١

# پوختەی صەحیح مۆسلیم

تالیف:
زکی الدین عبدالعظیم عبدالتوی المنذری
وەرگێڕان:
لیژنە یەک



بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

﴿وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا﴾

(الحشر: من الآية٧)

(( ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) بۆی هێنان وەریبگرن و جێبەجێی بکەن و ، ئەوەیش کەرێگریی لێکردوون مەیکەن ))

منذری، عبدالعظیم‌بن عبدالقوی، ۵۸۱ - ۶۵۶ق.
پوختەی صەحیحی موسلیم / نووسینی زکی‌الدین عبدالعظیم‌بن عبدالقوی المنذری؛ وەرگیرانی لیژنە یەک.-- تهران: احسان، ۱۳۸۲ -.
ج.
ISBN: 964-356-370-7 (دوره) . - ISBN: 964-356-371- 5: (ج. ۱)
ISBN: 964-356-372- 3: (ج. ۲)
فهرستنویسی بر اساس اطلاعات فیپا.
۱. احادیث اهل سنت -- قرن ۷ق. الف. مسلم‌بن حجاج، ۲۰۶ - ۲۶۱ق. -- الجامعا لصحیح. ب. عنوان. ج. عنوان: الجامع الصحیح.
۲۹۷/۲۱۱ BP۱۲۳/۶/م۸پ۹
۱۳۸۳
کتابخانه ملی ایران ۱۹۷۱۸-۸۳م

● ناوی کتێب: پوختەی صەحیحی موسلیم
● نووسینی: پێشەوا زکي عبدالعظیم بن عبدالقوي المنذري
● وەرگێڕانی: لیژنەیەک
● بڵاوکار: نەشری ئێحسان
● تیراژ: ۳۰۰۰ دانە
● ساڵی چاپ: ۱٤۲٦ کوچی ۲۷۰۵ کوردی ـ ۲۰۰۵ زاینی
● چاپ: مەهارەت ـ تاران
● ژمارەی نێونە تەوایەتی: ISBN: 964-356-370-7 / ۹۶۴-۳۵۶-۳۷۰-۷
● ژمارەی نێونە تەوایەتی برگی یەکەم: ISBN: 964-356-371-5 / ۹۶۴-۳۵۶-۳۷۱-۵

# پێشەکی لیژنەی وەرگێڕ

تەواوی سەوپاس و ستایش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیان. درودو سلاّو لەسەر گیانی پاکی پێغەمبەر و یارانی و شوێنکەوتوانی هەتا ڕۆژی دوایی.

جێیگومان نییە کە سەرچاوەی یەکەم و سەرەکی شەریعەتی ئیسلام قورئانی پیرۆزە. دووەم سەرچاوەش سوننەتی پێغەمبەرە (ﷺ) بە گوفتار و ڕەفتاریەوە. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿أطيعوا الله وأطيعوا الرسول و أولى الأمر منكم﴾ [النساء: ٥٩]. واتە ﴿گوێڕایەڵی خوا بکەن و، گوێڕایەڵی پێغەمبەر و خاوەن فرمانەکانیشتان بکەن ﴾. هەروەها دەفەرمووێ: ﴿وما آتاكم الرسول فخذوه وما نهاكم عنه فانتهوا﴾ [الحشر]. واتە: ﴿ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) بۆی هێناون و فەرمانی پێکردوون وەری گرن و بیکەن، ئەوەش لێتانی قەدەغە کردووە، مەیکەن و دەستی لێبکێشنەوە﴾.

کەواتە گوێڕایەڵی و پەیڕەوی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەواوکاریی گوێڕایەڵی خوایە، چونکە سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) ڕوونکەرەوەو ڕاڤە و بەرجەستەکردنی قورئانی پیرۆزە. هەر بۆیە عائشەی دایکی بڕواداران کاتێ لەبارەی ڕەوشتی پێغەمبەرەوە (ﷺ) پرسیاریان لێکرد، وتی: (كان خلقه القرآن) واتە: ڕەوشت و ڕەفتارەکانی پێغەمبەر (ﷺ) قورئان بوو. کەواتە ئێمەی بڕوادار چ وەك تاك و چ وەك کۆمەڵگە، چ وەك دەسەڵات و ئیدارە، چ وەك ژیار و شارستانێتی، پێویستمان بە فەرموودەکانی پێغەمبەر و ژیاننامەکەی هەیە، تا لەهەموو ڕەهەندە کرداری‌یەکانی ئیسلام باشتر تێبگەین.

لەو ڕوانگەیەوە و وەك بەشێك لە خزمەت بە ژیاننامە و، سوننەتە بەرزەکانی پێغەمبەری ئیسلام بە تایبەتی لە کۆمەڵگەی کوردەواریدا، کەڕێزو خۆشەویستی‌یەکی تایبەتی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) هەیە تا ئێستا گرنگی و بایەخێکی تایبەت بە سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) بەو ڕادە پێویستە نەدراوە. هەر بۆیە ئەم پرۆژەی وەرگێڕانەی (صحيح مسلم) هاتە ئاراوە.

## بۆچی (صحیح مسلم)مان هەڵبژارد؟

پاش ئەوەی بۆمان دەرکەوت کە چەند مامۆستایەکی بەڕێز، پرۆژەی وەرگێڕانی (صحیح البخاری)یان بەدەستەوەیە، بۆ ئەوەی تواناکان لەیەك بواردا دووبارە نەکرێنەوە، بڕیارمان دا کە (صحیح مسلم) لەڕێی کورتکراوەکەی پێشەوا (منذری)یەوە وەرگێڕین بۆ سەر زمانی شیرینی کوردی. دیارە – ئەوەندەی ئێمە ئاگادارین– تا ئێستە کاری لەم جۆرە نەکراوە؛ واتە راڤەکردنێکی کورت وپوختی فەرموودەکانی (صحیح مسلم). ئامانج لەم پرۆژەیە ئەوەیە کە خوێنەری کورد زمان کورتە و پوختەیەك لەواتاکانی فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بزانێ، چونکە گەڕان بەدوای واتاکاندا لە کتێب و، سەرچاوە گەورەکانی شەرحی (صحاح)دا، هەم لە ڕووی زمانی و هەم لەڕووی عەمەلی یەوە، بۆ ئەم سەردەمە و بۆ خوێنەرانی غەیری توێژەر، بۆتە کارێکی نیمچە ئەستەم، بەڵام بەم کارە دەتوانرێ –بەلای کەمەوە– زۆرترینی خوێنەرانی کورد زمانی شەیدای فەرمودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) کار ئاسانی بۆ بکرێ، ئەم کتێبە کورت کراوەیە لە بەردەستیاندا بێت و، ڕۆژانە سوودی لێببینن، بە تایبەتی کە تا ئێستا سەرچاوەیەکی کورتی کوردیی لەم بوارەدا لەبەردەستی خوێنەراندا نییە.

## لیژنەی وەرگێڕان و پێداچوونەوە:

کاتێ بیرۆکەی وەرگێڕانی فەرموودەکان باس کراو، چەند موسڵمانێکی کوردی دڵسۆز و بەئەمەك بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە نیشتەجێی بەریتانیان، بڕیاری لە ئەستۆ گرتنی چاپیان دا، لە لقی سلێمانی (کۆمەڵەی نوسەرانی ئیسلامی کوردستان) باسکراو، بڕیاری بەدەمەوە چوونی داخوازی‌یەکە درا.. پاشان لیژنەیەك لە مامۆستایانی شارەزا لە بواری نووسین و وەرگێڕاندا دیاری کران، بۆ جێبەجێکردنی کاری وەرگێڕانەکە. لیژنەکە بریتی بوو لە بەڕێزان:

١-حمەكريم عبداللە: بەرپرسی لقی سلێمانی کۆمەڵەی نووسەرانی ئیسلامی کوردستان (سەرپەرشتیاری لیژنە).
٢-محمد محمد حمه میرزا.
٣-برهان محمد أمين.
٤. عمر أحمد نظامي.
٥-برهان رؤوف شيخ سميع.

لیژنەی ناوبراو کتێبەکەی (مختصر المنذري لصحيح مسلم) یان دابەش کرد بە پێنج بەشەوە و، هەرکامیان بەشێکی وەرگێڕایە سەر کوردی. پاش تەواو بوونی پرۆسەی سەرەتایی وەرگێڕانەکە، هەر پێنج ئەندامی لیژنە، پێکەوە هەستان بە پیاچوونەوەی فەرمووده وەرگێڕراوەکان، پاش ئەوە بۆ پیاچونەوەی کۆتایی، تێکڕای کتێبە وەرگێڕراوەکە، خرایە بەدەستی مامۆستایان: (حەسەن شەمێرانی و عمر عبدالعزيز)، ئەوانیش سەرنج و تێبینی خۆیان لەسەر نووسی و، سەرەنجام بە پشتیوانی خوا پرۆژەکە کۆتایی هات.

## ئەو کارانەی لەم پرۆژەی وەرگێڕانەدا کراون:

١-فەرموودەکان دەقاودەق وەرگێڕراون و هیچ ڕستەو وشەیەك پشتگوێ نەخراوە. لەهەر جێیەك ئاڵۆزییەك بووبێ، ڕوونکردنەوەیەکی کورت لە دووکەوانەی [ ] دا دراوە.
٢-هەندێ فەرموودە دوو تا سێجار بەڕیوایەتی جیا جیا هاتووە، دووبارەکانمان بە پێویست نەزانیووە و لامان بردوون.
٣-لەهەندێ شوێندا، هەندێ فەرموودە -کەپێویستیان بە ڕاڤەکردنی زۆرە و، قسە و ئەحکامی فیقهی زۆر هەڵدەگرێ- لامان بردوون، تا خوێنەران توشی ئاڵۆزی فکری و گرفتی تێنەگەیشتن لە فەرموودەکان نەبن.
٤-لەپاش دەقە عەرەبییەکەوە ئەگەر فەرمودەکە لە (صەحیحی بخاری)یشدا هاتبێ، لە کۆتایی دەقە عەرەبییەکەدا ئاماژەمان بۆ کردووە کەلە کوێی بوخاریدا هاتووە؛ تا خوێنەر بتوانێ فەرمودە (متفق عليه) کان جیا بکاتەوە.

٥-هەندێ لە ناونیشانەکانمان لە بەرپێویستیی دەسکاری کردووە، یا کورتمان کردونەتەوە.

٦-وشەی (فەرموو)مان تەنها بۆ پێغەمبەر (ﷺ) بەکارهێناوە.

٧-ناوی باوباپیری هەندێ لە ڕاویەکانمان لە کوردی یەکەدا لابردووە، لەبەر ئەوەی کە لە عەرەبی‌یەکەدا هەیە و لەبەرچاودایە.

## باشترین ڕێگا بۆ تێگەیشتن لە فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ):

لەکۆتایی ئەم پێشەکی‌یەدا، داواکارین لە خوێنەری بەڕێز، بە بایەخەوە سەرنجی ئەم چەند خاڵە بدەن، کە ئەو ڕێگایانە دەخاتە پێش چاوی خوێنەران، کەبەئاسانی لە فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) بگەن و، توشی هەڵە و پێ ترازان نەبن:

١-تێگەیشتن لە فەرمووده لە ڕوانگەی قورئانی پیرۆزەوە:

لەبەر ئەوەی سوننەت ڕاڤە و ڕوونکەرەوەی قورئانی پیرۆزە، نابێ بە هیچ جۆرێ پێچەوانەی قورئان بێت یا نەگونجێت لە گەڵیدا.

٢-کۆکردنەوەی هەموو ئەو فەرموودانەی کەلەسەر یەك بابەت هاتوون و، یەکخستنیان واتە: نابێ تاك تاك فەرمووده وەربگرین و فەتوای پێبدەین، بەڵکو دەبێ چەند فەرمووده لەسەر ئەو بابەتە هاتووە کۆیان بکەینەوە و پێکەوە لێیان تێبگەین و ماناو مەبەستەکەیان بزانین.

٣-یەکخستن یا (تەرجیح) دان لە نێوان فەرمووده جیاوازەکاندا:

ئەگەر لە نێوان دوو فەرموودەدا لە ڕواڵەتدا جاوازی و پێکەوە نەگونجان هەبوو، سەرەتا دەبێ هەوڵ بدرێت یەکبخرێن، چونکە هەرگیز ڕاستیی دژی ڕاستی نابێت. بەڵام ئەگەر چارەنەما و ڕێکنەخران ئەو کاتە هەوڵ دەدەین یەکێکیان تەرجیح بدەن بەسەر ئەوی تریاندا.

٤-تێگەیشتن لە فەرمووده لە ڕوانگەی ئامانجەکانی و هەلومەرجەکانیەوە:

واتە: پێویستە بزانین بۆچ ڕووداو هەڵوێستێك هاتووە؟ گشتییە یا تایبەتە؟ هەمیشەییە یان کاتییە و بۆ کاتێکی دیاریکراو وتراوە؟ ئایا گشتگیرە یا جوزئیە؟ [ئایا پێغەمبەر (ﷺ) وەکو پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی، یاوەکو فەرمانڕوا بۆ چارەسەری کێشەیەکی ئەو سەردەمە؟].

٥-جیاکردنەوەی وەسیلەی گۆڕاو لە ئامانجی نەگۆڕ.

هەندێك ئامانجە نەگۆڕەکانی سوننە تێکەڵ دەکەن لەگەڵ وەسیلەکان کە کاتیە و تایبەتە بەسەردەمێك و ژینگەیەکی دیارییەوە، وا دەزانن ئەو وەسیلانەش خۆیان مەبەستن، بەڵام ئەوەی قوڵ ببێتەوە لەسوننە و نهێنیەکانی و [سیاسەتی گشتی ئیسلام]؛ بۆی دەردەکەوێت کە ئامانجەکان مەبەستن نەك وەسیلەکان، چونکە وەسیلە بەپێی کات و شوێن دەگۆڕێن.

٦-جیاکردنەوەی مانای ڕاستەقینە لەمانای (مەجاز)ی ئەو فەرموودەیە:

لەزمانی عەرەبیدا ئەوەندەی وشەو زاراوەکان لەمانای (مەجاز)یدا بەکاردەهێنرێن، لەمانا ڕاستەقینەکاندا بەکارنایەن، لەبەر ئەوە زۆر پێویستە خوێنەر دەرکی ئەوە بکات کە ئایا ئەو فەرموودەیە لەکام مانایاندا بەکارهاتووە.

٧-جیاکردنەوەی شتی نادیار (غەیب) لەشتی دیار و بەرچاو:

واتە: نابێ وەکو شتە بەرچاوەکانی دنیا بڕوانیە شتە غەیبیەکانی قیامەت، وەکو فریشتە و جنۆکە و پردی سیرات و ئەو شتانەی کە پەیوەندییان بە ژیانی بەهەشت و دۆزەخەوە هەیە، هەروەکو (ابن عباس)(ﷺ) دەڵێ: (لیس في الجنة من الدنيا الا الاسماء) واتە: ئەوەی لە بەهەشتا هەیە، تەنها ناوەکانیان لە قیامەتدا هەیە، ئەگینا لە شتەکانی دنیا ناچن.

٨-دڵنیابووە لەئاماژەی وشەکانی فەرموودەکان، چونکە دەستەواژەکان بەگوێرەی سەردەم واتاکانیان دەگۆڕێت، ئەمەش لەلای توێژەرانی زمان بەگەشەکردنی زمان ناودەبرێت. بۆ نمونە: وشەی (تصویر) بۆ شتێك بەکارهاتووە کە سێبەری هەبێت، بەڵام ئەمڕۆ بۆ وێنەی فۆتۆگراف بەکاردێت، کە (عەکس) کردنەوەی وێنەیە وەکو لە وێنەدا (عەکس) دەبێتەوە، هەتا لە زۆر وڵاتی عەرەبیدا [لە ئێرانیش] بە (تصویر)ی [لای ئێمە] دەڵێن (عکس) نەك (تصویر)[1]

---

[1] سەیری کتێبی (چۆن مامەڵە لەگەڵ سوننەدا دەکین؟) لە نووسینی دکتۆر یوسف قەرزاوی، وەرگێڕانی حمە کریم عبدالله، لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی ڕۆشنبیر لە سلێمانی.

هیواداریین خوای گەورە ئەم کارە لەهەموو لایەك وەرگریّ و، هەموو بەشدارانی ئەم پرۆژەیە لە پاداشتی نەبڕاوەی خۆی بەشدار بکات. خوای گەورە پاداشتی برایانی بەڕێز حاجی سەرنج لەبەریتانیا بداتەوە کە ئەرکی لەچاپدانی ئەم پرۆژەی گرتە ئەستۆو بیکاتە توێشوی قیامەتی، هەروەها زۆر سوپاسی بەرێز (محمد حسن محمود) دەکین کە کۆمپیوتەری بابەتەکەی گرتە ئەستۆ، هەستا بە گواستنەوەی دەقە عەرەبییەکە لە (CD)یەوە کە کارێکی زۆر گران و درێژ خایەن بوو، هەروەها سوپاسی مامۆستا رزگار دەکەین کە (تصمیمی) کتێبەکەی گرتە ئەستۆو بەجوانی بۆی ئەنجامداین ، خوا پاداشتیان بداتەوە..

لەخوێنەرانیش داوای دۆعای وەرگیران بۆ هەموولا دەکەین.

لیژنەی وەرگێران

ڕەمەزانی موبارەکی ١٤٢٤ك

تشرینی دووەمی ٢٠٠٣ز

# پێشەكی ئامادەكار

سوپاس بۆ پەروەردگاری جیهانیان؛ درودو سەلام لەسەر گەورەمان محەمەد، لەسەر خزمانی و هاوەڵانیو شەوێنكەوتووانی بەچاكە هەتا ڕۆژی قیامەت.

پاش ئەوە: من سوپاسی خوای باڵادەست دەكەم كە ڕێزی لێنام بەوەی كردمی بە خزمەتكاری سوننەتی پێغەمبەری هەڵبژاردە (ﷺ) و، كتێبی (صحيح البخاری)م بەپشتیوانی خوا بەچاپ گەیاند، خوازیارم خوای گەورە لێی وەرگرتبم، هەروەها پوختەی (صحيح البخاری)م ئامادە كرد كە پێی دەڵێن (التجريد الصريح للزبيدی) بەشێوەیەك كە خوێنەران و توێژەران دڵخۆش بن پێی. كاتێ چاپكراوەكە كەوتە بازاڕ، زانستخوازان زۆریان پێ‌خۆش بوو، هەروەها ئەوانەی كە حەزیان دەكرد لەشارەزابوون لەسوننەتەكانی پێغەمبەر (ﷺ)، زۆر هانیان دام بۆ ئامادەكردنی پوختەی (صحيح مسلم) لەسەر هەمان شێوەی ئەوانی پێشو منیش دەستم دایە بەپشتیوانی خوای گەورە و، خوای بەخشندەیش سەركەوتووی كردم لەم كارەدا، كە لە چاپێكی جواندایە و لێكۆڵینەوەشی لەسەر كراوە هاوڕێ لەگەڵ ڕاڤەی پێویست لەو جێگایانەدا كە پێویستی پێیەتی لەرستە و دەستەواژەكان لەگەڵ ڕوونكردنەوەی هەندێ (حوكمی) پێویست لە جێگای پێویستدا..

بۆ سوودی زیاتریش: ئەو فەرموودانەی كە لێرەدا هاتوون و لە بوخاریشدا هاتوون ئاماژەمان بۆ كردوون، لەپاڵ ئەو زنجیرەی كە بۆ فەرموودەكان دانراوە لەم پوختەیەدا ناوی بەش و زنجیرەكەی لە بوخاریدا دیاریكراوە، بەپێی زنجیرەی ئەو چاپەی خۆم كە لەسەرەوە ئاماژەم بۆ كردووە، كەلە پەراوێزدا لە پێشدا ئامارژەم بەوە كردووە پێش ڕاڤەكردنی ڕستە و زاراوەكان.. بۆ نمونە:

- العلم/ تحريض النبي وفد عبدالقيس على ان يحفظوا الايمان والعلم/٨٧.

## پلانەکەم لەم کارەدا بەم شێوەیە:

لەم کتێبەدا پشتم بەستووە بە دوو کتێب:

یەکەم: دەسنووسێکە وێنەیەکیم لە کتێبخانەی فاتیکان دەست کەوتووە، وێنەیەکی جوان و ڕوونە و بەدەستخەتێکی جوان نوسراوەتەوە، لە کۆتایشدا نووسراوە.. بە حوکمێکی شەرعی گواسترایەوە بۆ موڵکی شێخ محەمەد کوڕی پێشەوای حەرەمین خوا لە خۆی و باوکی و هەموو موسڵمانانا خۆش بێت، پاشان نووسراوە: بە حوکمێکی شەرعی گواسترایەوە بۆ موڵکی مەحمودی کوڕی حسین کوڕی محەمەد خوا لە خۆی و باوکی و موسڵمانان خۆش بێت، لە بەرواری مانگی شەعبانساڵی حەوت سەدو نەوەد و نۆ لە دیمەشق، ئیتر نەمزانی چۆن گەیشتۆتە کتێبخانەی فاتیکان.

ئەم کتێبە لە ڕەمەزانی ساڵی شەش سەد و چل ونۆدا نووسراوە، واتە لە ژیانی مونذری نووسەردا، وتراویشە کە بەدەستخەتی مونذری خۆی نوسراوەتەوە خوا ڕەحمی پێ بکات، ئەوەی بۆ منیش دەرکەوتووە، بە دەسخەتی خۆی نییە، وەکو لە بەراوردی خەتەکەو ئەو دەستخەتەی مونذری کە لە دوای کتێبەکەدا نووسیویەتی دەردەکەوێت، کە ڕاستکردنەوەی تێدایە لە کاتێکا گوێی گرتووە بۆ ئەو کەسەی بۆی خوێندۆتەوە و مۆڵەتی داوە بەگێڕانەوە بە مەرجەکانی ئەو، بەڵام ئەوەی کە دیارە لە ژێر چاودێری خۆیدا نووسراوەتەوە، بەپێی وێنەکەی ئەویش ڕێکخراوە...

لەلایەنەچاکەکانی ئەم کتێبە، بەراوردکراوە لەگەڵ چەند کتێبێکی ڕەسەندا. لەلایەن چەندین پیاوەوە، وەکو لە پیاچوونەوە و ئاماژەکردن بۆ کتێبی تریش دەردەکەوێت لە پەراوێزەکانیدا. لەبەر ئەوە زۆریان جەختیان لەسەر ئەوە کردۆتەوە کە ئەم کتێبە دادەنرێت بە کتێبێکی ڕەسەن و بناغەیی.

دووەم: ئەو کتێبەی کە شێخ محەمەد ناسرەدین ئەلبانی لێکۆڵینەوەی لەسەر کردووە، کتێبخانەی ئیسلامی بڵاوی کردۆتەوە.

ئەو کتێبەش وەرگیراوە لە کتێبی [السراج الوهاج من كشف مطالب صحيح مسلم بن الحجاج] کە هیندستان لەساڵی ١٣٠٢ ك چاپکراوە لەلایەن زانای توێژەر (ابوالطيب صديق حسن خان القنوجي رحمه الله) ئەویش ڕاڤەی پوختەی (صحيح مسلم للحافظ المنذري)یە، هەروەها بەراوردیش کراوە لەگەڵ

کتێبێکی پارێزراودا لە (دار الکتب المصریه) لەژێر زنجیرەی (٥٢٣- حدیث) لە کتێبخانەی تەیموریە، ئەویش لەوێنەیەك وەرگیراوە کەلە (رباط)ی مەغریبە، لە ساڵی (٩١٨) نوسراوە.

هەروەها پشتمان بەستووە بە -بێجگە لە پوختەکان هەردوکیان- بە ئەسڵەکەش کە (صحیح مسلم)ە، لەوەشدا پشتمان بەستووە بە:

١-وێنەی چاپکراو لە (دار الطباعة العامرة بالاستانة عام ١٣٢٩هـ) کەوێنەیەکی لێکۆڵینەوەی لەسەر کراوە. بەراوردیش لەگەڵ زۆر وێنەی تردا ساغیش کراوەتەوە

٢-وێنەیەکی چاپکراو لە (دار الاحیاء الکتب العربیة في القاهرة) کە خاوەنەکەی عیسا بابی حەڵەبی و هاوبەشەکانیەتی، لەساڵی ١٣٧٤کۆچی چاپکراوە.. بە کێکۆڵینەوەی شێخ محەمەد فوئاد عەبدول باقی رحمەتی خوای لێبێت.

٣-وێنەیەك کە راڤەی پێشەوا نەوەوی لەسەرە، کە لەچاپخانەی میسری ئەزهەر لەساڵی ١٣٤٧ك چاپکراوە.

لەکۆتاییدا لەخوای گەورە خوازیارم ئەم کارەمان لێوەربگرێت و لەنامەی کارەکانماندا تۆماری بکات، بیکات بە پاداشتیش بۆ دایك و باوکم و هەرکەسیش هەقی لەلامە، هەر ئەو توانایە بەسەر هەموو شتێکدا و شایانی بەدەمەوهاتنیشمانە، سوپاس و ستایشیش تەنها بۆ پەروەردگاری جیهانیانە.

ابو الحسن

مصطفى ديب البغا

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان
## پەروەردگارم ئاسانکاریم بۆ بکەیت

ماموستای فەقیه و پێشەوا شێخ (زکی الدین ابو محمد عبدالعظیم بن عبدالقوي بن عبدالله المنذري)خوا پاداشتی بە بەهەشت بداتەوە. دەڵێ:

سوپاس بۆ خوای میهرەبان و لێبوردە، بەخشندەی بەدەسەڵات، ئەوەی دڵان و بیناییەکان دەگۆڕێت، زانای ئاشکراو نهێنییەکان، سوپاسی دەکەم سوپاسی هەمیشەیی لە ئێوارە و بەیانیدا، شایەتیش دەدەم کە تەنها یەك خوا هەیە و هاوبەشی نییە، شایەتیەك بێژەرەکەی لە سزای ئاگر ڕزگار دەکات. شایەتیش دەدەم کە موحەمەد(ﷺ) پێغەمبەری هەڵبژاردەیەتی. درودوسڵاو لەسەر خۆیی و خزمانی و هاوسەرەکانی و هاوەڵەکانی کە شیاوی ڕێز و گەورەیین، سڵاواتی هەمیشەیی کە تا شەو و ڕۆژ مابێ ئەویش بمێنێ.

ئەم کتێبە کورتکراوەی [صحيح الامام ابي الحسين مسلم بن الحجاج القشيري التيسابوري] رەزای خوای لێبێت، کورتکردنەوەیەك ئاسان بێت بۆ ئەوانەی لەبەری دەکەن، کورتی بکاتەوە بۆ خوێنەرانی، بە شێوەیەکیش ڕێکم خستووە، کە بە خێرایی ئەوەی دەیەوێت بگات بەوەی بۆی دەگەڕێت، لەگەڵ کورتیدا تەواوی مەبەستەکانی تێدایە بۆی داواکارم خوای گەورە بەم کتێبە سوود بگەیەنێ بە من و خوێنەرانی و نووسەرەکەیی، هەر ئەویش نزیکە و وەڵاممان دەداتەوە.

# بەشی ئیمان‌و باوەڕ[(١)]

## (١) سەرەتای ئیمان ـ باوەڕ ـ وتنی: ( لا اله الا الله )یە.

١ـ عَنْ أَبِي جَمْرَةَ قَالَ: كُنْتُ أُتَرْجِمُ بَيْنَ يَدَي ابْنِ عَبَّاسٍ وَبَيْنَ النَّاسِ، فَأَتَتْهُ امْرَأَةٌ تَسْأَلُهُ عَنْ نَبِيذِ الْجَرِّ، فَقَالَ: إِنَّ وَفْدَ عَبْدِ الْقَيْسِ أَتَوْا رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ)، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((مَنِ الْوَفْدُ؟ أَوْ مَنِ الْقَوْمُ)). قَالُوا: رَبِيعَةُ. قَالَ: ((مَرْحَبًا بِالْقَوْمِ- أَوْ: بِالْوَفْدِ- غَيْرَ خَزَايَا وَلَا النَّدَامَى)). قَالَ: فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّا نَأْتِيكَ مِنْ شُقَّةٍ بَعِيدَةٍ، وَإِنَّ بَيْنَنَا وَبَيْنَكَ هَذَا الْحَيَّ مِنْ كُفَّارِ مُضَرَ، وَإِنَّا لَا نَسْتَطِيعُ أَنْ نَأْتِيَكَ إِلَّا فِي شَهْرِ الْحَرَامِ، فَمُرْنَا بِأَمْرٍ فَصْلٍ نُخْبِرْ بِهِ مَنْ وَرَاءَنَا، نَدْخُلُ بِهِ الْجَنَّةَ. قَالَ: فَأَمَرَهُمْ بِأَرْبَعٍ، وَنَهَاهُمْ عَنْ أَرْبَعٍ، قَالَ: أَمَرَهُمْ بِالْإِيمَانِ بِاللَّهِ وَحْدَهُ، وَقَالَ: ((هَلْ تَدْرُونَ مَا الْإِيمَانُ بِاللَّهِ وحده، وقال: ((هل تدرون ما الايمانُ بالله وحدَه)). قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ شَهَادَةُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، وَإِقَامُ الصَّلَاةِ، وَإِيتَاءُ الزَّكَاةِ، وَصَوْمُ رَمَضَانَ، وَأَنْ تُؤَدُّوا خُمُسًا مِنَ الْمَغْنَمِ)). وَنَهَاهُمْ عَنِ الدُّبَّاءِ وَالْحَنْتَمِ وَالْمُزَفَّتِ. -قَالَ شُعْبَةُ: وَرُبَّمَا قَالَ: النَّقِيرِ قَالَ: وَرُبَّمَا قَالَ الْمُقَيَّرِ- وَقَالَ: ((احْفَظُوهُ وَأَخْبِرُوا بِهِ مَنْ وَرَائَكُمْ. و قَالَ أَبُو بَكْرٍ فِي رِوَايَتِهِ: مَنْ وَرَاءَكُمْ)). وَزَادَ ابْنُ مُعَاذٍ فِي حَدِيثِهِ عَنْ أَبِيهِ قَالَ: وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) لِلْأَشَجِّ -أَشَجِّ عَبْدِ الْقَيْسِ-: ((إِنَّ فِيكَ خَصْلَتَيْنِ يُحِبُّهُمَا اللَّهُ: الْحِلْمُ وَالْأَنَاةُ)).

(ابوجمرة) دەڵێ: لەبەردەستی(عبدالله) کوڕی( عباس)دا بووم، قسەکانیم دەگەیاند بەخەڵکەکە، ئافرەتێك هات بۆ لای لەبارەی سرکەی گۆزەوە پرسیاری لێکرد، ئەویش وتی: نوێنەرانی هۆزی عبد القیس هاتنە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((ئەو نوێنەرانە کێن؟ یا ئەو کۆمەڵە کێن؟ وتیان لەهۆزی ڕەبیعەن. فەرمووی:((خزمان بەخێربێن لەهاتنتان شەرمەزارو پەشیمان نەبن)). دەڵێ: وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئێمە لەڕێگایەکی دوورەوە هاتووین، لەنێوان ئێمەو بەڕێزتانا ئاواییەك لە کافرانی(مُضَرْ)هەن، ئێمە ناتوانین سەردانت بکەین مەگەر لەمانگی حەرامدا،

---

(١) حەرامکردنی سرکە لەوکاسانەدا لەسەرەتای ئیسلامدا وابووە، دوایی بەڕوونکردنەوەی(کل مسکر حرام) نەسخ کراوەتەوە.

لەبەرئەوە فەرمانێکی روون و ئاشکرامان پێ ڕابگەیەنە، کەئێمەش بیگەیەنین بەخەڵکی لای خۆمان و پێیشی بچینە بەهەشتەوە. دەڵێ: فەرمانی پێکردن بەچوار شت و، قەدەغەشی کردن لەچوار. فەرمانی پێکردن بە باوەڕهێنان بەخوای تاک و تەنهاو ، فەرمووی: ((ئایا دەزانن باوەڕ بەخوای تاک و تەنها چییە)) وتیان: خواو پێغەمبەرەکەی زاناترن، فەرمووی:((شایەتیی بدەن کەهیچ خوایەك نییە جگە لە(الله)، موحەممەدیش رەوانەکراوی خوایە، نوێژبکەن، زەکات بدەن، رۆژووی رەمەزان بگرن، پێنج یەکی دەستکەوتی جەنگ بدەن)) هەروەها قەدەغەشی کردن لەچوارشت: سرکە کردن لەناو کولەکەدا، لەناو گۆزەی سەوزدا(ئەوەی ئارەقیان تێدا هەڵگرتووە)، لەناو(المزفت)دا ﴿کاسەیەکە ناوەکەی قیردراوە﴾، لەناو(نقیر)دا ﴿کاسەیەکە لەقەدی درەختەو ناوەکەی هەڵکۆڵراوە﴾.

ئنجا فەرمووی:((ئەم فەرمانە بپارێزن و کاری پێ بکەن و بیگەیێنن بەخەڵکی لای خۆتان، ئەبوبەکر ﴿مامۆستایەکی موسلیمە﴾ لە ریوایەتەکەیدا دەڵێ:((بەو خەڵکەی لەدواتانەوەن)) (ابن‌معاذ) لەفەرموودەکەیدا لەباوکیەوە بۆی زیاد کردووە دەڵێ: ( پێغەمبەر(ﷺ) بە(اشج عبدالقیس)شی فەرموو:((لەراستیدا تۆ دوو سیفەتت تێدایە خوا خۆشی دەوێن: ژیریی و پەلەنەکردن و لەسەرخۆیی لەکاروباردا).

٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَوْمًا بَارِزًا لِلنَّاسِ، فَأَتَاهُ رَجُلٌ فَقَالَ، يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا الْإِيمَانُ؟ قَالَ: ((أَنْ تُؤْمِنَ بِاللَّهِ، وَمَلَائِكَتِهِ، وَكِتَابِهِ، وَلِقَائِهِ، وَرُسُلِهِ، وَتُؤْمِنَ بِالْبَعْثِ الْآخِرِ)) قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا الْإِسْلَامُ؟ قَالَ: ((الْإِسْلَامُ أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ وَلَا تُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا، وَتُقِيمَ الصَّلَاةَ الْمَكْتُوبَةَ، وَتُؤَدِّيَ الزَّكَاةَ الْمَفْرُوضَةَ، وَتَصُومَ رَمَضَانَ)). قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا الْإِحْسَانُ؟ قَالَ: ((أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ، فَإِنَّكَ إِنْ لَا تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ)). قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَتَى السَّاعَةُ؟ قَالَ: ((مَا الْمَسْئُولُ عَنْهَا بِأَعْلَمَ مِنَ السَّائِلِ، وَلَكِنْ سَأُحَدِّثُكَ عَنْ أَشْرَاطِهَا: إِذَا وَلَدَتِ الْأَمَةُ رَبَّهَا فَذَاكَ مِنْ أَشْرَاطِهَا، وَإِذَا كَانَتِ الْعُرَاةُ الْحُفَاةُ رُءُوسَ النَّاسِ فَذَاكَ مِنْ أَشْرَاطِهَا، وَإِذَا تَطَاوَلَ رِعَاءُ الْبَهْمِ فِي الْبُنْيَانِ فَذَاكَ مِنْ أَشْرَاطِهَا، فِي خَمْسٍ لَا يَعْلَمُهُنَّ إِلَّا اللَّهُ)). ثُمَّ تَلَا (ﷺ): ﴿إِنَّ اللَّهَ عِنْدَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْأَرْحَامِ وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَاذَا تَكْسِبُ غَدًا وَمَا تَدْرِي

نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾ {لقمان: ٣٤}قَالَ ثُمَّ أَدْبَرَ الرَّجُلُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((رُدُّوا عَلَيَّ الرَّجُلَ، فَأَخَذُوا لِيَرُدُّوهُ فَلَمْ يَرَوْا شَيْئًا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((هَذَا جِبْرِيلُ جَاءَ لِيُعَلِّمَ النَّاسَ دِينَهُمْ)) [[٢] بخاري/ الايمان (سؤال جبريل النبي عن الايمان والاسلام وعلم الساعة ٥٧]

(ابوهريرة) (ﷺ) دەڵێ: ڕۆژێك پێغەمبەر(ﷺ) لەناو خەڵکیدا دەرکەوت، پیاوێك هاتە خزمەتی و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا باوەڕ چییە؟ فەرمووی: ((باوەڕت هەبێت بەخوا، بەفریشتەکانی، بەکتێبەکانی، بەدیدارو بەخزمەت گەیشتنی، بەپێغەمبەرانیی. هەروەها باوەڕت هەبێت بەزیندووبوونەوەی ڕۆژی قیامەت)). ئینجا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئیسلام چییە؟ فەرمووی: ((ئیسلام ئەوەیکە: خواپەرستیو هیچ شتێك نەکەیت بەهاوبەشی، نوێژە فەرزەکانت بکەیت، زەکاتی دیاریکراو بدەیت، ڕۆژووی ڕەمەزان بگریت)). وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئیحسان چییە؟ فەرمووی: ((وا خوا بپەرستیت وەکو چاوت لێی بێت، چونکە ئەگەر تۆ چاوت لەو نەبێت ئەو چاوی لە تۆیە) ئینجا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، کەی ڕۆژی قیامەتە؟ فەرمووی:((پرسیار لێکراو لەوبارەیەوە ﴿کەهاتنی قیامەتە﴾زاناتر نییە لەپرسیارکار، بەڵام باسی نیشانەکانیت بۆ دەکەم: هەرکاتێ کەنیزەك گەورەکەی خۆی بوو[١] ئەوە لەنیشانەکانیەتی. هەروەها ئەگەر ڕووتو پێخاوسەکان ببنە کاربەدەستانی خەڵك، ئەوەش لەنیشانەکانیەتی. هەروەها هەرکاتێ شوانەکانی مەڕومالاَت شانازییان کرد بەبەرزیی کۆشکەکانیانەوە﴿دوای ئەوەی دەست دەگرن بەسەر کاروبارياندا﴾ئەوەش لەنیشانەکانیەتی.

پێنج شتیش هەن کەس نایانزانێت جگە لەخوا، ئینجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە﴿ان الله عنده علم الساعة وينزل الغيث ويعلم ما في الارحام وما تدري نفس ماذا تكسب غداً وما تدري نفس بأي ارض تموت ان الله عليم خبير﴾ لقمان: ٣٤.واتە: لەڕاستیدا هەر خوا کاتی هاتنی ڕۆژی قیامەت دەزانێت، هەرئەویش باران دەبارێنێت، هەرئەویش دەزانێت چی لەمنداڵداندا هەیە، هیچ

---

[١] مەبەست لەمەش ئەوەیە: ڕۆژێك دێت منداڵ ڕێز لەباوكو دایكی ناگرێت، وەکو کۆیلە سەیریان دەکات

کەس نازانێت سبەینێ چی دەکات، هیچ کەسێك نازانێت لەچ خاکێکدا دەمرێت، لەراستیدا خوا زاناو شارەزایە. ئینجا پیاوەکە پشتی هەڵکردوو رۆیشت، پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی:((ئەو پیاوەم بۆ بگێڕنەوە، کاتێ ویستیان بیگێڕنەوە، کەسیان نەبینی. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:((ئەوە جوبرەئیل بوو هات بۆ ئەوەی خەڵك فێری ئایینەکەیان بکات)) ﴿بخاري/ الایمان (سؤال جبریل النبي عن الایمان والاسلام وعلم الساعة ٥٠)﴾..

٣ ـ عن سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ عَنْ أَبِيهِ (ﷺ) قَالَ: لَمَّا حَضَرَتْ أَبَا طَالِبٍ الْوَفَاةُ، جَاءَهُ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)، فَوَجَدَ عِنْدَهُ أَبَا جَهْلٍ وَعَبْدَ اللَّهِ بْنَ أَبِي أُمَيَّةَ بْنِ الْمُغِيرَةِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): يَا عَمِّ، قُلْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، كَلِمَةً أَشْهَدُ لَكَ بِهَا عِنْدَ اللَّهِ)). فَقَالَ أَبُو جَهْلٍ وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي أُمَيَّةَ: يَا أَبَا طَالِبٍ أَتَرْغَبُ عَنْ مِلَّةِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ؟ فَلَمْ يَزَلْ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَعْرِضُهَا عَلَيْهِ وَيُعِيدُ لَهُ تِلْكَ الْمَقَالَةَ، حَتَّى قَالَ أَبُو طَالِبٍ آخِرَ مَا كَلَّمَهُمْ، هُوَ عَلَى مِلَّةِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، وَأَبَى أَنْ يَقُولَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((أَمَا وَاللَّهِ لَأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ مَا لَمْ أُنْهَ عَنْكَ)). فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَنْ يَسْتَغْفِرُوا لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُوا أُولِي قُرْبَى مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ﴾ ﴿التوبة:١١٣﴾ وَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى فِي أَبِي طَالِبٍ فَقَالَ لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ): ﴿إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ﴾ ﴿القصص: ٥٦﴾.

(سعید) کوڕی(مسیب) لەباوکیەوە بۆمان دەگێڕێتەوە دەڵێ: (ابوطالب) لەسەرەمەرگدا بوو، پێغەمبەر(ﷺ)هات بۆ لای، بینی(ابوجهل)و (عبدالله) کوری (امیه) کوری (مغیرة) لەوێن، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((ئەی مامە، بڵێ ((لا اله الا الله))، ئەوە وشەیەکە کەلەلای خوا بەوە شایەتیت بۆ دەدەم. (ابوجهل)و (عبدالله) کوری (ابو امیه) وتیان: ئەی (ابوطالب) ئایا لە ئایینی (عبدالمطلب) لادەدەیت؟ پێغەمبەریش(ﷺ) هەمان قسەی بۆ دووبارەکردەوە، هەتا(ابو طالب)لەدوا وتەی خۆیدا وتی: ئەو لەسەر ئایینی (عبدالمطلب)ە، رازی نەبوو بڵێ: (لا اله الا الله).پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((بەڵام سوێند بەخوا ئەگەر رێگریم لێنەکرێت داوای لێخۆشبوونت بۆ دەکەم. هەر بۆیە خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە. (کەپێغەمبەرو ئیمانداران بۆیان نییە داوای لێخۆشبوون بۆ موشریکەکان بکەن، باخزمیشیان بن، دوای ئەوەی لێیان روونبوو ئەو موشریکانە نیشتەجێی دۆزەخن) . خوا لەبارەی (ابوطالب)ەوە ئەم

ئایەتەی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) دابەزاند:((بێگومان تۆ ڕێنمایی * کەسێك ناکەیت کەخۆشت دەوێت، بەڵام خوا بیەوێ ڕێنمایی هەرکەس بکات دەیکات، هەر ئەویش زاناترە بەڕێنمایی کراوەکان)) *.

## (٢) فەرمانم پێکراوە بجەنگم لەگەڵ خەڵکیدا هەتا دەڵێن (لا اله الا الله)

٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: لَمَّا تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وَاسْتُخْلِفَ أَبُو بَكْرٍ بَعْدَهُ، وَكَفَرَ مَنْ كَفَرَ مِنَ الْعَرَبِ، قَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ (ﷺ) لِأَبِي بَكْرٍ (ﷺ): كَيْفَ تُقَاتِلُ النَّاسَ وَقَدْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ فَمَنْ قَالَ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، فَقَدْ عَصَمَ مِنِّي مَالَهُ وَنَفْسَهُ إِلَّا بِحَقِّهِ، وَحِسَابُهُ عَلَى اللَّهِ)). فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ (ﷺ) وَاللَّهِ لَأُقَاتِلَنَّ مَنْ فَرَّقَ بَيْنَ الصَّلَاةِ وَالزَّكَاةِ، فَإِنَّ الزَّكَاةَ حَقُّ الْمَالِ وَاللَّهِ لَوْ مَنَعُونِي عِقَالًا كَانُوا يُؤَدُّونَهُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) لَقَاتَلْتُهُمْ عَلَى مَنْعِهِ. فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ (ﷺ): فَوَاللَّهِ مَا هُوَ إِلَّا أَنْ رَأَيْتُ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ قَدْ شَرَحَ صَدْرَ أَبِي بَكْرٍ لِلْقِتَالِ فَعَرَفْتُ أَنَّهُ الْحَقُّ. ﴿بخاري/ الزكاة/ وجوب الزكاة/١٢٢٥﴾

(ابوهریرة)(ﷺ)دەڵێ: کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی دوایی کردو، ئەبوبەکر کرا بە خەلیفە، کۆمەڵێك لەعەرەبەکان پاشگەز بوونەوە، (عمر) کوڕی(خطاب)(ﷺ)بە(ابوبکری(ﷺ)وت: چۆن دەجەنگیت لەگەڵ ئەو خەڵکەدا لەکاتێکا پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:((فەرمانم پێکراوە بجەنگم لەگەڵ خەڵکیدا هەتا دەڵێن: ( لا اله الا الله)هەرکەس وتی: (لا اله الا الله) خۆیو سامانیشی پارێزراوە ** ، تەنها بەهەقی خۆی نەبێت، لێپرسینەوەشی لەلای خوایە، ئەبوبەکر وتی: سوێند بەخوا دەجەنگم لەگەڵ ئەوانەی جیاوازی دەکەن لەنێوان نوێژو زەکاتدا[1]، چونکە زەکات مافێکە لەساماندا، سوێند بەخوا ئەگەر

---

* ڕێنمایی(هیدایەت): دوو جۆرە: یەکەم: بەمانای دروستکردنی هیدایەت لەدڵی مرۆڤدا تەنها لەدەستی خوادایە. دووەم: بەمانای ئامۆژگاریو ڕێنمایی ئەوە کاری پێغەمبەرانو چاکەخوازانە مەبەست لەوشەی(هدایەت) لەفەرموودەکەدا مانای یەکەمە.

** لەو سەردەمەدا خەڵکی بتیان پەرستووە ، بۆیە فشاریان خستۆتە سەریان کەواز لەو بتپەرستیە بهێنن‌و خوای تاك‌و تەنیا بپەرستن ، ئەگینا فشار نەخراوەتە سەر مەسیحیو جوولەکەکان کەئاینی ئاسمانیان هەبووە.

[1] واتە ئەو جەنگە بەرگری بووە لەمانی هەژاران کە زەکاتە.

پەتەگوریسێکم نەدەنێ کەداویانە بەپێغەمبەری خوا(ﷺ) لەسەر ئەوە دەجەنگم لەگەڵیاندا. عومەر وتی: سوێند بەخوا هەر خێرا بۆم دەرکەوت کە خوا دڵی ئەبوبەکری کردۆتەوە بۆ جەنگ ئینجا بۆیشم دەرکەوت کە ئەو لەسەر هەقە.

٥ ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَشْهَدُوا أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، وَيُقِيمُوا الصَّلَاةَ، وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ، فَإِذَا فَعَلُوا عَصَمُوا مِنِّي دِمَاءَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ إِلَّا بِحَقِّهَا، وَحِسَابُهُمْ عَلَى اللَّهِ)).﴿بخاري/ الايمان/ (فأن تابوا واقاموا الصلاة واقاموا الصلاة ...)٢٥﴾

( عبدالله) کوری(عمر)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ((فەرمانم پێکراوە بجەنگم لەگەڵ خەڵکیدا هەتا شایەتی دەدەن کە هیچ خوایەك نییە جگە لە(الله)، موحەمەدیش رەوانەکراوی خوایە، نوێژیش بکەن، زەکاتیش بدەن، ئەگەر ئەوەیان کرد ئەوا خوێن و سامانیان لەلای من پارێزراوە، مەگەر بەهەقی خۆی، لێپرسینەوەشیان لەلای خوایە)).

## ( ٣ ) کەسێك پیاوێك لەکافرەکانی کوشت دوای ئەوەی وتبوی ( لا اله الا الله )

٦ـ عَنِ الْمِقْدَادِ بْنِ الْأَسْوَدِ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَرَأَيْتَ إِنْ لَقِيتُ رَجُلًا مِنَ الْكُفَّارِ فَقَاتَلَنِي، فَضَرَبَ إِحْدَى يَدَيَّ بِالسَّيْفِ فَقَطَعَهَا، ثُمَّ لَاذَ مِنِّي بِشَجَرَةٍ فَقَالَ: أَسْلَمْتُ لِلَّهِ، أَفَأَقْتُلُهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ بَعْدَ أَنْ قَالَهَا؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((لَا تَقْتُلْهُ)). قَالَ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّهُ قَدْ قَطَعَ يَدِي، ثُمَّ قَالَ ذَلِكَ بَعْدَ أَنْ قَطَعَهَا، أَفَأَقْتُلُهُ؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((لَا تَقْتُلْهُ، فَإِنْ قَتَلْتَهُ فَإِنَّهُ بِمَنْزِلَتِكَ قَبْلَ أَنْ تَقْتُلَهُ، وَإِنَّكَ بِمَنْزِلَتِهِ قَبْلَ أَنْ يَقُولَ كَلِمَتَهُ الَّتِي قَالَ أَمَّا الْأَوْزَاعِيُّ وَابْنُ جُرَيْجٍ فَفِي حَدِيثِهِمَا: قَالَ: أَسْلَمْتُ لِلَّهِ. وَأَمَّا مَعْمَرٌ فَفِي حَدِيثِهِ. فَلَمَّا أَهْوَيْتُ لِأَقْتُلَهُ قَالَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ.

(مقداد)کوری( اسود)(ﷺ)دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) گەیشتم بەپیاوێك لەکافرەکان جەنگا لەدژم و بەشمشێر دای لەدەستێکم و قرتاندی ئینجا رای کردە پشتی درەختێکەوە وتی: باوەڕم هێنا بەخوا، ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئایا بیکوژم دوای وتنی ئەو قسەیە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((مەیکوژە)) دەڵێ: منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەو دەستێکی قرناندووم، دوای قرتاندنی دەستم ئەوەی وت، ئایا بیکوژم؟ پێغەمبەر(ﷺ)

فەرمووی: ((مەیکوژە، ئەگەر بیکوژیت ئەو لەشوێنی تۆدایە پێش ئەوەی بیکوژیت، تۆیش لەشوێنی ئەودای پێش وتنی ئەو وتەیەی کەوتی)). ﴿واتە: ئەو بە موسڵمانی مردووە، تۆیش ئیمان لە دەست دەدەیت چونکە موسڵمانێکت کوشتووە﴾.

٧ـ عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زيد (ﷺ) قَالَ: بَعَثَنَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فِي سَرِيَّةٍ، فَصَبَّحْنَا الْحُرَقَاتِ مِنْ جُهَيْنَةَ، فَأَدْرَكْتُ رَجُلًا، فَقَالَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، فَطَعَنْتُهُ، فَوَقَعَ فِي نَفْسِي مِنْ ذَلِكَ، فَذَكَرْتُهُ لِلنَّبِيِّ (ﷺ)، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((أَقَالَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَقَتَلْتَهُ)). قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّمَا قَالَهَا خَوْفًا مِنَ السِّلَاحِ. قَالَ: ((أَفَلَا شَقَقْتَ عَنْ قَلْبِهِ حَتَّى تَعْلَمَ أَقَالَهَا أَمْ لَا)). فَمَا زَالَ يُكَرِّرُهَا عَلَيَّ حَتَّى تَمَنَّيْتُ أَنِّي أَسْلَمْتُ يَوْمَئِذٍ. قَالَ: فَقَالَ سَعْدٌ: وَأَنَا وَاللَّهِ لَا أَقْتُلُ مُسْلِمًا حَتَّى يَقْتُلَهُ ذُو الْبُطَيْنِ. يَعْنِي أُسَامَةَ. قَالَ: قَالَ رَجُلٌ: أَلَمْ يَقُلِ اللَّهُ تعالى: ﴿وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ كُلُّهُ لِلَّهِ﴾ {الانفال: ٣٩} فَقَالَ سَعْدٌ: قَدْ قَاتَلْنَا حَتَّى لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ، وَأَنْتَ وَأَصْحَابُكَ تُرِيدُونَ أَنْ تُقَاتِلُوا حَتَّى تَكُونَ فِتْنَةٌ. ﴿بخاري / المغازي/ بعث النبي(ﷺ) اسامة بن زيد الى الحروقات .../ ٤٠٢١﴾

(اسامە) کوری (زید)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) بەمەفرەزەیەك ناردینی بۆ سەرتیرەی (حروقات)لەهۆزی(جوهەینە) دەمەوبەیان گەیشتینە ئەوێ﴿کەوتبوونە جەنگەوەو شکاندبوونیان﴾ گەیشتم بەپیاوێك، وتی: (لا اله الا الله)منیش شمشێرێکم لێدا کوشتم، بەلأم بوو بەگرێ لەدڵما، گێرامەوە بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ)، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: ((ئایا وتی(لا اله الا الله)و کوشتیشت)) دەڵێ: وتم ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەراستیدا ئەو لەترسی چەکەکە وای وت. فەرمووی: ((ئایا دڵت لەت کرد تابزانیت لەبەرئەوە وتویەتی یان نا))، بەردەوام پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەی دەوتەوە بەسەرما هەتا خۆزگەم خواست کە ئەو رۆژە موسڵمان ببومایە. دەڵێ: سەعدیش وتی: بەخوا من هیچ موسڵمانێك ناکوژم هەتا ورگزل نەیکوژێت. واتە ــ ئوسامە ــ دەڵێ: ئینجا پیاوێك وتی: ئایا خوای گەورە نەیفەرمووە:﴿ بجەنگن لەگەڵیان بانەبنە مایەی فیتنەو ئاینیش هەمووی ببێ بەئایینی خوا﴾. سەعدیش وتی: ئێمە جەنگاوین بۆ ئەوەی فیتنە روونەدات، بەلأم تۆو هاوەڵەکانت دەتانەوێت: بجەنگن بۆ ئەوەی فیتنە بەرپابکەن.

٨ . عَنْ صَفْوَانَ بْنِ مُحْرِزٍ: أَنَّهُ حَدَّثَ أَنَّ جُنْدَبَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ الْبَجَلِيَّ (رضي الله عنه) بَعَثَ إِلَى عَسْعَسِ بْنِ سَلَامَةَ زَمَنَ فِتْنَةِ ابْنِ الزُّبَيْرِ، فَقَالَ: اجْمَعْ لِي نَفَرًا مِنْ إِخْوَانِكَ حَتَّى أُحَدِّثَهُمْ. فَبَعَثَ رَسُولًا إِلَيْهِمْ فَلَمَّا اجْتَمَعُوا جَاءَ جُنْدَبٌ وَعَلَيْهِ بُرْنُسٌ أَصْفَرُ، فَقَالَ: تَحَدَّثُوا بِمَا كُنْتُمْ تَحَدَّثُونَ بِهِ. حَتَّى دَارَ الْحَدِيثُ، فَلَمَّا دَارَ الْحَدِيثُ إِلَيْهِ حَسَرَ الْبُرْنُسَ عَنْ رَأْسِهِ فَقَالَ: إِنِّي أَتَيْتُكُمْ وَلَا أُرِيدُ أَنْ أُخْبِرَكُمْ عَنْ نَبِيِّكُمْ (ﷺ)، إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) بَعَثَ بَعْثًا مِنَ الْمُسْلِمِينَ إِلَى قَوْمٍ مِنَ الْمُشْرِكِينَ، وَإِنَّهُمُ الْتَقَوْا، فَكَانَ رَجُلٌ مِنَ الْمُشْرِكِينَ إِذَا شَاءَ أَنْ يَقْصِدَ إِلَى رَجُلٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ قَصَدَ لَهُ فَقَتَلَهُ. وَإِنَّ رَجُلًا مِنَ الْمُسْلِمِينَ قَصَدَ غَفْلَتَهُ، قَالَ: وَكُنَّا نُحَدَّثُ أَنَّهُ أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ، فَلَمَّا رَفَعَ عَلَيْهِ السَّيْفَ قَالَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، فَقَتَلَهُ، فَجَاءَ الْبَشِيرُ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) فَسَأَلَهُ فَأَخْبَرَهُ، حَتَّى أَخْبَرَهُ خَبَرَ الرَّجُلِ كَيْفَ صَنَعَ، فَدَعَاهُ فَسَأَلَهُ فَقَالَ: ((لِمَ قَتَلْتَهُ)). فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَوْجَعَ فِي الْمُسْلِمِينَ، وَقَتَلَ فُلَانًا وَفُلَانًا، وَسَمَّى لَهُ نَفَرًا، وَإِنِّي حَمَلْتُ عَلَيْهِ، فَلَمَّا رَأَى السَّيْفَ قَالَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((أَقَتَلْتَهُ)). قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: ((فَكَيْفَ تَصْنَعُ بِلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ إِذَا جَاءَتْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)). {قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ اسْتَغْفِرْ لِي}. قَالَ: ((فَكَيْفَ تَصْنَعُ بِلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ إِذَا جَاءَتْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)). قَالَ: فَجَعَلَ لَا يَزِيدُهُ عَلَى أَنْ يَقُولَ: ((فَكَيْفَ تَصْنَعُ بِلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ إِذَا جَاءَتْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)).

(صفوان) کوڕی(محرز) دەڵێ: (جندب) کوڕی(عبدالله البجلی)(رضي الله عنه) لەسەردەمی فیتنەی(عبدالله)ی کوڕی( زوبیر)دا ناردی بۆلای(عسعس) کوڕی (سلامە)و وتی: کۆمەڵێك لەبراکانتم بۆ کۆبکەرەوە باقسەیان بۆ بکەم، ئەویش کەسێکی نادر بەدوایاندا، کاتێ کۆبوونەوە،(جندب) هات و جبەیەکی زەردی کڵاوداری لەبەردابوو وتی: لەسەرقسەکانی خۆتان قسەبکەن، هەرقسەکراو لەکەسێکەوە دەگۆڕا بۆ کەسێکی‌تر، کاتێ نۆرە گەیشتە سەر ئەم کڵاوەکەی لەسەری لاداو وتی: من هاتووم بۆ لاتان باسی هیچتان بۆناکەم باسی پێغەمبەرەکەتان(ﷺ)نەبێ. پێغەمبەری خوا(ﷺ)سوپایەکی لەموسڵمانان نارد بۆ سەر قەومێك لەموشریکەکان، لەوێ بەرامبەر بەیەك راوەستان، پیاوێك لەموشریکەکان هەرکە نیازی کوشتنی موسڵمانێکی بکردایا پەلاماری‌دەداو دەیکوشت یەکێکیش لەموسڵمانەکان بێ‌ئاگایی ئەوپیاوەی قۆستەوە و پەلاماری‌دا، واش قسەیان بۆ کردووین کەئەو پیاوە ئوسامەی کوڕی زەید بوو،

کاتێ شمشێری لێراکێشا موشریکەکە وتی: (لا اله الا الله)بەڵام هەرکوشتی، ئینجا هەواڵدەر خۆی گەیاندە پێغەمبەر (ﷺ)ئەویش پرسیاری لێکردو وەڵامی دایەوە هەتا هەواڵی ئەو پیاوەشی دایە(واتە هەواڵی ئوسامە کەچی کردووە، پێغەمبەریش (ﷺ) بانگی کردوو فەرمووی:((بۆچی کوشتت؟!)) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئازاری گەیاند بەموسڵمانەکان، فلاَن و فیساری لێ کوشتن ناوی چەند کەسێکی برد، هەر بۆیە منیش پەلامارم دایە، کاتێ چاوی بەشمشێرەکە کەوت وتی: ((لا اله الا الله))، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((ئایا کوشتت)) وتی: بەڵێ. فەرمووی: ((ئەی چی دەکەیت لە (لا الە الا الله)لەرۆژی قیامەتدا)). ئوسامە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا داوای لێخۆشبوونم بۆ بکە. فەرمووی: ((ئەی چی دەکەیت لە(لا اله الا الله)لەرۆژی قیامەتدا)). ئیتر بەو شێوەیە هەر دەیفەرموو: ((ئەی چی دەکەیت لە (لا الە الا الله)لە رۆژی قیامەتدا)).

## (٤) هەرکەس بەئیمانەوە گەڕایەوە بۆ لای خواو هیچ گومانی نەبوو دەچێتە بەهەشتەوە

٩- عَنْ عُثْمَانَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((مَنْ مَاتَ وَهُوَ يَعْلَمُ أَنْ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ دَخَلَ الْجَنَّةَ)).

(عثمان) (ﷺ)دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((ئەوەی مردوو دەیزانی و باوەری وابوو کە هیچ خوایەك نییە جگە لە (الله) دەچێتە بەهەشتەوە).[1]

١٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ)، أَوْ: عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (ﷺ) –شَكَّ الْأَعْمَشُ– قَالَ: لَمَّا كَانَ غَزْوَةُ تَبُوكَ أَصَابَ النَّاسَ مَجَاعَةٌ، فَقَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ، لَوْ أَذِنْتَ لَنَا فَنَحَرْنَا نَوَاضِحَنَا، فَأَكَلْنَا وَادَّهَنَّا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((افْعَلُوا)). قَالَ: فَجَاءَ عُمَرُ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنْ فَعَلْتَ قَلَّ الظَّهْرُ. وَلَكِنِ ادْعُهُمْ بِفَضْلِ أَزْوَادِهِمْ، ثُمَّ ادْعُ اللَّهَ لَهُمْ بِالْبَرَكَةِ، لَعَلَّ اللَّهَ أَنْ يَجْعَلَ فِي ذَلِكَ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((نَعَمْ)). فَدَعَا بِنِطَعٍ فَبَسَطَهُ، ثُمَّ دَعَا بِفَضْلِ أَزْوَادِهِمْ، قَالَ: فَجَعَلَ الرَّجُلُ يَجِيءُ بِكَفِّ ذُرَةٍ، قَالَ:

---

[1] ئەم جۆرە فەرمودانە بەتەنها حوکمیان لێوەرناگیرێت بەڵکو پێویستیان بەتەواوکەر هەیە لە ئایەت و فەرموودەی تر.

وَيَجِيءُ الْآخَرُ بِكَفِّ تَمْرٍ، قَالَ: وَيَجِيءُ الْآخَرُ بِكَسْرَةٍ، حَتَّى اجْتَمَعَ عَلَى النِّطَعِ مِنْ ذَلِكَ شَيْءٌ يَسِيرٌ، قَالَ: فَدَعَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بِالْبَرَكَةِ، ثُمَّ قَالَ: ((خُذُوا فِي أَوْعِيَتِكُمْ)). قَالَ: فَأَخَذُوا فِي أَوْعِيَتِهِمْ، حَتَّى مَا تَرَكُوا فِي الْعَسْكَرِ وِعَاءً إِلَّا مَلَئُوهُ، قَالَ: فَأَكَلُوا حَتَّى شَبِعُوا وَفَضَلَتْ فَضْلَةٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ، لَا يَلْقَى اللَّهَ بِهِمَا عَبْدٌ غَيْرَ شَاكٍ فَيُحْجَبَ عَنِ الْجَنَّةِ)).

(ابوهريرة)(ﷺ)، یا (ابوسعید)(ﷺ) (اعمش)گومانی هەبوو کامیان دەڵێ: لەرۆژی غەزای تەبوکدابوو، خەڵکەکە تووشی برسێتی بوون، وتیان ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەگەر ڕێگامان بدەیت، وشترەکانمان سەربڕین، تێریش دەبین و ڕۆنیشی لێدەگرین. پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ((وابکەن)) دەڵێ: عمر هات و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)ئەگەر وابکەیت، ولاغی سواربوونمان کەم دەبێتەوە، بەڵکو داوایان لێبکەیت پاشماوەی خۆراکەکانیان بهێنن و، ئینجا دۆعای بەرەکەتی بۆ بکەیت، بەڵکو خوای گەورە بەرەکەتی تێ بخات، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ((بەڵێ)) بانگی کرد پێستەیەکیان بۆ هێناو ،ئینجا داوای کرد پاشماوەی خۆراکەکانیان بهێنن، وتی: پیاوێك لێوەچێك گەنمەشامی هێنا، یەکێکی تریش خورماو، یەکێکی تریش پارچە نانێك و...هەتا لەسەر پێستەکە کەمێك شت کۆبوویەوە دەڵێ: ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) دۆعای بەرەکەتی کرد، ئینجا فەرمووی: ((لە دەفرەکانتانا خۆراك هەڵبگرن)) دەڵێ: هەموویان بەو دەفرانەی پێیان بوو خۆراکیان برد، هەتا یەك دەفر نەما لەناو سوپاکەو هەموویان پڕکرد دەڵێ: ئینجا دەستیان کرد بە خواردن هەتا تێربوون و لێشیان مایەوە ئینجا پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ((شایەتی دەدەم کە هیچ خوایەك نییە جگە لە(الله) منیش ڕەوانەکراوی خوام، هەرکەس بەم دوو وتەیەوە بگەڕێتەوە بۆ لای خواو گومانی نەبێ. ڕێگای بەهەشتی لێناگیرێت)).

١١- عَنِ الصُّنَابِحِيِّ –عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ (ﷺ)– قَالَ: دَخَلْتُ عَلَيْهِ وَهُوَ فِي الْمَوْتِ، فَبَكَيْتُ، فَقَالَ: مَهْلًا، لِمَ تَبْكِي؟ فَوَاللَّهِ لَئِنِ اسْتُشْهِدْتُ لَأَشْهَدَنَّ لَكَ، وَلَئِنْ شُفِّعْتُ لَأَشْفَعَنَّ لَكَ، وَلَئِنِ اسْتَطَعْتُ لَأَنْفَعَنَّكَ. ثُمَّ قَالَ: وَاللَّهِ مَا مِنْ حَدِيثٍ سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) لَكُمْ فِيهِ خَيْرٌ إِلَّا حَدَّثْتُكُمُوهُ، إِلَّا حَدِيثًا وَاحِدًا، وَسَوْفَ

أُحَدِّثُكُمُوهُ الْيَوْمَ، وَقَدْ أُحِيطَ بِنَفْسِي، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((مَنْ شَهِدَ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ النَّارَ)).

له(الصنابحى)یەوە ـ له(عبادە)کوری( الصامت)ەوە(ﷺ) ـ دەڵێ: چووم بۆ لای لەسەرەمەرگدابوو، دەستم کرد بەگریان، وتی: ئارام بە، بۆچی دەگریت؟ سوێند بەخوا ئەگەر شەهیدبووم شایەتیت بۆ دەدەم، ئەگەر شەفاعەتم بۆکرا بۆت دەکەم، ئەگەر توانیم سوودت پێدەگەێنم، ئینجا وتی: سوێند بەخوا فەرموودەیەك نییە کەلە پێغەمبەری خوام(ﷺ) بیستبێ خێری ئێوەی تێدابێت بۆم نەگێڕابنەوە جگە لەیەك فەرموودە، ئەویش ئیمڕۆ بۆتان دەگێڕمەوە، منیش ئێستا مردن دەورەی داوم لەپێغەمبەری خوام(ﷺ) بیستووە فەرموویەتی: ((هەرکەس شایەتیدا کە هیچ خوایەك نییە جگە لە(الله)و موحەمەدیش رەوانەکراوی خوایە، خوائاگری لەسەر حەرام دەکات)).

١٢ـ عن أَبُو هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: كُنَّا قُعُودًا حَوْلَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، مَعَنَا أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ (ﷺ) فِي نَفَرٍ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) مِنْ بَيْنِ أَظْهُرِنَا، فَأَبْطَأَ عَلَيْنَا، وَخَشِينَا أَنْ يُقْتَطَعَ دُونَنَا، وَفَزِعْنَا، فَقُمْنَا، فَكُنْتُ أَوَّلَ مَنْ فَزِعَ، فَخَرَجْتُ أَبْتَغِي رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) حَتَّى أَتَيْتُ حَائِطًا لِلْأَنْصَارِ لِبَنِي النَّجَّارِ، فَدُرْتُ بِهِ هَلْ أَجِدُ لَهُ بَابًا فَلَمْ أَجِدْ، فَإِذَا رَبِيعٌ يَدْخُلُ فِي جَوْفِ حَائِطٍ مِنْ بِئْرٍ خَارِجَةٍ -وَالرَّبِيعُ: الْجَدْوَلُ- فَاحْتَفَزْتُ فَدَخَلْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَقَالَ: ((أَبُو هُرَيْرَةَ)). فَقُلْتُ: نَعَمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: ((مَا شَأْنُكَ)). قُلْتُ: كُنْتَ بَيْنَ أَظْهُرِنَا فَقُمْتَ فَأَبْطَأْتَ عَلَيْنَا، فَخَشِينَا أَنْ تُقْتَطَعَ دُونَنَا، فَفَزِعْنَا، فَكُنْتُ أَوَّلَ مَنْ فَزِعَ، فَأَتَيْتُ هَذَا الْحَائِطَ فَاحْتَفَزْتُ كَمَا يَحْتَفِزُ الثَّعْلَبُ، وَهَؤُلَاءِ النَّاسُ وَرَائِي. فَقَالَ: ((يَا أَبَا هُرَيْرَةَ)). وَأَعْطَانِي نَعْلَيْهِ وَقَالَ: ((اذْهَبْ بِنَعْلَيَّ هَاتَيْنِ، فَمَنْ لَقِيتَ مِنْ وَرَاءِ هَذَا الْحَائِطِ يَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، مُسْتَيْقِنًا بِهَا قَلْبُهُ، فَبَشِّرْهُ بِالْجَنَّةِ)). فَكَانَ أَوَّلَ مَنْ لَقِيتُ عُمَرُ فَقَالَ: مَا هَاتَانِ النَّعْلَانِ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ؟ فَقُلْتُ: هَاتَانِ نَعْلَا رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) بَعَثَنِي بِهِمَا: مَنْ لَقِيتُ يَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ مُسْتَيْقِنًا بِهَا قَلْبُهُ بَشَّرْتُهُ بِالْجَنَّةِ، قَال: فَضَرَبَ عُمَرُ بِيَدِهِ بَيْنَ ثَدْيَيَّ فَخَرَرْتُ لِاسْتِي، فَقَالَ: ارْجِعْ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ، فَرَجَعْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَأَجْهَشْتُ بُكَاءً، وَرَكِبَنِي عُمَرُ فَإِذَا هُوَ عَلَى أَثَرِي، فَقَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((مَا لَكَ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ)). فَقُلْتُ: لَقِيتُ عُمَرَ، فَأَخْبَرْتُهُ بِالَّذِي بَعَثْتَنِي بِهِ، فَضَرَبَ بَيْنَ ثَدْيَيَّ ضَرْبَةً خَرَرْتُ لِاسْتِي، فَقَالَ: ارْجِعْ. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((يَا

عُمَرُ، مَا حَمَلَكَ عَلَى مَا فَعَلْتَ)). قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي، أَبَعَثْتَ أَبَا هُرَيْرَةَ بِنَعْلَيْكَ، مَنْ لَقِيَ يَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ مُسْتَيْقِنًا بِهَا قَلْبُهُ بَشَّرَهُ بِالْجَنَّةِ؟ قَالَ: ((نَعَمْ)). قَالَ: فَلَا تَفْعَلْ، فَإِنِّي أَخْشَى أَنْ يَتَّكِلَ النَّاسُ عَلَيْهَا، فَخَلِّهِمْ يَعْمَلُونَ. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فَخَلِّهِمْ)).

(ابوهریرة)(ﷺ) دەڵێ: ئێمە چەند کەسێك بووین بەدەوری پێغەمبەری خودا(ﷺ) دانیشتبووین، ئەبوبەکرو عومەریشمان لەگەڵدابوو، پێغەمبەر(ﷺ) لەناوماندا هەستاو ڕۆیشت، زۆری پێچوو، ترساین تووشی شتێك بووبێت، خێرا ڕاپەڕین، هەموو هەستاین، من یەکەم کەس بووم کەراپەڕیم، دەرچووم بەدوای پێغەمبەری خوادا(ﷺ) دەگەڕام، هەتا گەیشتم بەدیواری باخێك کەهی ئەنصارەکانی بەنی نەجار بوو، بەدەوریا گەڕام بۆ ئەوەی دەرگاکەی بدۆزمەوە، بەڵام جۆگەلەیەکم بینی لەبیرێکەوە دەردەچوو، لەکونی دیوارێکەوە دەچووە ناو باخەکە. منیش خۆم باریك کردەوە وەکوڕێوی بەکونەکەدا چوومە ژوورەوە بۆلای پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەو خەڵکەش لەدوامەوە بوون فەرمووی: ((ابوهریرة)) وتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، فەرمووی: ((ئەوەچیتە)) وتم: تۆ لەناو ئێمەدا بویت، هەستایت و ڕۆیشتی، زۆردواکەوتی، ئێمەش ترساین تووشی شتێك هاتبی، هەمووومان ڕاپەڕین، منیش یەکەم کەس بووم کەراپەڕیم، هاتم بۆ لای ئەم دیوارەو وەکو ڕێوی خۆم کۆکردەوە بۆناودیوارەکە، خەڵکەکەش وان لە دوامەوە. نەعلەکانی دامێ و فەرمووی ئەی(ابوهریرة): ((ئەم نەعلانەم ببە، هەرکەست بینی لەپشت ئەم دیوارەوە شایەتی بدات کەهیچ خوایەك نییە جگە لە (الله) بەدڵ باوەڕی بەوە هەبێت ئەوە مژدەی بەهەشتی بدەرێ)) منیش یەکەم کەس کەپێی گەیشم عومەر بوو وتی: ئەو نەعلانە چین ئەی(ابوهریرة)؟وتم: ئەمانە نەعلەکانی پێغەمبەری خوایە(ﷺ) بەوانەوە ناردومی، گەیشتم بەهەرکەس کەشایەتی بدات هیچ خوایەك نییە جگە لە(الله) بەدڵ باوەڕی پێی هەبێت، مژدەی بەهەشتی دەدەمێ وتی: عومەر دەستێکی کێشا بەنێوان هەردو مەمکمدا، کەوتم بەدوادا ،ئینجا وتی: ئەی(ابوهریرة)بگەڕێرەوە، منیش گەرامەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) دڵم زۆر پڕبووبوو، خەریك بوو دەگریام، عومەریش دوام کەوت. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((ئەوە چیتە(ابوهریرة))وتم گەیشتم بەعومەر ئەم هەواڵەم دایە

کەبەمندا ناردت، ئەویش کێشای بەنێوان هەردوو مەمکمداو کەوتم بەدوادا ،ئینجا وتی: بگەڕێرەوە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ((ئەی عومەر چی وایلێکردی کەوابکەیت)) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) باوكو دایکم بەقوربانت بێت ئایا(ابوهریرة)ت بەنەعلەکانتەوە ناردبوو، کاتێ گەیشت بەهەرکەسێك کەشایەتی بدات هیچ خوایەك نییە جگە لە(الله)و بەدڵ باوەڕی پێی هەبێت، مژدەی بەهەشتی بداتێ؟ فەرمووی: ((بەڵێ)) عمر وتی: دەوامەکە، چونکە من دەترسم خەڵکی پشت بەوە ببەستن، وازیان لێبێنە باکاربکەن. پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ((وازیان لێبێنە)).

١٣- عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ (ﷺ) قَالَ: كُنْتُ رِدْفَ النَّبِيِّ (ﷺ) لَيْسَ بَيْنِي وَبَيْنَهُ إِلَّا مُؤْخِرَةُ الرَّحْلِ، فَقَالَ: ((يَا مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ)). قُلْتُ: لَبَّيْكَ يا رَسُولَ اللَّهِ وَسَعْدَيْكَ، ثُمَّ سَارَ سَاعَةً ثُمَّ قَالَ: ((يَا مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ)). قُلْتُ: لَبَّيْكَ يا رَسُولَ اللَّهِ وَسَعْدَيْكَ، ثُمَّ سَارَ سَاعَةً، ثُمَّ قَالَ: ((يَا مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ)). قُلْتُ لَبَّيْكَ يا رَسُولَ اللَّهِ وَسَعْدَيْكَ، قَالَ: ((هَلْ تَدْرِي مَا حَقُّ اللَّهِ عَلَى الْعِبَادِ)). قَالَ: قُلْتُ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: ((فَإِنَّ حَقَّ اللَّهِ عَلَى الْعِبَادِ أَنْ يَعْبُدُوهُ وَلَا يُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا)). ثُمَّ سَارَ سَاعَةً، ثم قَالَ: ((يَا مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ)). قُلْتُ: لَبَّيْكَ يا رَسُولَ اللَّهِ وَسَعْدَيْكَ، قَالَ: ((هَلْ تَدْرِي مَا حَقُّ الْعِبَادِ عَلَى اللَّهِ إِذَا فَعَلُوا ذَلِكَ)). قُلْتُ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: ((أَنْ لَا يُعَذِّبَهُمْ)). ﴿* بخاري / الجهاد/ اسم الفرس والحمار/٢٧٠١﴾

(معاذ)کوڕی(جبل)(ﷺ)دەڵێ: من لەپشت پێغەمبەری خواوە(ﷺ) سوار بووبووم، لەنێوان من و ئەودا هیچ نەبوو جگە لەپاڵپشتێ زینەکە، فەرمووی: ((ئەی (معاذ)کوڕی(جبل)) وتم: ئەمر بکە لەخزمەتتام ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ماوەیەکی تر ڕۆیشت دووبارە فەرمووی: ((ئەی(معاذ)کوری (جبل)) وتم: ئەمرکە لەخزمەتتام ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ). ماوەیەکی تریش ڕۆیشتوو فەرمووی: ((ئەی(معاذ)کوڕی(جبل) وتم: ئەمرکە لەخزمەتتام ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ((ئایا دەزانی مافی خوا لەسەر بەندەکانی چییە)). دەڵێ: وتم : خواو پێغەمبەرەکەی(ﷺ) زاناترن، فەرمووی: ((لەراستیدا مافی خوا لەسەر بەندەکانی ئەوەیە کە بیپەرستن و هیچ شتێك نەکەن بەشەریکی)) ماوەیەکی تریش ڕۆیشت، دووبارە فەرمووی: ((ئەی(معاذ)کوڕی- جبل)) وتم: ئەمربکە لەخزمەتتام ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) . فەرمووی: ((ئایا دەزانی مافی بەندەکان

چییه لەسەر خوا ئەگەر وایان کرد)) وتم: خـواو پێغەمبەرەکـەی زاناترن. فەرمووی: (ئەوەیە کە سزایان نەدات)).

١٤ـ عن مَحْمُودُ ابْنُ الرَّبِيع (ﷺ) عَنْ عِتْبَانَ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: قَدِمْتُ الْمَدِينَةَ فَلَقِيتُ عِتْبَانَ، فَقُلْتُ حَدِيثٌ بَلَغَنِي عَنْكَ، قَالَ: أَصَابَنِي فِي بَصَرِي بَعْضُ الشَّيْءِ، فَبَعَثْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ): أَنِّي أُحِبُّ أَنْ تَأْتِيَنِي فَتُصَلِّيَ فِي مَنْزِلِي فَأَتَّخِذَهُ مُصَلًّى. قَالَ: فَأَتَى النَّبِيُّ (ﷺ) وَمَنْ شَاءَ اللَّهُ مِنْ أَصْحَابِهِ، فَدَخَلَ، وَهُوَ يُصَلِّي فِي مَنْزِلِي، وَأَصْحَابُهُ يَتَحَدَّثُونَ بَيْنَهُمْ، ثُمَّ أَسْنَدُوا عُظْمَ ذَلِكَ وَكِبْرَهُ إِلَى مَالِكِ بْنِ دُخْشُمٍ، قَالُوا: وَدُّوا أَنَّهُ دَعَا عَلَيْهِ فَهَلَكَ، وَوَدُّوا أَنَّهُ أَصَابَهُ شَرٌّ. فَقَضَى رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) الصَّلَاةَ، وَقَالَ: ((أَلَيْسَ يَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ)). قَالُوا: إِنَّهُ يَقُولُ ذَلِكَ، وَمَا هُوَ فِي قَلْبِهِ. قَالَ: ((لَا يَشْهَدُ أَحَدٌ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ فَيَدْخُلَ النَّارَ أَوْ تَطْعَمَهُ)) قَالَ أَنَسٌ: فَأَعْجَبَنِي هَذَا الْحَدِيثُ، فَقُلْتُ لِابْنِي: اكْتُبْهُ، فَكَتَبَهُ.

لە(محمود)کوڕی(ربیع)ەوە(ﷺ)لە(عتبان)کوڕی(مالك)ەوە(ﷺ)بۆمان دەگێڕێتەوە دەڵێ: هاتم بۆ مەدینە، گەیشتم بە(عتبان) وتم: فەرموودەیەکم لەتۆوە پێگەیشتووە. وتی: چاوم تووشی شتێك بوو بوو، منیش ناردم بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ): کە من پێم خۆشە سەردانم بکەیت‌و، لەماڵی ئێمە نوێژ بکەیت، بۆئەوەی بیکەم بەجێ‌نوێژ. دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ)لەگەڵ چەند کەسێك لەهاوەڵان هات‌و چووە ژوورەوەو، دەستی کرد بەنوێژکردن، هاوەڵانی لەناوخۆیاندا قسەیان دەکرد، زۆربەی باسەکەیان لەسەر(مالك) کوڕی (دخشم) بوو، وتیان: خۆزگە دەخوازین کە پێغەمبەر(ﷺ) دۆعای لێبکات‌و تیابچێت، خۆزگەشیان دەخواست تووشی شتێك ببێت. پێغەمبەر(ﷺ) لەنوێژەکەی بوویەوە، فەرمووی: ((ئایا شایەتی نەدەدا کە هیچ خوایەك نییە جگە لە(الله)و منیش ڕەوانەکراوی ئەوم)) وتیان: ئەو وادەڵێت، بەڵام لەدڵیەوە نایەت فەرمووی: ((کەس نییە شایەتی بدات کە جگە لە(الله) هیچ خوایەك نییەو، منیش پێغەمبەری خوام، بچێتە ئاگرەوە یان بیچەژێت)).

ئەنەس وتی: زۆر دڵخۆش بووم بەو فەرموودەیەو بەکوڕەکەمم وت: بینووسە، ئەویش نووسی.

## (٥) ئیمان چیە؟ ڕوونکردنەوەی نیشانەکانی

١٥- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (ﷺ): أَنَّ أُنَاسًا مِنْ عَبْدِ الْقَيْسِ قَدِمُوا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالُوا: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، إِنَّا حَيٌّ مِنْ رَبِيعَةَ، وَبَيْنَنَا وَبَيْنَكَ كُفَّارُ مُضَرَ، وَلَا نَقْدِرُ عَلَيْكَ إِلَّا فِي أَشْهُرِ الْحُرُمِ، فَمُرْنَا بِأَمْرٍ نَأْمُرُ بِهِ مَنْ وَرَاءَنَا، وَنَدْخُلُ بِهِ الْجَنَّةَ إِذَا نَحْنُ أَخَذْنَا بِهِ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((آمُرُكُمْ بِأَرْبَعٍ، وَأَنْهَاكُمْ عَنْ أَرْبَعٍ: اعْبُدُوا اللَّهَ وَلَا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا، وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ، وَآتُوا الزَّكَاةَ، وَصُومُوا رَمَضَانَ، وَأَعْطُوا الْخُمُسَ مِنَ الْغَنَائِمِ. وَأَنْهَاكُمْ عَنْ أَرْبَعٍ: عَنِ الدُّبَّاءِ وَالْحَنْتَمِ وَالْمُزَفَّتِ وَالنَّقِيرِ)). قَالُوا: يَا نَبِيَّ اللَّهِ مَا عِلْمُكَ بِالنَّقِيرِ؟ قَالَ: ((بَلَى، جِذْعٌ تَنْقُرُونَهُ فَتَقْذِفُونَ فِيهِ مِنَ الْقُطَيْعَاءِ -قَالَ سَعِيدٌ: أَوْ قَالَ: مِنَ التَّمْرِ- ثُمَّ تَصُبُّونَ فِيهِ مِنَ الْمَاءِ حَتَّى إِذَا سَكَنَ غَلَيَانُهُ شَرِبْتُمُوهُ، حَتَّى إِنَّ أَحَدَكُمْ -أَوْ: إِنَّ أَحَدَهُمْ- لَيَضْرِبُ ابْنَ عَمِّهِ بِالسَّيْفِ)). قَالَ: وَفِي الْقَوْمِ رَجُلٌ أَصَابَتْهُ جِرَاحَةٌ كَذَلِكَ، قَالَ: وَكُنْتُ أَخْبَؤُهَا حَيَاءً مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَقُلْتُ: فَفِيمَ نَشْرَبُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: ((فِي أَسْقِيَةِ الْأَدَمِ الَّتِي يُلَاثُ عَلَى أَفْوَاهِهَا)). قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ أَرْضَنَا كَثِيرَةُ الْجِرْذَانِ، وَلَا تَبْقَى بِهَا أَسْقِيَةُ الْأَدَمِ. فَقَالَ نَبِيُّ اللَّهِ (ﷺ): ((وَإِنْ أَكَلَتْهَا الْجِرْذَانُ، وَإِنْ أَكَلَتْهَا الْجِرْذَانُ، وَإِنْ أَكَلَتْهَا الْجِرْذَانُ)). قَالَ: وَقَالَ نَبِيُّ اللَّهِ (ﷺ) لِأَشَجِّ عَبْدِ الْقَيْسِ: ((إِنَّ فِيكَ لَخَصْلَتَيْنِ يُحِبُّهُمَا اللَّهُ: الْحِلْمُ وَالْأَنَاةُ)).

(ابو سعیدی الخدری)(ﷺ) دەڵێ: کەسانێك لە(عبدالقیس) هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئێمە ئاواییەکین لەرەبیعە، لەنێوان ئێمەو تۆدا کافرەکانی(مُضَر)هەن، ناتوانین سەردانت بکەین لەمانگە ڕێزگیراوەکاندا[٢] نەبێ، فەرمانمان پێ بکە بەفەرمانێك ،ئێمەش فەرمان بکەین بەوانەی لای خۆمان پێیشی بچینە بەهەشت ئەگەر ئێمە بەوکارە هەستاین. پێغەمبەری‌خوا(ﷺ) فەرمووی: ((فەرمانتان پێدەکەم بەچوارشت، چوارشتیشتان لێ‌قەدەغە دەکەم: خواپەرستن و هاوەڵی بۆدامەنێن، نوێژ بکەن، زەکات بدەن، ڕۆژووی ڕەمەزان بگرن، پێنجیەکی دەستکەوتیش بدەن. چوارشتیشتان لێ قەدەغە دەکەم: خواردنەوەی سرکەی ناو کولەکە، هی‌ناو

[٢] عەرەب ڕێزیان لە چەند مانگێك گرتووە جەنگیان تێدا ئەنجام نەداوە پێیان دەوترێ (الاشهر الحرم).

گۆزەی سەوز (ئەوەی ئارەقیان تێدا هەڵگرتووە)، هـی ناو(قیردراو)﴿کاسـەیەکە ناوەکـەی قیردراوە﴾هـی نـاو داری هـەڵکۆڵراو ﴿کاسـەیەکە کەقـەدی درەختـەو ناوەکـەی هـەڵکۆڵراوە﴾، وتیـان: ئـەی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) تۆچوزانـی داری هـەڵکۆڵراو چی‌یە؟ فەرمووی: ((بـەڵێ ئـەزانم ،قـەدی درەختێکـە هـەڵی دەکۆڵـن پارچـە خورمـای وردی تێدەکـەن . سعید وتـی: یـان فـەرمووی: خورمـا . ئینجـا ئـاوی تێدەکـەن، کـاتێ هـەڵچوونی نـامێنێ دەیخۆنـەوە: هـەتا یـەکێکتان . یـا یـەکێکیان . لـەئامۆزای خـۆی دەدات بەشمشێر﴿واتـە سەرخۆش دەبن ﴾دەڵـێ: لەوکۆمەڵەدا پیاوێك هەبوو بەوشێوەیە بریندارکرابوو، دەڵـێ: من دەمشـاردەوە شـەرمم دەکـرد لەپێغەمبـەری خـوا(ﷺ) وتم: ئـەی لـەچیدا بخۆینـەوە ئـەی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ)؟ فـەرمووی: ((لەکونـەی چـەرمدا کـە دەمەکـەی بەپـەت دەبەستری) وتیان ئەی پێغەمبەری‌خوا(ﷺ) : زەوی ئێمە جرجـی زۆر تێدایـە، کونـە نامێنێتـەوە، پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمووی: ((بامشـکیش بیخـوات، بامشـکیش بیخـوات، بامشـکیش بیخـوات)) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) ڕووی‌کـردە) (اشـج عبدالقیـس)و فـەرمووی: ((تـۆ دوو سـیفەتت تێدایـە خـوا خۆشـیانی دەوێ، ژیریی‌و پەلەنەکردن‌و لەسەرخۆیی)).

١٦ـ عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رضي الله عنه) قَالَ: قُلْتُ يَـا رَسُولَ اللَّـهِ: أَيُّ الْأَعْمَـالِ أَفْضَـلُ؟ قَـالَ: ((الْإِيمَـانُ بِاللَّـهِ وَالْجِهَادُ فِـي سَبِيلِهِ)). قَـالَ: قُلْـتُ: أَيُّ الرِّقَـابِ أَفْضَـلُ؟ قَـالَ: ((أَنْفَسُهَا عِنْدَ أَهْلِهَا وَأَكْثَرُهَا ثَمَنًا)). قَالَ: قُلْتُ: فَإِنْ لَمْ أَفْعَلْ؟ قَالَ: ((تُعِينُ صَانِعًا أَوْ تَصْنَعُ لِأَخْرَقَ)). قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ إِنْ ضَعُفْتُ عَنْ بَعْضِ الْعَمَلِ؟ قَالَ: ((تَكُفُّ شَرَّكَ عَنِ النَّاسِ، فَإِنَّهَا صَدَقَةٌ مِنْكَ عَلَى نَفْسِكَ)). [بخاري/ العتق/ اي الرقاب افضل / ٢٣٨٢]

(ابي ذر)(رضي الله عنه) دەڵـێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) : چاکترین کار کامەیە ؟ فەرمووی: ((باوەڕ بەخواو جیهاد لـەپێناویدا)) دەڵـێ: وتم: چاکترین ئازادکردن کامەیـە[ئـازادکردنی کۆیلـە] فـەرمووی: (گرانترینیـان‌و بەبـەهاترینیان لای خاوەنەکەیان) دەڵـێ: وتم: ئەگـەر نـەمکرد؟ فـەرمووی: ((یارمـەتی پیشـەکارێك بدەیت یایارمەتی کەسێك بدەیت پیشە باش نازانێ یا هیچ پیشەیەکی نییە)).

دەڵـێ: وتم: ئەی پێغەمبـەری خـوا پێت چۆنـە ئەگـەر بێ‌توانابووم لەهـەندێ کـار؟ فـەرمووی: ((شـەڕو خراپـەت لەخەڵکی لابـدە، ئـەوەش خێرێکـە لـەتۆوە بـۆ خۆت))

## ( ٦ ) فەرمانکردن بەئیمان ، پەناگرتن بەخوا لەوەسوەسەی شەیتان

١٧ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((لا يَزالُ النَّاسُ يَسْأَلُونَكُمْ عَنِ الْعِلْمِ حَتَّى يَقُولوا: هَذا اللَّهُ خَلَقَنا، فَمَنْ خَلَقَ اللَّهَ)). قالَ: وَهُوَ آخِذٌ بِيَدِ رَجُلٍ، فَقَالَ: صَدَقَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ، قَدْ سَأَلَنِي اثْنَانِ وَهَذَا الثَّالِثُ. أَوْ قَالَ: سَأَلَنِي وَاحِدٌ، وَهَذَا الثَّانِي. [بخاري/ اقتران النيرين ج٥ ص٢٨٣]

(ابوهريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ((بەردەوام خەڵك پرسیارتان لێدەکەن لەبارەی زانستەوە تەنانەت دەڵێن: ئەوە خوا ئێمەی دروست کردووە، ئەی کێ خوای دروست کردووە، (ابوهريرة)دەستی پیاوێکی گرتبوو، ئینجا وتی: خواو پێغەمبەرەکەی راستیان فەرمووە، دووکەس ئەم پرسیارەیان لێکردووم ئەمەش سێیەمە ، یان وتی: یەکێك لێی پرسیم ئەمەش دووەمە..

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((لَا يَزَالُونَ يَسْأَلُونَكَ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ حَتَّى يَقُولُوا: هَذَا اللَّهُ، فَمَنْ خَلَقَ اللَّهَ)). قَالَ: فَبَيْنَا أَنَا فِي الْمَسْجِدِ إِذْ جَاءَنِي نَاسٌ مِنَ الْأَعْرَابِ، فَقَالُوا: يَا أَبَا هُرَيْرَةَ، هَذَا اللَّهُ خَلَقَنَا، فَمَنْ خَلَقَ اللَّهَ؟ قَالَ: فَأَخَذَ حَصًى بِكَفِّهِ فَرَمَاهُمْ بِهِ، ثُمَّ قَالَ: قُومُوا قُومُوا، صَدَقَ خَلِيلِي (ﷺ).

ـ (ابوهریرە)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ((بەردەوام پرسیارت لێ دەکەن ئەی(ابوهريرة)هەتا دەڵێن: (ئەوە خوایە، باشە کێ خوای دروست کردووە)). وتی: لەکاتێکا من لەمزگەوت بووم چەند ئەعرابییەك هاتن بۆلام وتیان : ئەی (اباهریرە)، ئەوە خوا ئێمەی دروست کردووە، ئەی کێ خوای دروست کردووە؟ وتی: چنگی پڕکرد لەچەوو تێی گرتن، ئینجا وتی: هەستن، هەستن [ بڕۆن ] خۆشەویستەکەم(ﷺ) راستی فەرمووە.

## ( ٧ ) لەبارەی ئیمان بەخواو بەردەوامی

١٨ـ عَنْ سُفْيَانَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الثَّقَفِيِّ (ﷺ) قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، قُلْ لِي فِي الْإِسْلَامِ قَوْلًا لَا أَسْأَلُ عَنْهُ أَحَدًا بَعْدَكَ. وَفِي حَدِيثِ أَبِي أُسَامَةَ: غَيْرَكَ. قَالَ: ((قُلْ: آمَنْتُ بِاللَّهِ، فَاسْتَقِمْ)).

(سفیان)کوڕی( عبدالله الثقفي)(ﷺ)دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) شتێکم پێ بڵێ لەبارەی ئیسلامەوە کە دوای تۆ لەکەس نەپرسم . فەرمووی: ((بڵێ باوەڕم هێناوە بەخوا ئینجا رێگای راست بگرەو بەردەوام بە لەسەری)).

## (٨) بەڵگەكانی پێغەمبەرو(ﷺ) باوەڕهێنان پێی

١٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) قَالَ: ((مَا مِنَ الْأَنْبِيَاءِ مِنْ نَبِيٍّ إِلَّا قَدْ أُعْطِيَ مِنَ الْآيَاتِ مَا مِثْلُهُ آمَنَ عَلَيْهِ الْبَشَرُ، وَإِنَّمَا كَانَ الَّذِي أُوتِيتُ وَحْيًا أَوْحَى اللَّهُ إِلَيَّ، فَأَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَكْثَرَهُمْ تَابِعًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ)). [بخاري / فضائل القران/ كيف نزل الوحي /٤٦٩٦]

(ابوهريره)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (( لەپێغەمبەراندا هیچ پێغەمبەرێكیان نەبووە كە بەڵگەو سەراسیمەی وای پێنەبەخشرابێت كەوێنەی ئەوە خەڵك ئیمانی پێهێناوە ئەوەی منیش هێناومە(وحی)یە خوا ناردویەتە سەرم، خوازیارم لەهەموویان شوێن كەوتەم زیاتر بێت)).

٢٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ)، عَنْ رَسُولِ اللَّه (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: ((وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، لَا يَسْمَعُ بِي أَحَدٌ مِنْ هَذِهِ الْأُمَّةِ، يَهُودِيٌّ، وَلَا نَصْرَانِيٌّ، ثُمَّ يَمُوتُ وَلَمْ يُؤْمِنْ بِالَّذِي أُرْسِلْتُ بِهِ، إِلَّا كَانَ مِنْ أَصْحَابِ النَّارِ)).

(ابوهريره)(ﷺ)دەڵێ: پێغەمبەر( فەرموویەتی: ((سوێند بەوەی گیانی موحەمەدی بەدەستە، كەسێك نییە لەم خەڵكەدا باجولەكەو گاوریش بن كەناوی منی بیستبێ‌و بمرێ‌و باوەڕی بەوەنەبێت كەبەمندا نێردراوە ئەوە دەبێ ببێ بەنیشتەجێی دۆزەخ)).

٢١- عَنْ صَالِحِ بْنِ صَالِحٍ الْهَمْدَانِيِّ، عَنِ الشَّعْبِيِّ قَالَ: رَأَيْتُ رَجُلًا مِنْ أَهْلِ خُرَاسَانَ، سَأَلَ الشَّعْبِيَّ فَقَالَ: يَا أَبَا عَمْرٍو، إِنَّ مَنْ قِبَلَنَا مِنْ أَهْلِ خُرَاسَانَ يَقُولُونَ فِي الرَّجُلِ إِذَا أَعْتَقَ أَمَتَهُ ثُمَّ تَزَوَّجَهَا: فَهُوَ كَالرَّاكِبِ بَدَنَتَهُ. فَقَالَ الشَّعْبِيُّ: حَدَّثَنِي أَبُو بُرْدَةَ بْنُ أَبِي مُوسَى عَنْ أَبِيهِ: أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) قَالَ: ((ثَلَاثَةٌ يُؤْتَوْنَ أَجْرَهُمْ مَرَّتَيْنِ: رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ آمَنَ بِنَبِيِّهِ وَأَدْرَكَ النَّبِيَّ (ﷺ)، فَآمَنَ بِهِ وَاتَّبَعَهُ وَصَدَّقَهُ، فَلَهُ أَجْرَانِ. وَعَبْدٌ مَمْلُوكٌ أَدَّى حَقَّ اللَّه تَعَالَى، وَحَقَّ سَيِّدِهِ، فَلَهُ أَجْرَانِ. وَرَجُلٌ كَانَتْ لَهُ أَمَةٌ فَغَذَّاهَا فَأَحْسَنَ غِذَاءَهَا، ثُمَّ أَدَّبَهَا فَأَحْسَنَ أَدَبَهَا، ثُمَّ أَعْتَقَهَا وَتَزَوَّجَهَا، فَلَهُ أَجْرَانِ)). ثُمَّ قَالَ الشَّعْبِيُّ لِلْخُرَاسَانِيِّ: خُذْ هَذَا الْحَدِيثَ بِغَيْرِ شَيْءٍ، فَقَدْ كَانَ الرَّجُلُ يَرْحَلُ فِيمَا دُونَ هَذَا إِلَى الْمَدِينَةِ. ﴿بخاري / تعليم الرجل امته واهله/٩٧﴾

(صالح بن صالح الهمدانی) دەڵێ: (شعبی) دەڵێ: پیاوێكی خەڵكی خۆراسانم دی، پرسیاری لە(شعبی) كردوو وتی: ئەی(ابوعمرو) خەڵكی

خۆراسانی لای ئێمە هەندێکیان دەڵێن: ئەو پیاوەی کەنیزەکەکەی خۆی ئازاد بکات و پاشان خۆی مارەی بکات، وەکو ئەوە وایە کەوشترێك بکات بەخێرو بەلام خۆی سواری ببێت ئینجا(شعبی)وتی: (ابوبردە)کوری (ابوموسی) لەزاری باوکیەوە بۆی گێرامەوە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (( سێ کەس دووجار پاداشت دەدرێنەوە: پیاوێکی(ئەهلی کیتاب) باوەڕی بەپێغەمبەرەکەی هێنابێ و گەیشتبێت بەپێغەمبەری ئیسلامیش(ﷺ) باوەڕی بەویش هێنابێت و شوێنی کەوتبێ و بەراستی زانیبێت دووپاداشتی هەیە. دووەمیش کۆیلەیەك مافی خوای گەورەی ئەنجام دابێت لەگەڵ مافی خاوەنەکەی، ئەمیش دووپاداشتی هەیە، سێیەمیش پیاوێك کەنیزەکێکی هەبووبێت و بەباشی ژیاندبێتی ئینجا بەباشی پەروەردەی کردبێت، دوای ئەوە ئازادی کردبێت و مارەی کردبێت[1]، ئەمیش دووپاداشتی هەیە. ئینجا (شعبی) بەکابرای خۆراسانی وت: پیاوی وا هەبووە بۆ کەمتر لەم فەرموودەیەش لێرەوە چووە بۆ مەدینە.

## (٩) سێ شت هەن لە هەرکەسدا هەبن شیرینی ئیمان دەچەژێت

٢٢ـ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ)، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((ثَلَاثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ وَجَدَ بِهِنَّ حَلَاوَةَ الْإِيمَانِ: مَنْ كَانَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِمَّا سِوَاهُمَا، وَأَنْ يُحِبَّ الْمَرْءَ لَا يُحِبُّهُ إِلَّا لِلَّهِ، وَأَنْ يَكْرَهَ أَنْ يَعُودَ فِي الْكُفْرِ -بَعْدَ أَنْ أَنْقَذَهُ اللَّهُ مِنْهُ- كَمَا يَكْرَهُ أَنْ يُقْذَفَ فِي النَّارِ)). [بخاري / الايمان / حلاوة الايمان/ ١٦، ٢١]

(انس)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: ((سێ شت هەن هەر کەس تێیدابێت بەوسیانە شیرینی ئیمان بەدەست دەهێنێ، هەرکەس خواو پێغەمبەر(ﷺ)ی لەهەمووشت خۆشتر بووێت، هەروەها کەسێکی خۆشویست تەنها لەبەرخوا خۆشی بووێت، ئینجا پێی ناخۆش بێت بگەڕێتەوە بۆ کوفر ـ دوای ئەوەی خوا رزگاری کرد لێی ـ وەکو چۆن پێی ناخۆشە فڕێ بدرێتە ئاگرەوە)).

[1] لەو سەردەمەدا کەنیزەك باوبووە. بۆیە ئیسلام بەهەموو شێوەیەك هەوڵ ی نەهێشتنی داوەو . بێگومان کەئازادکراو کەسی نەبوو بەخێوی بکات ئەگەر خۆی مارەیبکات ئەوا کارێکی زۆر باشی کردووە لەبەرژەوەندی ئەو.

٢٣ـعَنْ أَنَسِ ابْنِ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((لا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ وَلَدِهِ وَوَالِدِهِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ)).

(انس)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: ( کەستان باوەڕی دامەزراوی نییە هەتا منی لەمنداڵەکانیو لەباوكو دایكیو لەهەموو خەڵكیش خۆشتر نەوێت).

٢٤ـعَنْ أَنَسٍ (ﷺ)، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لا يُؤْمِنُ عَبْدٌ حَتَّى يُحِبَّ لِجَارِهِ -أَوْ قَالَ: لأَخِيهِ- مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ)).

(انس)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: ((سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، هیچ بەندەیەك ئیمانی نابێت هەتا ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ دراوسێکەی. یافەرمووی بۆ براکەی پێی خۆش نەبێت)).واتە: (ئیمانی تەواو نیە).

## (١٠) ئەوکەسەی قایل بێت بە پەروەردگارێتی خوا تامی باوەڕی چەشتووە

٢٥ـ عَنِ الْعَبَّاس بْنِ عبْدِ الْمُطَّلِبِ (ﷺ): أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) يقُولُ: ((ذَاقَ طَعْمَ الْإِيمَانِ مَنْ رَضِيَ بِاللَّهِ رَبًّا، وَبِالْإِسْلَامِ دِينًا، وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولًا)).

(عباس) کوڕی(عبدالمطلب)(ﷺ)دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ((تامی باوەڕی چەشتووە؛ ئەو کەسەی ڕازی بێت بەوەی کە خوا پەروەردگاری بێت، ئیسلام ئاینی بێت، محەمەد پێغەمبەری بێت)).

## (١١) چوارشت هەن لەهەرکەسدا هەبن ئەوە مونافیقی تەواوە

٢٦ـعَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): ((أَرْبَعٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ كَانَ مُنَافِقًا خَالِصًا، وَمَنْ كَانَتْ فِيهِ خَلَّةٌ مِنْهُنَّ كانتْ فيه خلَّةٌ مِنْ نفاقٍ حتَّى يَدَعَهَا: إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وَإِذَا عَاهَدَ غَدَرَ، وإذا وعَدَ أَخْلَفَ، وإذا خاصم فجر)). غَيْرَ أَنَّ فِي حَدِيثِ سُفْيَانَ: ((وَإِنْ كَانَتْ فِيهِ خَصْلَةٌ مِنْهُنَّ كَانَتْ فِيهِ خَصْلَةٌ مِنَ النِّفَاقِ)). [بخاري/ الايمان/ علامة المنافق/٣٤]

(عبدالله) کوڕی( عمرو)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: ((چوارشت هەرکەس تیایدابێت ئەوە مونافیقی تەواوە، هەرکەسیش یەکێکیانی تێدابێت ئەوە سیفەتێکی مونافیقی تێدایە، هەتا دەستی لێهەڵدەگرێت، هەرکات قسەی کرد درۆ بکات، هەرکات پەیمانیدا بیشکێنێت ئەگەر بەڵێنیدا

سەرپێچی لێبکات، ئەگەر دژایەتی کەسێکی کرد لەهەق لابدات و ستەمی لێبکات)).

٢٧ـعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((آيَةُ الْمُنَافِقِ ثَلَاثٌ: إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ، وَإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ)). [بخاري/ الايمان/ علامة المنافق/٣٣]

(ابوهريره)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: ((نیشانەی مونافیق سیانە: ئەگەر قسەی کرد درۆ بکات، ئەگەر بەڵێنیدا نەیباتە سەر، ئەگەر سپاردەی لادانرا خیانەتی لێبکات)).

## (١٢) نموونەی ئیماندار وەکو کشتوکاڵ و نمونەی مونافیق و کافریش وەکو سنەوبەر وایە

٢٨ـعن كَعْبِ بْنِ مالِكٍ (ﷺ) قالَ: قال رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((مثَلُ الْمُؤْمِنِ كَمَثَلِ الْخامَةِ مِنَ الزَّرْعِ تُفَيِئُهَا الرِّيحُ، تصْرَعُهَا مرَّةً وَتعْدلُهَا أُخْرَى حَتَّى تَهيجَ. وَمَثَلُ الْكَافِرِ كَمَثَلِ الْأَرْزَةِ الْمُجْذِيَةِ عَلى أَصْلِهَا، لَا يُفِيئُهَا شَيْءٌ حَتَّى يَكُونَ انْجِعَافُهَا مَرَّةً وَاحِدةً)). وفي الرواية: ((وتعدلُها مرةً، حتى يأتيهُ أجلهُ، و مَثَلُ المنافق الأرزَةِ المجذيةِ التي لا يصيبُها شيءٌ)). [بخاري/ المرضى/ ماجاء في كفارة المرض/٥٣١٩]

(كعب)كوری(مالك)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ((نموونەی ئیماندار وەکو رووەکێکی تەڕی تازە رووا وایە، بادەیلەرزێنێ، بەملاو بەولادا لاری دەکاتەوە، جارێك زۆر لاری دەکاتەوە، جارێکیش بەرزی دەکاتەوە، هەتا وشك دەبێت. نمونەی کافریش وەکو سنەوبەرێك وایە لەسەر قەدەکەی راوەستاوە، هیچ شتێك نایجوڵێنی هەتا هەڵکەندنی بەیەکجاری)) لەریوایەتێکیشدا ((جارێکیش راستی دەکاتەوە، هەتا کۆتایی ژیانی دێت، نمونەی مونافقیش وەکو سنەوبەرێکی پتەو وایە هیچ شتێکی تووش نابێت)) [واتە: مونافیق تووشی دەردو بەڵای دونیایی نابێت تاببێتە کەفارەتی گوناهی].

## (١٣) نموونەی موسڵمان نمونەی دارخورمایە

٢٩ـعَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ) قَالَ: كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالَ: ((أَخْبِرُونِي بِشَجَرَةٍ شِبْهِ -أَوْ: كَالرَّجُلِ- الْمُسْلِمِ، لَا يَتَحَاتُّ وَرَقُهَا، تُؤْتِي أُكُلَهَا كُلَّ حِينٍ)). قَالَ ابْنُ

عُمَرَ: فَوَقَعَ فِي نَفْسِي أَنَّهَا النَّخْلَةُ، وَرَأَيْتُ أَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ لَا يَتَكَلَّمَانِ، فَكَرِهْتُ أَنْ أَتَكَلَّمَ أَوْ أَقُولَ شَيْئًا، فَقَالَ عُمَرُ: لَأَنْ تَكُونَ قُلْتَهَا أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ كَذَا وَكَذَا. ﴿بخاري/ العلم / قول المحدث حدثنا /٦١﴾

(عبدالله) كوڕی(عمر)(ﷺ) دەڵێ: لەخزمەت پێغەمبەری خوادا(ﷺ) بووین فەرمووی: ((ئاگادارم بكەن لەدرەختێك وێنەی موسڵمان بێت یا : وەكوپیاوێكی موسڵمان، كە گەڵاكانی ناوەرێت و هەموو كاتێك بەری خۆی دەدات)).

(ابن عمر) وتی: هات بەدڵما ئەوە دارخورمایە، (عمر)و(ابوبكر)م بینی قسەیان نەدەكرد، منیش پێم ناخۆش بوو قسەبكەم یاشتێك بڵێم عومەر وتی: ئەگەر بتوتایا ئەوەندەو ئەوەندەم لەلاخۆشتربوو.

## (١٤) شەرم كردن بەشێكە لەئیمان

٣٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((الْإِيمَانُ بِضْعٌ وَسَبْعُونَ –أَوْ: بِضْعٌ وَسِتُّونَ– شُعْبَةً، فَأَفْضَلُهَا قَوْلُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَدْنَاهَا إِمَاطَةُ الْأَذَى عَنِ الطَّرِيقِ، وَالْحَيَاءُ شُعْبَةٌ مِنَ الْإِيمَانِ)). [بخاري/ الايمان/ امور الايمان/٩]

(ابوهريره)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: ((ئیمان حەفتاو ئەوەندە ـ یا شەست و ئەوەندە ـ بەشە ، گەورەترینیان وتنی شایەتومانە، بچووكترینیان لابردنی كۆسپێكە لەسەر رێگایەك، شەرم و حەیا بەشێكە لەئیمان)).

٣١- عن أَبي قَتَادَةَ (ﷺ) قَالَ: كُنَّا عِنْدَ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ فِي رَهْطٍ، مِنَّا وَفِينَا بُشَيْرُ بْنُ كَعْبٍ، فَحَدَّثَنَا عِمْرَانُ يَوْمَئِذٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((الْحَيَاءُ خَيْرٌ كُلُّهُ. أَوْ قَالَ: الْحَيَاءُ كُلُّهُ خَيْرٌ)). فَقَالَ بُشَيْرُ بْنُ كَعْبٍ: إِنَّا لَنَجِدُ فِي بَعْضِ الْكُتُبِ –أَوِ الْحِكْمَةِ– أَنَّ مِنْهُ سَكِينَةً وَوَقَارًا لِلَّهِ تعالى، وَمِنْهُ ضَعْفٌ. قال: فَغَضِبَ عِمْرَانُ حَتَّى احْمَرَّتَا عَيْنَاهُ، وَقَالَ: أَلَا أَرَانِي أُحَدِّثُكَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) وَتُعَارِضُ فِيهِ؟ قَالَ: فَأَعَادَ عِمْرَانُ الْحَدِيثَ، قَالَ: فَأَعَادَ بُشَيْرٌ، فَغَضِبَ عِمْرَانُ، فَمَا زِلْنَا نَقُولُ: إِنَّهُ مِنَّا يَا أَبَا نُجَيْدٍ، إِنَّهُ لَا بَأْسَ بِهِ. ﴿بخاري/ الادب/ المياه/٥٧٦٦﴾

(ابو قتادة)(ﷺ) دەڵێ: ئێمە كۆمەڵێك لای(عمران)كوڕی( حُصين)بووین، (بشير)كوڕی( كعب) یشمان لەناودابوو، •عمران)قسەی بۆكردین و وتی: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: ((شەرم و حەیا خێرە هەمووی)) یا فەرمووی: (شەرم و حەیا هەمووی خێرە) ئینجا (بشير)كوڕی (كەعب)وتی: ئێمە

لەهەندێ کتێبدا یاحیکمەتدا. دەبینین، شەرم بەشێکی ئارامیو لەسەرخۆییەو ڕێزگرتنە لەخوای گەورە، هەندێکیشی لاوازییە، دەڵێ: عمران توورەبوو هەتا چاوەکانی سووڕهەڵگەران وتی: ئایا نابینیمن لە پێغەمبەری خواوە بۆت دەگێڕمەوە کەچی تۆ نارەزایی تیادەردەبڕێت؟ دەڵێ: (عمران) فەرموودەکەی دووبارەکردەوە، وتی: (بشیر)یش قسەکەی خۆی دووبارەکردەوە، ئینجا (عمران) توورە بوو، ئێمەش بەبەردەوامی دەمانوت: ئەی(ابو نجید) ئەویش لەئێمەیەو پیاوێکی خراپ نییە.

## (١٥) دراوسێتی چاك و ڕێزی میوان بەشێکە لەباوەڕە

٣٢- عَنْ أَبِي شُرَيْحٍ الْخُزَاعِيِّ (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: ((مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيُحْسِنْ إِلَى جَارِهِ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْرًا أَوْ لِيَسْكُتْ)). ﴿بخاري/ الادب/ من كان يؤمن بالله واليوم الاخر / ٥٦٧٣﴾

(ابو شريح الخزاعی) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: ((هەرکەس باوەڕی بەخواو ڕۆژی دوایی هەیە، با چاك بێت لەگەڵ دراوسێکەی، هەرکەس باوەڕی بەخواو ڕۆژی دوایی هەیە بارێز لە میوانەکەی بگرێت، هەرکەس باوەڕی بەخواو بەرۆژی دوایی هەیە با چاك بڵێت یان بێدەنگ بێت)).

## (١٦) هەرکەس دراوسێکەی لەشەڕو خراپەی ئەمین نەبێت ناچێتە بەهەشت

٣٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مَنْ لَا يَأْمَنُ جَارُهُ بَوَائِقَهُ)). [بخاري/ الادب/ اثم من لامن جاره /٥٦٧٠]

(ابوهريره)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((ناچێتە بەهەشت ئەوەی دراوسێکەی لەشەڕو خراپەی ئەمین نەبێت)).

## (١٧) گۆڕینی خراپە بەدەست و بەزمان و بەدڵ بەشێکە لەئیمان

٣٤- عَنْ طَارِقِ بْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَوَّلُ مَنْ بَدَأَ بِالْخُطْبَةِ يَوْمَ الْعِيدِ قَبْلَ الصَّلَاةِ مَرْوَانُ، فَقَامَ إِلَيْهِ رَجُلٌ فَقَالَ: الصَّلَاةُ قَبْلَ الْخُطْبَةِ. فَقَالَ: قَدْ تُرِكَ مَا هُنَالِكَ، فَقَالَ أَبُو سَعِيدٍ: أَمَّا هَذَا فَقَدْ قَضَى مَا عَلَيْهِ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((مَنْ رَأَى مِنْكُمْ مُنْكَرًا فَلْيُغَيِّرْهُ بِيَدِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِلِسَانِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِقَلْبِهِ، وَذَلِكَ أَضْعَفُ الْإِيمَانِ)).

(طارق)کوری(شهاب) دەڵێ: یەکەم کەس لەرۆژی جەژنا لەپێش نوێژدا دەستی کرد بە وتار خوێندنەوە مەروان بوو، پیاوێك هەستاو وتی: نوێژ لەپێش وتارەوەیە، وتی: ئەو سوننەتە وازی لێهێنراوە ( ابو سعید) وتی: بەلاّم ئەم پیاوە ئەوەی لەسەری بوو گەیاندی بیستوومە لەپێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: ((هەرکەس لەئێوە خراپەیەکی دی بابەدەست بیگۆڕێت ئەگەر نەیتوانی بەزمانی، ئەگەر نەیتوانی بەدڵی، ئەوەش لاوازترین ئیمانە)).

٣٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((مَا مِنْ نَبِيٍّ بَعَثَهُ اللَّهُ فِي أُمَّةٍ قَبْلِي إِلَّا كَانَ لَهُ مِنْ أُمَّتِهِ حَوَارِيُّونَ وَأَصْحَابٌ، يَأْخُذُونَ بِسُنَّتِهِ وَيَقْتَدُونَ بِأَمْرِهِ، ثُمَّ إِنَّهَا تَخْلُفُ مِنْ بَعْدِهِمْ خُلُوفٌ يَقُولُونَ مَا لَا يَفْعَلُونَ، وَيَفْعَلُونَ مَا لَا يُؤْمَرُونَ، فَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِيَدِهِ فَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِلِسَانِهِ فَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِقَلْبِهِ فَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلَيْسَ وَرَاءَ ذَلِكَ مِنَ الْإِيمَانِ حَبَّةُ خَرْدَلٍ)). قَالَ أَبُو رَافِعٍ: فَحَدَّثْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ فَأَنْكَرَهُ عَلَيَّ، فَقَدِمَ ابْنُ مَسْعُودٍ فَنَزَلَ بِقَنَاةَ، فَاسْتَتْبَعَنِي إِلَيْهِ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ (ﷺ) يَعُودُهُ، فَانْطَلَقْتُ مَعَهُ، فَلَمَّا جَلَسْنَا سَأَلْتُ ابْنَ مَسْعُودٍ عَنْ هَذَا الْحَدِيثِ، فَحَدَّثَنِيهِ كَمَا حَدَّثْتُهُ ابْنَ عُمَرَ.

(عبدالله) کوری (مسعود) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ((پێغەمبەر نییە کەخوای گەورە ناردبێتی بۆناو گەلێکی لەپێش مندا کەلەناو ئەوگەلەدا حەواریو هاوەڵی نەبێت، سوننەتەکانیان جێبەجێکردووەو شوێن فەرمانەکانی کەوتوون، ئینجا دوای ئەمان خەڵکانێك شوێنیان کەوتوون. ئەوەی دەیڵێن نایکەن بەکردەوە، کردەوەگەلێکیش دەکەن کەفەرمانیان پێنەکراوە. هەرکەس بەرگرییان بکات بەدەست ئەوە ئیمانداره، هەرکەس بەرگرییان بکات بەزمان ئەوە ئیمانداره. هەرکەسیش بەرگرییان بکات بەدڵ ئەویش ئەمانداره. ئیتر لەدوای ئەوە بەقەد دەنکە خەرتەلەیەك ئیمان نابێت (ابو رافع)وتی: ئەمەم بۆ (عبدالله) کوری(عمر) گێڕایەوە ئینکاری کرد، ئینجا ( ابن مسعود)هات لەقەنات دابەزی(عبدالله)کوری( عمر) (ﷺ) شوێن خۆی خستمو بردمی بۆ سەردانی منیش لەگەڵیا رۆیشتم ،کاتێ دانیشتین لەبارەی ئەم فەرموودەیەوە لە(ابن مسعود)م پرسی ئەویش بۆی گێڕاینەوە وەکو من بۆ (عمر)م گێڕایەوە.

## (١٨) عەلی خۆشناوێ ئیماندار نەبی، رقیشی لێی نییە موونافیق نەبێ

٣٦ـعَنْ زِرِّ بن حُبَيش (ﷺ) قالَ: قَالَ عَلِيٌّ بن أبي طالب (ﷺ): والَّذي فلق الْحَبَّةَ وبَرَأَ النَّسَمَةَ، إِنَّهُ لَعَهْدُ النَّبِيِّ الْأُمِّيِّ (ﷺ) إِلَيَّ: أَنْ لَا يُحِبَّنِي إِلَّا مُؤْمِنٌ ولَا يُبْغِضَنِي إِلَّا مُنَافِقٌ.

(زر)کوری(حبیش)(ﷺ) دەڵێ: علی کوری ابیطالب (ﷺ) وتی: سوێند بەوەی تۆوی تەقاندووەو، گیانی کردە بەر هەموو گیانلەبەرێك، ئەوە پەیمانی پێغەمبەری(ﷺ) نەخوێندەوارە بۆ من: کەس منی خۆشناوێت ئیماندار نەبێت رقیشی لێم نییە موونافیق نەبێ.

## (١٩) خۆشەویستی (انصار) نیشانەی ئیمانە، رق لێبوونیشیان دووروویییە

٣٧ـ عن الْبَرَاءِ (ﷺ)، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ فِي الْأَنْصَارِ: ((لَا يُحِبُّهُمْ إِلَّا مُؤْمِنٌ، وَلَا يُبْغِضُهُمْ إِلَّا مُنَافِقٌ. مَنْ أَحَبَّهُمْ أَحَبَّهُ اللَّهُ، وَمَنْ أَبْغَضَهُمْ أَبْغَضَهُ اللَّهُ)).

(البراء)(ﷺ)دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەبارەی (انصار)ەوە فەرموویەتی: ((خۆشی ناوێن جگە لەئیماندار، رقیشی لێیان نییە جگە لەدووڕوو، هەرکەس خۆشی بووێن خوا خۆشی دەوێت، هەرکەسیش رقی لێیان بێت خوا رقی لێیەتی)).

## (٢٠) ئیمان پەنا دەباتەوە بۆ مەدینە

٣٨ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((إِنَّ الْإِيمَانَ لَيَأْرِزُ إِلَى الْمَدِينَةِ كَمَا تَأْرِزُ الْحَيَّةُ إِلَى جُحْرِهَا)).

(ابوهریرە)(ﷺ) دەڵێ: بیستم لەپێغەمبەری، خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ( لەراستیدا ئیمان پەنا دەباتەوە بۆ مەدینە هەروەکو مار پەنا بۆ کونەکەی خۆی دەباتەوە).

## (٢١) ئیمان و حیکمەت یەمەنین

٣٩ـ عن أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: ((جَاءَ أَهْلُ الْيَمَنِ، هُمْ أَرَقُّ أَفْئِدَةً، وَأَضْعَفُ قُلُوبًا، الْإِيمَانُ يَمَانٍ، وَالْحِكْمَةُ يَمَانِيَةٌ. السَّكِينَةُ فِي أَهْلِ الْغَنَمِ، الْفَخْرُ وَالْخُيَلَاءُ فِي الْفَدَّادِينَ أَهْلِ الْوَبَرِ، قِبَلَ مَطْلِعِ الشَّمْسِ)).

(ابوهریرە)(ﷺ) دەڵێ: بیستم لەپێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ( خەڵکی یەمەن هاتن کەخەڵکێکی دڵناسكو دڵنەرمن، ئیمان لەناو خەڵکی یەمەندا

دامەزراوە حیکمەتیش یەمەنیە، ئارامی و بیٚفیزی لای مەڕدارەکانە، شانازیو خۆبەزلزانین لای دەنگ زلە خاوەن وشترەکانە ئەوانەی لەلای خۆر هەڵاتەوەن).

٤٠ـ عن جابِرِ بن عبدالله (ﷺ) قال: قال رسول الله (ﷺ): ((غلَظُ القلوبِ و الجفاءُ في المشرقِ، و الإيمانُ في أهلِ الحجازِ)).

(جابر) کوری(عبدالله) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (دڵڕەقی ووشکی لەخۆرهەڵاتەو، باوەڕیش لای خەڵکی حیجازە).

## (٢٢) ئەوەی ئیمان نەهێنێ کرداری باش سوودی پیٚناگەیێنیٚ

٤١ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّه، ابْنُ جُدْعَانَ كَانَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ يَصِلُ الرَّحِمَ، وَيُطْعِمُ الْمِسْكِينَ، فَهَلْ ذَاكَ نَافِعُهُ؟ قَالَ: ((لَا يَنْفَعُهُ، إِنَّهُ لَمْ يَقُلْ يَوْمًا: رَبِّ اغْفِرْ لِي خَطِيئَتِي يَوْمَ الدِّينِ)).

(عائشە)(ﷺ) دەڵێ: وتم : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) (ابن جدعان) لەسەردەمی نەفامیدا سەردانی کەسوکاری خۆی دەکرد، خواردنی دەدا بەهەژاران، ئایا ئەوە سوودی هەبووە بۆی؟ فەرمووی: ( نەخێر ،سوودی پیٚ ناگەیێنیٚ، چونکە ئەو رۆژێك لەرۆژان نەیوتووە: خوایە لەگوناهەکانم خۆش ببە لەرۆژی قیامەتدا).

## (٢٣) ناچنە بەهەشت تا ئیمان نەهێنن

٤٢ ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((لَا تَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ حَتَّى تُؤْمِنُوا، وَلَا تُؤْمِنُوا حَتَّى تَحَابُّوا، أَوَلَا أَدُلُّكُمْ عَلَى شَيْءٍ إِذَا فَعَلْتُمُوهُ تَحَابَبْتُمْ؟ أَفْشُوا السَّلَامَ بَيْنَكُمْ)).

(ابوهریرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: ((ناچنە بەهەشت هەتا ئیمان نەهێنن، ئیمانیش ناهێنن، هەتا یەکترتان خۆش نەوێت، ئایا شتێکتان پیٚ بڵێم ئەگەر بیکەن یەکترتان خۆشدەوێت؟ سەلام لەیەکتری زۆربکەن)).

## (٢٤) زیناکەر لەکاتی زینادا ئیمانی نییە

٤٣ ـ عن أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((لَا يَزْنِي الزَّانِي حِينَ يَزْنِي وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلَا يَسْرِقُ السَّارِقُ حِينَ يَسْرِقُ وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلَا يَشْرَبُ الْخَمْرَ حِينَ يَشْرَبُهَا وَهُوَ مؤمنٌ)). وكَانَ أَبُو هُرَيْرَةَ يُلْحِقُ مَعَهُنَّ: ((وَلَا يَنْتَهِبُ نُهْبَةً ذَاتَ شَرَفٍ يَرْفَعُ النَّاسُ إِلَيْهِ فِيهَا أَبْصَارَهُمْ حِينَ يَنْتَهِبُهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ)). وَفِي حَدِيث

همَّام: ((يَرْفَعُ إِلَيْهِ الْمُؤْمِنُونَ أَعْيُنَهُمْ فِيهَا وَهُوَ حِينَ يَنْتَهِبُهَا مُؤْمِنٌ)) وَزَادَ: ((وَلَا يَغُلُّ أَحَدُكُمْ حِينَ يَغُلُّ وَهُوَ مُؤْمِنٌ، فَإِيَّاكُمْ إِيَّاكُمْ)).

(ابوهريره)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: ((زیناکەر لەکاتێکدا کەزینادەکات ئیمانی نییە، دزیش لەکاتی دزیکردنەکەیدا ئیمانی نییە، ئارەق خۆریش لەکاتی ئارەق خواردنەوەکەیدا ئیمانی نییە ، جەردەش لەکاتێکا شتێکی گرانبەها کە خەڵك چاوی تێ بڕیبێ، تالآن بکات ئیمانی نییە) ( ابوهریرە) لەریوایەتی(همام)یشدا ئەمەی زیادکردووە: خیانەتکاریشتان لەکاتی خیانەت کردنەکەیدا ئیمانی نییە، کەواتە:وریای خۆتان بن، وریای خۆتان بن)).

## ( ٢٥ ) ئیماندار دووجار لەیەك کونەوە ناگەزرێت

٤٤ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ)، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((لَا يُلْدَغُ الْمُؤْمِنُ مِنْ جُحْرٍ وَاحِدٍ مَرَّتَيْنِ)).

(ابوهریرە) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (ئیماندار لەیەك کونەوە دووجار ناگەزرێت).

## ( ٢٦ ) وەسوەسە لەئیماندا

٤٥ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: جَاءَ نَاسٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (ﷺ) الى النبي (ﷺ) فَسَأَلُوهُ: إِنَّا نَجِدُ فِي أَنْفُسِنَا مَا يَتَعَاظَمُ أَحَدُنَا أَنْ يَتَكَلَّمَ بِهِ. قَالَ: ((وَقَدْ وَجَدْتُمُوهُ)). قَالُوا: نَعَمْ، قَالَ: ذَاكَ صَرِيحُ الْإِيمَانِ)).

(ابوهریرە)(ﷺ) دەڵێ: کەسانێك لەهاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) هاتن بۆخزمەتی و پرسیاریان لێکرد: ئێمە شتانێك دێت بەدڵماندا دەربڕینی زۆر قورسە لەلامان، فەرمووی: بەراستی ئەمەتان تووش هاتووە؟ وتیان: بەڵێ: فەرمووی : دە ئەوە ئیمانی پاکە.

## ( ٢٧ ) گەورەترین گوناه هاوەڵ بۆ خوا بریاردانە

٤٦ـ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي بَكْرَةَ، عَنْ أَبِيهِ (ﷺ) قَالَ: كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالَ: ((أَلَا أُنَبِّئُكُمْ بِأَكْبَرِ الْكَبَائِرِ -ثَلَاثًا-: الْإِشْرَاكُ بِاللَّهِ، وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ، وَشَهَادَةُ الزُّورِ. أَوْ: قَوْلُ الزُّورِ)). وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) مُتَّكِئًا فَجَلَسَ، فَمَا زَالَ يُكَرِّرُهَا حَتَّى قُلْنَا: لَيْتَهُ سَكَتَ. [بخاري/ الشهادات/ ماقيل في شهادة الزور/ ٢٥١١]

(عبدالرحمن)کوڕی(ابی بکره) دەڵێ: باوکم وتی: ئێمە لەخزمەت پێغەمبەری خوادا(ﷺ) بووین، فەرمووی: ئایا ئاگادارتان نەکەم لەگەورەترین گوناهە گەورەکان، سێجار ئەمەی فەرموو ئینجا فەرمووی: ((هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردان، ئازاردانی دڵی دایك و باوك، شایەتیدانی دۆرو ناهەق یان وتەی درۆو ناهەق)). لەوکاتەدا پێغەمبەر(ﷺ) پاڵی دابووەوە ئینجا دانیشت بەردەوام ئەمەی دوایی دوویات دەکردەوە، هەتا وتمان: خۆزگە بێدەنگ دەبوو.

٤٧ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((اجْتَنِبُوا السَّبْعَ الْمُوبِقَاتِ)). قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا هُنَّ؟ قَالَ: ((الشِّرْكُ بِاللَّهِ، وَالسِّحْرُ، وَقَتْلُ النَّفْسِ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ، وَأَكْلُ الرِّبَا، وَأَكْلُ مَالِ الْيَتِيمِ، وَالتَّوَلِّي يَوْمَ الزَّحْفِ، وَقَذْفُ الْمُحْصَنَاتِ الْغَافِلَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ)). [بخاري / الوصايا / ان الذين ياكلون اموال اليتامى /٢٦١٥]

(ابوهريره)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر( فەرموویەتی: ((دووربکەونەوە لەوحەوت گوناهەی کەئادەمیزاد تیادەبەن)) وتیان: ئەوانە چین ئەی پێغەمبەری خوا فەرمووی: ((هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردان، جادوو، کوشتنی ئادەمیزاد کەخوا حەرامی کردووە، مەگەر بەهەقی خۆی، سوو خواردن، خواردنی ماڵی هەتیوو، پشت هەڵکردن لەرۆژی جەنگی کافراندا، بوختان کردن بۆ ئافرەتانی باوەڕداری بێئاگای پاکداوێن)).

## ( ٢٨ ) لەدوای من مەبنەوە بەکافرو هەندێکتان نەگەردنی هەندێکتان بدەن

٤٨ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (ﷺ)، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ: ((وَيْحَكُمْ -أَوْ قَالَ: وَيْلَكُمْ- لَا تَرْجِعُوا بَعْدِي كُفَّارًا، يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ)).

(عبدالله) کوڕی(عمر)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەحەجی ماڵئاواییدا فەرمووی: کۆستان کەوێت،، لەدوای من مەبنەوە بەکافرو هەندێکتان بدەن لەگەردنی هەندێکتان).

## ( ٢٩ ) لادان لەرشتەی باوك کوفرە

٤٩ـ عَنْ أَبِي عُثْمَانَ قَالَ: لَمَّا ادُّعِيَ زِيَادٌ لَقِيتُ أَبَا بَكْرَةَ (ﷺ)، فَقُلْتُ لَهُ: مَا هَذَا الَّذِي صَنَعْتُمْ؟ إِنِّي سَمِعْتُ سَعْدَ بْنَ أَبِي وَقَّاصٍ يَقُولُ: سَمِعَ أُذُنَايَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ

(ﷺ) وَهُوَ يَقُولُ: ((مَنِ ادَّعَى أَبًا فِي الْإِسْلَامِ غَيْرَ أَبِيهِ، يَعْلَمُ أَنَّهُ غَيْرُ أَبِيهِ، فَالْجَنَّةُ عَلَيْهِ حَرَامٌ)). فَقَالَ أَبُو بَكْرَةَ: وَأَنَا سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ).[بخاري/ الفرائق /من ادعى الى غير ابيه/٦٣٨٥]

(ابو عثمان)دەڵێ: کاتێ(زیاد) یان کرد بەکوڕی پیاوێك کەباوگی خۆی نەبوو، بە(ابوبکره)گەیشتم(ﷺ) پێموت: ئەو کارە چییە کردووتانە؟ من لە(سعد)کوڕی(ابی وقاص)م بیستووە دەیوت: بەم دوو گوێیەم لەپێغەمبەری خوام(ﷺ) بیستووە دەیفەرموو: ((هەرکەس لەئیسلامدا جگە لەباوکی خۆی باوکێکیتر بۆ خۆی دابنێ، بیشزانێ کەباوکی نییە، ئەوە بەهەشت حەرامە لێی).ابوبکره وتی: منیش [ ئەوەم ] لەپێغەمبەر(ﷺ) بیستووە.

## (٣٠) ئەوەی بەبراکەی بڵێ کافر

٥٠- عَنْ أَبِي ذَرٍّ (ﷺ): أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((لَيْسَ مِنْ رَجُلٍ ادَّعَى لِغَيْرِ أَبِيهِ وَهُوَ يَعْلَمُهُ إِلَّا كَفَرَ، وَمَنِ ادَّعَى مَا لَيْسَ لَهُ فَلَيْسَ مِنَّا، وَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ. وَمَنْ دَعَا رَجُلًا بِالْكُفْرِ أَوْ قَالَ: عَدُوَّ اللَّهِ، وَلَيْسَ كَذَلِكَ، إِلَّا حَارَ عَلَيْهِ)).
[بخاري/ المناقب/ نسبة اليمين الى اسماعيل/٣٣١٧]

(ابوذر)(ﷺ)دەڵێ: لەپێغەمبەری خوای(ﷺ) بیستووە دەیفەرموو: ((هەرکەسێك بەناوی جگە لەباوکیەوە ناوی خۆی بنێت بیشزانێت، ئەوە کافر دەبێت، هەرکەسیش خۆی بەخاوەنی شتێك بزانێت کەهی خۆی نەبێت، ئەوە لەئێمە نییە، باجێی خۆی لەناو ئاگردا خۆش بکات، هەرکەسیش پیاوێك بەکافر بانگ بکات، پێی بڵێ : دوشمنی خوا، وایش نەبێت، ئەوە بۆ خۆی دەگەڕێتەوە).

٥١- عن عَبْدُ اللَّهِ بن مسعود (ﷺ) قَالَ: رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَيُّ الذَّنْبِ أَكْبَرُ عِنْدَ اللَّهِ؟ قَالَ: ((أَنْ تَدْعُوَ لِلَّهِ نِدًّا وَهُوَ خَلَقَكَ)). قَالَ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: ((أَنْ تَقْتُلَ وَلَدَكَ مَخَافَةَ أَنْ يَطْعَمَ مَعَكَ)). قَالَ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: ((أَنْ تُزَانِيَ حَلِيلَةَ جَارِكَ)). فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ تَصْدِيقَهَا: ﴿وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ يَلْقَ أَثَامًا﴾. ﴿الفرقان:﴾
[اقتران/ النيرين/ بخاري/ ١٤٨/٢٨٠ ب ١ ل٤٠٤]

(عبدالله)کوڕی (مسعود)(ﷺ) دەڵێ: پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کام گوناهە لای خوا گەورەترین گوناهە؟ فەرمووی: ((ئەوەیە هاوەڵ بۆ خوا

دابنێی کە ئەو دروستی کردووی)) وتی: ئینجا چی‌تر؟ فەرمووی: ((ئەوەیەکە منداڵەکەت بکوژیت لەترسی ئەوەی لەگەڵتا دەخوات [واتە لەترسی بەخێوکردنی]، وتی:ئینجا چی‌تر؟ فەرمووی: ( ئەوەیە دەست درێژی ، بەدڕەوشتی بکەیتە سەر خێزانی دراوسێت)) خوای گەورەش بۆ بەڕاستگێڕانی قسەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: ﴿والذين لايدعون مع الله الهاً اخر ولايقتلون النفس التي حرم الله الا بالحق ولايزنون ومن يفعل ذلك يلق اثاماً﴾ ﴿الفرقان:٦٨﴾.

واتە: ئەوانەی جۆرە خوایەکی‌تر لەگەڵ خوادا ناپەرستن، کەسێکیش ناکوژن کەخوا کوشتنی حەرام کردووە مەگەر بەهەق و ڕەوا، زیناش ناکەن، ئەوەی ئەو جۆرەکارە خراپانە ئەنجام بدات ئەواتووشی سزادەبێت.

## ( ٣١ ) کەسێك بمرێ و شەریکی بۆ خوا دانەنابێ دەچێتە بەهەشت

٥٢ـ عَنْ جَابِرِ بن عبدالله (ﷺ) قَالَ: أَتَى النَّبِيَّ (ﷺ) رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا الْمُوجِبَتَانِ؟ قَالَ: ((مَنْ مَاتَ لَا يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا دَخَلَ الْجَنَّةَ، وَمَنْ مَاتَ يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا دَخَلَ النَّارَ)).

(جابر)کوڕی(عبدالله)(ﷺ) دەڵێ: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەو دوو سیفەتەی مرۆڤ شایانی بەهەشت و دۆزەخ دەکەن چین؟ فەرمووی: هەرکەس مردو هیچ شتێکی نەکردبێ بەهاوەڵ بۆ خوا دەچێتە بەهەشت، هەرکەسیش مرد شتێکی کردبێ بەهاوەڵ بۆ خوا دەچێتە ئاگرەوە).

٥٣ـ عن أَبِي الْأَسْوَدِ الدِّيلِيِّ: أَنَّ أَبَا ذَرٍّ (ﷺ) حدَّثه انه قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) وَهُوَ نَائِمٌ، عَلَيْهِ ثَوْبٌ أَبْيَضُ، ثُمَّ أَتَيْتُهُ فَإِذَا هُوَ نَائِمٌ، ثُمَّ أَتَيْتُهُ وَقَدِ اسْتَيْقَظَ، فَجَلَسْتُ إِلَيْهِ، فَقَالَ: ((مَا مِنْ عَبْدٍ قَالَ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، ثُمَّ مَاتَ عَلَى ذَلِكَ إِلَّا دَخَلَ الْجَنَّةَ)). قُلْتُ: وَإِنْ زَنَى وَإِنْ سَرَقَ؟ قَالَ: ((وَإِنْ زَنَى وَإِنْ سَرَقَ)) قُلْتُ: وَإِنْ زَنَى وَإِنْ سَرَقَ؟ قَالَ: ((وَإِنْ زَنَى وَإِنْ سَرَقَ)). ثَلَاثًا، ثُمَّ قَالَ فِي الرَّابِعَةِ: ((عَلَى رَغْمِ أَنْفِ أَبِي ذَرٍّ)). قَالَ: فَخَرَجَ أَبُو ذَرٍ وَهُوَ يَقُولُ: وَإِنْ رَغِمَ أَنْفُ أَبِي ذَرٍّ. [بخاري/ الجنائز/ في الجنائز/١١٨٠]

(ابو اسود الديلی)دەڵێ: (ابو ذر)بۆی گێڕاوەتەوە وتوویەتی: چوومە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) نوستبوو، سەرچەفێکی سپی بەسەرەوە بوو، جارێکی‌تر هاتمەوە

هەرنوستبوو، پاشان جارێکیتر هاتمەوە خزمەتی هەستابوو،لەخزمەتیا دانیشتم، فەرمووی: ((هەر بەندەیەك (لا الـه الا الله)ی وتبێ‌و لەسەر ئەوە مردبێت، دەچێتە بەهەشتەوە)). وتم: ئەگەر داوێن پیسی و دزیشی کردبێت؟) فەرمووی: ((ئەگەر داوێن پیسی و دزیشی کردبێت)). وتم: ئەگەر داوێن پیسی و دزیشی کردبێت؟ سێجار فەرمووی: ((با داوێن پیسی و دزیشی کردبێت)) ئینجا لەچوارەم جاردا فەرمووی: ( بالووتی ئەبوذریش بدات لەخۆڵ)، دەڵێ (ابو ذر)هاتە دەرەوەو لەبەرخۆیەوە هەر دەیوت: بالوتی ئەبوذریش بدات لەخۆڵ.

## ( ٣٢ ) ناچێتە بەهەشت ئەوەی بەقەد گەردێك خۆبەزلزانینی تێدابێت

٥٤ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (ﷺ)، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ مِنْ كِبْرٍ)). قَالَ رَجُلٌ: إِنَّ الرَّجُلَ يُحِبُّ أَنْ يَكُونَ ثَوْبُهُ حَسَنًا، وَنَعْلُهُ حَسَنَةً؟ قَالَ: ((إِنَّ اللَّهَ جَمِيلٌ يُحِبُّ الْجَمَالَ، الْكِبْرُ بَطَرُ الْحَقِّ وَغَمْطُ النَّاسِ)).

(عبدالله)کوڕی ( مسعود)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((ناچێتە بەهەشت ئەوەی بەقەد گەردێك خۆبەزلزانینی تێدابێت))، پیاوێك وتی: پیاوێ حەزدەکات جلوبەرگەکەی جوان بێت، نەعلەکانی جوان بێت؟ فەرمووی: ((خوا جوانەو جوانی خۆش دەوێت، خۆبەزلزانین بریتیـیە لەڕەتکردنەوەی هەق‌و راستی‌و بەسووك سەیرکردنی خەڵکی)).

## ( ٣٣ ) تەشەردان لەڕەچەڵەك‌و شین‌و شەپۆڕ لەکوفرە

٥٥ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((اثْنَتَانِ فِي النَّاسِ هُمَا بِهِمْ كُفْرٌ: الطَّعْنُ فِي النَّسَبِ، وَالنِّيَاحَةُ عَلَى الْمَيِّتِ)).

(ابوهریرە)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (دوو جۆر لەخەڵکی کوفرییان تێدایە، تانەو تەشەردان لەڕەچەڵەك‌و شین‌و شەپۆڕ لەسەر مردوو).

## ( ٣٤ ) ئەوەی دەڵێ بەهۆی کەشوهەواوە باراننمان بۆ باری کافرە

٥٦ـ عَنْ زَيْدِ ابْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ (ﷺ) قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) صَلَاةَ الصُّبْحِ بِالْحُدَيْبِيَةِ فِي إِثْرِ السَّمَاءِ كَانَتْ مِنَ اللَّيْلِ، فَلَمَّا انْصَرَفَ أَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ فَقَالَ: ((هَلْ تَدْرُونَ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ)). قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: ((قَالَ: أَصْبَحَ مِنْ عِبَادِي مُؤْمِنٌ بِي وَكَافِرٌ، فَأَمَّا مَنْ قَالَ مُطِرْنَا بِفَضْلِ اللَّهِ وَرَحْمَتِهِ: فَذَلِكَ مُؤْمِنٌ

بِي كَافِرٌ بِالْكَوْكَبِ، وَأَمَّا مَنْ قَالَ مُطِرْنَا بِنَوْءِ كَذَا وَكَذَا، فَذلِكَ كَافِرٌ بِي مُؤْمِنٌ بِالْكَوْكَبِ)). [بخاري/ صفة الصلاة/ يستقبل الامام الناس/٨١٠]

(زيد) كوڕی(خالد الجهنی)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) نوێژی بەیانیی بۆ کردین لەحودەیبیە لەدوای باران بارین. کاتێ سەلامیدایەوە ڕووی‌کردە خەڵکەکەو فەرمووی: ((ئایا دەزانن پەروەردگارتان چی فەرمووە)) وتیان: خواو پێغەمبەرەکەی(ﷺ) زاناترن، فەرمووی: ((فەرمویەتی: بەندەکانم هەیانە بڕوای پێمە، هەشیانە کافرە، ئەوانەی کە دەڵێن: خوای گەورە بەبەزەیی خۆی بارانی بۆ بارانین، ئەوە باوەڕی بەمن هەیەو کافرە بەئەستێرە، بەڵام ئەوانەی کەدەڵێن: بەهۆی جوولەی ئەستێرەکانەوە بارانمان بۆ باری ئەوە باوەڕی بەخوا نییەو باوەڕی بەئەستێرە هەیە)

## ( ٣٥ ) پشتیوانم خواو باوەڕدارە چاکەکانن

٥٧ـ عَنْ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (ﷺ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) جِهَارًا غَيْرَ سِرٍّ يَقُولُ: ((أَلَا إِنَّ آلَ أَبِي –يَعْنِي فُلَانًا– لَيْسُوا لِي بِأَوْلِيَاءَ، إِنَّمَا وَلِيِّيَ اللَّهُ وَصَالِحُ الْمُؤْمِنِينَ)).

(عمرو) کوڕی( عاص) (ﷺ) دەڵێ: لەپێغەمبەری خوام(ﷺ) بیستووە، بەئاشکرا نەك بەنهێنی، دەیفەرموو: ((بابزانن کەسوکاری باوکم پشتیوان و هاوکاری من نین، بەڵکو پشتیوانم خواو باوەڕدارە چاکەکانن)).

## ( ٣٦ ) پاداشتی چاکەی ئیماندار لەدنیاو لەقیامەتیشدایە بەڵام کافر هەر لەدنیادایە

٥٨ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((إِنَّ اللَّهَ لَا يَظْلِمُ مُؤْمِنًا حَسَنَةً يُعْطَى بِهَا فِي الدُّنْيَا، وَيُجْزَى بِهَا فِي الْآخِرَةِ. وَأَمَّا الْكَافِرُ: فَيُطْعَمُ بِحَسَنَاتِ مَا عَمِلَ بِهَا لِلَّهِ فِي الدُّنْيَا، حَتَّى إِذَا أَفْضَى إِلَى الْآخِرَةِ لَمْ تَكُنْ لَهُ حَسَنَةٌ يُجْزَى بِهَا)).

(انس) کوڕی(مالك)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ((خوا ستەم لەئیمانداران ناکات و لەپاداشتی چاکەدا لەدنیاشداو لەقیامەتیشدا پاداشتیان دەداتەوە، بەڵام کافر پاداشتی ئەو کارانەی ﴿بەخەیاڵی خۆی﴾ بۆ خوا کردوویەتی هەر لەدنیادا دەدرێتەوە، بۆ ئەوەی کەگەیشتە قیامەت هیچ چاکەیەکی نەمێنێ کەلەوێ پاداشتی بدرێتەوە.

## (٣٧) ئیسلام چییە؟ ڕوونکردنەوەی نیشانەکانی

٥٩- عن طَلْحَةَ بْنَ عُبَيْدِ اللَّهِ (ﷺ) قال: جَاءَ رجُلٌ إلى رَسُول اللَّه (ﷺ) منْ أَهْلِ نجْدٍ، ثَائِرُ الرَّأس، نَسْمَعُ دَوِيَّ صَوْتِه وَلَا نفْقَهُ ما يقُولُ، حَتَّى دنا منْ رسُولِ اللَّه (ﷺ)، فَإِذَا هُوَ يَسْأَلُ عَنِ الْإِسْلَامِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): ((خَمْسُ صَلَوَاتٍ فِي الْيَوْمِ وَاللَّيْلَةِ)). فقَال: هَلْ عَلَيَّ غَيْرُهُنَّ؟ قَالَ: ((لَا، إِلَّا أَنْ تَطَّوَّعَ، وَصِيَامُ شَهْرِ رَمَضَانَ)). قَالَ: هَلْ عَلَيَّ غَيْرُهُ؟ فقَالَ: ((لَا، إِلَّا أَنْ تطَّوَّعَ)). وذكَرَ لَهُ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) الزَّكَاةَ، فقَال: هَلْ عَلَيَّ غَيْرُهَا؟ قَالَ: ((لَا، إِلَّا أَنْ تَطَّوَّعَ)). قَالَ: فَأَدْبَرَ الرَّجُلُ وَهُوَ يَقُولُ: وَاللَّهِ لَا أَزِيدُ عَلَى هَذَا وَلَا أَنْقُصُ منْهُ. فقَال رَسُولُ اللَّه : ((أَفْلَحَ إِنْ صَدَقَ)). وفي روايةٍ قَالَ: فقَالَ رَسُولُ اللَّه : ((أَفْلَحَ -وَأَبِيهِ- إِنْ صَدَقَ. أَوْ: دَخَلَ الْجَنَّةَ -وَأَبِيهِ- إِنْ صَدَقَ)). ﴿بخاري/ الايمان/ الزكاة في الاسلام/٤٦﴾

(طلحة)کوڕی(عبدالله)(ﷺ)دەڵێ: پیاوێکی خەڵکی نەجد هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) قژی ئاڵۆزکابوو، گوێمان لەبۆڵەبۆڵی بوو بەلام نەماندەزانی چی دەڵێت، هەتا نزیك بوویەوە لەپێغەمبەر(ﷺ) تومەس دەیەوێ پرسیاری لێبکات لەبارەی ئیسلامەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((پێنج نوێژ لەشەووڕۆژێکدا)) وتی: ئەی بێجگە لەوپێنجە هیچی ترم لەسەرە؟ فەرمووی: ((نەخێر، مەگەر خۆت خۆبەخشانە بیکەیت، هەروەها ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان)) وتی: ئایا جگەلەو [مانگەم]لەسەرە؟ فەرمووی: ((نەخێر، مەگەر خۆبەخشانە بیکەیت)) ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) ناوی زەکاتیشی هێنا، پیاوەکە وتی: ئایا لەوەزیاترم لەسەرە؟ فەرمووی: ((نەخێر، مەگەر خۆبەخشانە بیدەیت)) ئینجا پیاوەکە گەڕایەوەو لەبەرخۆیەوە دەیووت: سوێند بەخوا نەلەوە زیاد دەکەمو نەلێشی کەمدەکەمەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((ئەگەر ڕاست بکات ڕزگاری ئەبێت)).

## (٣٨) ئیسلام لەسەر پێنج شت بنیات نراوە

٦٠- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((بُنِيَ الْإِسْلَامُ عَلَى خَمْسٍ: عَلَى أَنْ يُوَحَّدَ اللَّهُ، وَإِقَامِ الصَّلَاةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَصِيَامِ رَمَضَانَ، وَالْحَجِّ)). فَقَالَ رَجُلٌ: الْحَجُّ وَصِيَامُ رَمَضَانَ؟ فقَالَ: لَا، صِيَامُ رَمَضَانَ وَالْحَجُّ، هَكَذَا سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) )). ﴿بخاري/ الايمان/ وقول النبي (ﷺ) بني/ .../٨﴾

(ابن عمر)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: ((ئیسلام لەسەر پێنج شت بنیات نراوە: خوا بەیەك بناسیت، نوێژ بكەیت، زەكات بدەیت، ڕۆژووی ڕەمەزان بگریت، حەج بكەیت)) پیاوێك وتی: حەج و ڕۆژووی ڕەمەزان؟ لەوەڵامدا وتی: نەخێر، ڕۆژووی ڕەمەزان و حەج، بەم شێوەیە لەپێغەمبەرم (ﷺ) بیستووە.

## (٣٩) لەئیسلامدا چی خێرە؟

٦١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (ﷺ): أَنَّ رَجُلًا سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ): أَيُّ الْإِسْلَامِ خَيْرٌ؟ قَالَ: ((تُطْعِمُ الطَّعَامَ، وَتَقْرَأُ السَّلَامَ عَلَى مَنْ عَرَفْتَ وَمَنْ لَمْ تَعْرِفْ)). [بخاري/ الايمان/ اطعام الطعام/١٢]

(عبدالله) كوڕی( عمرو)(ﷺ) دەڵێ: پیاوێك پرسیاری لەپێغەمبەر(ﷺ) كرد، وتی: لەئیسلامدا چی خێرە؟ فەرمووی: ((خۆراك ببەخشێت و سەلام بكەیت لەوەی دەیناسیت و لەوەش كەنایناسێت)).

## (٤٠) ئیسلام پێش خۆی دەسڕێتەوە، حەج و كۆچیش هەروەها

٦٢- عَنِ ابْنِ شِمَاسَةَ الْمَهْرِيِّ قَالَ: حَضَرْنَا عَمْرَو بْنَ الْعَاصِ (ﷺ) وَهُوَ فِي سِيَاقَةِ الْمَوْتِ، فَبَكَى طَوِيلًا، وَحَوَّلَ وَجْهَهُ إِلَى الْجِدَارِ، فَجَعَلَ ابْنُهُ يَقُولُ: يَا أَبَتَاهُ، أَمَا بَشَّرَكَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بِكَذَا؟ أَمَا بَشَّرَكَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بِكَذَا؟ قَالَ: فَأَقْبَلَ بِوَجْهِهِ فَقَالَ: إِنَّ أَفْضَلَ مَا نُعِدُّ شَهَادَةُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، إِنِّي قد كُنْتُ عَلَى أَطْبَاقٍ ثَلَاثٍ: لَقَدْ رَأَيْتُنِي وَمَا أَحَدٌ أَشَدَّ بُغْضًا لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) مِنِّي، وَلَا أَحَبَّ إِلَيَّ أَنْ أَكُونَ قَدِ اسْتَمْكَنْتُ مِنْهُ فَقَتَلْتُهُ، فَلَوْ مُتُّ عَلَى تِلْكَ الْحَالِ لَكُنْتُ مِنْ أَهْلِ النَّارِ. فَلَمَّا جَعَلَ اللَّهُ الْإِسْلَامَ فِي قَلْبِي أَتَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) فَقُلْتُ: ابْسُطْ يَمِينَكَ فَلْأُبَايِعْكَ، فَبَسَطَ يَمِينَهُ، قَالَ فَقَبَضْتُ يَدِي، قَالَ: ((مَا لَكَ يَا عَمْرُو)). قَالَ: قُلْتُ: أَرَدْتُ أَنْ أَشْتَرِطَ. قَالَ: ((تَشْتَرِطُ بِمَاذَا)). قُلْتُ: أَنْ يُغْفَرَ لِي. قَالَ: ((أَمَا عَلِمْتَ أَنَّ الْإِسْلَامَ يَهْدِمُ مَا كَانَ قَبْلَهُ، وَأَنَّ الْهِجْرَةَ تَهْدِمُ مَا كَانَ قَبْلَهَا، وَأَنَّ الْحَجَّ يَهْدِمُ مَا كَانَ قَبْلَهُ)). وَمَا كَانَ أَحَدٌ أَحَبَّ إِلَيَّ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) وَلَا أَجَلَّ فِي عَيْنِي مِنْهُ، وَمَا كُنْتُ أُطِيقُ أَنْ أَمْلَأَ عَيْنَيَّ مِنْهُ إِجْلَالًا لَهُ، وَلَوْ سُئِلْتُ أَنْ أَصِفَهُ مَا أَطَقْتُ، لِأَنِّي لَمْ أَكُنْ أَمْلَأُ عَيْنَيَّ مِنْهُ. وَلَوْ مُتُّ عَلَى تِلْكَ الْحَالِ لَرَجَوْتُ أَنْ أَكُونَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ. ثُمَّ وَلِينَا أَشْيَاءَ مَا أَدْرِي مَا حَالِي فِيهَا، فَإِذَا أَنَا مُتُّ فَلَا تَصْحَبْنِي نَائِحَةٌ وَلَا نَارٌ، فَإِذَا دَفَنْتُمُونِي فَشُنُّوا عَلَيَّ التُّرَابَ شَنًّا، ثُمَّ أَقِيمُوا حَوْلَ

قبْرِي قدْر ما تُنْحَرُ جزُورٌ ويُقْسَمُ لحْمُها، حتّى أسْتأْنس بكُمْ، وأنْظُر ماذا أُراجعُ بِهِ رُسُلَ ربِّي)).

(ابـن شماسـه المـهری) دەڵـێ: هـاتین بـۆ لای(عمـرو) کـوڕی (عـاص) (ﷺ) لەسەرەمەرگابوو، زۆر گریا، رووی کردە دیوارەکە، وایکرد لە کوڕەکەی کە بڵێ: ئەی بابە، ئایا پێغەمبەری خوا(ﷺ) مژدەی فلان شتی نەدایتێ؟ ئایا مژدەی فلان شتی نەدایتێ؟ دەڵێ: ئینجا رووی تێکردین و وتی: باشترین شت کە ئامادەی بکەیت: شایەتیدانە کە هیچ خوایەك نییە جگە لە (الله)و محمدیش رەوانەکراوی خوایە، من لەسەر سێ حاڵ بووم، کاتێ هەبوو کەس بەقەدەر من رقی لەپێغەمبەری‌خوا(ﷺ) نەبوو، هیچ شتێکیشم ئەوەندە پێ‌خۆش نەبوو کە دەستم بەسەرکوشتنیا برۆیشتایە ئەگەر لەسەر ئەو حاڵەیان بمردمایا ئەوەدەچوومە ئاگرەوە. کاتێ‌خوای گەورە ئیسلامی خستە دڵمەوە، هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) وتم: دەستت درێژ بکە باپەیمانت بدەمێ، دەستی درێژکرد بەڵام من دەستم گێڕایەوە، فەرمووی: ((ئەوە چیتە ئەی عەمر)) وتم: ویستم مەرج بگرم، فەرمووی: (( بەچی مەرج دەگریت؟)) ، وتم: لەگوناهەکانم ببوردرێت، فەرمووی: ((ئایا نازانی ئیسلام هەرچی لەپێش خۆیدا بووە هەڵی دەوەشێنێتەوە کۆچیش هەرچی لەپێش خۆیدا هەبووە هەڵی دەوەشێنێتەوە، حەجیش هەرچی لەپێش خۆیدا هەبووە هەڵی دەوەشێنێتەوە)) ئینجا کەس نەبوو لەپێغەمبەر(ﷺ) لام خۆشەویستر بێت، کەسیش ئەوەندە شکۆدار نەبوو لەبەرچاوما، من نەمدەتوانی چاوم تێر بکەم لەسەیرکردنی لەبەرشکۆداریی سەیرکردنی. خۆ ئەگەر پرسیارم لێ بکرایا کە وەسفی بکەم نەمدەتوانی، چونکە نەمدەتوانی تێر سەیری بکەم، ئەگەر لەسەر ئەو حاڵە بمردمایا تکام وابوو ببم بەخەڵکی بەهەشت ئینجا شتانێکمان درایە دەست نازانم حاڵم چۆنە تێیدا، جا ئەگەر لەسەر ئەم حاڵە مردم با شین و شەپۆڕو (مەشخەڵی) ئاگر یاوەرم نەبێت. ئەگەر شاردمتانەوە خۆڵ بپژێنن بەسەرما ئینجا بە دەروی گۆڕەکەما بووەستن بەقەدەرە ئەوەندەی وشترێك سەرببڕێت و گۆشتەکەی دابەش بکرێت. بادڵتان پێ‌خۆش بکەم و بزانم چۆن وەڵامی فریشتەکانی پەروەردگارم بدەمەوە.

## (٤١) جنێودان بەموسڵمان دەرچوونە لەهەق . جەنگان دژی کوفرە

٦٣ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (ﷺ) قالَ: قالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((سِبَابُ الْمُسْلِمِ فُسُوقٌ، وَقِتَالُهُ كُفْرٌ)). [بخاري/ الايمان/ خوف المؤمن من ان يحبط عمله/٤٨]

(عبدالله) کوڕی (مسعود) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ((جنێودان بەموسڵمان دەرچوونە لەهەق و ڕاستی، جەنگکردنیش دژی کوفرە)).

## (٤٢) هەرکەس لەئیسلامدا چاکە بکات، خراپەکانی سەردەمی نەفامی لێناگیرێت

٦٤ـعَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مسعود (ﷺ): قَالَ: قَالَ أُنَاسٌ لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ): يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَنُؤَاخَذُ بِمَا عَمِلْنَا فِي الْجَاهِلِيَّةِ؟ قَالَ: ((أَمَّا مَنْ أَحْسَنَ مِنْكُمْ فِي الْإِسْلَام فَلَا يُؤَاخَذُ بِهَا، وَمَنْ أَسَاءَ أُخِذَ بِعَمَلِهِ فِي الْجَاهِلِيَّةِ وَالْإِسْلَامِ)). ﴿بخاري/ استتابة المرتدين/٦٥٢٦﴾

(عبدالله) کوڕی (مسعود)(ﷺ) دەڵێ: خەڵکانێك وتیان بەپێغەمبەر(ﷺ) ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئایا لێپرسینەوەمان هەیە لەسەر ئەوکارانەی لەفامیدا ئەنجاممان داون؟ فەرمووی: ((ئەوکەسەتان کەلەئیسلامدا چاکەکار دەبێت، لێی ناپرسرێتەوە، بەڵام ئەوەی کەخراپەکاربوو [لەئیسلام هەڵگەڕایەوە]لەکارەکانی سەردەمی نەفامیی و ئیسلامیشی دەپرسرێتەوە)).

## (٤٣) ئەگەر کەسێکتان موسڵمانێکی باش بێ هەرچاکەیەك کەدەیکات بەدەقات بۆی تۆمار دەکرێت

٦٥ـ عن أبي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: إِذَا تَحَدَّثَ عَبْدِي بِأَنْ يَعْمَلَ حَسَنَةً فَأَنَا أَكْتُبُهَا لَهُ حَسَنَةً مَا لَمْ يَعْمَلْ، فَإِذَا عَمِلَهَا فَأَنَا أَكْتُبُهَا بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا. وَإِذَا تَحَدَّثَ بِأَنْ يَعْمَلَ سَيِّئَةً فَأَنَا أَغْفِرُهَا لَهُ مَا لَمْ يَعْمَلْهَا، فَإِذَا عَمِلَهَا فَأَنَا أَكْتُبُهَا لَهُ بِمِثْلِهَا)). وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((قَالَتِ الْمَلَائِكَةُ: رَبِّ ذَاكَ عَبْدُكَ يُرِيدُ أَنْ يَعْمَلَ سَيِّئَةً -وَهُوَ أَبْصَرُ بِهِ- فَقَالَ: ارْقُبُوهُ، فَإِنْ عَمِلَهَا فَاكْتُبُوهَا لَهُ بِمِثْلِهَا، وَإِنْ تَرَكَهَا فَاكْتُبُوهَا لَهُ حَسَنَةً، إِنَّمَا تَرَكَهَا مِنْ جَرَّائِي)). وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((إِذَا أَحْسَنَ أَحَدُكُمْ إِسْلَامَهُ فَكُلُّ حَسَنَةٍ يَعْمَلُهَا تُكْتَبُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا إِلَى سَبْعِ مِائَةِ ضِعْفٍ، وَكُلُّ سَيِّئَةٍ يَعْمَلُهَا تُكْتَبُ بِمِثْلِهَا حَتَّى يَلْقَى اللَّهَ (ﷻ) )). [بخاري/ حسن اسلام المرء/٤٢]

(ابوهریرە)( دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ((خوای گەورە فەرموویەتی: ئەگەر بەندەکەم نیازی وابوو چاکەیەك بکات، چاکەکەی بۆ دەنووسم کەهێشتا نەیکردووە، ئەگەر کردی ئەوا بەدەقات بۆی دەنووسم، بەلاَم ئەگەر نیازی وابوو کەخراپەیەك بکات ئەگەر نەیکرد من لێی خۆشدەبم. ئەگەر کردیشی یەك خراپەی بۆ دەنووسم)).

هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ((فریشتەکان وتیان: پەروەردگار ئەوە بەندەکەتە نیازی وایە خراپەیەك بکات ـ هەرچەندە خواباشتر چاوی لێیەتی ـ فەرمووی: ((چاودێری بکەن، ئەگەر کردی وەکو خۆی بۆی بنووسن، ئەگەر وازیشی لێهێنا چاکەیەکی بۆ بنووسن. چونکە لەبەر من وازی لێهێناوە)).

هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ((ئەگەر یەکێکتان ئیسلامەتیەکەی بەباش ئەنجامدا، هەرچاکەیەك کەدەیکات دەقات بۆی دەنووسرێت هەتا، حەوسەد قات. هەر خراپەیەکیش کەدەیکات بەقەد خراپەکە بۆی دەنووسرێت هەتا دەگەرێتەوە بۆ لای خوای گەورە)).

٦٦ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((إِنَّ اللَّهَ تبارك و تعالى تَجَاوَزَ لِأُمَّتِي مَا حَدَّثَتْ بِهِ أَنْفُسَهَا، مَا لَمْ يَتَكَلَّمُوا أَوْ يَعْمَلُوا بِهِ)). [بخاري/ العتق/ الخطأ والنسيان/٢٣٩١]

(ابوهریرە)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: ( خوای گەورەو بالاَدەست لەوشتانەی ئوممەتم دەبورێت کەبەخەیاڵیاندا دێت، مادام نەیڵێن یان نەیکەن).

## ( ٤٤ ) موسڵمان ئەوەیە موسڵمانان پارێزراوبن لەزیانی

٦٧ـ عن عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرِو بْنِ الْعَاص (ﷺ): إِنَّ رَجُلًا سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ): أَيُّ الْمُسْلِمِينَ خَيْرٌ؟ قَالَ: ((مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ)).

(عبداللە)کوڕی(عمرو) کوڕی(عاص)(ﷺ) دەڵێ: پیاوێك لەپێغەمبەری خوای(ﷺ) پرسی: کام موسڵمانە چاکە؟ فەرمووی: ((ئەوەی کە موسڵمانان لەدەست و زمانی پارێزراو بن)).

## ( ٤٥ ) هەرکەس لەنەفامیدا چاکە بکات و دوایی موسڵمان ببێ

٦٨ـ عن عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ: أَنّ حَكِيمَ بْنَ حِزَامٍ أَخْبَرَهُ: أَنَّهُ قَالَ لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ): أَيْ رَسُولَ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ أُمُورًا كُنْتُ أَتَحَنَّثُ بِهَا فِي الْجَاهِلِيَّةِ، مِنْ صَدَقَةٍ أَوْ عَتَاقَةٍ أَوْ

صِلَةَ رَحِمٍ، أفيهَا أجْرٌ؟ فَقَالَ ﴿لهُ﴾ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): ((أَسْلَمْتَ عَلَى مَا أَسْلَفْتَ مِنْ خَيْرٍ)). [بخاري/ الزكاة، من تصدق في الشرك ثم اسلم/ ١٣٦٩]

(عروه) کوڕی (زبیر) دەڵێ: (حکیم) کوڕی (حزام) بۆی گێڕاوەتەوە کە بەپێغەمبەری خوای(ﷺ) وتووە: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) ئایا ئەو کاروبارانەی کەلە نەفامیدا پەرستشمان پێدەکردن لەخێرو ئازادکردنی بەندەو سەردان لە کەسوکار، ئایا پاداشتیان هەیە؟ پێغەمبەر(ﷺ) لەوەڵامدا فەرمووی: ((تۆ لەسەر ئەوچاکانە موسڵمان بوویت کەپێشتر ئەنجامت داون)).

## ( ٤٦ ) وریاکردنەوە لەتاقیکردنەوە

٦٩ـ عَنْ حُذَيْفَةَ (ﷺ) قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالَ: ((أَحْصُوا لِي كَمْ يَلْفِظُ الْإِسْلَامَ)). قَالَ: فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَتَخَافُ عَلَيْنَا وَنَحْنُ مَا بَيْنَ السِّتِّ مِائَةٍ إِلَى السَّبْعِ مِائَةٍ؟ قَالَ: ((إِنَّكُمْ لَا تَدْرُونَ لَعَلَّكُمْ أَنْ تُبْتَلَوْا)). قَالَ: فَابْتُلِينَا، حَتَّى جَعَلَ الرَّجُلُ مِنَّا لَا يُصَلِّي إِلَّا سِرًّا)). [بخاري/ الجهاد، كتابة الامام الناس/٢٨٩٥]

(حذيفة)(ﷺ)دەڵێ: لەخزمەت پێغەمبەری خوادا(ﷺ) بووین، فەرمووی: ((بۆم بژمێرن چەند کەس دانی بەئیسلامدا ناوە)) دەڵێ: وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئایا غەمی ئێمەتە لەکاتێکا ئێمە لەنێوان شەشسەد تا حەوسەد کەسین؟ فەرمووی: ((ئێوە نازانن لەوانەیە تووشی تاقیکردنەوە ببن)) دەڵێ: تووشی هاتین هەتا وامان لێهات پیاوێك لەئێمە مەگەر بەدزی نوێژی بکردایا.

## ( ٤٧ ) ئیسلام بەغەریبی سەری هەڵداو غەریبیش دەکەوێتەوە

٧٠ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((إِنَّ الْإِسْلَامَ بَدَأَ غَرِيبًا، وَسَيَعُودُ غَرِيبًا كَمَا بَدَأَ، وَهُوَ يَأْرِزُ بَيْنَ الْمَسْجِدَيْنِ كَمَا تَأْرِزُ الْحَيَّةُ فِي جُحْرِهَا)).

(ابن عمر)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ((ئیسلام بەغەریبی سەری هەڵداو غەریبیش دەکەوێتەوە وەکو سەرەتا لەنێوان دوو مزگەوتەکەدا کۆدەبێتەوە، هەروەکو مار لەکونەکەی خۆیدا خۆی کۆدەکاتەوە)).

## ( ٤٨ ) وەحی بۆ پێغەمبەری خوا چۆن دەستی پێکرد

٧١ـ عن عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ: أَنَّ عَائِشَةَ (ﷺ) -زَوْجَ النَّبِيِّ (ﷺ)- أَخْبَرَتْهُ أَنَّها قَالَتْ: كَانَ أَوَّلُ مَا بُدِئَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) مِنَ الْوَحْيِ الرُّؤْيَا الصَّادِقَةَ فِي النَّوْمِ،

فكان لا يَرَى رُؤْيَا إلَّا جاءَتْ مِثْل فلقِ الصُّبْح، ثُمّ حُبِّبَ إليْـهِ الْخَلَـاءُ، فكانَ يَخْلُو بِغَار حِراءٍ يَتَحنَّثُ فيـه -وَهُوَ التَّعَبُّدُ- اللَّيَالِيَ أُوْلات الْعَدَد قَبْلَ أَنْ يَرْجِعَ إلَـى أَهْله، وَيَتَزَوَّدُ لذلك، ثُمَّ يَرْجِعُ إلَى خَدِيجَة فَيَتَزَوَّدُ لمِثْلها. حتَّـى فَجِئَهُ الْحَقُّ وهُـوَ في غَار حِراءٍ، فجَاءَهُ الْمَلَكُ فقَال: اقْرَأْ، قـال: ((مَـا أَنَـا بِقَـارِئٍ)). قَـالَ: ((فَأَخَذَنِي فغَطَّنِي حتَّى، بَلَغَ مِنِّي الْجَهْدَ، ثُمَّ أَرْسلَنِي، فقَال: اقْـرَأْ، قَـالَ قُلْـتُ: ((مَـا أَنَـا بِقَارِئٍ)). قَالَ: فأَخَذَنِي فغَطَّنِي الثَّانِيَةَ، حَتَّى بلغ مِنِّي الْجَهْدَ، ثُمَّ أَرْسلَنِي، فقَـالَ: اقْرَأْ، فَقُلْتُ: ((مَا أَنَا بِقَارِئٍ)). قَالَ: ((فَأَخذَنِي فغَطَّنِي الثَّالِثَة، حتَّـى بَلَغَ مِنِّي الْجَهْد، ثُمّ أَرْسَلَنِي، فقَال: ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ. خَلَقَ الْإِنْسَانَ مِنْ عَلَقٍ. اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ. الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ. عَلَّمَ الْإِنْسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ﴾[العلق: ١-٥]. فَرَجعَ بِهَا رَسُـولُ اللَّـه (ﷺ) تَرْجُـفُ بَـوادِرُهُ، حَتَّـى دَخَلَ عَلَـى خَدِيجَـة فَقَـالَ: ((زَمِّلُونِـي زَمِّلُونِـي)). فزَمَّلُـوهُ حَتَّـى ذَهَـبَ عَنْـهُ الـرَّوْعُ، ثُـمَّ قَـالَ لِخَدِيجَـةَ: ((أَيْ خَدِيجَةُ مَا لِي)). وَأَخْبَرهَا الْخَبَر، قَالَ: ((لَقَدْ خَشِيتُ عَلَى نَفْسِي)). فقَالَتْ لَهُ خَدِيجَةُ: كَلَّا، أَبْشِرْ، فَوَاللَّه لَا يُخْزِيك اللَّهُ أَبدًا، واللَّه إنَّك لَتَصِلُ الرَّحِمَ، وَتَصْدُقُ الْحَدِيثَ، وتَحْمِلُ الْكَلَّ، وتَكْسِبُ الْمَعْدُومَ، وَتَقْرِي الضَّيْـفَ، وَتُعِينُ عَلَـى نَوَائِبِ الْحقِّ. فانْطَلقَتْ بِه خَدِيجَةُ حتَّى أَتَتْ بِه ورقة بْنَ نوْفل بْن أَسَد بْنِ عَبْد الْعُزَّى، وَهُو ابْنُ عَمِّ خَدِيجَة أخِي أبِيها، وكَانَ امْرَأً تَنَصَّرَ فِي الْجَاهِلِيَّة، وكَانَ يَكْتُـبُ الْكِتَابَ الْعَرَبِيَّ وَيَكْتُبُ من الْإِنْجيل بالْعَرَبِيَّة ما شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَكْتُـبَ، وكَانَ شَيْخًا كَبِيرًا قَدْ عَمِيَ، فقَالَتْ لَهُ خَدِيجَةُ، أَيْ عَمِّ، اسْمعْ من ابْن أَخِيك، قَال ورقَةُ بْنُ نَوْفَل: يَا ابْنَ أَخِي مَاذَا تَرى؟ فأَخْبَرهُ رسُولُ اللَّه (ﷺ) خَبَر ما رأى، فَقَالَ لَهُ ورَقَـةُ: هَـذَا النَّامُوسُ الَّذِي أُنْزِلَ عَلَى مُوسَى (ﷺ)، يَا لَيْتَنِي فِيهَا جَذَعًا، يَا لَيْتَنِي أَكُونُ حَيًا حِينَ يُخْرِجُك قَوْمُكَ. قَالَ: رسُولُ اللَّه (ﷺ): ((أَوَ مُخْرِجِيَّ هُمْ)). قَال وَرَقَةُ: نَعَمْ لَمْ يَأْتِ رَجُلٌ قَطُّ بِمَا جِئْتَ بِه إلَّا عُودِيَ، وَإِنْ يُدْرِكْنِي يَوْمُك أَنْصُرْك نَصْرًا مُؤَزَّرًا.

(عروه) کوڕی( زبیر) دەڵێ: (عائشه)(ﷺ) هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ) ئاگاداری کردم وتی: سەرەتا کەوەحی دەستی پێکرد بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ) خەونی ڕاست بووە، هیچ خەونێکی نەدەدی کە وەکو ڕوناکی بەرەبەیان نەیەتەدی ، پاشان گۆشەگیری لەلا خۆشەویست کرا، هەربۆیە دەچووە ئەشکەوتی(حیراو) پەرستشی تێدا ئەنجام دەدا، چەندەها شەو دەمایەوە پێش ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوەو خۆی ئامادەبکاتەوە بۆی، ئینجا دەگەڕایەوە بۆلای خەدیجەو خۆی

ئامادە دەکردەوە بۆ هەمان شت ، هەتا لەپڕ لەکاتێکا لەئەشکەوتی حیرادا بوو (هەق) رایچڵەکاندو، فریشتەکە هاتە لای و فەرمووی: بخوێنە، وتم: ((من خوێندەوار نیم)) فەرمووی: گرتمیو گوشیمی بەخۆیدا هەتا ماندوی کردم ئینجا بەریدامو فەرمووی: بخوێنە، وتم: ((من خوێندوارنیم))، جارێکیت گرتمیو گوشیمی بەخۆیدا هەتا ماندوی کردمو ،ئینجا بەریدامو فەرمووی: بخوێنە، منیش وتم: ((من خوێندەوارنیم))، فەرمووی: بۆ سێیەم جار گرتمیو گوشیمی بەخۆیدا هەتا ماندووی کردم، ئینجا بەردامو وتی:﴿اقرأ باسم ربك الذي خلق خلق الانسان من علق اقرأ وربك الاكرم الذي علم بالقلم، علم الانسان مالم يعلم﴾العلق: ١ ـ ٥ .

بەوشێوەیە پێغەمبەر(ﷺ) گەرایەوە بۆماڵەوە، دەمارەکانی ملی دەلەرزی هەتا چووە ژوورەوە بۆ لای خەدیجەو فەرمووی: ((دامپۆشن، دامپۆشن)) دایانپۆشی هەتا هێمن بوویەوە .ئینجا بەخەدیجەی فەرموو: (( ئەی خەدیجە ئەوە من چیمە؟ )) ئینجا هەواڵەکەی بۆ گێڕایەوەو فەرمووی: ((زۆر لەخۆم ترسام)) خەدیجەپێی وت: نەخێر، مژدەت لێبێت، هەرگیز خوا تۆسەر شۆڕناکات، سوێند بەخوا، تۆسەردانی کەسوکارت دەکەیت، راستگۆیت، کارئاسانی بۆ خەڵکی دەکەیت، پێویستیی نەدار دابین دەکەیت، رێز لەمیوان دەگریت، کۆمەکی لێقەوماوان دەکەیت.

پاشان خەدیجە هەستاو پێغەمبەری(ﷺ) لەگەڵ خۆیدا برد بۆ لای وەرەقەی کوڕی نەوفەل کوری(اسد)کوری(عبدالعزی)، کە ئامۆزای باوك برای خەدیجە بوو پیاوێك بوو لەنەفامیدا بووبوو بەگاور، نوسراوی بەعەرەبی دەنووسیەوە ئینجیلیشی بەعەرەبی دەنووسیەوە ئەوەندەی ویستی خوای لەسەر بووبێت، پیاوێکی بەتەمەنو نابینابوو خەدیجە پێی وت: ئەی مامە، گوێ بگرە لەبرازاکەت وەرەقە وتی: ئەی برازا چیت دیووە؟ پێغەمبەر(ﷺ) ئاگاداری کرد لەوەی کە دیویەتی، وەرەقە وتی: ئەوە ئەو فریشتەیە کەدابەزیە سەر موسای کوڕی عیمران(علیه السلام) خۆزگە لەوکاتەدا من لاوێکی بەهێز بومایا، خۆزگە من زیندوو بومایا لەکاتێکا خزمەکانت دەربەدەرت دەکەن. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((ئایا ئەوان دەرم دەکەن)) وەرەقە وتی: بەڵێ هەرگیز کەسێك

گەورە؟ خوای گەورە لەرۆژی قیامەتدا خەڵکی پێشینان و پاشینان هەموو لەیەك شوێندا کۆدەکاتەوە، بانگخواز دەنگی دەیانگاتێ چاو دەیانبینێت، خۆریش نزیك دەبێتەوە خەڵکی تووشی غەم و پەژارەیەك دەبن بەرگەی ناگرن و، لەتوانایاندا نییە هەندێکیان بەهەندێکیان دەڵێن: ئایا نابینن ئێوە لەچ حاڵێکدان؟ ئایا نابینن چی یەخەی گرتوون؟ ئایا ناگەڕێن بەدوای کەسێکدا کەلەلای خواشەفاعەتتان بۆ بکات؟ هەندێکیان بەهەندێکی تریان دەڵێن: بچن بۆلای ئادەم، دەچن بۆلای ئادەم، پێی دەڵێن: ئەی ئادەم تۆباوکی مرۆڤیت، خوا بەدەستی ﴿قودرەتی﴾خۆی تۆی دروستکردووە، لەرۆحی خۆی گیانی بەبەرداکردووی ، فەرمانی کرد بەفریشتەکان کرنووشیان بۆ بردی، دەلای پەروەردگارت تکامان بۆ بکە، ئایا نابینی ئێمە لەچ حاڵێکداین؟ ئایا نابینی چی یەخەی گرتووین؟ ئادەمیش دەڵێ: ئەمڕۆ پەروەردگارم بەشێوەیەك تووڕە بووە کەتا ئێستا ئاوا تووڕە نەبوو، لەمەولاش ئاوا تووڕە نابێت، ئەو درەختەکەی لەمن قەدەغەکردو منیش سەرپێچیم کرد، ﴿ئەمڕۆ﴾هەر خەمی خۆمە، خەمی خۆمە، بچن بۆلای یەکێکی‌تر، بچن بۆلای نوح، دەچن بۆلای نوح (علیه السلام) دەڵێن: تۆ یەکەم رەوانەکراوی بۆ سەر زەوی، خوای گەورە ناوی ناوی بەندەی سوپاسگوزار، تکامان بۆ بکە لای پەروەردگارت، ئایا نابینی ئێمە لەچیداین؟ ئایا نابینی چی یەخەی گرتووین؟ ئەویش پێیان دەڵێت: پەروەردگارم ئیمڕۆ تووڕەبوونێك تووڕە بووە لەمەوپێش ئاوا تووڕە نەبووە، لەمەولاش ئاوا تووڕە نابێت، من لەراستیدا یەك دۆعام هەبوو ئەویش لەگەڵەکەمم کرد، ئێستا هەر غەمی خۆمە غەمی خۆمە، بچن بۆ لای ابراهیم(علیه السلام) ئەوانیش دەچن بۆلای (ابراهیم) (علیه السلام) پێی دەڵێن: تۆ پێغەمبەری خوایت و خۆشەویستی ئەوی لەسەرزەویدا تکامان بۆ بکە لای پەروەردگارت، ئایا نابینی ئێمە لەچ حاڵێکداین، ئایا نابینی چی‌یەخەی گرتووین؟ ئیبراهیم پێیان دەڵێت: ئەمڕۆ پەروەردگارم تووڕەبوونێك تورەبووە کەلەمەوپێش ئاوا تووڕەنەبووەو، لەمەولاش ئاوا تووڕەنابێت، ئینجا باسی درۆکانی کرد، ئەمڕۆ هەرغەمی خۆمە، هەرغەمی خۆمە، بچن بۆلای کەسێکی‌تر بچن بۆلای (موسی) (علیه السلام) ئەوانیش دەچن بۆ لای (موسی)(علیه السلام) پێی دەڵێن: ئەی (موسی) تۆ پێغەمبەری خوای، خوای گەورە رێزی زیاتری داوە بە تۆ بەپەیامەکانی و

بەقسەکردنی لەگەڵتا، تکامان بۆ بکە لای پەروەردگارت، ئایا نابینی ئێمە لەچ حاڵێکداین؟ ئایا نابینی چی یەخەی گرتووین؟ (موسی) پێیان دەڵێت: ئەمڕۆ پەروەردگارم تووڕەبوونێك تووڕەبووە کەلەمەوپێش ئاوا تووڕە نەبووەو لەمەودواش ئاوا تووڕە نابێت، من کەسێکم کوشتووە فەرمانم پێنەکرابوو بیکوژم، ئێستا هەر غەمی خۆمە، هەر غەمی خۆمە، بچن بۆلای (عیسی). ئەوانیش دێن بۆلای( عیسی)(علیه السلام) پێی دەڵێن: ئەی (عیسی) تۆ پێغەمبەری خوای، لەبێشکەدا قسەت لەگەڵ خەڵکیدا کردووە، ڕۆحی خواو وشەیەکی پیرۆزی ئەویت کە هەڵی داوە بۆ مریەم و بەخشراوی بەمریەم دە تکامان بۆ بکە لای پەروەردگارت، ئایا نابینی ئێمە لەچ حاڵێکداین؟ ئایا نابینی چی یەخەی گرتووین؟ (عیسی)ش پێی وتن: ئەمڕۆ پەروەردگارم تووڕەبوونێك تووڕەبووە کەلەمەوپێش ئاوا تووڕە نەبووەو لەمەو دواش ئاوا تورەنابێت، هەرغەمی خۆمە بچن بۆلای کەسێکی‌تر بچن بۆلای (محمد)(ﷺ) ئەوانیش دێن بۆلام، دەڵێن: ئەی (محمد)، تۆ پێغەمبەری خوایت، دواپێغەمبەری، خوای گەورە لەگوناهە پێشووەکانت و گوناهە دواییەکانیشت خۆش بووە، تکامان بۆ بکە لەلای پەروەردگارت ، ئایا نابینی ئێمە لەچ حاڵێکداین؟ ئایا نابینی چی‌یەخەی گرتووین؟ منیش ڕادەپەڕم و دێمە ژێر عەرش، دەکەوم بەسوجدەدا بۆ پەروەردگار، ئینجا خوا دڵم دەکاتەوە چەند سوپاسگوزاریەك و ستایشێکی پیرۆز دەخاتە دڵمەوە کەلەوەوپێش نەیداوە بەکەس، ئینجا دەفەرموێت: ئەی (محمد) سەرت بەرزبکەرەوە، داوابکە دەتدرێتیٚ، تکا بکە لێت وەردەگیرێت، منیش سەرم بەرزدەکەمەوەو دەڵێم: ئەی پەروەردگارم ئوممەتم، ئوممەتم ! پێم دەوترێ: ئەی (محمد) لەئوممەتەکەت ئەوانەی لێپرسینەوەیان لەسەر نییە لەدەرگای لای ڕاستی دەرگاکانی بەهەشتەوە، بیانخە ناو بەهەشتەوە، ئوممەتت لەدەرگاکانی تریشا بەشدارن لەگەڵ خەڵکی، سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، لەنێوان دوولاشیپانی دەرگاکانی بەهەشتا بەقەد نێوان مەککەو هەجەر پانە ، یاوەکو نێوانی مەککەو بوسرا)).

## ( ٥٨ ) من یەکەم کەسم لەبەهەشتا شەفاعەت دەکەم و، شوێنکەوتوانیشم لەهەموو پێغەمبەران زیاترە

٩١ـ عن أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: قالَ النَّبِيُّ (ﷺ): ((أَنَا أَوَّلُ شَفِيعٍ فِي الْجَنَّةِ، لَمْ يُصَدَّقْ نَبِيٌّ مِنَ الْأَنْبِيَاءِ مَا صُدِّقْتُ، وَإِنَّ مِنَ الْأَنْبِيَاءِ نَبِيًّا مَا يُصَدِّقُهُ مِنْ أُمَّتِهِ إِلَّا رَجُلٌ وَاحِدٌ)).

(انس) کوڕی (مالك(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( من یەکەم شەفاعەتکارم لەبەهەشتا ، هیچ پێغەمبەرێك بەقەد من خەڵك باوەڕی پێنەهێناوە لەناو پێغەمبەراندا، پێغەمبەر هەیە لەناو میللەتەکەیدا کەس باوەڕی پێنەهێناوە جگە لەیەك پیاو)).

## ( ٥٩ ) پێغەمبەر( ﷺ ) داوای کردنەوەی دەرگای بەهەشت دەکات

٩٢ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((آتِي بَابَ الْجَنَّةِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَأَسْتَفْتِحُ، فَيَقُولُ الْخَازِنُ: مَنْ أَنْتَ؟ فَأَقُولُ: مُحَمَّدٌ، فَيَقُولُ: بِكَ أُمِرْتُ لَا أَفْتَحُ لِأَحَدٍ قَبْلَكَ)).

(انس) کوڕی (مالك) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: لەرۆژی قیامەتدا دێمە دەرگای بەهەشت، داوای کردنەوەی دەکەم، دەرگاوانەکە دەڵێ: تۆ کێیت؟ دەڵێم: محمد، دەڵێت: فەرمانم بە تۆ پێکراوە لەپێش تۆدا بۆکەسی تری ناکەمەوە)).

## ( ٦٠ ) هەر پێغەمبەرێك نزایەکی گیرای هەیە

٩٣ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((لِكُلِّ نَبِيٍّ دَعْوَةٌ مُسْتَجَابَةٌ، فَتَعَجَّلَ كُلُّ نَبِيٍّ دَعْوَتَهُ، وَإِنِّي اخْتَبَأْتُ دَعْوَتِي شَفَاعَةً لِأُمَّتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَهِيَ نَائِلَةٌ -إِنْ شَاءَ اللَّهُ- مَنْ مَاتَ مِنْ أُمَّتِي لَا يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا)).

(ابو هريره) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ((هەر پێغەمبەرێك نزایەکی گیرای هەیە هەموو پێغەمبەرێك پەلەی کردووە لەنزاکەیدا بەلام من نزاکەم شاردۆتەوە بۆ ئوممەتەکەم بۆ رۆژی قیامەت کە(ان شاء الله)گیرایە بۆ هەرکەس لەئوممەتم کەمردبێ و هاوەڵی بۆ خوا بریار نەدابێ.

## (٦١) پارانەوەی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ ئوممەتەکەی

٩٤ـ عَنْ عَبْدِ اللَّه بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (ﭬ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) تَلَا قَوْلَ اللَّه (ﻷ) فِي إِبْرَاهِيمَ (ﻵ): ﴿رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِنَ النَّاسِ فَمَنْ تَبِعَنِي فَإِنَّهُ مِنِّي وَمَنْ عَصَانِي﴾ ﴿إبراهيم: ٣٦﴾ الْآيَةَ ، وَقَالَ عِيسَى (ﻵ): ﴿إِنْ تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِنْ تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنْتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ ﴿المائدة: ١٨﴾. فَرَفَعَ يَدَيْهِ وَقَالَ: ((اللَّهُمَّ أُمَّتِي اللهم أُمَّتِي)). وَبَكَى، فَقَالَ اللَّهُ (ﻷ): يَا جِبْرِيلُ اذْهَبْ إِلَى مُحَمَّدٍ – وَرَبُّكَ أَعْلَمُ– فَسَلْهُ مَا يُبْكِيكَ؟ فَأَتَاهُ جِبْرِيلُ (ﻵ) فَسَأَلَهُ فَأَخْبَرَهُ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) بِمَا قَالَ –وَهُوَ أَعْلَمُ– فَقَالَ اللَّهُ (ﻷ): يَا جِبْرِيلُ اذْهَبْ إِلَى مُحَمَّدٍ فَقُلْ: إِنَّا سَنُرْضِيكَ فِي أُمَّتِكَ وَلَا نَسُوءُكَ.

(عبدالله) کوڕی (عمرو) کوڕی (عاص)(ﭬ) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە:﴿رب انهن اضللن كثيراً من الناس فمن تبعني فأنه مني ومن عصاني ﴾ (ابراهيم:٣٦).عیساش(عليه السلام) فەرموویەتی:﴿ان تعذبهم فأنهم عبادك وان تغفر لهم فانك انت العزيـز الحكيم ﴾(المائدة: ١١٨)واتە: ئەگەر سزایان بدەیت ئەوان هەر بەندەی تۆن، خۆئەگەر لێشیان خۆش ببیت تەنها تۆ سەر بڵندو دانایت.

ئنجا دەستی بەرزکردەوەو فەرمووی: ئەی خوایە ئوممەتەکەم ئەی خوایە ئوممەتەکەم، ئینجا گریا، خوای گەورە بەجوبرەئیلی فەرموو: بڕۆ بۆلای موحەمەد، خۆ پەروەردگارت زاناترە ــ لێی بپرسە بۆچی دەگریت؟ جوبرەئیل(عليه السلام) هات و پرسیاری لێکرد: پێغەمبەر(ﷺ) ئاگاداری کرد لەوتەکەی ئەویش زاناترە ـ خوای گەورە فەرمووی: ئەی جوبرەئیل بچۆ بۆلای موحەمەد پێی بڵێ: ئێمە بەرامبەر بە ئوممەتەکەت رازیت دەکەین و دڵت ناشکێنین.

٩٥ـ عَنْ جَابِرٍ (ﭬ): أَنَّ الطُّفَيْلَ بْنَ عَمْرٍو الدَّوْسِيَّ أَتَى النَّبِيَّ (ﷺ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّه هَلْ لَكَ فِي حِصْنٍ حَصِينٍ وَمَنْعَةٍ؟ قَالَ: حِصْنٌ كَانَ لِدَوْسٍ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، فَأَبَى ذَلِكَ النَّبِيُّ (ﷺ) لِلَّذِي ذَخَرَ اللَّهُ لِلْأَنْصَارِ، فَلَمَّا هَاجَرَ النَّبِيُّ (ﷺ) إِلَى الْمَدِينَةِ هَاجَرَ إِلَيْهِ الطُّفَيْلُ بْنُ عَمْرٍو، وَهَاجَرَ مَعَهُ رَجُلٌ مِنْ قَوْمِهِ، فَاجْتَوَوُا الْمَدِينَةَ فَمَرِضَ فَجَزِعَ، فَأَخَذَ مَشَاقِصَ لَهُ فَقَطَعَ بِهَا بَرَاجِمَهُ، فَشَخَبَتْ يَدَاهُ حَتَّى مَاتَ، فَرَآهُ الطُّفَيْلُ بْنُ عَمْرٍو فِي مَنَامِهِ، فَرَآهُ وَهَيْئَتُهُ حَسَنَةٌ، وَرَآهُ مُغَطِّيًا يَدَيْهِ،

فَقَالَ لَهُ: مَا صَنَعَ بِكَ رَبُّكَ؟ فَقَالَ: غَفَرَ لِي بِهِجْرَتِي إِلَى نَبِيِّهِ (ﷺ)، فَقَالَ: مَا لِي أَرَاكَ مُغَطِّيًا يَدَيْكَ؟ قَالَ: قِيلَ لِي: لَنْ نُصْلِحَ مِنْكَ مَا أَفْسَدْتَ. فَقَصَّهَا الطُّفَيْلُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((اللَّهُمَّ وَلِيَدَيْهِ فَاغْفِرْ)).

جابر(ﷺ) دەڵێ: (طفیل) کوڕی (عمرو الدوسی) هات بۆ خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)ئایا قەڵایەکی قایمت ناوێ کەبتپارێزێت؟ راوی دەڵێ: ئەو قەڵایە هی دەوس بوو لەسەردەمی نەفامیدا، پێغەمبەر(ﷺ) رازی نەبوو، بەوچوونە چونکە خوا رێزی ئەو کۆچەی بۆ پشتیوانەکانی هەڵگرتبوو، کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) کۆچیکرد بۆ مەدینە(طفیل)کوڕی (عمرو) کۆچیکرد بۆلای، پیاوێکیش لەهۆزەکەی لەگەڵیا کۆچیکرد، حەزیان لەمەدینە نەبوو لەوێ نەخۆش کەوتبوو و بێزاربوو، تیرێکی پێبوو بەسەری تیرەکە کلاوەی سەرپەنجەکانی خۆی بڕی، خوێنی دەستەکانی بەربوون هەتا مرد. (طفیل)کوڕی (عمر) لەخەویا ئەو پیاوەی بینی بەدیمەنێکی جوانەوە بەڵام دەستەکانی داپۆشراوبووە، پێی وتووە: پەروەردگارت چی لیکردی؟ دەڵێ: بەکۆچکردنم بۆلای پێغەمبەرەکەی(ﷺ) لێم خۆشبوو دەڵێ وتم: ئەی بۆچی ئاوا دەستت داپۆشراوە؟ (طفیل)بۆ پێغەمبەری گێرایەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (( خوای گەورە لەدەستەکانیشی خۆش ببە)).

## (٦٢) لەبارەی ئەم ئایەتەوە: ﴿وانذر عشيرتك الاقربين﴾

٩٦ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: لَمَّا أُنْزِلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ: ﴿وَأَنْذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ﴾ ﴿الشعراء:٢١٤﴾ دَعَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) قُرَيْشًا فَاجْتَمَعُوا، فَعَمَّ وَخَصَّ، فَقَالَ: ((يَا بَنِي كَعْبِ بْنِ لُؤَيٍّ أَنْقِذُوا أَنْفُسَكُمْ مِنَ النَّارِ، يَا بَنِي مُرَّةَ بنِ كَعْبٍ أَنْقِذُوا أَنْفُسَكُمْ مِنَ النَّارِ، يَا بَنِي عَبْدِ شَمْسٍ أَنْقِذُوا أَنْفُسَكُمْ مِنَ النَّارِ، يَا بَنِي عَبْدِ مَنَافٍ أَنْقِذُوا أَنْفُسَكُمْ مِنَ النَّارِ، يَا بَنِي هَاشِمٍ أَنْقِذُوا أَنْفُسَكُمْ مِنَ النَّارِ، ﴿يَا بَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ أَنْقِذُوا أَنْفُسَكُمْ مِنَ النَّارِ﴾، يَا فَاطِمَةُ أَنْقِذِي نَفْسَكِ مِنَ النَّارِ، فَإِنِّي لَا أَمْلِكُ لَكُمْ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا، غَيْرَ أَنَّ لَكُمْ رَحِمًا سَأَبُلُّهَا بِبَلَالِهَا)). [بخاري / الوصايا/ هل يدخل النساء يولد في الاقارب /٢٦٠٢]

(ابو هريره)(ﷺ) دەڵێ: کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی ﴿وانذر عشيرتك الاقربين﴾ (الشعراء:٢١٤) پێغەمبەر(ﷺ) قورەیشی بانگ کردو کۆبوونەوە بانگی قورەیشی بەگشتیو چەند کەسێك بەتایبەتی کرد ، فەرمووی: (( ئەی نەوەی کەعبی

کوڕی لوئەی خۆتان رزگارکەن لەئاگر ئەی نەوەی موڕەی کوری کەعب، خۆتان رزگار کەن لەئاگر، ئەی نەوەی عەبدشەمس خۆتان رزگار کەن لەئاگر، ئەی نەوەی( عەبدول مەناف) خۆتان رزگارکەن لەئاگر ئەی نەوەی هاشم خۆتان رزگارکەن لەئاگر ﴿ئەی نەوەی عەبدول موتەلیب خۆتان رزگار کەن لەئاگر﴾ئەی فاتمە خۆت رزگارکە لەئاگر، من لەلای خوا هیچ دەسەلاتێکم نییە، جگە لەوەی رەحم و خزمایەتی هەیە لەنێوانماندا و دەیگەیەنم)).

## (٦٣) پێغەمبەر(ﷺ) فریای (ابوطالب)ناکەوێت

٩٧- عَنِ الْعَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَلْ نَفَعْتَ أَبَا طَالِبٍ بِشَيْءٍ، فَإِنَّهُ كَانَ يَحُوطُكَ وَيَغْضَبُ لَكَ؟ قَالَ (ﷺ): ((نَعَمْ هُوَ فِي ضَحْضَاحٍ مِنْ نَارٍ، وَلَوْلَا أَنَا لَكَانَ فِي الدَّرْكِ الْأَسْفَلِ مِنَ النَّارِ)). [بخاري/ فضائل الصحابة/ قصة ابي طالب / ٣٦٧ ، ٣٦٧٢]

(عباس) کوری(عبدالمطلب)(ﷺ) دەڵێ: وتم ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ): ئایا کەڵکێکت گەیاند بە(ابوطالب) ئەو جاران تۆی دەپاراست لەسەر تۆ تووڕە دەبوو؟ فەرمووی: (( بەڵێ ئەو لەناو ئاگرێکی تەنکدایە، ئەگەر من نەبوومایە دەبوو لەقولایی خوارەوەی ئاگردا بوایە)).

٩٨- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((أَهْوَنُ أَهْلِ النَّارِ عَذَابًا أَبُو طَالِبٍ، وَهُوَ مُنْتَعِلٌ بِنَعْلَيْنِ ﴿من نار﴾ يَغْلِي مِنْهُمَا دِمَاغُهُ)). [بخاري/ الطب/ ٥٣٧٨]

(ابن عباس) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (( سوکترین سزای ئاگری دۆزەخ سزای (ابوطالب)ە ،ئەویش جووتێ نەعلی لەئاگر دروستکراوی لەپێدایە، بەهۆی ئەو نەعلانەوە مێشکی دەکوڵێت.

## (٦٤) حەفتا هەزار لەئومەتم بەبێ لێپرسینەوە دەچنە بەهەشت

٩٩. عن حُصَيْنُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ (ﷺ) قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ فَقَالَ: أَيُّكُمْ رَأَى الْكَوْكَبَ الَّذِي انْقَضَّ الْبَارِحَةَ؟ قُلْتُ: أَنَا. ثُمَّ قُلْتُ: أَمَا إِنِّي لَمْ أَكُنْ فِي صَلَاةٍ، وَلَكِنِّي لُدِغْتُ. قَالَ: فَمَاذَا صَنَعْتَ؟ قُلْتُ: اسْتَرْقَيْتُ. قَالَ: فَمَا حَمَلَكَ عَلَى ذَلِكَ؟ قُلْتُ: حَدِيثٌ حَدَّثَنَاهُ الشَّعْبِيُّ، فَقَالَ: وَمَا حَدَّثَكُمُ الشَّعْبِيُّ؟ قُلْتُ: حَدَّثَنَا عَنْ بُرَيْدَةَ بْنِ حُصَيْبٍ الْأَسْلَمِيِّ أَنَّهُ قَالَ: لَا رُقْيَةَ إِلَّا مِنْ عَيْنٍ أَوْ حُمَةٍ، فَقَالَ: قَدْ أَحْسَنَ مَنِ انْتَهَى إِلَى مَا سَمِعَ، وَلَكِنْ حَدَّثَنَا ابْنُ عَبَّاسٍ عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((عُرِضَتْ عَلَيَّ الْأُمَمُ، فَرَأَيْتُ النَّبِيَّ وَمَعَهُ الرُّهَيْطُ، وَالنَّبِيَّ وَمَعَهُ الرَّجُلُ وَالرَّجُلَانِ، وَالنَّبِيَّ

لَيْسَ مَعَهُ أَحَدٌ، إِذْ رُفِعَ لِي سَوَادٌ عَظِيمٌ فَظَنَنْتُ أَنَّهُمْ أُمَّتِي، فَقِيلَ لِي: هَذَا مُوسَى وَقَوْمُهُ، وَلَكِنِ انْظُرْ إِلَى الْأُفُقِ، فَنَظَرْتُ فَإِذَا سَوَادٌ عَظِيمٌ، فَقِيلَ لِي: انْظُرْ إِلَى الْأُفُقِ الْآخَرِ، ﴿فنظرتُ﴾ فَإِذَا سَوَادٌ عَظِيمٌ، فَقِيلَ لِي: هَذِهِ أُمَّتُكَ، وَمَعَهُمْ سَبْعُونَ أَلْفًا يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ بِغَيْرِ حِسَابٍ وَلَا عَذَابٍ)). ثُمَّ نَهَضَ، فَدَخَلَ مَنْزِلَهُ، فَخَاضَ النَّاسُ فِي أُولَئِكَ الَّذِينَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ بِغَيْرِ حِسَابٍ وَلَا عَذَابٍ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: فَلَعَلَّهُمُ الَّذِينَ صَحِبُوا رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) وَقَالَ بَعْضُهُمْ: فَلَعَلَّهُمُ الَّذِينَ وُلِدُوا فِي الْإِسْلَامِ وَلَمْ يُشْرِكُوا بِاللَّهِ ﴿شيئاً﴾ وَذَكَرُوا أَشْيَاءَ، فَخَرَجَ عَلَيْهِمْ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالَ: ((مَا الَّذِي تَخُوضُونَ فِيهِ)). فَأَخْبَرُوهُ، فَقَالَ: ((هُمُ الَّذِينَ لَا يَرْقُونَ وَلَا يَسْتَرْقُونَ، وَلَا يَتَطَيَّرُونَ، وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ)). فَقَامَ عُكَّاشَةُ بْنُ مِحْصَنٍ فَقَالَ: ادْعُ اللَّهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ، فَقَالَ: ((أَنْتَ مِنْهُمْ)). ثُمَّ قَامَ رَجُلٌ آخَرُ فَقَالَ: ادْعُ اللَّهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ، فَقَالَ: ((سَبَقَكَ بِهَا عُكَّاشَةُ)). [بخاري/ الضب / ٥٣٧٨]

(حصين) كوری( عبدالرحمن) (ﷺ) دەڵێ: من لەلای (سعیدی) كوری( جبیر) بووم وتی: كێتان ئەو ئەستێرەیەی دی كە دوێنێ كەوتە خوارەوە؟ دەڵێ: وتم: من ئینجا وتم: بەڵام من لەنوێژدا نەبووم بەڵكو دوپشك پێوەی دابووم، وتی: ئەی چیت كرد؟ وتم: نوشتەم كرد وتی: چی وای لێكردی؟ وتم: فەرمودەیەك كە(شعبی) بۆی گێراینەوە، وتی: چی‌یە ئەوەی شەعبی بۆی گێراونەتەوە؟ وتم: لەبورەیدەی كوری(حصین الاسلمی)ەوە وتوویەتی: نوشتە نییە ﴿بۆ هیچ شتێ﴾ مەگەر بۆچاوپیسی‌و گەزین نەبێ، وتی: بەراستی چاكی كرد ئەوەی چی بیستووە پەیڕەوی دەكات بەڵام(ابن عباس) بۆی گێراینەوە لەپێغەمبەری خواوە(ﷺ) فەرموویەتی: ئوممەتەكان خرانە بەرچاوم، دەبینم پێغەمبەر هەیە كەسی لەگەڵدا نیە، ئینجا خەڵكێكی زۆرم پیشاندرا، گومانم كرد كە ئوممەتەكەی من بن، وپێم وترا: بروانە بۆ ئاسۆیەكی‌تر ﴿سەیرم كرد﴾دەبینم خەڵكێكی زۆر، پێم وترا: ئەوە ئوممەتەكەی تۆیە، حەفتا هەزاریان لەگەڵتا بەبێ لێپرینەوە دەچنە بەهەشتەوە، سزایان نییە)). ئینجا هەستا، چووە ماڵەوە، ئینجا خەڵكەكە كەوتنە باسكردنی ئەوانەی كەبەبێ لێپرسینەوە دەچنە بەهەشت‌و سزایان نییە، هەندێكیان وتی: لەوانەیە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) بن، هەندێكی‌تریان وتیان: لەوانەیە ئەوانەبن لەسەردەمی ئیسلامدا لەدایك بوون‌و شەریكیان بۆ خوا دانەناوە، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) هاتە دەرەوە بۆناویان‌و

فەرمووی: (( ئەوە باسی چی دەکەن)). ئاگاداریان کرد، فەرمووی: (( ئەوانەن کەنوشتە ناکەن، داوای نوشتەکردن ناکەن، رەشبینی ناکەن، پشت بە پەروەدگاریان دەبەستن)) (عەکاشە) کوڕی (محصن) هەستاو وتی: لەخوا داوا بکە بمخاتە ناو ئەوانە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (( تۆ لەوانی )) ئینجا پیاوێکی‌تر هەستاو وتی: داوا بکە خوا بمخاتە ناو ئەوانەوە، فەرمووی: (عەکاشە پێشت کەوت)).

## ( ٦٥ ) من خوازیارم کەنیوەی خەڵکی بەهەشت بن

١٠٠ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فِي قُبَّةٍ نَحْوًا مِنْ أَرْبَعِينَ رَجُلًا، فَقَالَ رسولُ اللهِ (ﷺ): ((أَتَرْضَوْنَ أَنْ تَكُونُوا رُبُعَ أَهْلِ الْجَنَّةِ)). قَالَ: قُلْنَا: نَعَمْ، قَالَ: ((أَتَرْضَوْنَ أَنْ تَكُونُوا ثُلُثَ أَهْلِ الْجَنَّةِ)). فَقُلْنَا: نَعَمْ، فَقَالَ: ((وَالَّذِي نَفْسُ محمدٍ بِيَدِهِ إِنِّي لَأَرْجُو أَنْ تَكُونُوا نِصْفَ أَهْلِ الْجَنَّةِ، وَذَاكَ أَنَّ الْجَنَّةَ لَا يَدْخُلُهَا إِلَّا نَفْسٌ مُسْلِمَةٌ، وَمَا أَنْتُمْ فِي أَهْلِ الشِّرْكِ إِلَّا كَالشَّعْرَةِ الْبَيْضَاءِ فِي جِلْدِ الثَّوْرِ الْأَسْوَدِ، أَوْ: كَالشَّعْرَةِ السَّوْدَاءِ فِي جِلْدِ الثَّوْرِ الْأَحْمَرِ)). [بخاري/ الرقاق/ كيف الحشر / ٦١٦٣]

(عبدالله) کوڕی( مسعود) (ﷺ) دەڵێ: ئێمە نزیکەی چل کەس لەخزمەت پێغەمبەری خوادا(ﷺ) بووین لەچادرێکدا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (( ئایا رازین چواریەکی خەڵکی بەهەشت بن )) دەڵێ: وتمان: بەڵێ ،فەرمووی: (( ئایا رازین سێیەکی خەڵکی بەهەشت بن، وتمان: بەڵێ: فەرمووی: (( سوێند بەوەی گیانی موحەمەدی بەدەستە من خوازیارم ئێوە نیوەی خەڵکی بەهەشت بن ، ئەوەشی موسڵمان نەبێ ناچێتە بەهەشت، ئێوەش لەناو خەڵکی موشریکدا وەکو موویەکی سپی وان لەپێستی گایەکی رەشدا، یاوەکو موویەکی رەش لەپێستی گایەکی سووردا)).

## ( ٦٦ ) – فەرمانی خوا بۆ ئادەم لەهەزار کەس نۆسەدو نەوەدو نۆیان بنێرە بۆ ئاگر

١٠١ـ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((يَقُولُ اللَّهُ (ﷻ): يَا آدَمُ، فَيَقُولُ: لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ، وَالْخَيْرُ فِي يَدَيْكَ. قَالَ: يَقُولُ: أَخْرِجْ بَعْثَ النَّارِ، قَالَ: وَمَا بَعْثُ النَّارِ؟ قَالَ: مِنْ كُلِّ أَلْفٍ تِسْعَ مِائَةٍ وَتِسْعَةً وَتِسْعِينَ، قَالَ: فَذَاكَ حِينَ يَشِيبُ الصَّغِيرُ ﴿وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى النَّاسَ سُكَارَى وَمَا هُمْ بِسُكَارَى

وَلَكِنَّ عَذَابَ اللَّهِ شَدِيدٌ﴾ ﴿الحج: ٢﴾)). قَالَ فَاشْتَدَّ ذلك عَلَيْهِمْ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيُّنَا ذَلِكَ الرَّجُلُ؟ فَقَالَ رسولُ الله (ﷺ): ((أَبْشِرُوا، فَإِنَّ مِنْ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ أَلْفًا وَمِنْكُمْ رَجُلٌ. ثُمَّ قَالَ: ((وَالَّذِي نَفْس محمدٍ بِيَدِهِ، إِنِّي لَأَطْمَعُ أَنْ تَكُونُوا ثُلُثَ أَهْلِ الْجَنَّةِ)). فَحَمِدْنَا اللَّهَ وَكَبَّرْنَا، ثُمَّ قَالَ: ((وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، إِنِّي لَأَطْمَعُ أَنْ تَكُونُوا شَطْرَ أَهْلِ الْجَنَّةِ إِنَّ مَثَلَكُمْ فِي الْأُمَمِ كَمَثَلِ الشَّعْرَةِ الْبَيْضَاءِ فِي جِلْدِ الثَّوْرِ الْأَسْوَدِ، أَوْ: كَالرَّقْمَةِ فِي ذِرَاعِ الْحِمَارِ)). [بخاري / الرقاق / قوله عزوجل ﴿ ان زلزلة الساعة شيء عظيم ﴾ ٦١٦٥]

(ابو سعيد) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (( خوای عزوجل دەفەرموێت: ئەی ئادەم، دەڵێ: گوێرایەڵم و لەخزمەتتام چاکەیش لەدەستی تۆدایە، دەفەرموێت: وەفدی ئاگر بنێرە، وتی: وەفدی ئاگر چەندە؟ فەرمووی: لەهەموو هەزارێك نۆسەدو نەوەدو نۆ، دەڵێ: ئەوەش لەکاتێکا منداڵ سەری سپی دەبێت:﴿ئافرەتی سك پڕ سکەکەی فرێدەدا، خەڵك دەڵێی سەرخۆشن و سەرخۆشیش نین، بەڵکو سزای خوا سەختە) دەڵێ: ئەوە زۆر نارەحەتی کردن، ئینجا وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو پیاوە کاممانە؟ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (( مژدەتان لێبێت، لەیاجوج و ماجوج هەزارو لەئێوە یەك پیاو، ئینجا فەرمووی: سوێند بەوەی گیانی موحەمەدی بەدەستە من بەتەمام کە ئێوە چواریەکی خەڵکی بەهەشتبن)). ئێمەش سوپاسی خوامان کردو تەکبیرمان کرد، پاشان فەرمووی: (( سوێند بەوەی گیانی موحەمەدی بەدەستە بەتەمام سێیەکی خەڵکی بەهەشت بن)).

ئێمەش سوپاس بۆ خوامان کردو تەکبیرمان کرد، ئینجا فەرمووی: ((سوێند بەوەی گیانی موحەمەدی بەدەستە، من بەتەمام ئێوە نیوەی خەڵکی بەهەشت بن، نمونەی ئێوە لەناو ئوممەتەکاندا ، وەکو موویەکی سپی وان لەپێستی گایەکی رەشدا یاوەکو: هێڵێکی سپی لەدەستی گوێدرێژێکدا)).

# (٢)بەشی دەستنوێژ

## (١) ـ خوا نوێژی بێ دەستنوێژ وەرناگرێت

١٠٢. عَنْ مُصْعَبِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: دَخَلَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ (ﷺ) عَلَى ابْنِ عَامِرٍ يَعُودُهُ وَهُوَ مَرِيضٌ، فَقَالَ: أَلَا تَدْعُو اللَّهَ لِي يَا ابْنَ عُمَرَ؟ قَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((لَا تُقْبَلُ صَلَاةٌ بِغَيْرِ طُهُورٍ، وَلَا صَدَقَةٌ مِنْ غُلُولٍ)). وَكُنْتَ عَلَى الْبَصْرَةِ.

(مصعب) کوڕی( سعد) دەڵێ: (عبدالله) کوڕی (عمر) (ﷺ) سەردانی (ابن عامر)ی کرد نەخۆش بوو، (ابن عامر) وتی: ئەی (ابن عمر) : ئایا لەخوا ناپاڕێیتەوە بۆم؟ (ابن عمر) وتی: لەپێغەمبەری خوام بیستووە(ﷺ) فەرموویەتی: ((خوا نوێژی بێ دەستنوێژ وەرناگرێت، خێری سامانی بەناهەق بەدەست هاتووش وەرناگرێت)) تۆیش فەرمانداری بەسرە بوویت. [واتە لەوانەیە سامانت بەناهەق بۆ خۆت لادابێت. النووی ٢/٢١٠].

## (٢) دەست شۆردن لەکاتی لەخەوهەستاندا پێش ئەوەی دەست بخەیتە دەفری ئاوەکەوە

١٠٣ـعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: ((إِذَا اسْتَيْقَظَ أَحَدُكُمْ مِنْ نَوْمِهِ فَلَا يَغْمِسْ يَدَهُ فِي الْإِنَاءِ حَتَّى يَغْسِلَهَا ثَلَاثًا، فَإِنَّهُ لَا يَدْرِي أَيْنَ بَاتَتْ يَدُهُ)).

(ابوهریرە)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: ((ئەگەر یەکێکتان لەخەو هەستا بادەستی نەخاتە ناو دەفرەکەوە هەتا سێجار دەیشۆرێت، چونکە نازانێ لەکاتی خەودا دەستی لەکوێدابووە)).

## (٣) ڕێگریی لە پیسی کردن لەسەرە ڕێگا و سێبەردا

١٠٤ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((اتَّقُوا اللَّعَّانَيْنِ)). قَالُوا: وَمَا اللَّعَّانَانِ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: ((الَّذِي يَتَخَلَّى فِي طَرِيقِ النَّاسِ أَوْ فِي ظِلِّهِمْ)).

(ابوهریرە) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ((خۆتان بپارێزن لەو دوو نەفرەت لێکراوە))وتیان: ئەو دوو نەفرەت لێکراوە چین ئەی پێغەمبەر(ﷺ)؟ فەرمووی: ((ئەوەی لەسەرە ڕێگای خەڵکیدا پیسی دەکات، یان لەسێبەرەکانیاندا)).[(کەجێگای دانیشتنی خەڵکە)].

## (٤) پەناگای کاتی سەرئاو

١٠٥ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ جَعْفَرٍ (ﷺ) قَالَ: أَرْدَفَنِي رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) ذَاتَ يَوْمٍ خَلْفَهُ، فَأَسَرَّ إِلَيَّ حَدِيثًا لَا أُحَدِّثُ بِهِ أَحَدًا مِنَ النَّاسِ، وَكَانَ أَحَبَّ مَا اسْتَتَرَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) لِحَاجَتِهِ هَدَفٌ أَوْ حَائِشُ نَخْلٍ. قَالَ ابْنُ أَسْمَاءَ فِي حَدِيثِهِ: يَعْنِي حَائِطَ نَخْلٍ.

(عبدالله) کوڕی ( جعفر) (ﷺ) دەڵێ: ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە پاشکۆی خۆیەوە سواری کردم، بەپەنهانی فەرموودەیەکی فەرموو کە بۆ کەسی ناگێڕمەوە، پێغەمبەر(ﷺ) شتێك زۆر پێی خۆش بووبێت کەلەکاتی سەرئاودا خۆی پێ شاردبێتەوە بەرزاییەك، یان دیواری باخە خورمایەك بووە.

## (٥) کەچویتە سەرئاو چی دەڵێیت

١٠٦ـ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ) قال: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِذَا دَخَلَ الْخَلَاءَ قال: ((اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْخُبْثِ وَالْخَبَائِثِ)). [بخاري/ الوضوء / مايقول عند الخلاء/١٤٢]

(انس)(ﷺ) دەڵێ: ئەگەر پێغەمبەری خوا(ﷺ) بچوایەتە سەر ئاو دەیفەرموو: ((اللهم اعوذ بك من الخبث والخبائث).واتە: خوایە پەنادەگرم بەتۆ لەشەیتانی نێرومێ)).

## (٦) لەکاتی سەرئاودا رووممەکەرە قیبلە

١٠٧ـ عَنْ أَبِي أَيُّوبَ (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: ((إِذَا أَتَيْتُمُ الْغَائِطَ فَلَا تَسْتَقْبِلُوا الْقِبْلَةَ وَلَا تَسْتَدْبِرُوهَا، بِبَوْلٍ وَلَا غَائِطٍ، وَلَكِنْ شَرِّقُوا أَوْ غَرِّبُوا)). قَالَ أَبُو أَيُّوبَ: فَقَدِمْنَا الشَّامَ فَوَجَدْنَا مَرَاحِيضَ قَدْ بُنِيَتْ قِبَلَ الْقِبْلَةِ، فَنَنْحَرِفُ عَنْهَا، وَنَسْتَغْفِرُ اللَّهَ. [بخاري/ الوضوء / الا تستقبل القبلة بغائط /١٤٤]

(ابو ایوب)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ((ئەگەر چوونە سەر ئاو بۆ میزوو پیسی روو نەکەنە قیبلەو پشتیشی تێمەکە، بەڵکو روبکەنە خۆرهەڵات یان خۆرئاوا)).

(ابو ایوب) دەڵێ: چووین بۆ شام دەبینین ئاودەستەکان رووەو قیبلە دروستکراون ئێمە رووممان وەردەگێراو داوای لێخۆشبوونمان لەخوادەکرد.

## (٧) لەناو خانوودا مۆڵەت دراوە

١٠٨ـ عَنْ وَاسِعِ بْنِ حَبَّانَ قَالَ: كُنْتُ أُصَلِّي فِي الْمَسْجِدِ، وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ مُسْنِدٌ ظَهْرَهُ إِلَى الْقِبْلَةِ، فَلَمَّا قَضَيْتُ صَلَاتِي انْصَرَفْتُ إِلَيْهِ مِنْ شِقِّي، فَقَالَ عَبْدُ

اللَّه: يَقُولُ أُناسٌ: إِذَا قَعَدْتَ لِلْحَاجَةِ فَلَا تَقْعُدْ مُسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةِ وَلَا بَيْتِ الْمَقْدِسِ، قَالَ عَبْدُ اللَّه: وَلَقَدْ رَقِيتُ عَلَى ظَهْرِ بَيْتٍ، فَرَأَيْتُ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) قَاعِدًا عَلَى لَبِنَتَيْنِ، مُسْتَقْبِلًا بَيْتَ الْمَقْدِسِ، لِحَاجَتِهِ. [بخاري/ الوضوء/ من تبرز على لبنتين/١٤٥]

(واسع) کوڕی (حبان) دەڵێ: لەمزگەوت نوێژم کرد ، (عبدالله) کوڕی ( عمر) پشتی کردبووە قیبلە، کاتێ لەنوێژەکە بوومەوە چوومە ئەوبەر بۆلای (عبدالله)وتی: خەڵکی دەڵێن: ئەگەر چوویتە سەرئاو روونەکەیتە نەقیبلەو نەقودس. (عبدالله)وتی: جارێکیان چوومە سەربانی ماڵێك پێغەمبەری خوام(ﷺ) دی لەسەر دووخشت دانیشتبوو رووی لەقودس بوو،(واتە پشتی لەقیبلە بوو) دەستی بەئاو دەگەیاند.

## ( ٨ ) رێگریی لەمیزکردنە ئاوێك کە پاشان خۆتی پێ بشۆریت

١٠٩ـعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((لَا يَبُولَنَّ أَحَدُكُمْ فِي الْمَاءِ الدَّائِمِ ثُمَّ يَغْتَسِلُ مِنْهُ)). [بخاري/ الوضوء/ البول في الماء الدائم / ٢٣٦]

(ابوهريره)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: ( باکەستان میز نەکاتە ئاوی وەستاوو دوایی خۆیشی تێدا بشوات). لەریوایەتێکیتردا: ((میز مەکەرە ئاوی هەمیشەییەوە (ڕاوەستاوەوە). کەلەبەری ناڕوات، دوایی خۆیشی تێدا بشۆرێت)).

## ( ٩ ) خۆپاراستن لەمیز

١١٠ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ) قَالَ: مَرَّ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) عَلَى قَبْرَيْنِ، فَقَالَ: ((أَمَا إِنَّهُمَا لَيُعَذَّبَانِ، وَمَا يُعَذَّبَانِ فِي كَبِيرٍ، أَمَّا أَحَدُهُمَا فَكَانَ يَمْشِي بِالنَّمِيمَةِ، وَأَمَّا الْآخَرُ فَكَانَ لَا يَسْتَتِرُ مِنْ بَوْلِهِ)). قَالَ: فَدَعَا بِعَسِيبٍ رَطْبٍ، فَشَقَّهُ بِاثْنَيْنِ، ثُمَّ غَرَسَ عَلَى هَذَا وَاحِدًا وَعَلَى هَذَا وَاحِدًا، ثُمَّ قَالَ: ((لَعَلَّهُ أَنْ يُخَفَّفُ عَنْهُمَا مَا لَمْ يَيْبَسَا)). [بخاري/ الوضوء/ من الكبائر ان يستتر من بوله/ ٢١٣]

(ابن عباس)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەلای دوو گۆڕدا تێپەڕی فەرمووی: ((ئەم دووانە سزادەدرێن ، بەڵام لەسەرشتی گەورە سزانادرێن ﴿چونکە دەیانتوانی خۆیانی لێ بپارێزن﴾، یەکێکیان قسەی دەهێناو دەبرد، ئەوی تریان خۆی نەدەپاراست لەمیزەکەی)).

دەڵێ: داوای لقێك دارخورمای تەڕی كرد ، كردی بەدووكەرتەوە، لەسەر هەر گۆڕێكیان كەرتێكی چەقاند، ئینجا فەرمووی: ((بەڵكو﴿سزا﴾لەسەریان سووك بكرێت هەتا وشك دەبن)).

## (١٠) رێگریی لەخۆپاككردنەوە بەدەستی راست

١١١-عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ عَنْ أَبِيهِ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((لَا يُمْسِكَنَّ أَحَدُكُمْ ذَكَرَهُ بِيَمِينِهِ وَهُوَ يَبُولُ، وَلَا يَتَمَسَّحْ مِنَ الْخَلَاءِ بِيَمِينِهِ، وَلَا يَتَنَفَّسْ فِي الْإِنَاءِ)). [بخاري الوضوء/ النهي عن الاستنجاء باليمين/١٠٢]

(عبدالله) كوڕی (ابو قتادە) لەباوكیەوە بۆمان دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: ((باكەستان زەكەری بەدەستی راستی نەگرێت لەكاتی میزكردنیدا، لەسەر ئاویش بەدەستی راست خۆی پاك نەكاتەوە، فوو نەكات لەدەفری[ خواردن و خواردنەوە])).

## (١١) خۆپاككردنەوە بەئاو

١١٢-عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) دَخَلَ حَائِطًا وَتَبِعَهُ غُلَامٌ مَعَهُ مِيضَأَةٌ، هُوَ أَصْغَرُنَا، فَوَضَعَهَا عِنْدَ سِدْرَةٍ، فَقَضَى رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) حَاجَتَهُ فَخَرَجَ عَلَيْنَا وَقَدِ اسْتَنْجَى بِالْمَاءِ. [بخاري / الوضوء/ الاستنجاء بالماء/ ١٤٩]

(انس) كوڕی ( مالك) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) چووە پەنا دیوارێكەوە مێرد منداڵێك كە بچووكترینمان بوو شوێنی كەوت مەسینەیەكی بەدەستەوە بوو، لەتەنیشت درەختێكی سدرا داینا، پێغەمبەر(ﷺ) لێبوویەوەو هاتە دەرەوە هات بۆ ناومان بە ئاوەكە خۆی پاك كردبووەوە.

## (١٢) خۆپاككردنەوە بەبەرد بەتاك دەبێ

١١٣-عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) -يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ (ﷺ)- قَالَ: ((إِذَا اسْتَجْمَرَ أَحَدُكُمْ فَلْيَسْتَجْمِرْ وِتْرًا، وَإِذَا تَوَضَّأَ أَحَدُكُمْ فَلْيَجْعَلْ فِي أَنْفِهِ مَاءً ثُمَّ لِيَنْتَثِرْ)). [بخاري/ الوضوء/ الاستنجاء في الوضوء/ ١٥٩]

(ابوهریرە)(ﷺ) دەیگەیەنێ بەپێغەمبەر(ﷺ) دەڵێ: ((ئەگەر كەسێكتان بەبەرد خۆی پاك كردەوە، با تاك بێت، ئەگەر كەسێكیشتان دەستنوێژی گرت با ئاو بكاتە لووتیەوە ئینجا فنی بكاتە دەرەوە)).

## (١٣) خۆپاككردنەوە بەبەردو قەدەغەكردنی بەتەرس و ئێسقان

١١٤ـعَنْ سَلْمَانَ (ﷺ) قَالَ: قِيلَ لَهُ: قَدْ عَلَّمَكُمْ نَبِيُّكُمْ (ﷺ) كُلَّ شَيْءٍ حَتَّى الْخِرَاءَةَ؟ قَالَ: فَقَالَ: أَجَلْ، لَقَدْ نَهَانَا أَنْ نَسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةَ لِغَائِطٍ أَوْ بَوْلٍ، أَوْ أَنْ نَسْتَنْجِيَ بِالْيَمِينِ، أَوْ أَنْ نَسْتَنْجِيَ بِأَقَلَّ مِنْ ثَلَاثَةِ أَحْجَارٍ، أَوْ أَنْ نَسْتَنْجِيَ بِرَجِيعٍ أَوْ بِعَظْمٍ.

(سلمان)(ﷺ) دەڵێ: پێی وترا: پێغەمبەرەكەتان لەبارەی چوونە سەرئاوەوە هەموو شتێكی فێركردوون تەنانەت چۆنێتی دانیشتنی سەرئاویش؟ دەڵێ: وتی: بەڵێ. لێی قەدەغەكردووین كەرووبكەینە قیبلە لەدانیشتنی سەرئاوودا، یان بەدەستی ڕاست خۆپاككردنەوە، هەروەها بەكەمتر لەسێ بەرد خۆپاككردنەوە، وەیا خۆپاك كردنەوە بە تەرس و ئێسقان.

## (١٤) سودوەرگرتن لە پێستی مردارەوەبوو

١١٥ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ) قَالَ: تُصُدِّقَ عَلَى مَوْلَاةٍ لِمَيْمُونَةَ بِشَاةٍ فَمَاتَتْ، فَمَرَّ بِهَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالَ: ((هَلَّا أَخَذْتُمْ إِهَابَهَا فَدَبَغْتُمُوهُ فَانْتَفَعْتُمْ بِهِ)). فَقَالُوا: إِنَّهَا مَيْتَةٌ. فَقَالَ: ((إِنَّمَا حَرُمَ أَكْلُهَا)).

(ابن عباس)(ﷺ) دەڵێ: گیسكێكیان بەخێر هێنابوو بۆ خزمەتكوزارێكی خاتوو مەیمونە، بەڵام مرداربوویەوە، پێغەمبەر(ﷺ) بەلایدا تێپەڕی فەرمووی: ((با پێستەكەیتان هەڵبگرتایەو خۆشەتان بكردایەو سوودتان لێوەربگرتایە)) وتیان: ئەوە مردار بۆتەوە، فەرمووی: ((ئەوە خواردنەكەی حەرام كراوە)).

## (١٥) ئەگەر پێستە خۆشكرا پاك دەبێتەوە

١١٦ـ عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي حَبِيبٍ: أَنَّ أَبَا الْخَيْرِ حَدَّثَهُ قَالَ: رَأَيْتُ عَلَى ابْنِ وَعْلَةَ السبئي فَرْوًا، فَمَسِسْتُهُ، فَقَالَ: مَا لَكَ تَمَسُّهُ؟ قَدْ سَأَلْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ قُلْتُ: إِنَّا نَكُونُ بِالْمَغْرِبِ، وَمَعَنَا الْبَرْبَرُ وَالْمَجُوسُ، نُؤْتَى بِالْكَبْشِ قَدْ ذَبَحُوهُ، وَنَحْنُ لَا نَأْكُلُ ذَبَائِحَهُمْ، وَيَأْتُونَا بِالسِّقَاءِ يَجْعَلُونَ فِيهِ الْوَدَكَ؟ فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: قَدْ سَأَلْنَا رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) عَنْ ذَلِكَ فَقَالَ: ((دِبَاغُهُ طَهُورُهُ)).

(یزید) كوڕی ابوحبیب) دەڵێ: (ابو خیر) بۆی گێڕایەوە وتی: (علی) كوڕی (وعلة السبی)م دی فەروەیەكی لەبەردابوو، منیش دەستم لێدا، وتی: بۆچی دەستی لێدەدەی؟ لە(عبدالله) كوڕی ( عباس)م پرسی وتم: ئێمە لەخۆرئاواین بەربەری و ئاگر پەرستمان لەگەڵدایە، بەرانی سەربڕاومان بۆ دەهێنن، ئێمەش

سەربڕاوی ئەوان ناخۆین، هیزەمان بۆ دەهێنن ، چەورییان تێکردووە؟ (ابن عباس) وتی: ئێمە ئەمەمان لەپێغەمبەر(ﷺ) پرسیووە: فەرموویەتی: ((خۆشەکردنی پاکبوونەوەیەتی)).

## ( ١٦ ) ئەگەر سەگێك دەمی خستە دەفری یەکێتانەوە با حەوت جار بیشۆرێت

١١٧ـ عن عَبْدِ اللَّهِ بنِ الْمُغَفَّلِ (ﷺ) قَالَ: أَمَرَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) بِقَتْلِ الْكِلَابِ، ثُمَّ قَالَ: ((مَا بَالُهُمْ وَبَالُ الْكِلَابِ)). ثُمَّ رَخَّصَ فِي كَلْبِ الصَّيْدِ وَكَلْبِ الْغَنَمِ، وَقَالَ: ((إِذَا وَلَغَ الْكَلْبُ فِي الْإِنَاءِ فَاغْسِلُوهُ سَبْعَ مَرَّاتٍ، وَعَفِّرُوهُ الثَّامِنَةَ فِي التُّرَابِ)). وَفِي رِوَايَةِ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ: وَرَخَّصَ فِي كَلْبِ الْغَنَمِ وَالصَّيْدِ وَالزَّرْعِ.

(عبدالله) کوڕی ( المغفل) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی کردووە بەکوشتنی سەگ ئینجا فەرموویەتی: ((هەقیان چییە بەسەر سەگەوە))پاشان مۆڵەتیداوە بەسەگی راوو، سەگی شوان، هەروەها فەرموویەتی: ((ئەگەر سەگێك دەمی خستە دەفرێکەوە حەوت جار بیشۆرن، هەشتەم جار بیتلێنن لەخۆڵەوە، لەریوایەتی (یحیی) کوری (سعیدا) مۆڵەتیداوە بەسەگی شوانو راوو سەرکشتوکاڵ.

## ( ١٧ ) گەورەیی دەستنوێژ

١١٨. عَنْ أَبِي مَالِكٍ الْأَشْعَرِيِّ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((الطُّهُورُ شَطْرُ الْإِيمَانِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ تَمْلَأُ الْمِيزَانَ، وَسُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ تَمْلَآنِ -أَوْ: تَمْلَأُ- مَا بَيْنَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ، وَالصَّلَاةُ نُورٌ، وَالصَّدَقَةُ بُرْهَانٌ، وَالصَّبْرُ ضِيَاءٌ، وَالْقُرْآنُ حُجَّةٌ لَكَ أَوْ عَلَيْكَ. كُلُّ النَّاسِ يَغْدُو، فَبَايِعٌ نَفْسَهُ: فَمُعْتِقُهَا أَوْ مُوبِقُهَا)).

(ابومسالك الاشعری)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ((پاکوخاوێنی بەشێکی ئیمانە، (الحمد لله) تەرازو پڕدەکات، (سبحان الله والحمد لله) نێوانی ئاسمانەکانو زەوی پڕدەکەن، نوێژ نوورە خێرکردن راستی ئیمانو گوێڕایەڵی بۆ خوا سەلماندنە، ئارامگرتن رووناکییە قورئانیش بەڵگەیە بۆت یان لەسەرت، خەڵکی هەموویان بەیانیان زوو دەڕۆن خۆیان دەفرۆشن، بەوەش یان خۆی رزگار دەکات، یان خۆی تیادەبات)). [واتە: یان خۆی بەخوا دەفرۆشێو فەرمانەکانی جێبەجێدەکاتو خۆی رزگاردەکات، یان خۆی بەشەیتان دەفرۆشێو فەرمانەکانی جێبەجێ دەکاتو خۆی تیادەبات].

## (١٨) ڕۆیشتنی گوناه لەگەڵ ئاوی دەستنوێژدا

١١٩ـعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) قَالَ: ((إِذَا تَوَضَّأَ الْعَبْدُ الْمُسْلِمُ -أَو: الْمُؤْمِنُ- فَغَسَلَ وَجْهَهُ، خَرَجَ مِنْ وَجْهِه كُلُّ خَطِيئَةٍ نَظَرَ إِلَيْهَا بِعَيْنَيْه مَعَ الْمَاء، أَوْ: مَعَ آخِرِ قَطْرِ الْمَاء. فَإِذَا غَسَلَ يَدَيْه خَرَجَ مِنْ يَدَيْه كُلُّ خَطِيئَةٍ ﴿كَانَ﴾ بَطَشَتْهَا يَدَاهُ مَعَ الْمَاء، أَوْ: مَعَ آخِرِ قَطْرِ الْمَاء. فَإِذَا غَسَلَ رِجْلَيْه خَرَجَتْ كُلُّ خَطِيئَةٍ مَشَتْهَا رِجْلَاهُ مَعَ الْمَاء، أَوْ: مَعَ آخِرِ قَطْرِ الْمَاء. حَتَّى يَخْرُجَ نَقِيًّا مِنَ الذُّنُوب)).

(ابوهریره) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ((ئەگەر بەندەی موسڵمان ـ یائیماندار ـ دەستنوێژی گرت ، دەموچاوی شۆرد، هەرگوناهێك بەچاوکردوویەتی لەگەڵ ئاوەکەدا، دەڕوات، یا لەگەڵ دواتنۆکی ئاوەکەدا، ئەگەر دەستەکانی شۆرد هەموو ئەو گوناهانەی بەدەستی کردوویەتی لەگەڵ ئاوەکەدا دەڕوات، یا لەگەڵ دواتنۆکی ئاوەکەدا ئەگەر قاچەکانی شۆرد ئەو گوناهانەی بەوقاچانەی بۆی چووە لەگەڵ ئاوەکەدا دەڕوات یا لەگەڵ دواتنۆکی ئاوەکەدا، هەتا پاك دەبێتەوە لەگوناه)).

## (١٩) لەبارەی سیواك لەکاتی دەستنوێژدا

١٢٠ـ عن ابْنَ عَبَّاسٍ (ﷺ): أَنَّهُ بَاتَ عِنْدَ النَّبِيِّ (ﷺ) ذَاتَ لَيْلَةٍ، فَقَامَ نَبِيُّ اللَّه (ﷺ) مِنْ آخِرِ اللَّيْلِ، فَخَرَجَ فَنَظَرَ فِي السَّمَاء، ثُمَّ تَلَا هَذِه الْآيَةَ فِي آلِ عِمْرَانَ: ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ﴾ حَتَّى بَلَغَ: ﴿فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾ ثُمَّ رَجَعَ إِلَى الْبَيْتِ، فَتَسَوَّكَ وَتَوَضَّأَ، ثُمَّ قَامَ فَصَلَّى، ثُمَّ اضْطَجَعَ، ثُمَّ قَامَ فَخَرَجَ، فَنَظَرَ إِلَى السَّمَاءِ فَتَلَا هَذِهِ الْآيَةَ، ثُمَّ رَجَعَ فَتَسَوَّكَ فَتَوَضَّأَ، ثُمَّ قَامَ فَصَلَّى.

(ابن عباس) (ﷺ) دەڵێ: شەوێکیان لەخزمەت پێغەمبەری خوادا(ﷺ) مامەوە لەکۆتایی شەوەکەدا پێغەمبەر(ﷺ) هەستا چووە دەرەوە، سەیرێکی ئاسمانی کرد ئینجا ئەم ئایەتەی لەسوورەتی ال عمران خوێندەوە: ﴿ان في خلق السموات والارض واختلاف الليل والنهار ﴾هەتا گەیشتە ﴿فقنا عذاب النار﴾ئینجا گەڕایەوە بۆ ژوورەوە سیواکی کرد دەستنوێژی گرت، ئینجا هەستاو دەستیکرد بەنوێژکردن، پاشان ڕاکشایەوە، ئینجا هەستاو چووە دەرەوە، دووبارە سەیری ئاسمانیکرد هەمان ئایەتی خوێندەوە، ئینجا

گەڕایەوە سیواکی کردوو دەستنوێژی گرت و هەستاو دەستی کردەوە بەنوێژکردن.

١٢١. عَنْ عَائِشَةَ (﵂): أنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كَانَ إِذَا دَخَلَ بَيْتَهُ بَدَأَ بِالسِّوَاكِ.

(عائشة)(﵂) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەرکاتێ بهاتایەتە ماڵەوە لەپێشدا سیواکی دەکرد.

## ( ٢٠ ) دەستپێکردن و دەستنوێژو شتیتر بەلای ڕاست

١٢٢ـ عَنْ عَائِشَةَ (﵂) قَالَتْ: إنْ كَانَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) لَيُحِبُّ التَّيَمُّنَ فِي طُهُورِهِ إذَا تَطَهَّرَ، وَفِي تَرَجُّلِهِ إِذَا تَرَجَّلَ، وَفِي انْتِعَالِهِ إِذَا انْتَعَلَ. [بخاري/ الوضوء/ ١٦٦]

(عائشة)(﵂)دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) حەزی بەوەدەکرد بەلای ڕاست دەست پێبکات لەدەستنوێژ گرتنا کاتێ دەستنوێژی دەگرت، لەسەر داهێنان کاتێ سەری دادەهێنا، لەنەعل لەپێکردنا، کاتێ نەعلی لەپێ دەکرد.

## ( ٢١ ) شێوەی دەستنوێژی پێغەمبەر( ﷺ )

١٢٣ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدِ ابْنِ عَاصِمِ الْأَنْصَارِيِّ (﵁) –وَكَانَتْ لَهُ صُحْبَةٌ– قَالَ: قِيلَ لَهُ: تَوَضَّأْ لَنَا وُضُوءَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ).فَدَعَا بِإِنَاءٍ فَأَكْفَأَ مِنْهَا عَلَى يَدَيْهِ فَغَسَلَهُمَا ثَلَاثًا، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ فَاسْتَخْرَجَهَا، فَمَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ مِنْ كَفٍّ وَاحِدَةٍ، فَفَعَلَ ذَلِكَ ثَلَاثًا، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ فَاسْتَخْرَجَهَا، فَغَسَلَ وَجْهَهُ ثَلَاثًا، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ فَاسْتَخْرَجَهَا، فَغَسَلَ يَدَيْهِ إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ مَرَّتَيْنِ مَرَّتَيْنِ، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ فَاسْتَخْرَجَهَا، فَمَسَحَ بِرَأْسِهِ فَأَقْبَلَ بِيَدَيْهِ وَأَدْبَرَ، ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَيْهِ إِلَى الْكَعْبَيْنِ، ثُمَّ قَالَ: هَكَذَا كَانَ وُضُوءُ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ).[بخاري/ الوضوء/ ١٨٣]

(عبدالله) کوڕی ( زید) کوری (عاصم الانصاری) (﵁) کەیەکێك بووە لەهاوەڵان دەڵێ: پێی وترا: دەستنوێژێکمان بۆ بگرە وەکو دەستنوێژی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەویش داوای کاسەیەکی ﴿پڕ لەئاوی﴾ کرد، لاری کردەوە بەسەردەستیداو سێجار دەستەکانی شۆرد، ئینجا دەستێکی کرد بەئاوەکەداو دەری هێناو سێجار ئاوی لەدەمولوتی وەردا پاشان دەستی کرد بە ئاوەکەداو دەری هێناو سێجار دەموچاوی شۆرد، ئینجا دەستی کرد بەئاوەکەداو دەری هێناو دووجار دەستەکانی تا ئەنیشکی شۆرد پاشان دەستی کرد بەئاوەکەداو دەستی تەڕی هێنا بەسەریا، هەردوو دەستی لەپێشەوە داناو دەیبرد بۆدواوەو

دەیهێنایەوە بۆ پێشەوە،ئینجا هەردوو قاچی شۆرد هەتا قولەپێی ، پاشان وتی: ئابەم شێوەیە بوو دەستنوێژی پێغەمبەری خوا(ﷺ).

## (٢٢) لووت پاککردنەوە

١٢٤ـ عن أَبُو هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((إِذَا تَوَضَّأَ أَحَدُكُمْ فَلْيَسْتَنْشِقْ بِمَنْخِرَيْهِ مِنَ الْمَاءِ، ثُمَّ لِيَنْتَثِرْ)). [بخاري/ الوضوء/ الاستنثار/١٥٩]

(ابوهریره)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ((ئەگەر یەکێکتان دەستنوێژی گرت با ئاو لەکونەلوتەکانی وەردات ،ئینجا فن بکات)).

ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: ((إِذَا اسْتَيْقَظَ أَحَدُكُمْ مِنْ مَنَامِهِ فَلْيَسْتَنْثِرْ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَبِيتُ عَلَى خَيَاشِيمِهِ)). [اقتران/ بخاري ١٦٨٨/٣٠]

(ابوهریره)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ((ئەگەر یەکێکتان لەخەوهەستا باسێجار فن بکات ، چونکە شەیتان بەشەودا لەکونە لوتیدا دەخەوێت)).

## (٢٣) ناوچاو جوان و دەست و پێ سپی بەهۆی دەستنوێژەوە

١٢٥ـ عَنْ نُعَيْمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الْمُجْمِرِ قَالَ: رَأَيْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ يَتَوَضَّأُ، فَغَسَلَ وَجْهَهُ، فَأَسْبَغَ الْوُضُوءَ، ثُمَّ غَسَلَ يَدَهُ الْيُمْنَى حَتَّى أَشْرَعَ فِي الْعَضُدِ، ثُمَّ يَدَهُ الْيُسْرَى حَتَّى أَشْرَعَ فِي الْعَضُدِ، ثُمَّ مَسَحَ رَأْسَهُ، ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَهُ الْيُمْنَى حَتَّى أَشْرَعَ فِي السَّاقِ، ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَهُ الْيُسْرَى حَتَّى أَشْرَعَ فِي السَّاقِ، ثُمَّ قَالَ ﴿لي﴾: هَكَذَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَتَوَضَّأُ. وَقَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((أَنْتُمُ الْغُرُّ الْمُحَجَّلُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، مِنْ إِسْبَاغِ الْوُضُوءِ، فَمَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمْ فَلْيُطِلْ غُرَّتَهُ وَتَحْجِيلَهُ)). [بخاري/ الوضوء/ ١٣٦].

(نعیم) کوڕی( عبدالله الجمر) دەڵێ: (ابوهریره) م دی دەستنوێژی دەگرت دەموچاوی شۆرد بەباشی شۆردی، ئینجا دەستی راستی شۆرد هەتا گەیشتە قۆڵی، ئینجا دەستی چەپی شۆرد هەتا گەیشتە قۆڵی، ئینجا دەستی تەڕی هێنا بەسەریدا، ئینجا قاچی راستی شۆرد، هەتا لولاقیشی گرتەوە، پاشان قاچی چەپی شۆرد هەتا لولاقیشی گرتەوە وتی [بەمن] ئابەم شێوەیە پێغەمبەری خوام(ﷺ) دیوە دەستنوێژی گرتووە، ئینجا وتی: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: ((ئێوە لەرۆژی قیامەتدا ناوچاو جوان و دەست و پێ

سپین بەهۆی دەستنوێژ گرتنەوە، هەرکەسێك لەئێوە دەتوانێ بازیاتر ناوچاوی جوان بكاتو دەستوپێی سپی بكات)).

١٢٦ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) أَتَى الْمَقْبُرَةَ فَقَالَ: ((السَّلَامُ عَلَيْكُمْ دَارَ قَوْمٍ مُؤْمِنِينَ، وَإِنَّا إِنْ شَاءَ اللَّهُ بِكُمْ لَاحِقُونَ، وَدِدْتُ أَنَّا قَدْ رَأَيْنَا إِخْوَانَنَا)). قَالُوا: أَوَلَسْنَا إِخْوَانَكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: ((بَلْ أَنْتُمْ أَصْحَابِي، وَإِخْوَانُنَا الَّذِينَ لَمْ يَأْتُوا بَعْدُ)). فَقَالُوا: كَيْفَ تَعْرِفُ مَنْ لَمْ يَأْتِ بَعْدُ مِنْ أُمَّتِكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَقَالَ: ((أَرَأَيْتَ لَوْ أَنَّ رَجُلًا لَهُ خَيْلٌ غُرٌّ مُحَجَّلَةٌ بَيْنَ ظَهْرَيْ خَيْلٍ دُهْمٍ بُهْمٍ، أَلَا يَعْرِفُ خَيْلَهُ)). قَالُوا: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: ((فَإِنَّهُمْ يَأْتُونَ غُرًّا مُحَجَّلِينَ مِنَ الْوُضُوءِ، وَأَنَا فَرَطُهُمْ عَلَى الْحَوْضِ، أَلَا لَيُذَادَنَّ رِجَالٌ عَنْ حَوْضِي كَمَا يُذَادُ الْبَعِيرُ الضَّالُّ، أُنَادِيهِمْ: أَلَا هَلُمَّ، فَيُقَالُ: إِنَّهُمْ قَدْ بَدَّلُوا بَعْدَكَ، فَأَقُولُ سُحْقًا سُحْقًا)).

(ابوهریرە)(ﷺ) وتی: پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاتە سەر گۆڕستانو فەرمووی: ((سڵاوتان لێبێت ئەی ماڵی قەومی ئیماندار، ئێمەش ئەگەر خوابیەوێت شوێنتان دەكەوین پێتان دەگەین، حەزم دەكرد براكانمان بدیایە)) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەی ئێمە برای تۆنین ؟ فەرمووی: ((بەڵكو ئێوە هاوەڵمن، براكانمان ئەوانەن كەهێشتا نەهاتوون)) وتیان: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) چۆن كەسانێك دەناسیتەوە لەئوممەتت كەهێشتا نەهاتوون؟ فەرمووی: ئەگەر پیاوێك ئەسپێكی كوێتی[ناو چاوو دەستو پێ سپی]هەبێت لەناو كۆمەڵێك ئەسپی رەشی تۆخدا بێت، ئایا ئەسپەكەی خۆی ناناسێتەوە؟ وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ، فەرمووی: ((دە ئەوانیش رۆژی قیامەت بەناوچاوی جوانو دەستوپێی سپییەوە، بەهۆی دەستنوێژەوە، دێنو، منیش پێشیان دەكەوم بۆ سەر حەوزەكە، ئاگاداربن پیاوانێك دووردەخرێنەوە لەحەوزەكەی من وەكو چۆن وشتری تار دوور دەخرێتەوە ، منیش بانگیان دەگەم: ئاگاداربن وەرن ، بەلاّم دەوترێت: ئەوانە لەدوای تۆ گۆڕاون، منیش دەڵێم: دە هەر دووربن دەهەر دووربن)).

## ( ٢٤ ) ئەوەی بەباشی دەستنوێژ دەگرێت

١٢٧. عن حُمْرَانَ، مَوْلَى عُثْمَانَ (ﷺ): أَنَّ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ (ﷺ) دَعَا بِوَضُوءٍ فَتَوَضَّأَ: فَغَسَلَ كَفَّيْهِ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ مَضْمَضَ وَاسْتَنْثَرَ، ثُمَّ غَسَلَ وَجْهَهُ ثَلَاثَ

مَرَّاتٍ، ثُمَّ غَسَلَ يَدَهُ الْيُمْنَى إِلَى الْمِرْفَقِ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ غَسَلَ يَدَهُ الْيُسْرَى مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ مَسَحَ رَأْسَهُ، ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَهُ الْيُمْنَى إِلَى الْكَعْبَيْنِ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ غَسَلَ الْيُسْرَى مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) تَوَضَّأَ نَحْوَ وُضُوئِي هَذَا، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((مَنْ تَوَضَّأَ نَحْوَ وُضُوئِي هَذَا، ثُمَّ قَامَ فَرَكَعَ رَكْعَتَيْنِ، لَا يُحَدِّثُ فِيهِمَا نَفْسَهُ، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ)). [بخاري/ الوضوء/ ١٥٨]

قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: وَكَانَ عُلَمَاؤُنَا يَقُولُونَ: هَذَا الْوُضُوءُ أَسْبَغُ مَا يَتَوَضَّأُ بِهِ أَحَدٌ لِلصَّلَاةِ.

(حمران) کارگوزاری (عثمان)کوڕی (عفان)(ﷺ) دەڵێ: (عثمان)کوڕی (عفان)(ﷺ) داوای ئاوی دەستنوێژی کردو، دەستنوێژی گرت: دەستەکانی سێجار شۆرد ئاوی لەدەمولوتی وەرداو، سێجار دەموچاوی شۆرد، ئینجا دەستی ڕاستی هەتا ئەنیشکی سێجار شۆردو، دەستی چەپیشی بەوشێوەیە، پاشان مەسحی سەریکرد، پاشان قاچی ڕاستی تاقولە پێی سێجار شۆردو، قاچی چەپیشی بەهەمان شێوە، ئینجا وتی: پێغەمبەری خوام(ﷺ) دیووە وەکو ئەم دەستنوێژەی من دەستنوێژی گرتووەو، پاشان فەرموویەتی: ((هەرکەس دەستنوێژ وەکو ئەم دەستنوێژەی من بگرێت، ئینجا هەستێو دووڕکات نوێژ بکات، دالغەلێنەدا لەنوێژەکەدا(خوا)، لەهەموو گوناهە رابوردووەکانی دەبوردرێت)).

(ابن شهاب) دەڵێ: زانایانمان دەڵێن: ئەم دەستنوێژە تەواوترین دەستنوێژە کەسێك بیگرێت بۆ نوێژکردن.

١٢٨- عن حُمْرَانَ: أَنَّ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((مَنْ أَتَمَّ الْوُضُوءَ كَمَا أَمَرَهُ اللَّهُ ﴿تعَالَى﴾، فَالصَّلَوَاتُ الْمَكْتُوبَاتُ كَفَّارَاتٌ لِمَا بَيْنَهُنَّ)).

(حمران) دەڵێ: (عثمان)(ﷺ)وتی: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: ((هەرکەس بەتەواوی دەستنوێژەکەی بگرێت، وەکو خوای گەورە فەرمانی پێکردووە، ئەوا نوێژە فەرزەکان دەبنە هۆی سڕینەوەی گوناهەکانی نێوانیان)).

١٢٩- عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ (ﷺ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((مَنْ تَوَضَّأَ لِلصَّلَاةِ فَأَسْبَغَ الْوُضُوءَ، ثُمَّ مَشَى إِلَى الصَّلَاةِ الْمَكْتُوبَةِ فَصَلَّاهَا مَعَ النَّاسِ -أَوْ: مَعَ الْجَمَاعَةِ، أَوْ: فِي الْمَسْجِدِ- غَفَرَ اللَّهُ لَهُ ذُنُوبَهُ)).

(عثمـــان)(ﷺ) دەڵـــێ: پێغەمبـــەری خـــوا(ﷺ) فەرموویـــەتی: ( هەرکـــەس دەستنوێژ بگرێت بۆ نوێژ بەباشی بیگرێت، ئینجا بڕوات بەرەو نوێژی فەرز لەگەڵ خەڵکیدا نوێژەکەی بکات ـ یا لەگەڵ جەماعەت، یا لەمزگەوت ـ خوا لەگوناهەکانی خۆشدەبێت)).

## ( ٢٥ ) دەستنوێژی تەواو گرتن لەگەڵ نارەحەتیش

١٣٠. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((أَلَا أَدُلُّكُمْ عَلَى مَا يَمْحُو اللَّهُ بِهِ الْخَطَايَا وَيَرْفَعُ بِهِ الدَّرَجَاتِ)). قَالُوا: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: إِسْبَاغُ الْوُضُوءِ عَلَى الْمَكَارِهِ، وَكَثْرَةُ الْخُطَا إِلَى الْمَسَاجِدِ، وَانْتِظَارُ الصَّلَاةِ بَعْدَ الصَّلَاةِ فَذَلِكُمُ الرِّبَاطُ)).

(ابوهریره)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: ((ئایا شتێکتان پیشان نەدەم کە خوا بەوشتە گوناهەکانتان بسڕێتەوەو پلەتان بەرزبکاتەوە)) وتیان: بەڵێ: ئەی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) ، فـەرمووی: ((بەتـەواوی دەسـتنوێژ گرتن بالەکاتی نارەحەتیشا بێت [واتە لەکاتی سەرماو نەخۆشیو شتیتر ]، ئینجا هەنگاونانی زۆر بۆ مزگەوت پاشان چاوەڕێکردنی نوێژ لەدوای نوێژ . ئا ئەوەیە لەسەنگەردابوونو پابەند بوون بە فەرمانەکانی خوای گەورەوە)).

## ( ٢٦ ) جوانی دەگاتە ئەو شوێنەی ئاوی دەستنوێژ دەیگاتێ

١٣١ـعَنْ أَبِي حَازِمٍ قَالَ: كُنْتُ خَلْفَ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) وَهُوَ يَتَوَضَّأُ لِلصَّلَاةِ، فَكَانَ يَمُدُّ يَدَهُ حَتَّى تَبْلُغَ إِبْطَهُ، فَقُلْتُ لَهُ: يَا أَبَا هُرَيْرَةَ، مَا هَذَا الْوُضُوءُ؟ فَقَالَ: يَا بَنِي فَرُّوخَ، أَنْتُمْ هَاهُنَا؟ لَوْ عَلِمْتُ أَنَّكُمْ هَاهُنَا مَا تَوَضَّأْتُ هَذَا الْوُضُوءَ، سَمِعْتُ خَلِيلِي (ﷺ) يَقُولُ: ((تَبْلُغُ الْحِلْيَةُ مِنَ الْمُؤْمِنِ حَيْثُ يَبْلُغُ الْوَضُوءُ)).

(ابو حازم) دەڵێ: من لەدوای(ابوهریره)(ﷺ) وە بووم، دەستنوێژی دەگرت بۆ نوێژکردن، دەستی درێژدەکـرد هـەتا دەگەیشـتە بـن بـاڵی، پێـم وت: ئـەی (ابوهریـره) ئـەوە چ دەستنوێژێکە؟ ئەویش وتـی: ئـەی نـەوەی (فروخ)، ئێـوە لـێرەن؟ ئەگـەر بمانزانیایـە ئێـوە لـێرەن بـەم شـێوەیە دەسـتنوێژم نـەدەگرت، بیسـتوومە لەخۆشەویسـتم(ﷺ) فەرموویـەتی: ((جوانـیو ڕازاوەیـی ئیمـاندار لەڕۆژی قیامەتدا دەگاتە ئەو شوێنەی ئاوی دەستنوێژی پێدەگات)).

## (٢٧) ئەوەی لەدەستنوێژدا شوێنێکی شۆردن تەرك دەکات بابگەڕێتەوە سەری‌و نوێژەکەی بکاتەوە

١٣٢ـ عَنْ جَابِرٍ (ﷺ) قال: أَخْبَرَنِي عُمَرُ ابْنُ الْخَطَّابِ (ﷺ): أَنَّ رَجُلًا تَوَضَّأَ، فَتَرَكَ مَوْضِعَ ظُفُرٍ عَلَى قَدَمِهِ، فَأَبْصَرَهُ النَّبِيُّ (ﷺ)، فَقَالَ: ((ارْجِعْ فَأَحْسِنْ وُضُوءَكَ)). فَرَجَعَ، ثُمَّ صَلَّى. [بخاري/ الصلاة في ثياب، الصلاة في الخفان/ ٣٨٠]

(جابر)(ﷺ) دەڵێ: (عمر) کوری(خطاب)(ﷺ) ئاگاداری کردم: پیاوێك دەستنوێژی دەگرت، بەئەندازەی نینۆکێکی لەسەر قاچی نەشۆرد بوو، پێغەمبەر(ﷺ) چاوی پێی کەوت پێی فەرموو: ((بگەڕێرەوە دەستنوێژەکەت بەباشی بگرە)) گەڕایەوەو دوایی نوێژی کرد).

## (٢٨) بڕی ئاو بۆ خۆشۆردنو دەستنوێژ

١٣٣ـ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يَتَوَضَّأُ بِالْمُدِّ، وَيَغْتَسِلُ بِالصَّاعِ، إِلَى خَمْسَةِ أَمْدَادٍ. [بخاري / الوضوء بالمد/ ١٩٨]

(انس) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر( ﷺ) بە مشتێك( مد) ئاو دەستنوێژی دەگرت بەمەنێك (صاع)ێك، هەتا پێنج مشت خۆی دەشۆرد.*

## (٢٩) مەسحی کاڵەو پێتاو (خف)

١٣٤ـ عَنْ هَمَّامٍ قَالَ: بَالَ جَرِيرٌ (ﷺ) ثُمَّ تَوَضَّأَ وَمَسَحَ عَلَى خُفَّيْهِ، فَقِيلَ: تَفْعَلُ هَذَا؟ فَقَالَ: نَعَمْ، رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) بَالَ، ثُمَّ تَوَضَّأَ، وَمَسَحَ عَلَى خُفَّيْهِ. ﴿قَالَ الْأَعْمَشُ﴾: قَالَ إِبْرَاهِيمُ: كَانَ يُعْجِبُهُمْ هَذَا الْحَدِيثُ، لِأَنَّ إِسْلَامَ جَرِيرٍ كَانَ بَعْدَ نُزُولِ الْمَائِدَةِ. [بخاري/ الصلاة/٣٨٠]

(همام) دەڵێ: (جریر) (ﷺ) دەستی بەئاو گەیاند، ئینجا دەستنوێژی گرت مەسحی کاڵەو پێتاوەکانی کرد، پێیان وت: ئاوا دەکەیت؟ وتی: بەڵێ: پێغەمبەری خوام(ﷺ) دیوە چۆتە سەرئاو، دوایی دەستنوێژی گرتووەو دەستی هێناوە بەسەر کاڵەو پێتاوەکانیدا ﴿اعمش﴾دەڵێ: ابراهیم وتی: ئەو فەرموودەیان پێ خۆشبوو، چونکە موسڵمانبوونی(جریر) دوای دابەزینی سوورەتی(المائدة)بوو.

---

* مشت ﴿مد﴾بریتییە لەشەشپالویەك درێژی لایەکی ٩،٢ سم بێت.
مەن ﴿صاع﴾: بریتییە لەچوار ﴿مد﴾.

١٣٥ـ﴿عَنْ أَبِي وَائِلٍ قَالَ: كَانَ أَبُو مُوسَى يُشَدِّدُ فِي الْبَوْلِ، وَيَبُولُ فِي قَارُورَةٍ، وَيَقُولُ: إِنَّ بَنِي إِسْرَائِيلَ كَانَ إِذَا أَصَابَ جِلْدَ أَحَدِهِمْ بَوْلٌ قَرَضَهُ بِالْمَقَارِيضِ. فَقَالَ حُذَيْفَةُ: لَوَدِدْتُ أَنَّ صَاحِبَكُمْ لَا يُشَدِّدُ هَذَا التَّشْدِيدَ، فَلَقَدْ رَأَيْتُنِي أَنَا وَرَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) نَتَمَاشَى، فَأَتَى سُبَاطَةً خَلْفَ حَائِطٍ فَقَامَ كَمَا يَقُومُ أَحَدُكُمْ، فَبَالَ، فَانْتَبَذْتُ مِنْهُ، فَأَشَارَ إِلَيَّ، فَجِئْتُ فَقُمْتُ عِنْدَ عَقِبِهِ حَتَّى فَرَغَ. زاد في رواية: فتوضّأ فسمح على خُفّيه﴾. [بخاري/ الوضوء/ ٢٢٤]

﴿(ابو وائل) دەڵێ: (ابو موسى) زۆر خۆپارێز بوو لە میزكردندا، میزی دەكردە شووشەوەو دەیووت: نەوەی ئیسرائیلیەكان ئەگەر یەكێكیان پرژی میز بەرجێگایەكی بكەوتایا بەمقەست دەیبڕی. حوزەیفە وتی: حەزم دەكرد هاوەڵەكەتان ئەوەندە توندوتیژ نەبوایا خۆمم بینی لەخزمەت پێغەمبەری خوادا(ﷺ) دەرۆیشتین، گەیشتینە سەرە لوێنكی قەومێك لەدوای دیوارێكەوە، وەكو یەكێك لەئێوە هەستا چوو میزی كرد ، لێی دووركەوتمەوە ، ئامارژەی بۆ من كرد، چووم بۆ لای لەنزیكەوە راوەستام هەتا لێ بووەوە.﴿لەریوایەتێكدا ئەمەی زیادكردووە: دەستنوێژی گرت و دەستی هێنا بەسەر (كاڵەوپێتاوەكان)یدا﴾.

١٣٦. عَنْ الْمُغِيرَةِ بن شعبة (ﷺ) قَالَ: كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) ذَاتَ لَيْلَةٍ فِي مَسِيرٍ، فَقَالَ لِي: ((أَمَعَكَ مَاءٌ)). قُلْتُ: نَعَمْ، فَنَزَلَ عَنْ رَاحِلَتِهِ، فَمَشَى حَتَّى تَوَارَى فِي سَوَادِ اللَّيْلِ، ثُمَّ جَاءَ، فَأَفْرَغْتُ عَلَيْهِ مِنَ الْإِدَاوَةِ، فَغَسَلَ وَجْهَهُ، وَعَلَيْهِ جُبَّةٌ مِنْ صُوفٍ، فَلَمْ يَسْتَطِعْ أَنْ يُخْرِجَ ذِرَاعَيْهِ مِنْهَا حَتَّى أَخْرَجَهُمَا مِنْ أَسْفَلِ الْجُبَّةِ، فَغَسَلَ ذِرَاعَيْهِ، وَمَسَحَ بِرَأْسِهِ، ثُمَّ أَهْوَيْتُ لِأَنْزِعَ خُفَّيْهِ، فَقَالَ: ((دَعْهُمَا، فَإِنِّي أَدْخَلْتُهُمَا طَاهِرَتَيْنِ)). وَمَسَحَ عَلَيْهِمَا. [بخاري / اللباس / ٥٤٦٣]

(مغیرە)ی كوڕی( شعبە)(ﷺ) دەڵێ: شەوێكیان لەرێگایەكدا لەخزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) بووم فەرمووی پێم: ((ئایا ئاوت پێیە)) وتم: بەڵێ. لەوڵاغەكەی دابەزی رۆیشت تا لە تاریكی شەودا لەچاو ون بوو، ئینجا هاتەوە لەدۆڵچەكە ئاوم كرد بە دەستیا، دەموچاوی شۆرد، جبەیەكی خوری لەبەردابوو نەیدەتوانی دەستی دەربێنێ هەتا لەژێر جبەكەوە دەریهێناو هەردوو قۆڵی شۆرد، دەستی تەڕی هێنا بەسەریدا، ئینجا ویستم كاڵەو پێتاوەكانی داكەنم،

بەلاّم فەرمووی: ((وازیان لیّ بێنە من بەپاکی لەپێم کردوون)) ئینجا دەستی تەڕی هێنا بەسەر هەردووکیاندا.

## (٣٠) ماوە دانان بۆ مەسحی کاڵەو پێتاو

١٣٧ـعَنْ شُرَيْحِ بْنِ هَانِئٍ قَالَ: أَتَيْتُ عَائِشَةَ (ﷺ) أَسْأَلُهَا عَنِ الْمَسْحِ عَلَى الْخُفَّيْنِ، فَقَالَتْ: عَلَيْكَ بِابْنِ أَبِي طَالِبٍ فَسَلْهُ، فَإِنَّهُ كَانَ يُسَافِرُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَسَأَلْنَاهُ، فَقَالَ: جَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ وَلَيَالِيَهُنَّ لِلْمُسَافِرِ وَيَوْمًا وَلَيْلَةً لِلْمُقِيمِ)).

(شریح) کوڕی ( هانی) وتی: هاتم بۆ لای عائشە(ﷺ) پرسیاری مەسحی کاڵەوپێتاوی لیّبکەم ، وتی: بچۆ بۆ لای(علی) کوڕی( ابوطالب)لەوبپرسە چونکە ئەو لەخزمەت پێغەمبەریخودادا(ﷺ) سەفەری کردووە، ئێمەش لێمان پرسی: وتی: پێغەمبەری خوا(ﷺ) دایناوە: بۆ ڕێبوار سیّشەوو سیّڕۆژ ، بۆ دانیشتوش شەوو ڕۆژێك.

## (٣١) مەسح لەسەر تەوێڵ و مێزەر

١٣٨ـ عَنْ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ عَنْ أَبِيهِ (ﷺ) قَالَ: تَخَلَّفَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وَتَخَلَّفْتُ مَعَهُ، فَلَمَّا قَضَى حَاجَتَهُ قَالَ: ((أَمَعَكَ مَاءٌ)). فَأَتَيْتُهُ بِمِطْهَرَةٍ، فَغَسَلَ كَفَّيْهِ وَوَجْهَهُ، ثُمَّ ذَهَبَ يَحْسِرُ عَنْ ذِرَاعَيْهِ، فَضَاقَ كُمُّ الْجُبَّةِ، فَأَخْرَجَ يَدَهُ مِنْ تَحْتِ الْجُبَّةِ، وَأَلْقَى الْجُبَّةَ عَلَى مَنْكِبَيْهِ، وَغَسَلَ ذِرَاعَيْهِ، وَمَسَحَ بِنَاصِيَتِهِ وَعَلَى الْعِمَامَةِ، وَعَلَى خُفَّيْهِ، ثُمَّ رَكِبَ وَرَكِبْتُ، فَانْتَهَيْنَا إِلَى الْقَوْمِ وَقَدْ قَامُوا فِي الصَّلَاةِ، يُصَلِّي بِهِمْ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ، وَقَدْ رَكَعَ بِهِمْ رَكْعَةً، فَلَمَّا أَحَسَّ بِالنَّبِيِّ (ﷺ) ذَهَبَ يَتَأَخَّرُ، فَأَوْمَأَ إِلَيْهِ فَصَلَّى بِهِمْ، فَلَمَّا سَلَّمَ، قَامَ النَّبِيُّ (ﷺ) وَقُمْتُ، فَرَكَعْنَا الرَّكْعَةَ الَّتِي سَبَقَتْنَا.

(مغیرە) کوڕی (شعبە) (ﷺ) دەڵیّ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) دواکەوت منیش لەخزمەتیا دواکەوتم، کاتیّ دەستی بەئاوگەیاند فەرمووی: ((ئایا ئاوت پێیە)) منیش دەفرێکم بۆهێنا ئاوی تێدابوو، دەستو دەموچاوی شۆرد، ئینجا ویستی قۆڵی هەڵماڵیّ بەلاّم قۆڵی جبەکەی تەسك بوو هەڵنەماڵرا، بۆیە لەژێر جبەکەوە قۆڵی دەرهێناو جبەکەیدا بەسەرشانیا، هەردووباڵی شۆردو، مەسحی تەوێڵ و سەرمێزەرەکەی کرد، هەروەها مەسحی کاڵەو پێتاوەکانی کرد، ئینجا سواربوو منیش سواربووم هەتا گەیشتینە خەڵکەکە هەستابوونەوە بۆ نوێژو

(عبدالرحمن) كوڕی ( عوف) نوێژی بۆ دەكردن، ركاتێكی پیٚكردبوون، كاتیٚ هەستی بەهاتنی پێغەمبەر(ﷺ) كرد، ویستی بێتە دوواوە، پێغەمبەر(ﷺ) ئاماژەیەكی بۆ كرد، ئەویش نوێژەكەی بۆ تەواوكردن كاتیٚ سەلامیدایەوە پێغەمبەر(ﷺ) هەستایەوە﴿بۆ ركاتە رۆیشتووەكەی﴾منیش هەستامەوە، ئەو ركاتەمان كرد كەلەپێش ئێمەوە كردبوویان.

## ( ٣٢ ) مەسح لەسەر مێزەر

١٣٩ـ عَنْ بِلَالٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) مَسَحَ عَلَى الْخُفَّيْنِ وَالْخِمَارِ.

(بلال)(ﷺ) دەڵیٚ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) مەسحی لەسەر _خف)و لەسەر مێزەریش دەكرد.

## ( ٣٣ ) چەند نوێژێك بەیەك دەستنوێژ

١٤٠ـ عن بُرَيْدَةَ (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) صَلَّى الصَّلَوَاتِ يَوْمَ الْفَتْحِ بِوُضُوءٍ وَاحِدٍ، وَمَسَحَ عَلَى خُفَّيْهِ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ (ﷺ): لَقَدْ صَنَعْتَ الْيَوْمَ شَيْئًا لَمْ تَكُنْ تَصْنَعُهُ؟ قَالَ: ((عَمْدًا صَنَعْتُهُ يَا عُمَرُ)).

(بریدە)(ﷺ) دەڵیٚ: پێغەمبەر(ﷺ) نوێژەكانی رۆژی(فتح)ی بەیەك دەستنوێژكرد، مەسحی كاڵەوپێتاوەكانیشی كرد، عمر(ﷺ) پێی وت: ئیمڕۆ كارێكت كرد لەمەوپێش نەتكردووە؟ فەرمووی: ((بەتایبەتی خۆم ویستم ئەوكارەبكەم ئەی عومەر)) [بۆئەوەی روونیبكەمەوە كەئەمەش دروستە].

## ( ٣٤ ) وتەی دوای نوێژ

١٤١ـعَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (ﷺ) قَالَ: كَانَتْ عَلَيْنَا رِعَايَةُ الْإِبِلِ، فَجَاءَتْ نَوْبَتِي فَرَوَّحْتُهَا بِعَشِيٍّ، فَأَدْرَكْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَائِمًا يُحَدِّثُ النَّاسَ، فَأَدْرَكْتُ مِنْ قَوْلِهِ: ((مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَتَوَضَّأُ فَيُحْسِنُ وُضُوءَهُ، ثُمَّ يَقُومُ فَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ مُقْبِلٌ عَلَيْهِمَا بِقَلْبِهِ وَوَجْهِهِ، إِلَّا وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ)). قَالَ: فَقُلْتُ مَا أَجْوَدَ هَذِهِ، فَإِذَا قَائِلٌ بَيْنَ يَدَيَّ يَقُولُ: الَّتِي قَبْلَهَا أَجْوَدُ، فَنَظَرْتُ فَإِذَا عُمَرُ (ﷺ) قَالَ: إِنِّي قَدْ رَأَيْتُكَ جِئْتَ آنِفًا، قَالَ: ((مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ يَتَوَضَّأُ فَيُبْلِغُ -أَوْ: فَيُسْبِغُ- الْوَضُوءَ، ثُمَّ يَقُولُ: أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ، إِلَّا فُتِحَتْ لَهُ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ الثَّمَانِيَةُ، يَدْخُلُ مِنْ أَيِّهَا شَاءَ)).

(عقبە) كوڕی( عامر) (ﷺ) دەڵیٚ: ئێمە وشترمان بەخێودەكرد ، نۆرەی من هات و، ئێوارەیەك گێڕامنەوە بۆ مۆڵگاكەیان، گەیشتم بەخزمەت پێغەمبەری

خوا(ﷺ) بەپێوە راوەستابوو قسەی بۆ خەڵك دەكرد، گەیشتم بەو قسەیەی كەدەیفەرموو: ((هیچ موسڵمانێك نییە كەدەستنوێژ بگرێت و بەباشی بیگرێت، ئینجا هەستێ و دوورکات نوێژ بكات. بەدڵ و بەگیان لەناو نوێژەكەدابێت، ئەوا بەهەشت مسۆگەر دەبێت بۆی)) دەڵێ: منیش وتم: ئای ئەم مژدەیە چەند خۆش بوو، كوتوپڕ لەبەردەستما كەسێك وتی: مژدەی پێشتری خۆشتربوو، سەیرم كرد دەبینم عومەرە(ﷺ) وتی: من چاوم لێت بوو كەئێستا هاتی، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((هەریەكێك لەئێوە دەستنوێژ بگرێت، بەباشی و بەتەواوی دەستنوێژەكەی بگرێت، ئینجا بڵێت: (اشهد ان لا اله الا الله واشهد ان محمداً عبده ورسوله، ئەوە هەر هەشت دەرگاكەی بەهەشتی بۆ دەكرێتەوە، لەكامیانەوە بیەوێت دەچێتە ژوورەوە)).

## ( ٣٥ )شۆردنی لینجاو( مذي )و دەستنوێژ گرتنەوەلێی

١٤٢ـعَنْ عَلِيّ (ﷺ) قَال: كُنْتُ رَجُلًا مذَّاءً، وَكُنْتُ أَسْتَحْيِي أَنْ أَسْأَلَ النَّبِيَّ (ﷺ) لِمَكَانِ ابْنَتِهِ، فَأَمَرْتُ الْمِقْدَادَ بْنَ الْأَسْوَدِ فَسَأَلَهُ، فَقَالَ: ((يَغْسِلُ ذَكَرَهُ وَيَتَوَضَّأُ)).

(علی)(ﷺ) دەڵێ: من پیاوێك بووم لینجاوم زۆربوو، شەرمم دەكرد لەپێغەمبەر(ﷺ) بپرسم لەبەرئەوە فاتمەی كچی لای من بوو ، هەر بۆیە داوام لە(مقدادی) كوڕی(اسود) كرد، ئەو پرسیاری لێكرد، فەرمووی: ((زەكەری دەشواو دەستنوێژ دەگرێت)).

## ( ٣٦ ) خەوی دانیشتوو دەستنوێژ ناشكێنێ

١٤٣ـ عن أنسَ بْنَ مَالِكٍ (ﷺ): أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ، و رسولُ اللهِ (ﷺ) نَجِيٌّ لرجلٍ – وفي حديثِ عبدِ الوارثِ: ونبيُّ اللهِ (ﷺ) يُنَاجِي رَجُلًا – فما قامَ إلى الصَّلاة حتى نامَ القومُ. وفي حديثِ شُعبةَ: فَلَمْ يَزَلْ يُنَاجِيهِ حَتَّى نَامَ أَصْحَابُهُ، ثُمَّ جَاءَ فَصَلَّى بِهِمْ. [بخاري/ الاذان/ ٦١٦]

(انس)(ﷺ) دەڵێ: قامەت كرا بۆ نوێژ كەچی پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ پیاوێكدا چپەی دەكرد هەڵنەستا بۆ نوێژ هەتا خەڵكەكە خەویان لێكەوت پاشان هات و نوێژی بۆ كردن..

## ( ٣٧ ) دەستنوێژ لەدوای خواردنی گۆشتی وشتر

١٤٤ـ عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَجُلًا سَأَلَ رَسُولَ اللَّه (ﷺ): أَأَتَوَضَّأُ مِنْ لُحُومِ الْغَنَمِ؟ قَالَ: ((إِنْ شِئْتَ فَتَوَضَّأْ، وَإِنْ شِئْتَ فَلَا تَوَضَّأْ)). قَالَ: أَتَوَضَّأُ مِنْ لُحُومِ الْإِبِلِ؟ قَالَ: ((نَعَمْ، فَتَوَضَّأْ مِنْ لُحُومِ الْإِبِلِ)). قَالَ: أُصَلِّي فِي مَرَابِضِ الْغَنَمِ؟ قَالَ: ((نَعَمْ)). قَالَ: أُصَلِّي فِي مَبَارِكِ الْإِبِلِ؟ قَالَ: ((لَا)). [اقتران النيرين/ بخاري/ ١٧٢١/٦٣]

(جابر) کوڕی ( سمره) (ﷺ) دەڵێ: پیاوێك پرسیاری كرد لەپێغەمبەر (ﷺ) ئایا دەستنوێژ بگرمەوە لەخواردنی گۆشتی مەڕ؟ فەرمووی: ((ئەگەر ویستت دەستنوێژ بگرە، ئەگەر ویستیشت مەیگرە)) وتی: ئەی دەستنوێژ بگرم لەگۆشتی وشتر؟ فەرمووی: ((بەڵێ)) وتی: نوێژبكەم لەمۆڵگای وشتردا؟ فەرمووی: ((نەخێر)).

## ( ٣٨ ) دەستنوێژ گرتن لەشتێ ئاگری بەركەوتبێ

١٤٥ـ عن عُمَرُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ: أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ إِبْرَاهِيمَ بْنِ قَارِظٍ أَخْبَرَهُ: أَنَّهُ وَجَدَ أَبَا هُرَيْرَةَ يَتَوَضَّأُ عَلَى الْمَسْجِدِ، فَقَالَ: إِنَّمَا أَتَوَضَّأُ مِنْ أَثْوَارِ أَقِطٍ أَكَلْتُهَا، لِأَنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((تَوَضَّئُوا مِمَّا مَسَّتِ النَّارُ)).

(عمر) کوڕی (عبدالعزیز) دەڵێ: (عبدالله) کوڕی(ابراهیم) کوڕی (قارض)پێی ڕاگەیاندم: (ابوهریرە)ی دیووە لەمزگەوت دەستنوێژی گرتووە، وتوویەتی: من دەستنوێژ دەگرم لەوپارچە گۆشتانەی كەخواردومن، چونكە لەپێغەمبەری خوام( ﷺ) بیستووە فەرموویەتی: ((دەستنوێژ بگرن لەوشتانەی ئاگریان بەردەكەوێت)).

## ( ٣٩ ) هەڵوەشاندنەوەی دەستنوێژ گرتن لەوشتەی ئاگری بەركەوتووە

١٤٦ـ عَنْ جَعْفَرِ بْنِ عَمْرِو بْنِ أُمَيَّةَ الضَّمْرِيِّ عَنْ أَبِيهِ (ﷺ) قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَحْتَزُّ مِنْ كَتِفِ شَاةٍ، فَأَكَلَ مِنْهَا، فَدُعِيَ إِلَى الصَّلَاةِ، فَقَامَ وَطَرَحَ السِّكِّينَ، وَصَلَّى وَلَمْ يَتَوَضَّأْ. [بخاري / الوضوء/ من لم يتوضأ من كم الشاة/٢٠٥]

(جعفر) کوڕی ( عمرو) کوڕی(امیة الضمیري)(ﷺ)دەڵێ: چاوم لێ بوو پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەچەقۆ گۆشتی لەشانی مەڕێك دەكردەوە لێی دەخوارد، بانگ درا بۆ نوێژ چەقۆكەی داناو هەستا چوو نوێژی كرد دەستنوێژی نەگرت.

١٤٧ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (ﭬ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) شَرِبَ لَبَنًا، ثُمَّ دَعَا بِمَاءٍ فَتَمَضْمَضَ وَقَالَ: ((إِنَّ لَهُ دَسَمًا)). [بخاري/ الوضوء/ هل يمضمض من اللبن/ ٢٠٨]

(ابن عباس) (ﭭ) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) شیری خواردەوە، ئینجا داوای ئاوی کردو لەدەمی وەرداو فەرمووی: ((چەوری پێوەیە)).

١٤٨ـ عنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﭬ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((إِذَا وَجَدَ أَحَدُكُمْ فِي بَطْنِهِ شَيْئًا، فَأَشْكَلَ عَلَيْهِ أَخَرَجَ مِنْهُ شَيْءٌ أَمْ لَا؟ فَلَا يَخْرُجَنَّ مِنَ الْمَسْجِدِ حَتَّى يَسْمَعَ صَوْتًا، أَوْ يَجِدَ رِيحًا)).

(ابو هريرە) (ﭬ) دەڵێ: پێغمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: ((ئەگەر یەکێکتان هەستی بەشتیٚکرد لەسکیا، ئینجا لێی تێکچوو ئایا شتێکی لێ هاتبێتە دەرەوە یان نا؟ با لە مزگەوت نەچێتە دەرەوە، هەتا یان گوێی لەدەنگی دەبێ، یان بۆنێك دەکات [واتە: تا دڵنیا نەبێ لەدەرچوونی شتێك بەگومان دەستنوێژی ناشکێت].

# (٣) - بەشی خۆشۆردن

## (١)ئاو لەئاوەوە پێویست دەبێت بۆ پیاوێك سەرجێیی (جماع) بكات و ئاوی نەیەتەوە

١٤٩- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ عَنْ أَبِيهِ (ﷺ) قَالَ: خَرَجْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) يَوْمَ الاثْنَيْنِ إِلَى قُبَاءَ، حَتَّى إِذَا كُنَّا فِي بَنِي سَالِمٍ وَقَفَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَلَى بَابِ عِتْبَانَ فَصَرَخَ بِهِ، فَخَرَجَ يَجُرُّ إِزَارَهُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((أَعْجَلْنَا الرَّجُلَ)). فَقَالَ عِتْبَانُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ الرَّجُلَ يُعْجَلُ عَنِ امْرَأَتِهِ وَلَمْ يُمْنِ، مَاذَا عَلَيْهِ؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((إِنَّمَا الْمَاءُ مِنَ الْمَاءِ)). [بخاري / الوضوء/ ١٧٨].

(عبدالرحمن) كوڕی( ابی سعید الخدری) لەباوكیەوە بۆمان دەگێڕێتەوە(ﷺ) دەڵێ: ڕۆژی دووشەممە لەخزمەت پێغەمبەری خوادا(ﷺ)ڕۆیشتین بۆ قوباء،ڕۆیشتین تاگەیشتینە (بنی سالم)، پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەبەردەرگای ماڵی (عتبان)دا ڕاوەستاو بانگی (عتبان)ی كرد، ئەویش هاتە دەرەوە داوێنی كراسەكەی ڕادەكێشا، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ((پەلەمان لەپیاوەكە كرد)) عتبان وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) : ئەگەر پیاوێك بچێتە لای هاوسەرەكەی و پەلەی لێبكەن و ئاوی نەیەتەوە ، چی لەسەرە؟ فەرمووی: ((ئاو لەئاوەوە پێویست دەبێت))[لێرەدا واتە هەتا ئاو نەپەڕێت خۆ شۆردنی ناوێت].

## (٢) هەڵوەشاندنەوەی فەرموودەی پێشوو / واجب بوونی خۆشۆردن بە بەیەك گەیشتنی هەردوخەتەنەكراو

١٥٠- عَنْ أَبِي مُوسَى (ﷺ) قَالَ: اخْتَلَفَ فِي ذَلِكَ رَهْطٌ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنْصَارِ، فَقَالَ الْأَنْصَارِيُّونَ: لَا يَجِبُ الْغُسْلُ إِلَّا مِنَ الدَّفْقِ أَوْ مِنَ الْمَاءِ. وَقَالَ الْمُهَاجِرُونَ: بَلْ إِذَا خَالَطَ فَقَدْ وَجَبَ الْغُسْلُ. قَالَ: قَالَ أَبُو مُوسَى: فَأَنَا أَشْفِيكُمْ مِنْ ذَلِكَ، فَقُمْتُ فَاسْتَأْذَنْتُ عَلَى عَائِشَةَ (ﷺ) فَأَذِنَ لِي، فَقُلْتُ ﴿لها﴾: يَا أُمَّاهْ -أَوْ يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ- إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أَسْأَلَكِ عَنْ شَيْءٍ وَإِنِّي أَسْتَحْيِيكِ. فَقَالَتْ: لَا تَسْتَحْيِي أَنْ تَسْأَلَنِي عَمَّا كُنْتَ سَائِلًا عَنْهُ أُمَّكَ الَّتِي وَلَدَتْكَ، فَإِنَّمَا أَنَا أُمُّكَ. قُلْتُ: فَمَا يُوجِبُ الْغُسْلَ؟ قَالَتْ: عَلَى الْخَبِيرِ سَقَطْتَ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((إِذَا جَلَس

بَيْنَ شُعَبِها الْأَرْبَعِ، وَمَسَّ الْخِتانُ الْخِتَانَ، فَقَدْ وَجَبَ الْغُسْلُ)). [اقتران النيرين / بخاري/ ١٧٦٥/٧]

(ابو موسى)(ﷺ) دەڵێ: کۆمەڵێك لە(مهاجر)و (انصار) جیاوازی کەوتە نێوانیان. (انصار)یەکان وتیان: خۆشۆردن پێویست نابێت هەتا ئاو نەیەتەوە (مهاجر)یەکانیش وتیان: بەڵێ ئەگەر تێکەڵبوون، خۆشۆردن پێویست دەبێت. دەڵێ(ابو موسى) وتی: من ئەوەتان بۆچارەدەکەم، هەستام چووم مۆڵەتم لەعائشە(ﷺ)وەرگرت و ئەویش مۆڵەتی دامو پێموت: دایە گیان ـ یا ئەی دایکی ئیمانداران ـ من دەمەوێ پرسیارێك لەبارەی شتێکەوە بکەمو بەلام شەرمت لێدەکەم ، ئەویش وتی: شەرم مەکە، ئەو پرسیارەی پرسیوتە لەو دایکەت کەتۆی لێ بوویت لەمنیشی بپرسە، منیش دایکتم، وتم: چی خۆشۆردن واجب دەکات؟ وتی: گەیشتی بەکەسی شارەزا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ((ئەگەر لەنێوان هەردوو قاچیو هەردوو رانیا دانیشت، خەتەنەکراوی ئەم بەر خەتەنەکراوی ئەو کەوت، ئەوا خۆشۆردن واجب دەبێت))[1].

١٥١ـ ﴿عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ عَنْ أُمِّ كُلْثُومٍ، عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَتْ: إِنَّ رَجُلًا سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) عَنِ الرَّجُلِ يُجَامِعُ أَهْلَهُ ثُمَّ يُكْسِلُ، هَلْ عَلَيْهِمَا الْغُسْلُ؟ وَعَائِشَةُ جَالِسَةٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((إِنِّي لَأَفْعَلُ ذَلِكَ أَنَا وَهَذِهِ ثُمَّ نَغْتَسِلُ))﴾.

﴿ لە(جابر) کوری (عبدالله)وە لە (ام کلثوم)وە لە(عائشة)وە (ﷺ) هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ) وتی: پیاوێك پرسیاری لەپێغەمبەری خوا(ﷺ) کرد لەبارەی پیاوێکەوە کەسەرجێیی :(تێکەڵی لەگەڵ هاوسەرەکەی بکات و ئینجا تاقەتی نەمێنێ[واتە: ئاوی نەیەتەوە] ئایا خۆشۆردنیان لەسەرە؟ لەوکاتەدا (عائشة)لەوێ دانیشتبوو ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((منو ئەمە(عائشە) وادەکەینو دوایی خۆمان دەشۆرین)).

## (٣) ئافرەت لەخەویا شتێك ببینێ کە پیاو دەیبینێ

١٥٢ـ عن إِسْحَقَ ﴿بْنُ أَبِي طَلْحَةَ﴾ عن أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ جَاءَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ -وَهِيَ جَدَّةُ إِسْحَقَ- إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالَتْ لَهُ وَعَائِشَةُ عِنْدَهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ

[1] ئەم فەرموودەیە پێشووەکەیان هەڵدەوەشێنێتەوە.

الْمَرْأَةُ تَرَى مَا يَرَى الرَّجُلُ فِي الْمَنَامِ، فَتَرَى مِنْ نَفْسِهَا مَا يَرَى الرَّجُلُ مِنْ نَفْسِهِ؟ فَقَالَتْ عَائِشَةُ: يَا أُمَّ سُلَيْمٍ، فَضَحْتِ النِّسَاءَ تَرِبَتْ يَمِينُكِ. فَقَالَ لِعَائِشَةَ: ((بَلْ أَنْتِ فَتَرِبَتْ يَمِينُكِ، نَعَمْ فَلْتَغْتَسِلْ يَا أُمَّ سُلَيْمٍ إِذَا رَأَتْ ذَاكِ)).

لە(اسحاق) کوری (ابي طالب)ەوە لە(انس)ەوە (ﷺ) دەڵێ: (ام سليم)کە نەنکی اسحاق بوو. هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) عائیشەش لەوێ بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ژن ، ئەوەی پیاوێك لەخەودا دەیبینێ ئەمیش دەیبینێ، پیاو چی لەخۆیدا دەبینێ ئەمیش دەیبینێ؟[ئایا خۆشۆردنی لەسەرە؟] (عائشە)(ﷺ) وتی: هەی دەست بکەیت بەکەنوی خاڵیدا ئەی (ام سلیم) ئابڕووی ژنانت برد، پێغەمبەر(ﷺ) بە(عائشە)ی فەرموو: تۆدەست بکەیت بەکەنووی خاڵیدا، بەڵێ ئەی (ام سلیم) با خۆی بشۆرێت ئەگەر ئەوەی دی [لەخەویا].

## ( ٤ ) چۆنێتی خۆشۆردن لە لەشگرانیی

١٥٣ـ عن مَيْمُونَةُ (ﷺ) زوج النبي (ﷺ) قَالَتْ: أَدْنَيْتُ لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) غُسْلَهُ مِنَ الْجَنَابَةِ، فَغَسَلَ كَفَّيْهِ مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلَاثًا، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ فِي الْإِنَاءِ، ثُمَّ أَفْرَغَ بِهِ عَلَى فَرْجِهِ وَغَسَلَهُ بِشِمَالِهِ، ثُمَّ ضَرَبَ بِشِمَالِهِ الْأَرْضَ فَدَلَكَهَا دَلْكًا شَدِيدًا، ثُمَّ تَوَضَّأَ وُضُوءَهُ لِلصَّلَاةِ، ثُمَّ أَفْرَغَ عَلَى رَأْسِهِ ثَلَاثَ حَفَنَاتٍ مِلْءَ كَفِّهِ، ثُمَّ غَسَلَ سَائِرَ جَسَدِهِ، ثُمَّ تَنَحَّى عَنْ مَقَامِهِ ذَلِكَ فَغَسَلَ رِجْلَيْهِ، ثُمَّ أَتَيْتُهُ بِالْمِنْدِيلِ، فَرَدَّهُ)).
[بخاري/ الغسل/ ٢١٦]

(مەیمونە) ی هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ) دەڵێ: ئاوم هێنا بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆ خۆشتن لەلەشگرانیی، دووجار یا سێجار دەستی شۆرد، ئینجا دەستی خستە ناو قاپەکەوە بەدەستی ئاوی کرد بە پێشی خۆیداو بەدەستی چەپی شۆردی، ئینجا بەتوندی دەستی چەپی هێنا بەزەویداو لەزەویەکەی دەخشاند، پاشان دەستنوێژی گرت وەکو بۆ نوێژ بیگرێت، ئینجا سێ مشتی پڕ ئاوی کرد بەسەریا، ئینجا هەموو لەشی شۆرد، پاشان جێگاکەی گۆڕیو هەردوو پێی شۆرد، ئینجا خاولیم بۆهێنا خۆی پێ وشك بکاتەوە نەیویست.

## ( ٥ ) بڕی ئەو ئاوەی لەشگران خۆی پێ دەشوات

١٥٤ـ عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عَائِشَةَ (ﷺ) أَنَا وَأَخُوهَا مِنَ الرَّضَاعَةِ، فَسَأَلَهَا عَنْ غُسْلِ النَّبِيِّ (ﷺ) مِنَ الْجَنَابَةِ؟ فَدَعَتْ بِإِنَاءٍ قَدْرِ الصَّاعِ،

فَاغْتَسَلَتْ، وَبَيْنَنَا وَبَيْنَهَا سِتْرٌ، وَأَفْرَغَتْ عَلَى رَأْسِهَا ثَلَاثًا، قَالَ: وَكَانَ أَزْوَاجُ النَّبِيِّ (ﷺ) يَأْخُذْنَ مِنْ رُءُوسِهِنَّ حَتَّى تَكُونَ كَالْوَفْرَةِ. [بخاري/ الغسل/ ٢٤٨]

(ابو سلمه) كوڕی ( عبدالرحمن) دەڵێ: چوین بۆ لای عائشه(ﵵ) لەگەڵ برا شیریەکەیدا، لەبارەی خۆشۆردنی پێغەمبەری خواوە(ﷺ) لە لەشگرانی لێی پرسی؟ داوای قاپێکی کرد بەئەندازەی (مەنێك) دەبوو، خۆی پێ شۆرد، لەنێوان ئێمەو عائشەدا پەردەیەك هەبوو، سێجار ئاوی کرد بەسەریا وتی: هاوسەرەکانی پێغەمبەر(ﷺ) قژیان دەبڕی تادەگاتە ئاستی گوێچکەیان)).

## ( ٦ ) پەردە گێڕان بۆ خۆشۆردن

١٥٥ـ عن أُمَّ هَانِئٍ بِنْتَ أَبِي طَالِبٍ (﵂): أَنَّهَا لَمَّا كَانَ عَامُ الْفَتْحِ أَتَتْ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) وَهُوَ بِأَعْلَى مَكَّةَ، قَامَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِلَى غُسْلِهِ، فَسَتَرَتْ عَلَيْهِ فَاطِمَةُ، ثُمَّ أَخَذَ ثَوْبَهُ فَالْتَحَفَ بِهِ، ثُمَّ صَلَّى ثَمَانَ رَكَعَاتٍ سُبْحَةَ الضُّحَى. [بخاري / الصلاة في ثياب/٢٥٠]

(ام هانی) کچی (ابوطالب)دەڵێ: لەساڵی فەتحی مەککەدا هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەسەرووی مەککەوەبوو، پێغەمبەر(ﷺ) هەستا چوو بۆ شوێنی خۆشۆردن فاتمە پەردەیەکی بۆ گێڕا تا خۆی شۆرد، ئینجا جلەکانی خۆی هەڵگرتو پێچای لەخۆیەوەو ، دوای ئەوە هەشت ڕکات نوێژی سوننەتی چێشتەنگاوی کرد.

## ( ٧ ) بەتەنها خۆشۆردنی پیاوو خۆ پەنادانی

١٥٦ـ عن أَبِي هُرَيْرَةَ (﵁) عَنْ مُحَمَّدٍ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَذَكَرَ أَحَادِيثَ، مِنْهَا: وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((كَانَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ يَغْتَسِلُونَ عُرَاةً يَنْظُرُ بَعْضُهُمْ إِلَى سَوْأَةِ بَعْضٍ، وَكَانَ مُوسَى (ﷺ) يَغْتَسِلُ وَحْدَهُ، فَقَالُوا: وَاللَّهِ مَا يَمْنَعُ مُوسَى أَنْ يَغْتَسِلَ مَعَنَا إِلَّا أَنَّهُ آدَرُ، قَالَ: فَذَهَبَ مَرَّةً يَغْتَسِلُ، فَوَضَعَ ثَوْبَهُ عَلَى حَجَرٍ فَفَرَّ الْحَجَرُ بِثَوْبِهِ، قَالَ: فَجَمَحَ مُوسَى (ﷺ) بِإِثْرِهِ يَقُولُ: ثَوْبِي حَجَرُ ثَوْبِي حَجَرُ، حَتَّى نَظَرَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ إِلَى سَوْأَةِ مُوسَى، قَالُوا: وَاللَّهِ مَا بِمُوسَى مِنْ بَأْسٍ، فَقَامَ الْحَجَرُ حَتَّى نُظِرَ إِلَيْهِ، ﴿قَالَ: فَأَخَذَ ثَوْبَهُ﴾ فَطَفِقَ بِالْحَجَرِ ضَرْبًا)). قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: وَاللَّهِ إِنَّهُ بِالْحَجَرِ نَدَبٌ، سِتَّةٌ أَوْ سَبْعَةٌ، ضَرْبُ مُوسَى بِالْحَجَرِ. [بخاري/ الغسل/ من اغتسل عرياناً ../٢٧٤]

(ابوهريـــره)(ﷺ) لەپێغەمبـەری خـواوە(ﷺ) چـەند فەرموودەیـەکی بـۆ گێڕاینەوە لەوانەش وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((نەوەی ئیسرائیل بەرووتی خۆیان دەشۆردو سەیری عەیبی یەکتریان دەکرد، موسا(عليه السلام) بەتەنیا خۆی دەشۆرد، وتیان: بەخوا موسا قۆڕە بۆیە بەتەنیا خۆی دەشۆرێت دەڵێ: جارێکیان موسا چوو خۆی بشوات، جلەکانی لەسەر بەردێك دانا، بەردەکە جلەکانی رفاند، دەڵێ: موسا (عليه السلام) ناچار بەپەلە کەوتەدوایو دەیفەرموو: بەردەکە جلەکانم، بەردەکە جلەکانم ، هەتا خەڵکەکە سەیری موسایان کردو وتیان: بەخوا موسا هیچ عەیبێکی نییە. دەڵێ: ئینجا جلەکانی هەڵگرت و دەستی کرد بەلێدانی بەردەکە)) (ابوهريره) دەڵێ: بەخوا لەبەردەکەدا شوێنی لێدانەکە دیاربوو، شەش یا حەوت شوێنی لێدان بەبەردەکەوەبوو.

## ( ٨ ) رێگریی کراوە لەسەیرکردنی عەیبی پیاوو ئافرەت

١٥٧ـ عن أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((لَا يَنْظُرُ الرَّجُلُ إِلَى عَوْرَةِ الرَّجُلِ، وَلَا الْمَرْأَةُ إِلَى عَوْرَةِ الْمَرْأَةِ، وَلَا يُفْضِي الرَّجُلُ إِلَى الرَّجُلِ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ، وَلَا تُفْضِي الْمَرْأَةُ إِلَى الْمَرْأَةِ فِي الثَّوْبِ الْوَاحِدِ)).

(ابو سعيد الخدرى)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: ((پیاو نابێ سەیری عەیبی پیاو بکات، ئافرەتیش نابێ سەیری عەیبی ئافرەت بکات، هەروەها پیاو نابێ لەشی بخشێنێ لەلەشی پیاوێکیتر لەیەك پۆشاکدا ، هەروەها نابێ ئافرەتیش لەشی بخشێنێ لە لەشی ئافرەتێکیتر لەیەك پۆشاکدا.

## ( ٩ ) خۆپەنادان و نابێ مرۆڤ بەرووتی ببینرێت

١٥٨ـ عن جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) كَانَ يَنْقُلُ مَعَهُمُ الْحِجَارَةَ لِلْكَعْبَةِ وَعَلَيْهِ إِزَارُهُ، فَقَالَ لَهُ الْعَبَّاسُ عَمُّهُ: يَا ابْنَ أَخِي، لَوْ حَلَلْتَ إِزَارَكَ فَجَعَلْتَهُ عَلَى مَنْكِبِكَ دُونَ الْحِجَارَةِ. قَالَ: فَحَلَّهُ فَجَعَلَهُ عَلَى مَنْكِبِهِ، فَسَقَطَ مَغْشِيًّا عَلَيْهِ. قَالَ: فَمَا رُئِيَ بَعْدَ ذَلِكَ الْيَوْمِ عُرْيَانًا. [بخاري / الصلاة في ثياب/ ٣٥٧]

(جابر) کوڕی(عبدالله) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) بەردی دەگواستەوە لەگەڵ هاوەڵەکانیدا بۆ کەعبە کراسێکی لەبەردابوو، (عباس)ی مامی پێی وت: ئەی برازا با کراسەکەت بکردایەتەوە بتخستایەتە سەرشتانت لەژێر بەردەکاندا،

وتـی: کردیەوە خستیە سەرشـانی ، بەلاَم بوورایـەوەو کـەوت، دەڵـێ: لـەو ڕۆژە بەدواوە بەرووتی نەبینراوە.

## (١٠) خۆشۆردنی ژن و پیاو لەیەك دەفردا

١٥٩ـ عَنْ مُعَاذَةَ، عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: كُنْتُ أَغْتَسِلُ أَنَا وَرَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) مِنْ إِنَاءٍ واحد بَيْنِي وَبَيْنَهُ، فَيُبَادِرُنِي، حَتَّى أَقُولَ: دَعْ لِي دَعْ لِي، قَالَتْ: وَهُمَا جُنُبَانِ. [بخاري/ الغسل / هل يدخل الجنب يده في الاناء/ ٢٦٠]

(معاذ)لە (عائشة)ەوە (ﷺ) دەڵـێ: منو پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەیەك دەفردا خۆمان دەشۆرد، ئەو دەستپێشخەری دەکرد، منیش دەموت: داینێ بۆ من، داینێ بۆ من دەڵێ: هەردووکمان لەشمان گرانبوو.

## (١١) دەستنوێژی لەشگران ئەگەر بیەوێ بخەوێ یان نان بخوات

١٦٠ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِذَا كَانَ جُنُبًا، فَأَرَادَ أَنْ يَأْكُلَ أَوْ يَنَامَ، تَوَضَّأَ وُضُوءَهُ ﴿لِلصَّلَاةِ﴾. [بخاري/ الغسل/ الجنب يتوضأ ثم ينام/ ٢٨٤]

(عائشه) (ﷺ) دەڵێ: کاتێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەشگران بوایەو بیویستایە نان بخوات یان بخەوێت ، دەستنوێژی دەگرت وەکو (بۆ نوێژ) دەستنوێژ بگرێت.

## (١٢) خەوتنی لەشگران پێش خۆشۆردن

١٦١ـعَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَيْسٍ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ (ﷺ) عَنْ وِتْرِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) -فَذَكَرَ الْحَدِيثَ- قُلْتُ: كَيْفَ كَانَ يَصْنَعُ فِي الْجَنَابَةِ، أَكَانَ يَغْتَسِلُ قَبْلَ أَنْ يَنَامَ أَمْ يَنَامُ قَبْلَ أَنْ يَغْتَسِلَ؟ قَالَتْ: كُلُّ ذَلِكَ قَدْ كَانَ يَفْعَلُ، رُبَّمَا اغْتَسَلَ فَنَامَ، وَرُبَّمَا تَوَضَّأَ فَنَامَ. قُلْتُ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي جَعَلَ فِي الْأَمْرِ سَعَةً.

(عبدالله) کوری (ابی قیس) دەڵـێ: پرسیارم کرد لە(عائشە)(ﷺ) لەبارەی وەتری پێغەمبـەرەوە، فەرموودەکەی گێڕایەوەو وتم: ئەی لەکاتی لەشگرانیدا چۆنی دەکرد؟ ئایا پێش خەوتن خۆی دەشۆرد، یان دەنوست پێش خۆشۆردن؟ وتی: ئەمانەی هەموو دەکرد، جاربووە خۆی شۆردووەو نووستووە، جاریش بووە دەستنوێژی گرتووەو نووستووە، وتم: سوپاس بۆ ئەو خوایەی فراوانی داوە بەم کارە.

## (١٣) هەرکەس چووە لای خێزانیو ویستی دووبارەی بکاتەوە با دەستنوێژێك بگرێت

١٦٢ـعَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((إِذَا أَتَى أَحَدُكُمْ أَهْلَهُ، ثُمَّ أَرَادَ أَنْ يَعُودَ، فَلْيَتَوضَّأ)).

(ابوسعيد الخدری)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: ((ئەگەر کەسێکتان چووە لای خێزانی، ئینجا ویستی دووبارەی بکاتەوە، با دەستنوێژ بگرێت)).

## (١٤) تەیەموم

١٦٣ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) أَنَّهَا قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فِي بَعْضِ أَسْفَارِهِ حَتَّى إِذَا كُنَّا بِالْبَيْدَاءِ أَوْ بِذَاتِ الْجَيْشِ انْقَطَعَ عِقْدٌ لِي، فَأَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَلَى الْتِمَاسِهِ، وَأَقَامَ النَّاسُ مَعَهُ، وَلَيْسُوا عَلَى مَاءٍ وَلَيْسَ مَعَهُمْ مَاءٌ، فَأَتَى النَّاسُ إِلَى أَبِي بَكْرٍ (ﷺ) فَقَالُوا: أَلَا تَرَى إِلَى مَا صَنَعَتْ عَائِشَةُ؟ أَقَامَتْ بِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) وَبِالنَّاسِ مَعَهُ، وَلَيْسُوا عَلَى مَاءٍ وَلَيْسَ مَعَهُمْ مَاءٌ؟ فَجَاءَ أَبُو بَكْرٍ (ﷺ) وَرَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وَاضِعٌ رَأْسَهُ عَلَى فَخِذِي قَدْ نَامَ، فَقَالَ: حَبَسْتِ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) وَالنَّاسَ. وَلَيْسُوا عَلَى مَاءٍ وَلَيْسَ مَعَهُمْ مَاءٌ؟ قَالَتْ: فَعَاتَبَنِي أَبُو بَكْرٍ وَقَالَ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَقُولَ، وَجَعَلَ يَطْعُنُ بِيَدِهِ فِي خَاصِرَتِي، فَلَا يَمْنَعُنِي مِنَ التَّحَرُّكِ إِلَّا مَكَانُ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) عَلَى فَخِذِي، فَنَامَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) حَتَّى أَصْبَحَ عَلَى غَيْرِ مَاءٍ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عز آيَةَ التَّيَمُّمِ، فَتَيَمَّمُوا، فَقَالَ أُسَيْدُ بْنُ الْحُضَيْرِ وَهُوَ أَحَدُ النُّقَبَاءِ: مَا هِيَ بِأَوَّلِ بَرَكَتِكُمْ يَا آلَ أَبِي بَكْرٍ. فَقَالَتْ عَائِشَةُ رض: فَبَعَثْنَا الْبَعِيرَ الَّذِي كُنْتُ عَلَيْهِ فَوَجَدْنَا الْعِقْدَ تَحْتَهُ. [بخاري / اول كتاب التيمم / ٣٢٧]

(عائشە)(ﷺ) دەڵێ: لەخزمەت پێغەمبەری خوادا(ﷺ) لەسەفەرێکدا دەرچووین رۆیشتین هەتا گەیشتینە بەیدا یا (ذات الجیش)لەوێ گەردانەکەم بچڕایەوە، پێغەمبەر(ﷺ) وەستا بۆئەوەی بیدۆزینەوە، خەڵکەکەش وەستان، لەوجێگەیەشدا نە ئاو هەبوو نەخۆیشیان ئاویان پێبوو[هەر بۆیە]خەڵکەکە چوون بۆ لای (ابوبکر) (ﷺ) وتیان: نابینی عائشەی کچت چیکرد؟ پێغەمبەری خواو(ﷺ) ئەم خەڵکەشی لێرەدا وەستاندووە، نەلەسەر ئاوێکیشینو نە ئاویشمان پێیە؟ ابوبکر هاتو لەوکاتەشدا پێغەمبەر(ﷺ) سەری خستبوویە سەر ڕانمو خەوی لێکەوتبوو، وتی: پێغەمبەرو(ﷺ) ئەم خەڵکەت بۆ ئالێرەدا

گیرداوە، نەشوێنەکە ئاوی لێیە نەئاویان پێیە؟ (عائشه)(ﷺ) وتی: (ابوبکر) زۆر سەرزەنشتی کردم ـ چەندە خواحەزبکات ـ خێراخێرا سیخورمەی دەدا لەکەلەکەم منیــش لەبەرئــەوەی ســەری پێغەمبــەر(ﷺ) لەســەر ڕانم بــوو نــەدەجولاّم ، پێغەمبــەر(ﷺ) ئەوشــەوە تابــەیانی لــەوێ خــەوت کــاتێ هەســتا ئــاو نــەبوو بۆدەستنوێژ، هەر بۆیە خوای گەورە ئایەتی تەیەمومی ناردە خوارەوەو، هەموو تەیەمومیان کرد (اسید) کوری (خضیر)کەیـەکێك بوو لەنەقیبـەکان وتی: ئەی بنەماڵەی ابوبکر: ئەمە یەکەم بەرەکەت نییە کەخوا بەهۆی ئێوەوە پێی داوین. (عائشــه)(ﷺ) وتــی: کــاتێ وشــترەکەمان هەســتا گەردانەکــەم لــەژێریابوو دۆزیمانەوە.

## (١٥) تەیەمومی لەشگران

١٦٤. عَنْ شَقِيقٍ قَالَ: كُنْتُ جَالِسًا مَعَ عَبْدِ اللَّهِ وَأَبِي مُوسَى (ﷺ)، فَقَالَ أَبُو مُوسَى: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَرَأَيْتَ لَوْ أَنَّ رَجُلًا أَجْنَبَ فَلَمْ يَجِدِ الْمَاءَ شَهْرًا، كَيْفَ يَصْنَعُ بِالصَّلَاةِ؟ فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: لَا يَتَيَمَّمُ وَإِنْ لَمْ يَجِدِ الْمَاءَ شَهْرًا، فَقَالَ أَبُو مُوسَى: فَكَيْفَ بِهَذِهِ الْآيَةِ فِي سُورَةِ الْمَائِدَةِ: ﴿فَلَمْ تَجِدُوا مَاءً فَتَيَمَّمُوا صَعِيدًا طَيِّبًا﴾. فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: لَوْ رُخِّصَ لَهُمْ فِي هَذِهِ الْآيَةِ لَأَوْشَكَ إِذَا بَرَدَ عَلَيْهِمُ الْمَاءُ أَنْ يَتَيَمَّمُوا بِالصَّعِيدِ فَقَالَ أَبُو مُوسَى لِعَبْدِ اللَّهِ: أَلَمْ تَسْمَعْ قَوْلَ عَمَّارٍ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فِي حَاجَةٍ، فَأَجْنَبْتُ، فَلَمْ أَجِدِ الْمَاءَ، فَتَمَرَّغْتُ فِي الصَّعِيدِ كَمَا تَمَرَّغُ الدَّابَّةُ، ثُمَّ أَتَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: ((إِنَّمَا يَكْفِيكَ أَنْ تَقُولَ بِيَدَيْكَ هَكَذَا)). ثُمَّ ضَرَبَ بِيَدَيْهِ الْأَرْضَ ضَرْبَةً وَاحِدَةً، ثُمَّ مَسَحَ الشِّمَالَ عَلَى الْيَمِينِ، وَظَاهِرَ كَفَّيْهِ وَوَجْهَهُ؟ فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: أَوَلَمْ تَرَ عُمَرَ لَمْ يَقْنَعْ بِقَوْلِ عَمَّارٍ (ﷺ)؟ [بخاري/ التيمم ضربة /٣٤٠]

(شـقیق) دەڵــێ: مـن لەگــەڵ (عبداللــه) و ابوموســی)(ﷺ) دانیشــتبووین ، (ابوموسی) وتی: ئەی باوکی (عبدالرحمن): ئایا ئەگەر پیاوێك لەشی گرانبوو و تـا مـانگێ ئاوی دەسـت نەکـەوت، چۆن نوێژ بکات؟ ( عبدالله) وتـی: تەیــەموم ناکات بامانگێ ئاوی دەست نەکـەوێ، (ابوموســی) وتــی: ئــەی چــی دەکــەیت لەگەڵ ئەم ئایەتـەی سوورەتی(المــائدة) :[ ئەگــەر ئاویـان دەسـت نەکـەوت بـا بـەخۆڵێکی پاك تەیـەموم بکەن] (عبداللـه) وتـی: ئەگـەر ئـەو مۆڵەتـەیان بدرێتـێ کەلەم ئایەتەدا هاتووە، لەوانەیە کاتێ ئاویش ساردبێت بەخۆڵ تەیەموم بکەن،

(ابوموسی) بە(عبداللە)ی وت: ئایا ئەم قسەی عەممارت نەبیستووە کەدەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆ کارێك ناردمی، تووشی لەشگرانی بووم، ئاوم دەست نەکەوت، منیش خۆمم لەخۆڵدا گەوزان وەکو ولاَغ، ئینجا هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) بۆم گێڕایەوە، فەرمووی: ((بەڵکو ئەوەندەت بەس بوو کەبەدەستەکانت ئاوابکەیت)) دەستی دا بەزەویدا یەك جار [هێنای بەدەموچاویدا ]پاشان دەستی چەپی هێنا بەدەست و قۆڵی راستیا (عبداللە) ئایا نەتدی عومەر متمانەی بەقسەکەی عەممار نەبوو؟ .

## ( ١٦ ) تەیەموم بۆ وەڵامی سەلام

١٦٥ـعَنْ عُمَيْرٍ مَوْلَى ابْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ) أَنَّهُ سَمِعَهُ يَقُولُ: أَقْبَلْتُ أَنَا وَعَبْدُ اللهِ بْنُ يَسَارٍ، مَوْلَى مَيْمُونَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ)، حَتَّى دَخَلْنَا عَلَى أَبِي الْجَهْمِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ الصِّمَّةِ الْأَنْصَارِيِّ، فَقَالَ أَبُو الْجَهْمِ: أَقْبَلَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) مِنْ نَحْوِ بِئْرِ جَمَلٍ، فَلَقِيَهُ رَجُلٌ فَسَلَّمَ عَلَيْهِ، فَلَمْ يَرُدَّ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَلَيْهِ حَتَّى أَقْبَلَ عَلَى الْجِدَارِ، فَمَسَحَ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ، ثُمَّ رَدَّ عَلَيْهِ السَّلَامَ. [بخاري / التيمم/ التيمم في الحضر اذا لم يجد الماء/٣٣٠]

(عمير) کارگوزاری (ابن عباس)(ﷺ) دەڵێ: گوێی لە(ابن عباس) بووە وتوویەتی: من و (عبداللە) کوڕی (یسار) کارگوزاری مەیمونەی هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ) هاتین هەتا چووینە لای (ابولجهم) کوری (الحارث)کوری (الصمد الانصاري)، (ابو الجهم)وتی: پێغەمبەری خوا(ﷺ) تەشریفی لەلای بیری جەمەلەوە هات پیاوێکی پێگەیشت سەلامی لێکرد، پێغەمبەری خوا(ﷺ) وەڵامی سەلامەکەی نەدایەوە، هەتا گەیشتە دیوارەکەو مەسحی دەموچاوی و دەستیکرد، ئینجا وەڵامی سەلامەکەی دایەوە.

## ( ١٧ ) ئیماندار پیس نابێت

١٦٦ـعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّهُ لَقِيَهُ النَّبِيُّ (ﷺ) فِي طَرِيقٍ مِنْ طُرُقِ الْمَدِينَةِ وَهُوَ جُنُبٌ، فَانْسَلَّ فَذَهَبَ فَاغْتَسَلَ، فَتَفَقَّدَهُ النَّبِيُّ (ﷺ)، فَلَمَّا جَاءَهُ قَالَ: ((أَيْنَ كُنْتَ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ)). قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، لَقِيتَنِي وَأَنَا جُنُبٌ، فَكَرِهْتُ أَنْ أُجَالِسَكَ حَتَّى أَغْتَسِلَ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((سُبْحَانَ اللَّهِ، إِنَّ الْمُؤْمِنَ لَا يَنْجُسُ)). [بخاري / الغسل / ٣٧٩]

(ابوهریـره) (ﷺ) دەڵـێ: لەیـەکێ لـە ڕێگاکـانی مەدینـەدا گەیشـتم بەخزمـەت پێغەمبەر(ﷺ) لەشگران بووم، بەپەنهانی ڕۆیشتم خۆمـم شـۆرد، پێغەمبـەر(ﷺ) بۆم دەگەڕا، کاتێ کەهاتمەوە فەرمووی: ((لـەکوێ بوویـت ئـەی ابوهریـره)) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کاتێ گەیشتی بەمن لەشم گران بوو، پێم خۆش نەبوو لەخزمەتتا دانیشم هەتا خۆم دەشۆم ، پێغەمبەر(ﷺ) فـەرمووی: ((سـبحان الله ، ئیماندار پیس نابێت)).

## ( ١٨ ) یادی خوا لەهەموو کاتێکدا

١٦٧ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يَذْكُرُ اللَّهَ عَلَى كُلِّ أَحْيَانِهِ.

(عائشـه) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبەری خـوا( ﷺ) لەهـەموو کـاتێکدا یـادی خـوای دەکرد.

## ( ١٩ ) خواردن بەبێ دەستنوێژ

١٦٨ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ): أَنَّ النَّبِـيَّ (ﷺ) خَـرَجَ مِـنَ الْخَلَـاءِ فَـأُتِيَ بِطَعَـامٍ، فَذَكَرُوا لَهُ الْوُضُوءَ، فَقَالَ: ((أُرِيدُ أَنْ أُصَلِّيَ فَأَتَوَضَّأَ؟!)).

(ابـن عبـاس) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەر( ﷺ) لەسـەر ئـاو هاتـە دەرەوە خواردنێکیان بۆ هێنا دەستنوێژیان بیرخستەوە، ئەویش فـەرمووی: ((بۆچی خۆ نوێژ ناکەم تا دەستنوێژی بۆ بگرم؟!)).

# (٤) بەشی حەیز

## (١) ـ فەرموودەی خوای گەورە : ﴿ پرسیارت لێدەکەن لەبارەی کاتی بێنوێژیی ئافرەتەوە﴾

١٦٩ـ عَنْ أنسٍ (ﷺ): أنَّ الْيَهُودَ كانُوا إذا حاضَت الْمَرْأةُ فيهِمْ لمْ يُؤاكلُوها، ولَمْ يُجَامعُوهُنَّ في الْبُيُوت، فسأَلَ أصْحَابُ النَّبِيِّ (ﷺ) النَّبيَّ (ﷺ)، فأنْزل اللَّهُ تَعَالى: ﴿ويسْألُونَكَ عَنِ الْمَحيضِ قُلْ هُوَ أذًى فَاعْتَزلُوا النِّسَاءَ فِي الْمَحيضِ﴾ إلى آخر الآية ،فقالَ رسُولُ اللَّه (ﷺ): ((اصْنَعُوا كُلَّ شَيْءٍ إلَّا النِّكَاحَ)). فبلَغَ ذلك الْيهُودَ فقالُوا: ما يُريدُ هذا الرَّجُلُ أنْ يدعَ منْ أمْرنا شَيْئًا إلَّا خَالفنا فيه. فجاءَ أُسيْدُ بْنُ حُضَيْرٍ وعبّادُ بْنُ بشْرٍ فقالا: يَا رسُول اللَّه إنَّ الْيهُود تقُولُ كذا وكذا، فلا نُجامعُهُنَّ؟ فتغيّر وجْهُ رسُول اللَّه (ﷺ) حتَّى ظننَّا أنْ قدْ وجد عليْهما، فخرجا. فاسْتقْبلهُما هديّةٌ منْ لبنٍ إلى النَّبيِّ (ﷺ)، فأرْسَلَ فِي آثارهِمَا فَسَقاهُمَا. فعرفا أنْ لمْ يجدْ عليْهما.

(انـس) (ﷺ) دەڵـێ: جولەکـەکان ئەگـەر ئافرەتیـان بکەوتایەتـە بێنوێژیـی، نانیـان لەگـەڵ نـەدەخوارد، لـەماڵدا لەگـەڵیا دانەدەنیشـتن، هـاوەڵان لەپێغەمبەریان(ﷺ) پرسـی لەوبارەیـەوە، ئـەم ئایەتـە هاتـە خـوارەوە لەسـەری ﴿پرسـیارت لێدەکـەن لـەبارەی بێنوێژیـەوە بڵـێ ئـەوە ئـازارە لەوکاتـەدا لەئافرەتەکان نزیک مەکەون﴾ تا کۆتایی ئایەتەکە.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((هەموو شتێکی لەگەڵدا بکەن جگە لە سەرجێیی، ئەو هەواڵە گەیشت بە جولەکەکان، وتیان: ئەم پیاوە دەیەوێ هەرچی کاری ئێمە هەیە پێچەوانەکەی بکات، (اسید) کوری(حضیر)و (عباد) کوری ( بشر) هاتن وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا جولەکـەکان ئـاواو ئـاوا دەڵێن: ئایا سـەر جێییان لەگـەڵدا نەکـەین؟ ڕەنگـی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) ئـەوەندە گـۆڕا هـەتا واگومانمان برد کـە پێغەمبـەر(ﷺ) لێیـان تـوورە بوویـێت، ڕۆیشـتنە دەرەوە، گەیشتن بەقاپێ شیر کەبەدیاری بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاتبوو، ئەویش ناردی بەدوایاندا، لەوشیرە بەشیدان خواردیانەوە. بەوەدا زانیان کە پێغەمبـەر (ﷺ) توورە نییە لێیان.

## (٢) چۆنێتی خۆشۆردنی ئافرەت لەحەیزو لەشگرانیی

١٧٠. عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ أَسْمَاءَ -(ﷺ)- سَأَلَتِ النَّبِيَّ (ﷺ) عَنْ غُسْلِ الْمَحِيضِ؟ فَقَالَ: تَأْخُذُ إِحْدَاكُنَّ مَاءَهَا وَسِدْرَتَهَا فَتَطَهَّرُ فَتُحْسِنُ الطُّهُورَ، ثُمَّ تَصُبُّ عَلَى رَأْسِهَا فَتَدْلُكُهُ دَلْكًا شَدِيدًا حَتَّى تَبْلُغَ شُؤُونَ رَأْسِهَا، ثُمَّ تَصُبُّ عَلَيْهَا الْمَاءَ، ثُمَّ تَأْخُذُ فِرْصَةً مُمَسَّكَةً فَتَطَهَّرُ بِهَا)). فَقَالَتْ أَسْمَاءُ: وَكَيْفَ أَتَطَهَّرُ بِهَا؟ فَقَالَ: سُبْحَانَ اللَّهِ، تَطَهَّرِين بِهَا)). فَقَالَتْ عَائِشَةُ -كَأَنَّهَا تُخْفِي ذَلِكَ- تَتَبَّعِينَ أَثَرَ الدَّمِ. وَسَأَلَتْهُ عَنْ غُسْلِ الْجَنَابَةِ؟ فَقَالَ: ((تَأْخُذُ مَاءً فَتَطَهَّرُ فَتُحْسِنُ الطُّهُورَ -أَوْ: تُبْلِغُ الطُّهُورَ -ثُمَّ تَصُبُّ عَلَى رَأْسِهَا فَتَدْلُكُهُ حَتَّى تَبْلُغَ شُؤُونَ رَأْسِهَا، ثُمَّ تُفِيضُ عَلَيْهَا الْمَاءَ)). فَقَالَتْ عَائِشَةُ: نِعْمَ النِّسَاءُ نِسَاءُ الْأَنْصَارِ، لَمْ يَكُنْ يَمْنَعُهُنَّ الْحَيَاءُ أَنْ يَتَفَقَّهْنَ فِي الدِّينِ. [بخاري/ الحيض/ ٣٠٨].

(عائشە)( دەڵـێ: (اسمـاء)(ﷺ) پرســیاری کـرد لەپێغەمبـەر(ﷺ) لـەبارەی خۆشـۆردنی حـەیزەوە؟ فـەرمووی: یـەکێکتان ئاو هـەڵدەگرێت لەگـەڵ سـیدرا [گەڵای دارێکە لەباتی صابون بەکاریان هێناوە]بەباشـی خۆی پاك دەکاتـەوە، ئینجا ئاو دەکات بە سەریا بەتوندی دەستی لێدەخات هەتا ئاو دەگاتـە پێستی سەری ، پاشـان ئاوی تـر دەکا بەسـەریا، ئینجا پارچە لۆکەیـەك هـەڵدەگرێت و خۆی پێ پاك دەکاتەوە.

(اسماء)وتی: چۆن خۆمی پێ پاك بکەمەوە؟ فەرمووی((سبحان الله) خۆتـی پێ‌پاك بکەرەوە)) عائشە وتـی: وەکـو بیـەوێ بەنـهێنی پێیـی بڵـێ ـ شـوێن و شـوێنەواری خوێنەکـەی پێ‌پـاك بکـەرەوە، ئینجـا پرسـیاری لێکـرد لـەبارەی خۆشـۆردنی لەشـگرانییەوە؟ فـەرمووی: ((ئـاو هــەڵدەگریت بەباشـی خــۆت دەشۆریت، ئینجا ئاو دەکـەیت بەسـەرتاو دەست دەخـەیت لەسـەرت تا پێستی سەرت تـەڕ دەبێـت، ئینجا ئاوی‌تر دەکـەیت بەسـەرتا)) عائشە وتـی: باشترین ئــافرەت ئــافرەتی ئەنســارەکانن ، شــەرم رێگــای لێنــەگرتن کەشــارەزابن لەئاییینەکەیان.

## (٣) پۆشاك وەرگرتن لەحەیزدار

١٧١. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: بَيْنَمَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فِي الْمَسْجِدِ، فَقَالَ: ((يَا عَائِشَةُ نَاوِلِينِي الثَّوْبَ)). فَقَالَتْ: إِنِّي حَائِضٌ، فَقَالَ: ((إِنَّ حَيْضَتَكِ لَيْسَتْ فِي يَدِكِ)). فَنَاوَلَتْهُ.

(ابوهریـره) (ﷺ) دەڵـیٚ: لـەکاتێکا پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) لەمزگـەوتا بـوو، فەرمووی: ((ئەی عائشه ئەو جلانەم بدەریٚ) وتـی: من لەحـەزیدام، فـەرمووی: ((خۆ حەیزەکەت لەدەستتا نییە)) ئینجا جلەکانی دایەدەستی.

## ( ٤ ) ئافرەتی حەیزدارو شۆردنی سەری پیاو

١٧٢ـعن عَائشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: إِنْ كُنْتُ لَأَدْخُلُ الْبَيْتَ لِلْحَاجَةِ، وَالْمَرِيضُ فِيهِ، فَمَا أَسْأَلُ عَنْهُ إِلَّا وَأَنَا مَارَّةٌ. وَإِنْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) لَيُدْخِلُ عَلَيَّ رَأْسَهُ وَهُوَ فِي الْمَسْجِدِ، فَأُرَجِّلُهُ. وَكَانَ لَا يَدْخُلُ الْبَيْتَ إِلَّا لِحَاجَةٍ، إِذَا كَانَ مُعْتَكِفًا. [بخاري/ الاعتكاف / الحائض ترجل المعتكف/ ١٩٢٤]

(عائشه)(ﷺ) دەڵیٚ: هەر کاتیٚ بۆ پێویستیەك دەچومە ژوورەوە نەخۆشێکی لێبوایە، (هەواڵم نەدەپرسی مەگەر بەدەم ڕێگەوە کەتێدەپەڕیم، جاری واهەبووە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) سـەری دەهێنـا ژوورەوە بـۆم خـۆی لەمزگەوتەکـەدابوو، منیـش سـەریم شـانە دەکـرد، پێغەمبـەر(ﷺ) لـەکاتی (اعتکـاف)دا مەگـەر بـۆ پێویستیەك ئەگینا نەدەهاتەماڵەوە.

## ( ٥ ) پاڵدانەوە لەکۆشی حەیزدارو خوێندنەوە

١٧٣ـ عَنْ عَائشَةَ (ﷺ) أَنَّهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَتَّكِئُ فِي حِجْرِي وَأَنَا حَائِضٌ، فَيَقْرَأُ الْقُرْآنَ. [بخاري/ قراءة الرجل في حجر امراته وهي حائض /٢٩٣]

عائشـه ( ﷺ) دەڵـیٚ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) سـەری دەکـردە سـەر کۆشـمو منیش لەحەیزدا بووم، قورئانی دەخوێند.

## ( ٦ ) خەوتن لەیەك لێفەدا لەگەڵ حەیزدار

١٧٤ـ عن أُمِّ سَلَمَةَ (ﷺ) قَالَتْ: بَيْنَمَا أَنَا مُضْطَجِعَةٌ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فِي الْخَمِيلَةِ إِذْ حِضْتُ، فَانْسَلَلْتُ فَأَخَذْتُ ثِيَابَ حِيضَتِي، فَقَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((أَنَفِسْتِ)). قُلْتُ: نَعَمْ، فَدَعَانِي فَاضْطَجَعْتُ مَعَهُ فِي الْخَمِيلَةِ. قَالَتْ: وَكَانَتْ هِيَ وَرَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَغْتَسِلَانِ فِي الْإِنَاءِ الْوَاحِدِ مِنَ الْجَنَابَةِ. [بخاري / من سمى النفاس حيضاً/ ٢٩٤]

(ام سـلمه) (ﷺ) دەڵـیٚ: لـەکاتێکا مـن لەگـەڵ پێغەمبـەری خـوادا(ﷺ) ڕاکشابووم سەرچەفێکم بەسەروەبوو کەوتمـە حـەیزەوە، بەدزی ڕۆیشتم جلـی حـەیزم لەبـەرکرد، پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمووی: ((کەوتیتـە حـەیزەوە)) وتم: بـەڵیٚ:

بانگی کردم لەژێر سەرچەفەکەدا لەگەڵیا راکشام/ (ام سەلەمە) دەڵـێ: خۆیـو پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەیەك دەفردا پێکەوە خۆیان دەشۆرد لەلەشگرانیی.

## ( ٧ ) گەمەکردن لەگەڵ ئافرەت لەحەیزا

١٧٥ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: كَانَ إِحْدَانَا إِذَا كَانَتْ حَائِضًا، أَمَرَهَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أَنْ تَأْتَزِرَ فِي فَوْرِ حَيْضَتِهَا، ثُمَّ يُبَاشِرُهَا، قَالَتْ: وَأَيُّكُمْ يَمْلِكُ إِرْبَهُ كَمَا كَانَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) يَمْلِكُ إِرْبَهُ. [بخاري/الحيض، مباشرة الحائض/ ٢٩٦]

(عائشـە)(ﷺ) دەڵـێ: ئەگـەر یـەکێکمان [ لەهاوسـەرەکانی پێغەمبـەر(ﷺ)] لەحەیزا بوایا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێدەکرد کە نێوان ناوك و ئەژنۆی بەباش داپۆشێت ، ئینجا گەمەی لەگەڵ دەکرد، دەڵـێ: ئایا کامتـان دەتوانـن خۆتـان بگرن، وەکو پێغەمبەر(ﷺ) دەیتوانی خۆی بگرێت.

## ( ٨ ) خواردنەوە لەگەڵ حەیزدار لەیەك دەفرا

١٧٦. عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: كُنْتُ أَشْرَبُ وَأَنَـا حَـائِضٌ. أُنَاوِلُـهُ النَّبِـيَّ (ﷺ) فَيَضَعُ فَاهُ عَلَى مَوْضِعِ فِيَّ، فَيَشْرَبُ، وَأَتَعَرَّقُ الْعَرْقَ وَأَنَا حَائِضٌ، ثُمَّ أُنَاوِلُهُ النَّبِيَّ (ﷺ)، فَيَضَعُ فَاهُ عَلَى مَوْضِعِ فِيَّ.

(عائشە) (ﷺ) دەڵـێ: من لەحـەیزا بـووم ئاوم دەخـواردەوە، پاشـان دەمدایـە دەستی پێغەمبەر(ﷺ) دەمی دەخستە سەر شوێن دەمەکەی من و دەیخواردەوە هەروەها قەپم دەگرت لەپلە گۆشت و من لەحەیزدا بووم، ئینجا دەمدایە دەستی پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش دەمی دەخستە شوێن دەمەکەی من [و دەیخوارد].

## ( ٩ ) خۆشتن و نوێژی کاتی خوێنی نەخۆشی

١٧٧ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَت: اسْتَفْتَتْ أُمُّ حَبِيبَةَ بِنْتُ جَحْشٍ (ﷺ) رَسُولَ اللَّه (ﷺ) فَقَالَتْ: إِنِّي أُسْتَحَاضُ؟ فَقَالَ: ((إِنَّمَا ذَلِك عِرْقٌ، فَاغْتَسِلِي ثُمَّ صَلِّي)). فَكَانَتْ تَغْتَسِلُ عِنْدَ كُلِّ صَلَاةٍ قَال اللَّيْثُ بْنُ سَعْدٍ: لَمْ يَذْكُر ابْنُ شِهَابٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ)، أَمَرَ أُمَّ حَبِيبَةَ بِنْتَ جَحْشٍ (ﷺ) أَنْ تَغْتَسِلَ عِنْدَ كُلِّ صَلَاةٍ. وَلَكِنَّهُ شَيْءٌ فَعَلَتْهُ هِيَ. [بخاري/ الحيض/ عرق المستحاضة/ ٣٢١]

(عائشـــە)(ﷺ) دەڵـــێ: (ام حبیبـــە) کچـــی (جحـــش) پرســـی لەپێغەمبـــەری خوا(ﷺ) وتـی: مـن خوێنـی نەخۆشیم پیـادێت؟ فـەرمووی: ((ئـەوە دەمارێکـە، خـۆت بشـــۆرە ، ئینجـــا نوێـــژ بکـــە)) ئـــەویش بـــۆ هـــەموو نوێژێـــك خـــۆی دەشۆرد.(لیث)کوری (سعد) وتـی: (ابن شهاب)ئەوەی نـەوت کـە پێغەمبـەری

خوا(ﷺ) فەرمانی کرد بە( (ام حبیبە) (ﷺ) کە بۆ هەموو نوێژێك خۆی بشوات، بەڵکو شتێك بووە خۆی کردوویەتی.

## (١٠) حەیزدار نوێژ ناگێڕێتەوە بەلاَم ڕۆژوو دەگێڕێتەوە

١٧٨ـ عَنْ مُعَاذَةَ قَالَتْ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ (ﷺ): فَقُلْتُ: مَا بَالُ الْحَائِض تَقْضِي الصَّوْمَ وَلَا تَقْضِي الصَّلَاةَ؟ فَقَالَتْ: أَحَرُورِيَّةٌ أَنْتِ؟ قُلْتُ: لَسْتُ بِحَرُورِيَّةٍ، وَلَكِنِّي أَسْأَلُ. قَالَتْ: كَانَ يُصِيبُنَا ذَلِكَ، فَنُؤْمَرُ بِقَضَاءِ الصَّوْمِ وَلَا نُؤْمَرُ بِقَضَاءِ الصَّلَاةِ.

(معاذة)دەڵێ: لە(عائشە)م پرسی وتم: چیـە وا حـەیزدار ڕۆژو دەگێڕێتـەوە بەلاَم نوێژ ناگێڕێتەوە؟ وتی: ئایا تۆ حەروریت؟ وتم: من (حەروری*) نیم، بەڵکو پرسیار دەکەم. وتـی: کەتوشـی ئـەوە دەبوویـن فـەرمانمان پێدەکـرا کـە ڕۆژو بگێڕینەوە، بەلاَم فەرمانمان پێ نەکرا کەنوێژ بگێڕینەوە.

## (١١) پێنج شت لەسروشتی پاکن

١٧٩ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عن النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((الْفِطْرَةُ خَمْسٌ، أَوْ خَمْسٌ مِنَ الْفِطْرَةِ: الْخِتَانُ، وَالِاسْتِحْدَادُ، وَتَقْلِيمُ الْأَظْفَارِ، وَنَتْفُ الْإِبِطِ، وَقَصُّ الشَّارِبِ)).

[بخاري اللباس/ قص الشارب/ ٥٥٥٠]

(ابوهریرە) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر( ﷺ) فەرموویـەتی: ((سروشـتی پـاك پێنج شتە، یا پێج شت لەسروشتی پاکە: خەتەنەکردن، بەرتاشین، نینـۆك کـردن، توکی بن باڵ هەڵکەندن. سمێڵ کورت کردنەوە)).

## (١٢) دەشت لەسروشتی پاکن

١٨٠ـعَنْ عائشة (ﷺ) قالَتْ: قال رَسُولُ اللَّه (ﷺ): ((عَشْرٌ من الْفِطْرَة: قصُّ الشَّارِب، وإعْفاءُ اللِّحْيَة، والسِّواك، واسْتِنْشاقُ الْماء، وقـصُّ الْأَظْفـار، وغسْـلُ الْـبرَاجِم، ونتْـفُ الْـإبِط، وحَلْـقُ الْعانـة، وانْتقـاصُ الْمـاء)). قـال زكريَّـاءُ: قَـال مُصْعَبٌ: ونَسِيتُ الْعاشِـرَة، إلَـا أنْ تكُـون الْمضْمضـة. زاد قُتَيْبـةُ: قَـال وكِيـعٌ: انْتِقَاصُ الْمَاءِ يعْنِي الاسْتِنْجاء.

(عائشـــە) (ﷺ) دەڵـــێ: پێغەمبـــەری خـــوا( ﷺ) فەرموویـــەتی: ((دەشـــت لـەفیترەتن: کـورت کردنـەوەی سمێـڵ، هێشـتنەوەی ڕیـش، سـیواك کـردن، ئـاو

---

* حـروری: کۆمـەڵێك بـوون لەخەواریجـەکان دەیـانوت دەبـێ نوێژیـش بگێڕنـەوە.(بخـاري، الحیض/ لاتقضي الحائض الصلاة، ٣١٥).

لەلووت وەردان، نینۆك كردن، شۆردنی جومگەی پەنجەكان، مووی بن باڵ هەڵكەندن، بەرتاشین، تارەت گرتن)) (مصعب) دەڵێ: دەیەمم بیرچووە، ئەگەر ئاو لەدەم وەردان نەبێت.

## (١٣) سیواك دان بەكەسی گەورە

١٨١ـ عن ﴿عَبْدَ اللَّه﴾ بْنَ عُمَرَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) قَالَ: ((أَرَانِي فِي الْمَنَامِ أَتَسَوَّكُ بِسِوَاكٍ، فَجَذَبَنِي رَجُلَانِ أَحَدُهُمَا أَكْبَرُ مِنَ الْآخَرِ، فَنَاوَلْتُ السِّوَاكَ الْأَصْغَرَ مِنْهُمَا، فَقِيلَ لِي: كَبِّرْ، فَدَفَعْتُهُ إِلَى الْأَكْبَرِ)). [بخاري/ الوضوء. دفع السواك الى الاكبر/ ٢٤٣]

(عبدالله) كوڕی ( عمر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ((خۆم بینی لەخەودا سیواك دەكەم بەسواكێك، دووپیاو كێشیان كردم، یەكێكیان لەوی تریان گەورەتربوو، من سیواكەكەم دا بەبچووكەكەیان ، پێیان وتم: گەورەی كە، منیش دام بەگەورەكەیان))

## (١٤) سمێڵ كورت بكەنەوەو ریش بهێڵنەوە

١٨٢ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): ((خَالِفُوا الْمُشْرِكِينَ: أَحْفُوا الشَّوَارِبَ، وَأَوْفُوا اللِّحَى)). [بخاري/ اللباس/ تقليم الاظافر / ٥٥٥٣]

(عبدالله) كوڕی (عمر) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: ((پێچەوانەی موشریكەكان بكەن، سمێڵ كورت بكەنەوە ، ریش بهێڵنەوە)).

١٨٣ـ عَنْ أَنَسِ ﴿بْنِ مَالِكٍ﴾ (ﷺ) قَالَ: وُقِّتَ لَنَا فِي قَصِّ الشَّارِبِ، وَتَقْلِيمِ الْأَظْفَارِ، وَنَتْفِ الْإِبِطِ، وَحَلْقِ الْعَانَةِ: أَنْ لَا نَتْرُكَ أَكْثَرَ مِنْ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً)).

(انس) كوڕی (مالك) دەڵێ: كاتمان بۆ دانراوە بۆ كورت كردنەوەی سمێڵ و نینۆك كردن و مووی بن باڵ هەڵكەندنو بەرتاشین بالە چل شەو تێ نەپەڕێت.

## (١٥) شۆردنی میزی ناو مزگەوت

١٨٤ـ عن أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ فِي الْمَسْجِدِ مَعَ رَسُولِ اللَّه (ﷺ) إِذْ جَاءَ أَعْرَابِيٌّ فَقَامَ يَبُولُ فِي الْمَسْجِدِ، فَقَالَ أَصْحَابُ رَسُولِ اللَّه (ﷺ) مَهْ مَهْ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): ((لَا تُزْرِمُوهُ، دَعُوهُ)). فَتَرَكُوهُ حَتَّى بَالَ، ثُمَّ إِنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) دَعَاهُ فَقَالَ لَهُ: ((إِنَّ هَذِهِ الْمَسَاجِدَ لَا تَصْلُحُ لِشَيْءٍ مِنْ هَذَا الْبَوْلِ وَلَا الْقَذَرِ. إِنَّمَا هِيَ لِذِكْرِ اللَّه (ﷻ) وَالصَّلَاةِ وَقِرَاءَةِ الْقُرْآنِ)). أَوْ كَمَا قَالَ رَسُولُ اللَّه

(ﷺ)، قَالَ: فَأَمَرَ رَجُلًا مِنَ الْقَوْمِ فَجَاءَ بِدَلْوٍ مِنْ مَاءٍ فَشَنَّهُ عَلَيْهِ. [بخاري/ الادب/ ٥٦٧٨]

(انس) كوری (مالك) (ﷺ) دەڵێ: لەكاتێكا ئێمە لەمزگەوت لەخزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) دانیشتبووین، عەرەبێكی دەشتەكی هات و لەمزگەوتەكەدا دەستی كرد بەمیزكردن، هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) وتیان: نەكەی ، نەكەی، دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ((پێی مەبڕن، وازی لێ بێنن)) وازیان لێهێنا هەتا میزەكەی كرد، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) بانگی كردوو فەرمووی: ((ئەم مزگەوتانە جێگای میزكردن و پیسی كردن نییە، بەڵكو جێگای یادكردنەوەی خوای گەورەو نوێژو خوێندنی قورئانە))، ئینجا فەرمانیكرد بە پیاوێك لەو خەڵكە، ئەویش دۆلكەیە ئاوی هێناو رشتی بەسەریا)

## ( ١٦ ) ئاو پرژاندن لەمیزی منداڵ بەجلەوە

١٨٥ـ عن أُمِّ قَيْسٍ بِنْتَ مِحْصَنٍ (ﷺ): أَنَّهَا أَتَتْ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) بِابْنٍ لَهَا لَمْ يَبْلُغْ أَنْ يَأْكُلَ الطَّعَامَ، قَالَ عُبَيْدُ اللَّهِ: أَخْبَرَتْنِي أَنَّ ابْنَهَا ذَاكَ بَالَ فِي حَجْرِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَدَعَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بِمَاءٍ فَنَضَحَهُ عَلَى ثَوْبِهِ، وَلَمْ يَغْسِلْهُ غَسْلًا. [بخاري/ الوضوء/ بول الصبيان/ ٢٢١]

( ام قيس) كچی (محصف) (ﷺ) دەڵێ: منداڵێكم هێنا بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) هێشتا خواردنی نەدەخوارد، عبيد الله وتی: ئەو ژنە ئاگاداری كردم كە كوڕەكەی میزی كرد بەكۆشی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) پێغەمبەر(ﷺ) داوای ئاوی كردو پرژاندی بەسەر پۆشاكەكەیداو نەیشۆرد.

## ( ١٧ ) شۆردنی ( مەنی ) بەجلەوە

١٨٦ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شِهَابٍ الْخَوْلَانِيِّ قَالَ: كُنْتُ نَازِلًا عَلَى عَائِشَةَ (ﷺ)، فَاحْتَلَمْتُ فِي ثَوْبَيَّ، فَغَمَسْتُهُمَا فِي الْمَاءِ، فَرَأَتْنِي جَارِيَةٌ لِعَائِشَةَ (ﷺ) فَأَخْبَرَتْهَا، فَبَعَثَتْ إِلَيَّ عَائِشَةُ فَقَالَتْ: مَا حَمَلَكَ عَلَى مَا صَنَعْتَ بِثَوْبَيْكَ؟ قَالَ: قُلْتُ: رَأَيْتُ مَا يَرَى النَّائِمُ فِي مَنَامِهِ، قَالَتْ: هَلْ رَأَيْتَ فِيهِمَا شَيْئًا؟ قُلْتُ: لَا، قَالَتْ: فَلَوْ رَأَيْتَ شَيْئًا غَسَلْتَهُ، لَقَدْ رَأَيْتُنِي وَإِنِّي لَأَحُكُّهُ مِنْ ثَوْبِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) يَابِسًا بِظُفُرِي.

(عبداللـه) كوڕی ( شهاب الخولانی) دەڵێ: من میوان بووم لەلای (عائشە)(ﷺ) شەیتانی بووم، منیش جلەكانم هەڵژەند لەئاو، كەنیزەكێكی عائشە(ﷺ) چاوی پێم كەوت چوو ئاگاداری عائشەی كرد، عائشەش ناردی بۆ

لام وتی: چی وای لێکردی جلەکانت ئاوا لێ بکەیت؟ دەڵێ: خەوتوو لەخەویا چی دەبینێت منیش ئەوەم دیووە، عائشە وتی: هیچت بەجلەکانتەوە بینی؟ وتم : نەخێر، ئەویش وتی: ئەگەر شتێکت بینی بتشتایا من خۆم بەجلەکانی پێغەمبەرەوە (ﷺ) بەوشکی پرواندوومەو بەنینۆك کراندومە.

## ( ١٨ ) شۆردنی خوێنی حەیز بەجلەوە

١٨٧ـعَنْ أَسْمَاءَ بنت ابي بكر (ﷺ) قَالَتْ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالَتْ: إِحْدَانَا يُصِيبُ ثَوْبَهَا مِنْ دَمِ الْحَيْضَةِ، كَيْفَ تَصْنَعُ بِهِ؟ قَالَ: ((تَحُتُّهُ، ثُمَّ تَقْرُصُهُ بِالْمَاءِ، ثُمَّ تَنْضَحُهُ، ثُمَّ تُصَلِّي فِيهِ)).

(اسماء)کچی (ابوبکر) (ﷺ) دەڵێ: ئافرەتێ هات بۆ خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) وتی: یەکێکمان[جاری وا هەیە] جلەکانی خوێنی حەیزی بەردەکەوێت چی لێ بکات؟ فەرمووی: بی پروێنە ئینجا ئاوی پیا بکەو دەستی لێ بخە، ئینجا ئاوی پیا بکەرەوەو دوایی نوێژی پێوە بکە). [واتە: بیشۆرە].

# (٥) كتاب الصلاة ( بەشی نوێژ )

## ( ١ ) دەستپێكردنی بانگدان

١٨٨ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رضي الله عنه) أَنَّهُ قَالَ: كَانَ الْمُسْلِمُونَ حِينَ قَدِمُوا الْمَدِينَةَ يَجْتَمِعُونَ فَيَتَحَيَّنُونَ الصَّلَوَاتِ، وَلَيْسَ يُنَادِي بِهَا أَحَدٌ، فَتَكَلَّمُوا يَوْمًا فِي ذَلِكَ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: اتَّخِذُوا نَاقُوسًا مِثْلَ نَاقُوسِ النَّصَارَى، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: قَرْنًا مِثْلَ قَرْنِ الْيَهُودِ، فَقَالَ عُمَرُ (رضي الله عنه): أَوَلَا تَبْعَثُونَ رَجُلًا يُنَادِي بِالصَّلَاةِ؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((يَا بِلَالُ، قُمْ فَنَادِ بِالصَّلَاةِ)). [بخاري/ الاذان/ ٥٧٩]

(عبدالله) كوڕی (عمر) (رضي الله عنه) دەڵێ: لەكاتێكا موسڵمانەكان هاتن بۆ مەدینە كۆدەبوونەوەو كاتی نوێژیان دەخەملاند، كەس بانگی نەدەدا، ڕۆژێكیان باسی ئەوەیان كرد، هەندێكیان وتیان: بازەنگێكی وەكو زەنگی گاورەكان دابنێین، هەندێكی تریان وتیان: كەرەنایەك وەكو كەڕەنای جولەكە دابنێن، عمر(رضي الله عنه) وتی: ئەی بۆ پیاوێك نانێرن بانگ بدات بۆ نوێژ. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((ئەی بلال هەستە بانگ بدە بۆ نوێژ))

## ( ٢ ) چۆنێتی بانگدان

١٨٩ـ عَنْ أَبِي مَحْذُورَةَ (رضي الله عنه): أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ (ﷺ) عَلَّمَهُ هَذَا الْأَذَانَ: ((اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، ثُمَّ يَعُودُ فَيَقُولُ: أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، مرتين، حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ -مَرَّتَيْنِ- حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ -مَرَّتَيْنِ-)) زَادَ إِسْحَقُ -يعني ابن إبراهيم- ((اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ)).

(ابو مخدومە) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەم بانگەی فێركردم : ( الله اكبر الله اكبر اشهد ان لا اله الا الله، اشهد ان لا اله الا الله ، اشهد ان محمداً رسول الله، اشهد ان محمداً رسول الله )ئینجا جارێكی تریش دەڵێ: اشهد ان لا اله الا الله اشهد ان لا اله الا الله دووجار ، اشهد ان محمدا رسول الله ، اشهد محمدا رسول الله دووجار، حي على الصلاة ـدووجار ـ حي على الفلاح ـ دووجار . اسحاق ـ واتە ابراهیم . ئەمەشی زیادكرد : ( الله اكبر الله اكبر ، لا اله الا الله) .

## (٣) بانگدان جوتەو قامەتیش تاك

١٩٠ـ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ) قَالَ: أُمِرَ بِلَالٌ أَنْ يَشْفَعَ الْأَذَانَ، وَيُوتِرَ الْإِقَامَةَ، زَادَ يَحْيَى ﴿فِي حَدِيثِهِ عَنِ ابْنِ عُلَيَّةَ: فَحَدَّثْتُ بِهِ أَيُّوبَ، فَقَالَ﴾: إِلَّا الْإِقَامَةَ. [بخاري/ الاذان / ٥٨٢]

(انس) (ﷺ) دەڵێ: فەرمانكرا بە(بیلال) كەبانگدان بەجووت بڵێت قامەتیش بەتاك یەحیا ﴿لەریوایەتەكەیدا ﴾ لە(ابن علیه)وە ئەمەی بۆ زیادكرد: ئەمەم بۆ (ایوب) گێڕایەوە وتی: بێجگە لەقامەت ﴿ واتە رستەی قد قامت الصلاه — دووجار دەیووت ﴾.

## (٤) دانانی دووبانگبێژ

١٩١ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ) قَالَ: كَانَ لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) مُؤَذِّنَانِ: بِلَالٌ، وَابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ الْأَعْمَى.

(ابن عمر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) دوبانگبێژی هەبوو: (بیلال)و( ابن ام مكتوم)ی نابینا.

## (٥) دانانی بانگبێژی نابینا

١٩٢ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: كَانَ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ يُؤَذِّنُ لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) وَهُوَ أعمى.

(عائشە) (ﷺ) دەڵێ: ( ابن ام مكتوم) بانگی دەدا بۆ پێغەمبەری خوا كوێریش بوو.

## (٦) خێری بانگدان

١٩٣ـعَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يُغِيرُ إِذَا طَلَعَ الْفَجْرُ، وَكَانَ يَسْتَمِعُ الْأَذَانَ، فَإِنْ سَمِعَ أَذَانًا أَمْسَكَ، وَإِلَّا أَغَارَ، فَسَمِعَ رَجُلًا يَقُولُ: اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((عَلَى الْفِطْرَةِ)). ثُمَّ قَالَ: أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((خَرَجْتَ مِنَ النَّارِ)). فَنَظَرُوا فَإِذَا هُوَ رَاعِي مِعْزًى.

(انس) كوری (مالك) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەگەڵ بەرەبەیاندا هێرشی دەبردە [سەر دوژمن]، گوێ بیستی بانگ دەبوو، ئەگەر گوێی لەبانگ بوایا رادەوەستا، ئەگەرنا هێرشی دەكرد، گوێی لێبوو، پیاوێك دەیوت: الله اكبر الله اكبر ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((لەسەر سروشتی پاك)) ئینجا وتی: اشهد

ان لا اله الا الله ، اشهد ان لا اله الا الله ، پێغەمبەری خوا(ﷺ فەرمووی: ((لەئاگر دەربازبوویت)) کە سەیریان کرد دەبینن شوانێکی بزنە.

١٩٤ـ عَنْ أَبِـي هُرَيْـرَةَ (ﷺ): أَنَّ النَّبِـيَّ (ﷺ) قَـالَ: ((إِذَا نُـودِيَ لِلصَّلَـاةِ أَدْبَـرَ الشَّيْطَانُ لَهُ ضُرَاطٌ، حَتَّى لَا يَسْمَعَ التَّأْذِينَ، فَإِذَا قُضِيَ التَّأْذِينُ أَقْبَلَ، حَتَّـى إِذَا ثُوِّبَ بِالصَّلَاةِ أَدْبَرَ، حَتَّى إِذَا قُضِيَ التَّثْوِيبُ أَقْبَلَ، حَتَّى يَخْطُرَ بَيْنَ الْمَرْءِ وَنَفْسِهِ يَقُولُ لَهُ: اذْكُرْ كَذَا، وَاذْكُرْ كَذَا، لِمَا لَمْ يَكُنْ يَذْكُرُ مِنْ قَبْـلُ، حَتَّـى يَظَلَّ الرَّجُلُ مَـا يَدْرِي كَمْ صَلَّى)). [بخاري/ الاذان / فضل التاذين/ ٥٨٣]

(ابوهريره) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((ئەگەر بانگ درا بۆ نوێژ شەیتان هەڵدێتو تڕ لێدەدات بۆ ئەوەی بانگەکە نەبیستێ، کاتێ بانگەکە تەواو دەبێت، دێتەوە هەتا قامەت دەکرێت ئینجا هەڵدێتەوە، کاتێ قامەت تەواو دەبێ دێتەوە بۆ ئەوەی دالْغە بۆ نوێژگەرەکە دروست بکات، پێی دەڵێت: یادی ئەمەو ئەوە [شتیوا کەپێشتر لەیادیانەبوو] تاوا لەکابرا دەکات نازانێ چەند رکاتی کردووە)).

## (٧) خێری بانگبێژان

١٩٥ـ عَنْ عيسى بن طَلْحَةَ قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ مُعَاوِيَةَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ (ﷺ)، فَجَاءَهُ الْمُـؤَذِّنُ يَدْعُـوهُ إِلَـى الصَّلَـاةِ، فَقَـالَ مُعَاوِيَـةُ: سَـمِعْتُ رَسُولَ اللَّـهِ (ﷺ) يَقُـولُ: ((الْمُؤَذِّنُونَ أَطْوَلُ النَّاسِ أَعْنَاقًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ)).

(عيسى) كوڕی ( طلحـه)دەڵێ: من لەلای (معاويه) كوری (ابی سفيان) بوم بانگبێژەكە هات بانگیدا بۆ نوێژكردن، معاويە وتی: لەپێغەمبەری خوام(ﷺ) بیستووە دەیفەرموو: ((بانگبێژان لەرۆژی قیامەتدا گەردنیان لەهەموو كەس بەرزترە)).

## (٨) وەڵامدانەوەی بانگبێژ

١٩٦ ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (ﷺ): أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: ((إِذَا سَمِعْتُمُ الْمُؤَذِّنَ فَقُولُوا مِثْلَ مَـا يَقُولُ، ثُمَّ صَلُّوا عَلَيَّ، فَإِنَّـهُ مَنْ صَلَّى عَلَـيَّ صَلَـاةً صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ بِهَا عَشْرًا. ثُمَّ سَلُوا اللَّهَ لِي الْوَسِيلَةَ، فَإِنَّهَا مَنْزِلَةٌ فِـي الْجَنَّةِ، لَا تَنْبَغِي إِلَّا لِعَبْدٍ مِنْ عِبَادِ اللَّهِ، وَأَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَنَا هُوَ، فَمَنْ سَأَلَ لِـي الْوَسِيلَةَ حَلَّتْ عليه الشَّفَاعَةُ)).

(عبدالله) کوری ( عمرو) کوری( عاص) (ﷺ) گوێی لەپێغەمبەر (ﷺ) بووە فەرموویەتی: ( ((ئەگەر گوێتان لەبانگبێژبوو، ئەوچی دەڵێت ئێوەش وابڵێن ئینجا سلاَّوات لەسەر من بدەن، چونکە ئەوەی سلاَّوات لەسەر من بدات خوایگەورە دەجار سلاَّواتی لەسەر دەدات، ئینجا داوای پلەوپایەی بەرزم بۆبکەن لەخوا، ئەوپلەبەرزە پلەیەکە لەبەهەشتا دەست کەس ناکەوێت یەك بەندە لەبەندەکانی خوا نەبێت، داواکارم ئەو کەسەش من بم ، ئەوەی داوای وەسیلەم لەخوا بۆ بکات شیاوی شەفاعەتم دەبێت).

## ( ٩ ) خێری وەلاَّم دانەوەی بانگ

١٩٧ـ عن عُمَرَ بْنِ الْخَطَّاب (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): ((إِذَا قَالَ الْمُؤَذِّنُ: اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ، فَقَالَ أَحَدُكُمُ: اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ، ثُمَّ قَالَ: أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، قَالَ: أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، ثُمَّ قَالَ: أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّه، قَالَ: أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّه، ثُمَّ قَالَ: حَيَّ عَلَى الصَّلَاة، قَالَ: لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّه، ثُمَّ قَالَ: حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، قَالَ: لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّه، ثُمَّ قَالَ: اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ، قَالَ: اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ، ثُمَّ قَالَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، قَالَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، مِنْ قَلْبِهِ، دَخَلَ الْجَنَّةَ)).

(عمر) کوری(خطاب)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا( ﷺ) فەرموویەتی: ((ئەگەر بانگبێژ وتی: الله اکبر الله اکبر یەکێکتان وتی: الله اکبر الله اکبر ، ئینجا وتی: اشهد ان لا اله الا الله ئەویش وتی: اشهد ان لا اله الا الله ، ئینجا وتی: اشهد ان محمدا رسول الله ، ئەویش وتی: اشهد ان محمداً رسول الله ئینجا وتی: حی علی الصلاة ، ئەویش وتی: لا حول ولا قوه الا بالله ،ئینجا وتی( حي علی الفلاح) ئەویش وتی( لاحول ولا قوه الا بالله) ئینجا وتی: الله اکبر الله اکبر ئەویش وتی: الله اکبر الله اکبر ، ئینجا وتی: لا اله الا الله ، ئەویش وتی: لا اله الا الله ، لەدڵیەوە وتبێتی دەچێتە بەهەشت)).

١٩٨ـ عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاص (ﷺ)، عَنْ رَسُولِ اللَّه (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: ((مَنْ قَالَ حِينَ يَسْمَعُ الْمُؤَذِّنَ: أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، رَضِيتُ بِاللَّهِ رَبًّا، وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولًا، وَبِالْإِسْلَامِ دِينًا، غُفِرَ لَهُ ذَنْبُهُ)).

(سعد) کوری (ابی وقاص) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر فەرموویەتی: ((ئەوەی لەکاتێکا گوێی لەبانگ دەبێت بڵێت: شایەتی دەدەم کەخواتاك و تەنیایەو

شـەریکی نیەو موحەمـەد بـەندەو ڕەوانـەکراوی ئەوە، ڕازیـم خـوا پـەروەردگارم بێتو موحەمـەدیش ڕەوانەکراو ئیسـلامیش ئـایین، ئـەوە خـوا لەگوناهـەکانی خۆش دەبێت)).

## ( ١٠ ) فەرزبوونی نویژ

١٩٩ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: نُهِينَا أَنْ نَسْأَلَ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) عَنْ شَيْءٍ، فَكَانَ يُعْجِبُنَا أَنْ يَجِيءَ الرَّجُلُ –مِنْ أَهْلِ الْبَادِيَةِ– الْعَاقِلُ، فَيَسْأَلَهُ وَنَحْنُ نَسْمَعُ، فَجَاءَ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْبَادِيَةِ، فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ أَتَانَا رَسُولُكَ، فَزَعَمَ لَنَا أَنَّكَ تَزْعُمُ أَنَّ اللَّهَ أَرْسَلَكَ؟ قَالَ: ((صَدَقَ)). قَالَ: فَمَنْ خَلَقَ السَّمَاءَ؟ قَالَ: ((اللَّهُ)) قَالَ: فَمَنْ خَلَقَ الْأَرْضَ؟ قَالَ: ((اللَّهُ)) قَالَ: فَمَنْ نَصَبَ هَذِهِ الْجِبَالَ، وَجَعَلَ فِيهَا مَا جَعَلَ، قَالَ: ((اللَّهُ)). قَالَ: فَبِالَّذِي خَلَقَ السَّمَاءَ وَخَلَقَ الْأَرْضَ وَنَصَبَ هَذِهِ الْجِبَالَ، آللَّهُ أَرْسَلَكَ؟ قَالَ: ((نَعَمْ)). قَالَ: وَزَعَمَ رَسُولُكَ: أَنَّ عَلَيْنَا خَمْسَ صَلَوَاتٍ فِي يَوْمِنَا وَلَيْلَتِنَا؟ قَالَ: ((صَدَقَ)). قَالَ: فَبِالَّذِي أَرْسَلَكَ، آللَّهُ أَمَرَكَ بِهَذَا، قَالَ: ((نَعَمْ)). قَالَ: وَزَعَمَ رَسُولُكَ: أَنَّ عَلَيْنَا زَكَاةً فِي أَمْوَالِنَا؟ قَالَ: ((صَدَقَ)). قَالَ: فَبِالَّذِي أَرْسَلَكَ، آللَّهُ أَمَرَكَ بِهَذَا؟ قَالَ: ((نَعَمْ)). قَالَ: وَزَعَمَ رَسُولُكَ: أَنَّ عَلَيْنَا صَوْمَ شَهْرِ رَمَضَانَ فِي سَنَتِنَا؟ قَالَ: ((صَدَقَ)). قَالَ: فَبِالَّذِي أَرْسَلَكَ، آللَّهُ أَمَرَكَ بِهَذَا؟ قَالَ: ((نَعَمْ)). قَالَ: وَزَعَمَ رَسُولُكَ: أَنَّ عَلَيْنَا حَجَّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا؟ قَالَ: ((صَدَقَ)). ثُمَّ وَلَّى، قَالَ: وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ لَا أَزِيدُ عَلَيْهِنَّ وَلَا أَنْقُصُ مِنْهُنَّ. فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): ((لَئِنْ صَدَقَ لَيَدْخُلَنَّ الْجَنَّةَ)).

(انس) کوڕی (مالك) (ﷺ) دەڵێ: ڕێمان نەدەدرا پرسیار لەپێغەمبەری خوا(ﷺ) بکەین، هەر بۆیە حەزمان دەکرد، پیاوێکی ـ دەشتەکی ـ ژیر بێتو پرسیاری لێبکاتو ئێمەش گوێ بگرین، لەوکاتەدا پیاوێکی دەشتەکی هات، وتی: ئەی موحەمەد نێراوەکەت هات بۆلامان پێی وتین گوایا تۆ دەڵێی: خوا تۆی کردووە بەپێغەمبەر؟ فەرمووی: ((ڕاستی وتووە)). وتی: دەباشە کێ ئاسمانی دروست کردووە؟ فەرمووی: ((خوا)) وتی: ئەی کێ زەوی دروستکردووە فەرمووی: ((خوا)). وتی: ئەی کێ ئەم شاخانەی داناوەو هەرچیشی ویستووە تیا دروستکردووە؟ فەرمووی: ((خوا)) ئینجا وتی: هەروەها نێراوەکەت دەڵێ گوایا ئێمە لەشەوو ڕۆژێکماندا پێنج نوێژمان لەسەرە، فەرمووی: ((ڕاست دەکات)) وتی: دەتوو ئەوەی تۆی ناردووە ئایا خوا

فەرمانی ئەوەی پێکردووی؟ فەرمووی : ((بەڵێ)) وتی: نێراوەکەت دەڵێ گوایا زەکاتی سامانەکانمان لەسەرە؟ فەرمووی: ((راستی وتووە)) وتی: دەتوو ئەو کەسەی تۆی ناردووە ئایا خوا فەرمانی ئەوەی پێکردووی؟ فەرمووی: ((بەڵێ)) وتی: نێراوەکەت دەڵێ گوایا: لەساڵەکەماندا رۆژووی مانگی رەمەزانمان لەسەرە؟ فەرمووی: ((راستی وتووە)) وتی: دەتوو ئەوکەسەی تۆی ناردووە ئایا خوا فەرمانی ئەوەی پێکردووی؟ فەرمووی: ((بەڵێ)). وتی: هەروەها نێراوەکەت دەڵێ کەگوایا: ئێمە ئەوانەمان کەلەتوانایاندا هەیە حەجی ماڵی خوایان لەسەرە؟ فەرمووی: ( راستی وتووە) ئینجا پشتی هەڵکردوو وتی: سوێند بەوەی بەهەق تۆی ناردووە نەلێیان زیاد دەکەم نەلێیان کەم دەکەم. پێغەمبەر ( فەرمووی: ((ئەگەر راست بکات دەچێتە بەهەشت)).

## ( ١١ ) فەرزبوونی نوێژ دوورکات دوو رکات

٢٠٠ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ): أَنَّ الصَّلَاةَ أَوَّلَ مَا فُرِضَتْ رَكْعَتَيْنِ، فَأُقِرَّتْ صَلَاةُ السَّفَرِ، وَأُتِمَّتْ صَلَاةُ الْحَضَرِ. قَالَ الزُّهْرِيُّ: فَقُلْتُ لِعُرْوَةَ: مَا بَالُ عَائِشَةَ تُتِمُّ فِي السَّفَرِ؟ قَالَ: إِنَّهَا تَأَوَّلَتْ كَمَا تَأَوَّلَ عُثْمَانُ. [بخاري / تقصير الصلاة / يقصر اذا خرج من موضعه/١٠٤٠]

عائشه(ر.ض) دەڵێ : یەکەمجار کەنوێژ فەرزکرا دوورکات بوو ، پاشان نوێژی سەفەر مایەوە بەدوورکاتو، نوێژی نیشتەجێ بەتەواو دانرا (زهری) دەڵێ: بە(عروە)م وت: بۆچی عائشه لەسەفەردا نوێژی تەواو دەکات؟ وتی: ئەو وەکو عوسمان تەئویلی کردووە.[کە هەردووکیان دروستە].

## ( ١٢ ) پێنج نوێژەکە کەفارەتن بۆ گوناهی نێوانیان

٢٠١ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((الصَّلَاةُ الْخَمْسُ، وَالْجُمْعَةُ إِلَى الْجُمْعَةِ، كَفَّارَةٌ لِمَا بَيْنَهُنَّ مَا لَمْ تُغْشَ الْكَبَائِرُ)). وفي الرواية: ((وَرَمَضَانُ إِلَى رَمَضَانَ مُكَفِّرَاتٌ لِمَا بَيْنَهُنَّ مَا اجْتُنِبَتِ الْكَبَائِرُ)).

(ابوهریرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ((پێنج نوێژەکەو جومعە بۆ جومعە کەفارەتن بۆ نێوانەکانیان، بەومەرجەی گوناهی گەورە نەکرابێ)). لەریوایەتێکیشا : ((رەمەزانیش کەفارەتی نێوانیانن ئەگەر دوورە پەرێزی لەگوناهە گەورەکان کرابێت)).

## (١٣) نوێژ نەکردن کوفرە

٢٠٢ـ عن جَابِر (ﷺ) قال: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: ((إِنَّ بَيْنَ الرَّجُلِ وَبَيْنَ الشِّرْكِ وَالْكُفْرِ تَرْكَ الصَّلَاةِ)).

(جـابر)(ﷺ) دەڵـێ: بیسـتوومە لەپێغەمبـەری خـوا(ﷺ) فەرموویـەتی: ((لەنێوان مرۆڤ و هاوەڵ بۆ خوا بریاردان و کوفردا نوێژنەکردنە)).

## (١٤) کۆکەرەوەی کاتەکان

٢٠٣ـ عَنْ عَبْدِ اللَّه ابْنِ عَمْرو (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) قَالَ: ((وَقْتُ الظُّهْرِ إِذَا زَالَتِ الشَّمْسُ وَكَانَ ظِلُّ الرَّجُلِ كَطُولِهِ، مَا لَمْ يَحْضُرِ الْعَصْرُ. وَوَقْتُ الْعَصْرِ مَا لَمْ تَصْفَرَّ الشَّمْسُ، وَوَقْتُ صَلَاةِ الْمَغْرِبِ مَا لَمْ يَغِبِ الشَّفَقُ، وَوَقْتُ صَلَاةِ الْعِشَاءِ إِلَى نِصْفِ اللَّيْلِ الْأَوْسَطِ، وَوَقْتُ صَلَاةِ الصُّبْحِ مِنْ طُلُوعِ الْفَجْرِ مَا لَمْ تَطْلُعِ الشَّمْسُ، فَإِذَا طَلَعَتِ الشَّمْسُ فَأَمْسِكْ عَنِ الصَّلَاةِ، فَإِنَّهَا تَطْلُعُ بَيْنَ قَرْنَيْ شَيْطَانٍ)).

( عبدالله) کوڕی (عمرو) کوڕی (عاص)(رضي لله عنهما) دەڵـێ: پێغەمبـەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((کاتی نیوەڕۆ کاتێکە خۆر بترازێ لەناوەڕاستی ئاسمان و سێبەری هـەموو کەسێك بەقەد درێـژی خـۆی لێبێت، مـادام عەسـر نـەهاتبێت. کاتی عەسریش هەتا بەر لەخۆر زەرد هەڵگەڕان، کـاتی نوێـژی شـێوانیش هـەتا ونبونی روناکیی ئاسۆ، کاتی نوێژی خەوتنیش هەتا نیوەی شەو، کاتی نوێژی بەیانیش ، لەبەرەبەیانەوە هەتا پێش خۆرکەوتن، هەرکاتێ خۆر هەڵهات دەست بگرنەوە لەنوێژ، چونکە لەنێوان دووشاخی شەیتاندا هەڵدێت)).

٢٠٤ـ عن أَبِي مُوسَى الاشعري (ﷺ)، عَنْ رَسُولِ اللَّه (ﷺ): أَنَّهُ أَتَاهُ سَائِلٌ يَسْأَلُهُ عَنْ مَوَاقِيتِ الصَّلَاةِ، فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْهِ شَيْئًا، قَالَ: فأمرَ بلالاً فَأَقَامَ الْفَجْرَ حِينَ انْشَقَّ الْفَجْرُ، وَالنَّاسُ لَا يَكَادُ يَعْرِفُ بَعْضُهُمْ بَعْضًا، ثُمَّ أَمَرَهُ فَأَقَامَ بِالظُّهْرِ حِينَ زَالَتِ الشَّمْسُ، وَالْقَائِلُ يَقُولُ: قَد انْتَصَفَ النَّهَارُ، وَهُوَ كَانَ أَعْلَمَ مِنْهُمْ، ثُمَّ أَمَرَهُ فَأَقَامَ بِالْعَصْرِ وَالشَّمْسُ مُرْتَفِعَةٌ، ثُمَّ أَمَرَهُ فَأَقَامَ بِالْمَغْرِبِ حِينَ وَقَعَتِ الشَّمْسُ، ثُمَّ أَمَرَهُ فَأَقَامَ الْعِشَاءَ حِينَ غَابَ الشَّفَقُ، ثُمَّ أَخَّرَ الْفَجْرَ مِنَ الْغَدِ حَتَّى انْصَرَفَ مِنْهَا وَالْقَائِلُ يَقُولُ: قَدْ طَلَعَتِ الشَّمْسُ أَوْ كَادَتْ، ثُمَّ أَخَّرَ الظُّهْرَ حَتَّى كَانَ قَرِيبًا مِنْ وَقْتِ الْعَصْرِ بِالْأَمْسِ، ثُمَّ أَخَّرَ الْعَصْرَ حَتَّى انْصَرَفَ مِنْهَا وَالْقَائِلُ يَقُولُ: قَدِ

احْمَرَّتِ الشَّمْسُ، ثُمَّ أَخَّرَ الْمَغْرِبَ حَتَّى كَانَ عِنْدَ سُقُوطِ الشَّفَقِ، ثُمَّ أَخَّرَ الْعِشَاءَ حَتَّى كَانَ ثُلُثُ اللَّيْلِ الْأَوَّلِ، ثُمَّ أَصْبَحَ، فَدَعَا السَّائِلَ، فَقَالَ: ((الْوَقْتُ بَيْنَ هَذَيْنِ)).

(ابو موسى الاشعري) لەپێغەمبەری خواوە(ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوە دەڵێ: پرسیارکەرێك هات لەبارەی کاتەکانی نوێژەوە پرسیاری لێکرد، هیچ وەڵامی نەدایەوە دەڵێ: فەرمانیکرد بەبیلال بانگی بەیانیدا، کاتێ بەرەبەیان هەڵهات هێشتا خەڵك یەکتریان نەدەناسیەوە، پاشان فەرمانی پێکرد بانگی نیوەڕۆیدا کاتێ خۆرترازا [ لەناوەڕاستی ئاسمان لایدا]هەموو کەس دەیوت بەراستی ڕۆژ نیوە بووە، ئەو خۆیشی زاناتربوو، ئینجا کاتێ خۆرداکەوت فەرمانی پێکرد بانگیدا بۆ شێوان، پاشان کاتێ ئاسۆ ونبوو فەرمانی پێکرد بانگیدا بۆ خەوتنان، ئینجا بەربەیانی ڕۆژی داهاتووی دواخست هەتا کاتەکەی تێپەڕی، تا قسەکەرێك دەیوت خۆرکەوتووە، یا خەریکە بکەوێت، پاشان نیوەڕۆی دواخست تا نزیك بوویەوە لەکاتی عەسری دوێنێ، پاشان عەسری دواخست تاکاتەکەی تێپەڕیو قسەکەر دەیوت: خۆر سوور هەڵگەراوە، ئینجا شێوانی دواخست هەتا گەیشتە کەوتنی ئاسۆ، پاشان خەوتنانی دواخست هەتا سێیەکی یەکەمی شەو ڕۆیشت، ئینجا بەیانیی کردەوە، پاشان پرسیارکەری بانگ کردوو فەرمووی: ((کات لەنێوان ئەو دوانەدایە)).

## ( ١٥ ) بەتاریکی نوێژی بەیانی کردن

٢٠٥- عن مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: لَمَّا قَدِمَ الْحَجَّاجُ الْمَدِينَةَ، فَسَأَلْنَا جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ فَقَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يُصَلِّي الظُّهْرَ بِالْهَاجِرَةِ، وَالْعَصْرَ وَالشَّمْسُ نَقِيَّةٌ، وَالْمَغْرِبَ إِذَا وَجَبَتْ، وَالْعِشَاءَ أَحْيَانًا يُؤَخِّرُهَا وَأَحْيَانًا يُعَجِّلُ، كَانَ إِذَا رَآهُمْ قَدِ اجْتَمَعُوا عَجَّلَ، وَإِذَا رَآهُمْ قَدْ أَبْطَئُوا أَخَّرَ، وَالصُّبْحَ -كَانُوا، أَوْ قَالَ- كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يُصَلِّيهَا بِغَلَسٍ. [بخاري/ حاشية مواقيت الصلاة/ ٥٣٥]

(محمد) کوڕی(عمرو) دەڵێ: کاتێ حاجیەکان گەیشتنە مەدینە، پرسیارمان کرد لە(جابر) کوڕی(عبدالله) ئەویش وتی: پێغەمبەری خوا(ﷺ) نوێژی نیوەڕۆی لەگەرمای نیوەڕۆدا دەکرد نوێژی عەسریشی دەکرد کەهێشتا خۆر ڕوون بوو، شێوانیش هەرکاتێ خۆرئاوابوو، خەوتنانیش جارجار دوای دەخستو جارجاریش زوودەیکرد: هەرکاتێ دەیبینی کۆبوونەتەوە پەلەی

دەکرد) ئەگەر ئەوان دوابکەوتنایە ئەمیش دوای دەخست. بەیانیش [بەتاریکی دەیکرد] یا راوی دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) بەتاریکی دەیکرد.

## (١٦) پارێزگاری لەنوێژی بەیانیو عەسر

٢٠٦. عن أبِي بَكْرِ بْن عُمَارَة بْنِ رُؤَيْبَةَ عَنْ أَبِيهِ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُول اللَّه (ﷺ) يَقُولُ: ((لَنْ يَلِجَ النَّارَ أَحَدٌ صَلَّى قبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ، وَقَبْلَ غُرُوبِهَا)) يعْني الْفَجْرَ وَالْعَصْرَ، فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْبَصْرَةِ: آنْتَ سَمِعْتَ هَذَا مِنْ رَسُول اللَّه (ﷺ)؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ الرَّجُلُ: وَأَنَا أَشْهَدُ أَنِّي سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، سَمِعَتْهُ أُذُنَايَ، وَوَعَاهُ قَلْبِي.

(ابوبکر) کـوڕی( عمـارە) کـوڕی ( ڕۆییبـە) لەباوکیـەوە دەگێڕێتـەوە دەڵـێ: بیستومە لەپێغەمبـەری خـوا(ﷺ) دەیفـەرموو: ((ئـاگر بـەر ئەوکەسـە ناکـەوێت کەنوێژی پێش خۆرکەوتنو پێش خۆر نیشتن بکات)).

واتە: نوێـژی بەیانیو عەسر ، پیاوێکی خەڵکی بەسرە پێی وت: ئایا تـۆ ئەمـەت لەپێغەمبـەری خوا(ﷺ) بیستووە؟ وتـی: بـەڵێ، پیاوەکـە وتـی: منیـش شـایەتی دەدەم منیـش ئەمـەم لـە پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) بیسـتووە گوێکـانم بیستویەتیو، دڵم تێی گەیشتووە.

٢٠٧ـ عَنْ أَبِي بَكْرِ بن ابي موسى الاشعريِّ عَنْ أَبِيهِ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((مَنْ صَلَّى الْبَرْدَيْنِ دَخَلَ الْجَنَّةَ)). ﴿بخاري/ مواقيت الصلاة /٥٤٨﴾

(ابوبکر) کوڕی (ابو موسی الاشعری) لەباوکیەوە دەگێڕێتـەوە: پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) فـەرمووی: ((هەرکـەس دوونوێـژی فێنکـی ﴿ واتـە بـەیانیو عەسـر بکات﴾دەچێتە بەهەشتەوە)).

## (١٧) ڕێگریی لە نوێژکردن لەکاتی هەڵهاتنو ئاوا بوونی خۆردا:

٢٠٨ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: لَمْ يَدَعْ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) الرَّكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْعَصْرِ، قَالَ: فَقَالَتْ عَائِشَةُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((لَا تَتَحَرَّوْا بِصلاتكم طُلُوعَ الشَّمْسِ وَلَا غُرُوبَهَا فَتُصَلُّوا عِنْدَ ذَلِكَ)).

عائشـە(ر.ض)دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) دەسـتبەرداری دوورکـاتی دوای عەسر نەدەبوو، راوی دەڵێ عائشـە وتـی: پێغەمبـەر(ﷺ) فەرموویـەتی: (( بـۆ نوێژکردنتـان مەگەڕێن بۆ کـاتی خۆرهـەڵاتنو خۆرئاوابوونو لەوکاتانـەدا نوێـژ بکەن)).[(واتە: لەو دوو کاتەدا نوێژمەکەن)].

## ( ١٨ ) نوێژی نیوەڕۆ لەسەرەتـای کاتدا

٢٠٩ـ عَنْ خَبَّابٍ (ﷺ) قَالَ: أَتَيْنَا رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ)، فَشَكَوْنَا إِلَيْهِ حَرَّ الرَّمْضَاءِ، فَلَمْ يُشْكِنَا. قَالَ زُهَيْرٌ: قُلْتُ لِأَبِي إِسْحَقَ: أَفِي الظُّهْرِ؟ قَـالَ: نَعَمْ، قُلْتُ: أَفِـي تَعْجِيلِهَا؟ قَالَ: نَعَمْ.

(خبـاب) (ﷺ) دەڵـێ: هاتینـە خزمـەت پێغەمبـەر(ﷺ) سکالأمان لــەلا کــرد لەگەرمی لمی [زەویەکە] بەلأم سکالأکەی وەرنەگرتین، (زهیر) وتـی: بـە(ابـی اسـحاق)م وت: ئایـا مەبەسـت نیوەڕۆبـوو وتـی: بـەڵێ، وتم: ئایـا مەبەسـت سەرەتای کاتی نیوەڕۆبوو؟ وتی بەڵێ.

## ( ١٩ ) بەفێنکی نوێژکردن لەکاتی گەرمادا

٢١٠ـ عَنْ أَبِي ذَرٍّ (ﷺ) قَالَ: أَذَّنَ مُؤَذِّنُ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) بِالظُّهْرِ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ) ((أَبْرِدْ أَبْرِدْ. أَوْ قَالَ: انْتَظِرِ، انْتَظِرْ)). وَقَالَ: ((إِنَّ شِدَّةَ الْحَرِّ مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ، فَإِذَا اشْتَدَّ الْحَرُّ فَأَبْرِدُوا عَنِ الصَّلَاةِ)). قَالَ أَبُو ذَرٍّ: حَتَّى رَأَيْنَـا فَـيْءَ التُّلُـولِ. [بخاري/ مواقيت الصلاة / الابراد بالظهر في شدة الحر/ ٥١١]

(ابـوذر)(ﷺ) دەڵـێ: بـانگبێژی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) بانگی نیـوەڕۆیدا ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((فێنکی کە فێنکی کە ، یا فەرمووی: چاوەڕێ بکە چاوەڕێ بکەو فەرمووی: بەهێزی تینـی گـەرما لـەهالأوی دۆزەخـە، جـا ئەگـەر گەرما بەتین بوو نوێژەکان بخەنە کاتی فێنکی)). (ابـوذر)دەڵـێ : هـەتا سێبـەری گردۆڵکەکانمان بینی.

## ( ٢٠ ) سەرەتـای کاتی نوێژی عەسر

٢١١ــ عَـنْ أَنَـسِ بْـنِ مَـالِكٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّـهِ (ﷺ) كَـانَ يُصَلِّـي الْعَصْـرَ وَالشَّمْسُ مُرْتَفِعَةٌ حَيَّـةٌ، فَيَذْهَـبُ الذَّاهِـبُ إِلَى الْعَوَالِـي، فَيَأْتِي الْعَوَالِيَ وَالشَّـمْسُ مُرْتَفِعَةٌ. [بخاري/ مواقيت الصلاة / وقت العصر/٥٢٥]

(انـس) کـوڕی (مـالك) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) نوێـژی عەسـری دەکردو خۆر بەرزو بەتین بوو ڕێبوارێك دەچوو بۆ گوندەکانی دەوری مەدینـە، دەگەیشتە ئەوێ‌و هێشتا خۆر بەرزدەبوو.

٢١٢ـ عَنِ الْعَلَاءِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ: أَنَّهُ دَخَلَ عَلَـى أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ) فِـي دَارِهِ بِالْبَصْرَةِ، حِينَ انْصَرَفَ مِنَ الظُّهْرِ، وَدَارُهُ بِجَنْبِ الْمَسْجِدِ، فَلَمَّا دَخَلْنَا عَلَيْهِ قَالَ: أَصَلَّيْتُمُ الْعَصْرَ؟ فَقُلْنَا لَهُ: إِنَّمَا انْصَرَفْنَا السَّاعَةَ مِنَ الظُّهْرِ، قَالَ: فَصَلُّوا الْعَصْـرَ.

فَقُمْنَا فصَلَّيْنَا. فلَمَّا انْصَرَفْنَا قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) يقُولُ: ((تلْك صلاةُ الْمُنَافِقِ: يَجْلسُ يَرْقُبُ الشَّمْس، حتَّى إِذَا كانتْ بَيْنَ قرْني الشَّيْطان قَامَ فنقرَهَا أَرْبَعًا، لَا يَذْكُرُ اللَّهَ فيهَا إِلَّا قَليلًا)).

(علاء)كوڕی( عبدالرحمن) دەڵێ: چۆتە لای (انس) كوری (مالك)(ﷺ) لەماڵەكەیدا لەبەسرە لەكاتێكا لەنوێژی نیوەڕۆ هاتۆتە دەرەوە، ماڵیان لەتەنیشتی مزگەوتەكەدابوو، كاتێ چووینە ژوورەوە بۆ لای وتی: ئایا نوێژی عەسرتان كردووە؟ پێمان وت: ئێمە ئێستا لە نوێژی نیوەڕۆهاتوینە دەرەوە، وتی: دە نوێژی عەسر بكەن، ئێمەش هەستاین‌و نوێژمان كرد، كاتێ لێ بووینەوە وتی: بیستوومە لەپێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: ((ئەوە نوێژی دووڕووە ! دادەنیشێ چاوەڕێی خۆردەكات ، هەتا كاتێ دەگاتە نێوان دووشاخەكەی شەیتان هەڵدەستێ‌و چوار دەنووك دەدات بەزەویدا، یادی خوای تێدا ناكات كەم نەبێت)).

## ( ٢١ ) پارێزگاری لەعەسرو رێگری لەنوێژ لەدوایەوە

٢١٣ـ عَنْ أَبِي بَصْرَةَ الْغِفَارِيِّ (ﷺ) قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) الْعَصْرَ بِالْمُخَمَّصِ، فَقَالَ: ((إِنَّ هَذِهِ الصَّلَاةَ عُرِضَتْ عَلَى مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ فَضَيَّعُوهَا، فَمَنْ حَافَظَ عَلَيْهَا كَانَ لَهُ أَجْرُهُ مَرَّتَيْنِ، وَلَا صَلَاةَ بَعْدَهَا حَتَّى يَطْلُعَ الشَّاهِدُ)). وَالشَّاهِدُ النَّجْمُ.

(ابو بصرة الغفاري) (ﷺ ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە(مخمص) نوێژی عەسری پێكردین‌و فەرمووی: ((ئەم نوێژە خرایە سەر ئەوانەی لەپێش ئێوەدا بوون بەڵام زایەیان كرد، كەواتە هەركەس پارێزگاری بكات دووجار پاداشتی هەیە، نوێژیش لەدوایەوە نییە هەتا ئەستێرە هەڵدێت)).

## ( ٢٢ ) هەرەشە لەوكەسەی نوێژی عەسری دەچێت

٢١٤ـ عَنِ عبدالله بْنِ عُمَرَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((الَّذِي تَفُوتُهُ صَلَاةُ الْعَصْرِ كَأَنَّمَا وُتِرَ أَهْلَهُ ومالَهُ)). [بخاري / مواقيت الصلاة ٥٢٧]

(عبدالله) كوڕی(عمر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ((ئەوەی نوێژی عەسری دەچێت هەروەكو ئەوەوایە ماڵ‌و خێزانی تالان كرابێت)).

## ( ٢٣ ) لەبارەی نوێژی ناوەندەوە( الوسطى )

٢١٥ـ عَنْ عَبْدِ اللَّه بن المسعود (ﷺ) قالَ: حَبَسَ الْمُشْرِكُونَ رَسُول اللَّه (ﷺ) عَنْ صَلَاةِ الْعَصْرِ، حَتَّى احْمَرَّت الشَّمْسُ أو اصْفَرَّتْ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): ((شَغَلُونَا عَنِ الصَّلَاةِ الْوُسْطَى صَلَاةِ الْعَصْرِ، مَلَأَ اللَّهُ أَجْوَافَهُمْ وَقُبُورَهُمْ نَارًا. أَوْ ﴿قَالَ﴾: حَشَا اللَّهُ أَجْوَافَهُمْ وَقُبُورَهُمْ نَارًا)). [اخرجه البخاري في الجهاد بان الدعاء على المشركين ٢٧٧٣]

(عبدالله) کوڕی (مسعود)(ﷺ) دەڵێ: موشریکەکان ڕێگەیان نەدا کە پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی عەسر بکات، هەتا خۆر سوورهەڵگەڕا یازەردبوو، ئنجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((خەریکیان کردین لەنوێژی ناوەراست ، نوێژی عەسر، خـوای گـەورە ناوسکیان و گۆڕەکانیان پڕ بکات لەئاگر. یا[فەرمووی]خوای گەورە ناوسکیان و گۆڕەکانیان بەئاگر بئاخنێ)).

## ( ٢٤ ) ڕێگری لەنوێژکردنی دوای عەسرو دوای بەیانی

٢١٦ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) نَهَى عَنِ الصَّلَاةِ بَعْدَ الْعَصْرِ حَتَّى تَغْرُبَ الشَّمْسُ، وَعَنِ الصَّلَاةِ بَعْدَ الصُّبْحِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ.

(ابوهریرە)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕێگری کردووە لەنوێژکردن لەدوای نوێژی عەسر هەتا خۆرئاوا دەبێت. هەروەها لەنوێژکردن دوای نوێژی بەیانی هەتا خۆر هەڵدێت.

## ( ٢٥ ) سێ‌کات هەیە نەنوێژی تیادەکرێت نەمردووی تیا دەنێژرێت

٢١٧. عن عَلِيّ بن رباح قَالَ: سَمِعْتُ عُقْبَةَ بْنَ عَامِرٍ الْجُهَنِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: ثَلَاثُ سَاعَاتٍ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَنْهَانَا أَنْ نُصَلِّيَ فِيهِنَّ أَوْ أَنْ نَقْبُرَ فِيهِنَّ مَوْتَانَا: حِينَ تَطْلُعُ الشَّمْسُ بَازِغَةً حَتَّى تَرْتَفِعَ، وَحِينَ يَقُومُ قَائِمُ الظَّهِيرَةِ حَتَّى تَمِيلَ الشَّمْسُ، وحِينَ تَضَيَّفُ الشَّمْسُ لِلْغُرُوبِ حتَّى تَغْرُبَ.

(علی)کوڕی (رباح) دەڵێ: لە(عقبە) کوڕی( عامر الجهنی)م بیستووە (ﷺ) دەیووت: سێ‌کات هەن کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕێگری لێدەکردین کە نوێژی تێدابکەین یا مردووی تێدا بخەینە گۆڕ: کاتێ خۆر هەڵدێت بەتەواوی هەتا بەرز دەبێتەوە، کاتێ لەنیوەڕۆدا بەپێوە وەستاو سێبەری نامێنێ تا لادەدات، کاتێکیش خۆر لاردەبێتەوە بۆ ئاوابوون هەتا ون دەبێت.

## ( ٢٦ ) دووركات دوای عەسر

٢١٨. عن أَبِي سَلَمَةَ: أَنَّهُ سَأَلَ عَائِشَةَ (ﷺ) عن السَّجْدَتَيْنِ اللَّتَيْنِ كَانَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) يُصَلِّيهِمَا بَعْدَ الْعَصْرِ؟ فَقَالَتْ: كَانَ يُصَلِّيهِمَا قَبْلَ الْعَصْرِ، ثُمَّ إِنَّهُ شُغِلَ عَنْهُمَا، أَوْ نَسِيَهُمَا، فَصَلَّاهُمَا بَعْدَ الْعَصْرِ، ثُمَّ أَثْبَتَهُمَا، وَكَانَ إِذَا صَلَّى صَلَاةً أَثْبَتَهَا. قَالَ إِسْمَعِيلُ بنُ جعفرٍ: تَعْنِي دَاوَمَ عَلَيْهَا. [بخاري، مواقيت الصلاة /٥٩٥ . ٥٦٨]

(ابو سلمه) پرسیاری كردووه لە(عائشه) (ر.ض)لەبارەی ئەو دوو ركاتەی كەپێغەمبەر(ﷺ) دەیكردن لەدوای عەسر؟ ئەویش وتوویەتی: لەپێش عەسرا دەیكردن، سەرقاڵی نەیهێشتبوو بیا نكات، یا لەبیری چووبوو ، لەبەر ئەوە دوای عەسر كردوویەتی ، ئینجا بەردەوام بووە لەسەری پێغەمبەر(ﷺ) ئەگەر نوێژێكی بكردایە بەردەوام دەبوو لەسەری.

## ( ٢٧ ) گێڕانەوەی نوێژی عەسر لەدوای شێوان

٢١٩ـ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ): أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ (ﷺ) يَوْمَ الْخَنْدَقِ جَعَلَ يَسُبُّ كُفَّارَ قُرَيْشٍ، وَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَاللَّهِ مَا كِدْتُ أَنْ أُصَلِّيَ الْعَصْرَ حَتَّى كَادَتْ أَنْ تَغْرُبَ الشَّمْسُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((فَوَاللَّهِ إِنْ صَلَّيْتُهَا)). فَنَزَلْنَا إِلَى بُطْحَانَ، فَتَوَضَّأَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وَتَوَضَّأْنَا، فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) الْعَصْرَ بَعْدَ مَا غَرَبَتِ الشَّمْسُ. ثُمَّ صَلَّى بَعْدَهَا المغربَ. [بخاري / مواقيت الصلاة/ ٥٧١]

(جابر) كوری (عبدالله) (ﷺ) دەڵێ: لەرۆژی خەندەقا (عمر) كوری (خطاب) جنێوی بەكافرەكانی قورەیش دەدا، ئینجا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەخوا نوێژی عەسرم نەكردهەتا خەریكبوو خۆرئاوادەبوو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((سوێند بەخوا منیش نوێژم نەكردووە)) بۆیە دابەزین بۆ (بطحان) پێغەمبەر(ﷺ) دەستنوێژی گرت، ئێمەش دەستنوێژمان گرت، پێغەمبەر(ﷺ) دوای ئەوەی خۆرئاوابوو نوێژی عەسری كرد، ئینجا دوای ئەوە نوێژی شێوانی كرد.

## ( ٢٨ ) دووركات پێش شێوان دوای خۆر ئاوابوون

٢٢٠ـ عَنْ مُخْتَارِ بْنِ فُلْفُلٍ قَالَ: سَأَلْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ (ﷺ) عَنِ التَّطَوُّعِ بَعْدَ الْعَصْرِ، فَقَالَ: كَانَ عُمَرُ يَضْرِبُ الْأَيْدِي عَلَى صَلَاةٍ بَعْدَ الْعَصْرِ، وَكُنَّا نُصَلِّي عَلَى

عَهْدِ النَّبِيِّ (ﷺ) رَكْعَتَيْنِ بَعْدَ غُرُوبِ الشَّمْسِ قَبْلَ صَلَاةِ الْمَغْرِبِ. فَقُلْتُ لَهُ: أَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) صَلَّاهُمَا؟ قَالَ: كَانَ يَرَانَا نُصَلِّيهِمَا، فَلَمْ يَأْمُرْنَا وَلَمْ يَنْهَنَا.

(مختار) کوری (فلفل) دەڵێ: پرسیارم کرد لە(انس) کوری(مالك) (﵁) لەبارەی سوننەتی دوای عەسرەوە ، وتی: عمر دەیکێشا بەدەستیاندا ﴿نارەزایی دەردەبڕی﴾لەنوێژی دوای عەسرا، ئێمە لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) دوای خۆرئاوابوون ، پێش نوێژی شێو دورکاتمان دەکرد پێم وت: ئایا پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەو دوو رکاتەی دەکرد؟ وتی: ئێمەی دەبینی دەمانکرد، نەفەرمانی پێدەکرین و نەرێگری لێدەکردین.

## ( ٢٩ ) کاتی شێو ئەوکاتەیە خۆرئاوا دەبێت

٢٢١ـ عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الْأَكْوَعِ (﵁) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) كَانَ يُصَلِّي الْمَغْرِبَ إِذَا غَرَبَتِ الشَّمْسُ وَتَوَارَتْ بِالْحِجَابِ. ﴿بخاري/ مواقيت الصلاة / وقت المغرب /٥٣٦﴾

(سلمە) کوری (اکوع) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) کاتێ خۆرئاوا دەبوو دیارنەدەما نوێژی شێوی دەکرد.

## ( ٣٠ ) کاتی نوێژی خەوتنان و دواخستنی

٢٢٢ـ عن عَائِشَةَ (﵂) قَالَتْ: أَعْتَمَ النَّبِيُّ (ﷺ) ذَاتَ لَيْلَةٍ حَتَّى ذَهَبَ عَامَّةُ اللَّيْلِ، وَحَتَّى نَامَ أَهْلُ الْمَسْجِدِ، ثُمَّ خرج فصلَّى فقالَ: ((إِنَّهُ لَوَقْتُهَا، لَوْلَا أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي)). [بخاري/ مواقيت الصلاة ، فضل العشاء/٥٤١]

عائشە(ر.ض) دەڵێ: شەوێکیان پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی خەوتنی دواخست هەتا زۆربەی شەو رۆیشت و خەڵکی ناو مزگەوت خەوتن، ئینجا هات و نوێژی کردو فەرمووی: ((لەراستیدا ئەگەر گران نەبوایە لەسەر ئوممەتم، ئەمە کاتیەتی)).

## ( ٣١ ) ناوی نوێژی خەوتنان

٢٢٣ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (﵁) قَالَ: قَالَ رَسُولَ اللَّه (ﷺ): ((لَا تَغْلِبَنَّكُمُ الْأَعْرَابُ عَلَى اسْمِ صَلَاتِكُمُ العِشاءِ، أَلَا إِنَّهَا فِي كِتابِ اللهِ الْعِشَاءُ، وَهُمْ يُعْتِمُونَ بِالْإِبِلِ)).

(عبدالله) کوری ( عمر) (﵁) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: ((عەرەبە دەشتەکیەکان زاڵ نەبن بەسەرتانا لەسەر ناوی نوێژی خەوتنان، بە(عەتەمە) ناوی بەرن چونکە لەقورئانەکەی خوادا بە(عشاء) هاتووە، عەرەبی

دەشتەکی لەتاریکی شەودا وشتر ئەدۆشن ئەیخەنە تاریکیەوە ئەوان بە وشتر دۆشین دەڵێن عەتەمە)).

## (٣٢) ڕێگری لەدواخستنی نوێژ لەکاتی خۆی

٢٢٤ـ عَنْ أَبِي ذَرّ (ﷺ) قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((كَيْفَ أَنْتَ إِذَا كَانَتْ عَلَيْكَ أُمَرَاءُ يُؤَخِّرُونَ الصَّلَاةَ عَنْ وَقْتِهَا؟ أَوْ: يُمِيتُونَ الصَّلَاةَ عَنْ وَقْتِهَا)). قَالَ: قُلْتُ: فَمَا تَأْمُرُنِي؟ قَالَ: ((صَلِّ الصَّلَاةَ لِوَقْتِهَا، فَإِنْ أَدْرَكْتَهَا مَعَهُمْ فَصَلِّ، فَإِنَّهَا لَكَ نَافِلَةٌ)).

(ابو ذر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ((حاڵت چۆن دەبێت ئەگەر کاربەدەستانێکت لەسەربێت، نوێژ دوابخەن لەکاتی خۆی ؟ بیفەوتێنن دەڵێ: وتم : چ فەرمانێکم پێدەکەیت؟ فەرمووی: ((نوێژ لەکاتی خۆیدا بکە، ئەگەر بەنوێژەکەی ئەوانیش گەیشتیت نوێژیان لەگەڵدا بکە ، ئەوەش دەبێتە سوننەت بۆت)).

## (٣٣) چاکترین کار نوێژە لەکاتی خۆیدا

٢٢٥ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (ﷺ) قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ): أَيُّ الْعَمَلِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: ((الصَّلَاةُ لِوَقْتِهَا)). قَالَ: ﴿قُلْتُ﴾: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: ((بِرُّ الْوَالِدَيْنِ)). قَالَ: ﴿قُلْتُ﴾: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: ((الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ)). فَمَا تَرَكْتُ أَسْتَزِيدُهُ إِلَّا إِرْعَاءً عَلَيْهِ.

(عبدالله) کوری (مسعود) دەڵێ: پرسیارم کرد لەپێغەمبەری خوا(ﷺ) کام کار زۆرچاکە ؟ فەرمووی : ((نوێژ لەکاتی خۆیدا)) دەڵێ: [وتم] پاشان چی ؟ فەرمووی: ((چاکە کردن لەگەڵ دایك و باوکا)). وتم: پاشان چی؟ فەرموی: ((جهاد لەرێی خوادا)) بۆیە پرسیاری ترم نەکرد لەبەرئەوەی ئەزیەتی نەکەم.

## (٣٤) ئەوەی گەیشت بەرکاتێك گەیشتووە بەنوێژەکە

٢٢٦ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: ((مَنْ أَدْرَكَ رَكْعَةً مِنَ الصَّلَاةِ فَقَدْ أَدْرَكَ الصَّلَاةَ)). [بخاري/ مواقيت الصلاة / ٥٥٥]

(ابوهریره) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: ((ئەوەی گەیشت بەرکاتێك لەنوێژەکە ئەوە گەیشتووە بەنوێژەکە)).

**(٣٥) هەرکەس خەوتبوو لەکاتی نوێژدا یان لەبیری چوو هەرکاتێ بیری کەوتەوە بابیکات**

٢٢٧ـ عَنْ أَبِي قَتَادَةَ (ﷺ) قَالَ: خَطَبَنَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالَ: ((إِنَّكُمْ تَسِيرُونَ عَشِيَّتَكُمْ وَلَيْلَتَكُمْ، وَتَأْتُونَ الْمَاءَ إِنْ شَاءَ اللَّهُ غَدًا)). فَانْطَلَقَ النَّاسُ لَا يَلْوِي أَحَدٌ عَلَى أَحَدٍ، قَالَ أَبُو قَتَادَةَ: فَبَيْنَمَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَسِيرُ حَتَّى ابْهَارَّ اللَّيْلُ وَأَنَا إِلَى جَنْبِهِ، قَالَ: فَنَعَسَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فَمَالَ عَنْ رَاحِلَتِهِ فَأَتَيْتُهُ فَدَعَمْتُهُ مِنْ غَيْرِ أَنْ أُوقِظَهُ، حَتَّى اعْتَدَلَ عَلَى رَاحِلَتِهِ، قَالَ: ثُمَّ سَارَ حَتَّى تَهَوَّرَ اللَّيْلُ مَالَ عَنْ رَاحِلَتِهِ، قَالَ: فَدَعَمْتُهُ مِنْ غَيْرِ أَنْ أُوقِظَهُ حَتَّى اعْتَدَلَ عَلَى رَاحِلَتِهِ، قَالَ: ثُمَّ سَارَ حَتَّى إِذَا كَانَ مِنْ آخِرِ السَّحَرِ مَالَ مَيْلَةً هِيَ أَشَدُّ مِنَ الْمَيْلَتَيْنِ الْأُولَيَيْنِ حَتَّى كَادَ يَنْجَفِلُ، فَأَتَيْتُهُ فَدَعَمْتُهُ، فَرَفَعَ رَأْسَهُ فَقَالَ: ((مَنْ هَذَا)). قُلْتُ: أَبُو قَتَادَةَ، قَالَ: ((مَتَى كَانَ هَذَا مَسِيرَكَ مِنِّي)). قُلْتُ: مَا زَالَ هَذَا مَسِيرِي مُنْذُ اللَّيْلَةِ، قَالَ: ((حَفِظَكَ اللَّهُ بِمَا حَفِظْتَ بِهِ نَبِيَّهُ)). ثُمَّ قَالَ: ((هَلْ تَرَانَا نَخْفَى عَلَى النَّاسِ)). ثُمَّ قَالَ: ((هَلْ تَرَى مِنْ أَحَدٍ)). قُلْتُ: هَذَا رَاكِبٌ، ثُمَّ قُلْتُ: هَذَا رَاكِبٌ آخَرُ، حَتَّى اجْتَمَعْنَا فَكُنَّا سَبْعَةَ رَكْبٍ، قَالَ: فَمَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَنِ الطَّرِيقِ فَوَضَعَ رَأْسَهُ، ثُمَّ قَالَ: ((احْفَظُوا عَلَيْنَا صَلَاتَنَا)). فَكَانَ أَوَّلَ مَنِ اسْتَيْقَظَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وَالشَّمْسُ فِي ظَهْرِهِ، قَالَ: فَقُمْنَا فَزِعِينَ، ثُمَّ قَالَ: ((ارْكَبُوا)). فَرَكِبْنَا فَسِرْنَا، حَتَّى إِذَا ارْتَفَعَتِ الشَّمْسُ نَزَلَ، ثُمَّ دَعَا بِمِيضَأَةٍ كَانَتْ مَعِي فِيهَا شَيْءٌ مِنْ مَاءٍ، قَالَ: فَتَوَضَّأَ مِنْهَا وُضُوءًا دُونَ وُضُوءٍ، قَالَ: وَبَقِيَ فِيهَا شَيْءٌ مِنْ مَاءٍ، ثُمَّ قَالَ لِأَبِي قَتَادَةَ: ((احْفَظْ عَلَيْنَا مِيضَأَتَكَ، فَسَيَكُونُ لَهَا نَبَأٌ)). ثُمَّ أَذَّنَ بِلَالٌ بِالصَّلَاةِ فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ صَلَّى الْغَدَاةَ، فَصَنَعَ كَمَا كَانَ يَصْنَعُ كُلَّ يَوْمٍ، قَالَ: وَرَكِبَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وَرَكِبْنَا مَعَهُ، قَالَ: فَجَعَلَ بَعْضُنَا يَهْمِسُ إِلَى بَعْضٍ: مَا كَفَّارَةُ مَا صَنَعْنَا بِتَفْرِيطِنَا فِي صَلَاتِنَا؟ ثُمَّ قَالَ: ((أَمَا لَكُمْ فِيَّ أُسْوَةٌ)). ثُمَّ قَالَ: ﴿أَمَا﴾ إِنَّهُ لَيْسَ فِي النَّوْمِ تَفْرِيطٌ، إِنَّمَا التَّفْرِيطُ عَلَى مَنْ لَمْ يُصَلِّ الصَّلَاةَ حَتَّى يَجِيءَ وَقْتُ الصَّلَاةِ الْأُخْرَى، فَمَنْ فَعَلَ ذَلِكَ فَلْيُصَلِّهَا حِينَ يَنْتَبِهُ لَهَا، فَإِذَا كَانَ الْغَدُ فَلْيُصَلِّهَا عِنْدَ وَقْتِهَا)). ثُمَّ قَالَ: ((مَا تَرَوْنَ النَّاسَ صَنَعُوا)). قَالَ: ثُمَّ قَالَ: ((أَصْبَحَ النَّاسُ، فَقَدُوا نَبِيَّهُمْ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ -(ﷺ)-: رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بَعْدَكُمْ، لَمْ يَكُنْ لِيُخَلِّفَكُمْ. وَقَالَ النَّاسُ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) بَيْنَ أَيْدِيكُمْ. فَإِنْ يُطِيعُوا أَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ يَرْشُدُوا)). قَالَ: فَانْتَهَيْنَا إِلَى النَّاسِ حِينَ امْتَدَّ النَّهَارُ وَحَمِيَ كُلُّ شَيْءٍ،

وَهُمْ يَقُولُونَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ هَلَكْنَا، عَطِشْنَا، فَقَالَ: ((لَا هُلْكَ عَلَيْكُمْ)). ثُمَّ قَالَ: ((أَطْلِقُوا لِي غُمَرِي)). وَدَعَا بِالْمِيضَأَةِ، فَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَصُبُّ، وَأَبُو قَتَادَةَ يَسْقِيهِمْ، فَلَمْ يَعْدُ أَنْ رَأَى النَّاسُ مَاءً فِي الْمِيضَأَةِ تَكَابُّوا عَلَيْهَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((أَحْسِنُوا الْمَلَأَ، كُلُّكُمْ سَيَرْوَى)). قَالَ: فَفَعَلُوا، فَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَصُبُّ وَأَسْقِيهِمْ حَتَّى مَا بَقِيَ غَيْرِي وَغَيْرُ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، قَالَ: ثُمَّ صَبَّ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالَ لِي: ((اشْرَبْ)). فَقُلْتُ: لَا أَشْرَبُ حَتَّى تَشْرَبَ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: ((إِنَّ سَاقِيَ الْقَوْمِ آخِرُهُمْ ﴿شُرْبًا﴾)). قَالَ: فَشَرِبْتُ، وَشَرِبَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)، قَالَ: فَأَتَى النَّاسُ الْمَاءَ جَامِّينَ رِوَاءً. قَالَ: فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ رَبَاحٍ: إِنِّي لَأُحَدِّثُ هَذَا الْحَدِيثَ فِي مَسْجِدِ الْجَامِعِ إِذْ قَالَ عِمْرَانُ بْنُ حُصَيْنٍ: انْظُرْ أَيُّهَا الْفَتَى كَيْفَ تُحَدِّثُ، فَإِنِّي أَحَدُ الرَّكْبِ تِلْكَ اللَّيْلَةَ. قَالَ: قُلْتُ: فَأَنْتَ أَعْلَمُ بِالْحَدِيثِ، فَقَالَ: مِمَّنْ أَنْتَ؟ قُلْتُ: مِنَ الْأَنْصَارِ، قَالَ: حَدِّثْ فَأَنْتُمْ أَعْلَمُ بِحَدِيثِكُمْ. قَالَ: فَحَدَّثْتُ الْقَوْمَ، فَقَالَ عِمْرَانُ: لَقَدْ شَهِدْتُ تِلْكَ اللَّيْلَةَ، وَمَا شَعَرْتُ أَنَّ أَحَدًا حَفِظَهُ كَمَا حَفِظْتُهُ.

(ابو قتادە) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) وتاری بۆ دەداین فەرمووی: ((ئێوە بەرێگاوەن ئەمشەوەتان ، خوا حەزکات سبەینێ دەگەن بەئاو)) خەڵکەکە دەرچوون، کەس لای نەدەکردەوە بۆ کەس، (ابو قتادە) دەڵێ: لەکاتێکا پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەرێگادا دەڕۆیشت هەتا نیوەی شەو ڕۆیشت و منیش لەتەنیشتیەوە بووم، دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) وەنەوزی دەدا، لاربوویەوە لەسەر وڵاغەکەی ، دەڵێ: منیش خێرا راستم کردەوەو خەبەریشم نەکردەوە، دەڵێ: ئینجا ڕۆیشت هەتا زۆربەی شەوەکە ڕۆیشت [دووبارە] بەسەر وڵاغەکەیەوە لاربوویەوە، دەڵێ: راستم کردەوە لەسەر وڵاغەکەی بەبێ ئەوەی خەبەری بکەمەوە، ئینجا ڕۆیشت هەتا کاتی کۆتایی پارشێو، ئەمجارەیان زۆر لار بوویەوە زیاتر لەدوو جارەکەی پێشوو هەتا خەریك بوو بکەوێتە خوارەوە، خێراهاتم راستم کردەوە سەری بەرزکردەوە فەرمووی: ((ئەوە کێیە؟)) وتم: (ابوقتادە) فەرمووی: ((لەکەیەوە ئاوا لەگەڵ منداى لەرێگادا؟)) وتم: هەموو ئەمشەو لەخزمەتتا بووم، فەرمووی : ((خوا بتپارێزێت چۆن تۆ پارێزگاری پێغەمبەرەکەیت کرد)) ئینجا فەرمووی: ((ئایا وادەبینی ئێمە دیار نەبین لەخەڵکیەوە)) ئینجا فەرمووی: ((ئایا کەس دەبینی)) وتم: ئەوە سوارێکە ، ئینجا وتم : ئەوە سوارێکیترە، هەتا کۆبووینەوە بووین بەحەوت کەس، دەڵێ:

پێغەمبـەر(ﷺ) لەرێگاکـە لایـدا سـەری خسـتە سـەرزەوی ، ئینجـا فـەرمووی: ((ئاگاتان لەنوێژەکانتان بێت)) یەکەم کەس کەهەستا پێغەمبـەری خوابوو (ﷺ) خۆریش لەپشتیەوە بوو، دەڵێ: خێرا هـەموو هەسـتاین بەشڵەژاویی، ئینجـا فـەرمووی: ((سـواربن)) ئێمـەش سـوار بوویـن و کەوتینـەڕێ هـەتا خـۆر بەرزبوویەوە، دابەزی ، ئینجا داوای مەسینەیەکی کرد کەمن پێم بوو کـەمێك ئاوی تێدابوو، دەڵێ: سووکە دەستنوێژێکی گرت، کەمێك ئـاوی تێدامابوو، ئینجا بە(ابوقتادە)ی فەرموو: ((مەسینەکەت بپارێزە بۆمان ئەوە ناوبانگێکی گەورەی دەبێت)) ئینجا بیلال بانگیداو پێغەمبەر(ﷺ) دوورکات نوێـژی کـرد ، پاشان نوێژی بەیانی کرد، هەروەکو رۆژانی رابوردوو، دەڵێ: پێغەمبـەر(ﷺ) سواربوو، ئێمەش لەگەڵیا سواربووین ، دەڵێ : هەندێکمان بەچپە بەهەندێکمان وت: ((ئایا کـەفارەتی ئـەوەی کەنوێژەکـەمان دواخسـتبوو دەبـێ چـی بێـت؟)) ئینجا فـەرمووی: ((ئایـا مـن سەرمەشـق نیم بـۆ ئێـوە)) پاشـان فـەرمووی : ((ئاگاداربن خەوتن نابێتە کەمتەرخەمیو، بەڵکو کەمتەرخەمی ئەوەیە: کەسێك نوێژێك نەکات هەتا کاتی نوێژێکیتر دێت، هەرکەس وایکرد با هـەرکاتێ بیری کەوتەوە نوێژەکە بکات ئەگەر کەوتەوە سبەینێ. بالەکاتەکەی خۆیدا بیکات)) پاشان فەرمووی: ((ئەو خەڵکە چییـان کـرد؟)) ئینجـا وتـی: خـەڵکی رۆژیـان لێبویەوە، پێغەمبەرەکەیان لێون بووبوو، ابوبکرو عمر (ر.ض)وتیان: پێغەمبەری خـوا (ﷺ) لەدواتانەوەیـە، ئـەو زۆر دواناکـەوێ لێتـان، خەڵکەکـە وتیـان: پێغەمبـەری خوا(ﷺ) لێتـان پێشکەوتووە، ئەگەر گوێڕایەڵی ابوبکـرو عمـر بـن بەهەڵەدا ناچن )قەتادە دەڵێ: [زۆری پێنەچوو] گەیشتین بەخەڵکەکە ، کاتێ خۆر بەرزبوویەوە هەمووشتێ گـەرم بووبوو خـەڵك دەیانوت : ئەی پێغەمبەری خـوا(ﷺ) فـەوتاین، تینومانـە، فـەرمووی: (( نافـەوتێن)) ئینجـا فـەرمووی: ((جامەکەم بۆ دەربێنن)) داوای مەسینەکەی کرد، پێغەمبـەر(ﷺ) ئاوی رۆکردە جامەکەو (ابو قتادە) دەیدانێ، کاتێ خەڵکی مەسینەکەیان بینی کەڵەکەیان کرد لەسـەری، پێغەمبـەری (ﷺ) فـەرمووی: ((بـاش پـڕی کـەن، هـەمووتان تێرئـاو دەبن)) قـەتادە دەڵێ: بەقسـەیان کرد، پێغەمبەر(ﷺ) ئاوی رۆدەکردوو منیـش ئاوەکەم دەدانێ هەتا کەس نەما منو پێغەمبـەر(ﷺ) نەبێ. دەڵێ: ئینجا ئاوی تێکردوو بەمنی فەرموو بخۆرەوە، منیش وتم: ناخۆمەوە هـەتا تۆ نەخۆیتەوە

ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ((ئاودێری خەڵكی دەبێ لەدوای هەموویان بخواتەوە)) منیش خواردمەوە، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) خواردیەوە ئینجا خەڵكەكە تێرئاو بوون و پشوویاندا، ( عبدالله) كوڕی( رباح) دەڵێ: من لەمزگـەوتا ئـەم فەرموودەم بۆ خەڵكەكە دەگێڕایەوە ، ( عمران) كوڕی(حصین) وتی: وریابە ئەی گـەنج بزانـە چۆن ئـەو فـەرموودە دەگێڕێتـەوە لەراسـتیدا مـن یـەكێك بـووم لـەو كاروانەی ئەو شەوە ، عبدالله دەڵێ وتم: كەواتـە تـۆ زاناتری بـەم فەرموودەیـە ، وتـی: تۆكێـی؟ وتم: لـە(انصارە)كـانم ، وتـی: كـەوابوو تـۆ بیگـێڕەوە ، ئێـوە زانـاترن بەفەرموودەكـەتان. دەڵـێ: گێڕامـەوە بـۆ خەڵكەكـە ، عمـران وتـی: لەوشەوەدا من لەوێ بووم.. واهەستم نەكردووە كەكەسێك هەبێت لـەمن باشتر ئەو فەرموودەی لەبەركردبێت.

## ( ٣٦ ) نوێژ لەیەك پۆشاكدا

٢٢٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ سَائِلًا سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) عَنِ الصَّلَاةِ فِي الثَّوْبِ الْوَاحِدِ؟ فَقَالَ: ((أَوَلِكُلِّكُمْ ثَوْبَانِ)). [بخاري/ الصلاة في ثياب/ ٣٥١]

(ابوهريره) (ﷺ) دەڵێ: پرسیاركەرێك پرسیاری لەپێغەمبەری خوا(ﷺ) كرد لەبارەی نوێژەوە لەیەك پۆشاكدا؟ ئەویش بەسەر سوورمانەوە فەرمووی: ((بۆ هەموو یەكێكتان دوو پۆشاكی هەیە)).

٢٢٩- عن عُمَرَ بْنَ أَبِي سلـ مَةَ (ﷺ) قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يُصَلِّي فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ مُشْتَمِلًا بِهِ فِي بَيْتِ أُمِّ سَلَمَةَ، وَاضِعًا طَرَفَيْهِ عَلَى عَاتِقَيْهِ. [بخاري/ الصلاة في ثياب/ ٣٤٩]

(عمر) كوڕی ( ابو سلمه) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوام( ﷺ) دیووە نوێژی دەكـرد لەیـەك پۆشـاكدا كـە پێچـابوی لـەخۆی لـەماڵی (ام سـلمه) هەردووچمەكەی خستبووە سەر هەردووشانی.

## ( ٣٧ ) نوێژ لە پۆشاكی خە تخەتدا

٢٣٠- عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: قَامَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يُصَلِّي فِي خَمِيصَةٍ ذَاتِ أَعْلَامٍ، فَنَظَرَ إِلَى عَلَمِهَا، فَلَمَّا قَضَى صَلَاتَهُ قَالَ: ((اذْهَبُوا بِهَذِهِ الْخَمِيصَةِ إِلَى أَبِي جَهْمِ بْنِ حُذَيْفَةَ وَأْتُونِي بِأَنْبِجَانِيِّهِ، فَإِنَّهَا أَلْهَتْنِي آنِفًا عَنْ صَلَاتِي)). [بخاري/ الصلاة في ثياب/ ٣٦٦]

(عائشـه) (ر.ض) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) هەسـتا دەسـتیکرد بـەنوێژ لەبەرگێکی چوارگۆشەدا کە خەتخەت بوو، سەیری خەتەکانی دەکـرد، کـاتێ لەنوێژەکـەی بوویـەوە ، فـەرمووی: ((ئـەم بەرگـە ببـەن بـۆ ( ابوجـهم) کـوری (حذیفـة)بـەرگێکی ئەسـتووری سـادە بـۆ مـن بـهێنن ، چونکـە خـەیاڵی بـردم لەنوێژەکەمدا)).

## ( ٣٨ ) نوێژ لەسەر حەسیر

٢٣١. عَنْ إِسْحَقَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ): أَنَّ جَدَّتَهُ مُلَيْكَةَ دَعَتْ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) لِطَعَامٍ صَنَعَتْهُ، فَأَكَلَ مِنْهُ، ثُمَّ قَالَ: ((قُومُوا فَأُصَلِّيَ لَكُمْ)). قَالَ أَنَسُ ﴿بْنُ مَالِكٍ﴾: فَقُمْتُ إِلَى حَصِيرٍ لَنَا قَدِ اسْوَدَّ مِنْ طُولِ مَا لُبِسَ، فَنَضَحْتُهُ بِمَاءٍ، فَقَامَ عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)، وَصَفَفْتُ أَنَا وَالْيَتِيمُ وَرَاءَهُ، وَالْعَجُوزُ مِنْ وَرَائِنَا، فَصَلَّى لَنَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ انْصَرَفَ. [بخاري/ الصلاة في ثياب/ ٣٦٦]

(اسحاق) کوری( عبدالله) کوری( ابوطلحة) له ( انس) کوری (مالك)ەوە بۆمان دەگێڕێتەوە کە مولەیکەی نەنکی بانگێشتنی پێغەمبـەری خـوای (ﷺ) کرد بۆ خواردنێك کە سازی کردبوو، ئەویش لێی خوارد، پاشان فەرمووی: ((هەستن با نوێژتـان بـۆ بکـەم)) (انـس) دەڵـێ: هەسـتاین لەسـەر حەسـیرێکی ئێمـە کەلەبـەر کۆنی رەش دا گەڕابوو، ئاورشێنێکم کرد بەئاو پێغەمبـەر (ﷺ) چـووە سـەری من و منداڵێکی بێباوك لەدوایەوە ریزبووین (پیرەژنەکـەش لەدوامانـەوە بـوو) ،پێغەمبەر(ﷺ) دوورکاتی بۆ کردین و پاشان رۆیشت.

## ( ٣٩ ) نوێژ بەنەعلەوە

٢٣٢ـ عن سَعِيدِ بْنِ يَزِيدَ قَالَ: قُلْتُ لِأَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ): أَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يُصَلِّي فِي النَّعْلَيْنِ؟ قَالَ: نَعَمْ. [بخاري/ الصلاة في ثياب/ ٣٧٢]

(سـعید) کـوری( یزیـد) دەڵـێ: بـە(انـس) کـوری( مـالك)م (ﷺ) وت: ئایـا پێغەمبەری خوا بەنەعلەکانیەوە نوێژی دەکرد؟ وتی: بەڵێ.

## ( ٤٠ ) یەکەم مزگەوت لەسەرزەویدا کرایەوە

٢٣٣ـ عَنْ أَبِي ذَرٍّ (ﷺ) قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَيُّ مَسْجِدٍ وُضِعَ فِي الْأَرْضِ أَوَّلُ؟ قَالَ: ((الْمَسْجِدُ الْحَرَامُ)). قُلْتُ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: ((الْمَسْجِدُ الْأَقْصَى)). قُلْتُ: كَمْ

بَيْنَهُمَا؟ قَالَ: ((أَرْبَعُونَ سَنَةً، وَأَيْنَمَا أَدْرَكَتْكَ الصَّلَاةُ فَصَلِّ، فَهُوَ مَسْجِدٌ)). [بخاري/ الانبياء/ ٣١٨٦].

(ابوذر)(ﷺ) دەڵێ: وتم: ئـەی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) کـام مزگـەوت یەکـەم مزگەوتـە لەسـەرزەویدا؟ فـەرمووی: ((مزگـەوتی حـەرام)) وتم : پاشـان کـام؟ فەرمووی: ((مزگەوتی ئەقسا)) وتم: ماوەی نێوانیان چەندە؟ فەرمووی: ((چل ساڵ، لەهەر شوێنێکیش کاتی نوێژ هات نوێژ بکە، ئەوە مزگەوتە)).

## (٤١) دروستکردنی مزگەوتی پێغەمبەر(ﷺ)

٢٣٤ـ عن أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَدِمَ الْمَدِينَةَ، فَنَزَلَ فِي عُلْوِ الْمَدِينَةِ فِي حَيٍّ يُقَالُ لَهُمْ: بَنُو عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ، فَأَقَامَ فِيهِمْ أَرْبَعَ عَشْرَةَ لَيْلَةً، ثُمَّ إِنَّهُ أَرْسَلَ إِلَى مَلَإِ بَنِي النَّجَّارِ، فَجَاءُوا مُتَقَلِّدِينَ بِسُيُوفِهِمْ، قَالَ: فَكَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) عَلَى رَاحِلَتِهِ وَأَبُو بَكْرٍ رِدْفُهُ، وَمَلَأُ بَنِي النَّجَّارِ حَوْلَهُ حَتَّى أَلْقَى بِفِنَاءِ أَبِي أَيُّوبَ، قَالَ: فَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يُصَلِّي حَيْثُ أَدْرَكَتْهُ الصَّلَاةُ، وَيُصَلِّي فِي مَرَابِضِ الْغَنَمِ، ثُمَّ إِنَّهُ أَمَرَ بِالْمَسْجِدِ، قَالَ فَأَرْسَلَ إِلَى مَلَإِ بَنِي النَّجَّارِ فَجَاءُوا فَقَالَ: ((يَا بَنِي النَّجَّارِ ثَامِنُونِي بِحَائِطِكُمْ هَذَا)). قَالُوا: لَا وَاللَّهِ لَا نَطْلُبُ ثَمَنَهُ إِلَّا إِلَى اللَّهِ (ﷻ). قَالَ أَنَسٌ: فَكَانَ فِيهِ مَا أَقُولُ: كَانَ فِيهِ نَخْلٌ، وَقُبُورُ الْمُشْرِكِينَ وَخِرَبٌ، فَأَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بِالنَّخْلِ فَقُطِعَ، وَبِقُبُورِ الْمُشْرِكِينَ فَنُبِشَتْ، وَبِالْخِرَبِ فَسُوِّيَتْ، قَالَ: فَصَفُّوا النَّخْلَ قِبْلَةً، وَجَعَلُوا عِضَادَتَيْهِ حِجَارَةً، قَالَ: فَكَانُوا يَرْتَجِزُونَ وَرَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) مَعَهُمْ، وَهُمْ يَقُولُونَ:

اللَّهُمَّ لَا خَيْرَ إِلَّا خَيْرُ الْآخِرَهْ

فَانْصُرِ الْأَنْصَارَ والمهاجرة [بخاري/ المساجد/ ٤١٨]

(انس) کوری(مالك) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) هات بۆ مەدینە لەسەرووی مەدینە دابەزی لەناوتیرەیەکدا پێیان دەوتن: نەوەی(عمرو کوری عوف) چواردەشەو لەناویاندا مایەوە، پاشان ناردی بەدوای پیاو ماقوڵانی (بنی النجار) دا، ئەوانیش هاتن شمشێرەکانیان لەملیاندا بوو، راوی دەڵێ: هەر دەڵێی ئێستا چاوم لەپێغەمبەری خوایە(ﷺ) بەسەروشترەکەیەوە (ابوبکر)وا لەپاشکۆی و پیاوماقوڵانی (بنی النجار) دەورەیان داوە هەتا گەیشتە بەردەم ماڵی (ابو ایوب) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەهەر شوێنێك کاتی نوێژ بهاتایە نوێژی دەکرد، لەمۆڵگای عەریش نوێژی کرد، پاشان فەرمانی کرد

بەدروستکردنی مزگـەوت، دەڵـێ: نـاردی بـەدوای پیاوماقوڵانی (بنـی النجـار) ئـەوانیش هـاتن‌و پێـی فـەرموون: ئـەی (بنـی النجـار) مامەڵـەی ئـەم باخـە خورمایەتانم لەگەڵ بکـەن))، وتیـان : نەبەخوا نرخمـان نـاوێ تەنـها لـەخوای (عزوجل) نـەبێ ( انس ) دەڵـێ: باخەکـە ئەمانـەی تێدابـوو دارخورمـاو گـۆڕی موشـریکەکان‌و چـەند کەلاوەیـەکیش ، پێغەمبـەر(ﷺ) فـەرمانیکرد بـەبڕینی دارخورماکان‌و، هەڵتەکاندنی گۆڕی موشریکەکانو کەلاوەکانیش تـەخت کـران، دەڵێ: دارخورماکانیان لەلای قیبلەوە ریزکرد، دوولاکەیشی بەبەرد دانرا، دەڵـێ : ئـەوان سـروودیان دەخوێنـدەوە، پێغەمبـەری خـواش (ﷺ) لەگـەڵیانا هـەموو دەیانوت : اللهم لا خير الا خير الاخرة فانصر الانصار والمهاجرة

## ( ٤٢ ) لەبارەی ئەو مزگەوتەوە کەلەسەر تەقوا دامەزراوە

٢٣٥ـ عن أَبِي سَلَمَةَ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ قَالَ: مَرَّ بِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (ﷺ)، قَالَ: قُلْتُ لَهُ: كَيْفَ سَمِعْتَ أَبَاكَ يَذْكُرُ فِي الْمَسْجِدِ الَّذِي أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَى؟ قَالَ: قَالَ أَبِي: دَخَلْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فِي بَيْتِ بَعْضِ نِسَائِهِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَيُّ الْمَسْجِدَيْنِ الَّذِي أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَى؟ قَالَ: فَأَخَذَ كَفًّا مِنْ حَصْبَاءَ فَضَرَبَ بِهِ الْأَرْضَ ثُمَّ قَالَ: ((هُوَ مَسْجِدُكُمْ هَذَا)) لِمَسْجِدِ الْمَدِينَةِ. قَالَ: فَقُلْتُ: أَشْهَدُ أَنِّي سَمِعْتُ أَبَاكَ هَكَذَا يَذْكُرُهُ.

(ابـو مسـلم) کـوری (عبدالرحمـن) دەڵـێ: عبدالرحمـن کـوری (ابـو سـعيد الخدري) (ﷺ) تێپـەڕی بەلاماندا ، دەڵـێ: پێـم وت:چۆنت بیسـتووە لـە ابوبکـر باسـی ئـەو مزگەوتـە بکـات لەسـەر تـەقوا دامـەزراوە؟ وتـی: بـاوکم وتـی: چوومـە خزمـەت پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) لـەماڵی یـەکێ لەخێزانـەکانی ، وتم: ئـەی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) کـام لـەو دوو مزگەوتـە لەسـەر تـەقوا دامـەزراوە؟ دەڵـێ: چنگێ چەوی هەڵگرت‌و کێشای بەزەویدا ئینجا فەرمووی: ((ئا ئەم مزگەوتـەی ئێوەیە ) مزگەوتی مەدینە دەڵێ: وتم: شایەتی دەدەم من لەباوکم بیستووە ئاوا باسی دەکرد.

## ( ٤٣ ) خێری نوێژ لەمزگەوتی مەدینەو مەککە

٢٣٦ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ): إِنَّ امْرَأَةً اشْتَكَتْ شَكْوَى، فَقَالَتْ: إِنْ شَفَانِي اللَّهُ لَأَخْرُجَنَّ فَلَأُصَلِّيَنَّ فِي بَيْتِ الْمَقْدِسِ، فَبَرَأَتْ، ثُمَّ تَجَهَّزَتْ تُرِيدُ الْخُرُوجَ، فَجَاءَتْ مَيْمُونَةَ زَوْجَ النَّبِيِّ (ﷺ) تُسَلِّمُ عَلَيْهَا، فَأَخْبَرَتْهَا ذَلِكَ، فَقَالَتْ: اجْلِسِي فَكُلِي مَا

صَنَعْت، وَصَلِّي فِي مَسْجِدِ الرَّسُولِ (ﷺ)، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) يَقُولُ: ((صَلَاةٌ فِيهِ أَفْضَلُ مِنْ أَلْفِ صَلَاةٍ فِيمَا سِوَاهُ مِنَ الْمَسَاجِد، إِلَّا مَسْجِد الْكَعْبَة)).

(ابن عباس) (ﷺ) دەڵێ: ئافرەتێك سكالأیەكی كرد، وتی: ئەگەر خواچاكی كردمەوە دەچم لە( بیت المقدس) نوێژ دەكەم، چاك بوویەوە، ئینجا خۆی ئامادەكرد دەیویست بڕوات، كەچی مەیمونەی هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ لای بۆ هەواڵ پرسینی ، ئەویش لەوە ئاگاداری كرد ، [مەیمونە] وتی: دانیشە چیت دروست كردووە بیخۆ، لەمزگەوتی پێغەمبەریش (ﷺ) نوێژ بكە ، من لەپێغەمبەری خوام(ﷺ) بیستووە دەیفەرموو: ( نوێژ تیایدا چاكترە لەهەزار نوێژ لەمزگەوتەكانی تردا، جگە لەمزگەوتی كەعبە)).

## (٤٤) هاتن بۆ مزگەوتی (قباء)و نوێژكردن تێیدا

٢٣٧. عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) يَأْتِي مَسْجِدَ قُبَاءٍ رَاكِبًا وَمَاشِيًا، فَيُصَلِّي فِيهِ رَكْعَتَيْنِ. [بخاري/ التطوع/ اتيان مسجد قباء / ١١٣٦]

(ابن عمر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەسواری و یان بەپێ دەهات بۆ مزگەوتی (قوباء)دووركات نوێژی تێدادەكرد.

## (٤٥) خێری ئەوەی مزگەوتێك بۆ خوا دروست بكات

٢٣٨ـ عَنْ مَحْمُود بْنِ لَبِيدٍ (ﷺ): أَنَّ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ (ﷺ) أَرَادَ بِنَاءَ الْمَسْجِدِ، فَكَرِهَ النَّاسُ ذَلِكَ، فَأَحَبُّوا أَنْ يَدَعَهُ عَلَى هَيْئَتِهِ، فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) يَقُولُ: ((مَنْ بَنَى مَسْجِدًا لِلَّهِ بَنَى اللَّهُ لَهُ فِي الْجَنَّة مِثْلَهُ)). [بخاري/ / المساجد / من بنى مسجداً/ ٤٣٩]

(محمود) كوری (لبید) (ﷺ) دەڵێ: (عثمان)كوڕی( عفان) (ﷺ) ویستی مزگەوت دروست بكاتەوە، خەڵك ئەوەیان پێناخۆش بوو، حەزیان دەكرد، وەكو خۆی بمێنێتەوە بۆیە وتی: لەپێغەمبەری خوام(ﷺ) بیستووە دەیفەرموو: ((هەركەس مزگەوتێك بۆ خوا دروست بكات خوا لە بەهەشتا بەوێنەی ئەوەی بۆ دروست دەكات)).

## (٤٦) خێری مزگەوتەكان

٢٣٩ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((أَحَبُّ الْبِلَادِ إِلَى اللَّهِ مَسَاجِدُهَا، وَأَبْغَضُ الْبِلَادِ إِلَى اللَّهِ أَسْوَاقُهَا)).

(ابوهریـره) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) فـەرمووی: ((خۆشەویسـترین ولآت لـەلای خـوا مزگەوتەکانیـەتی، ناشـیرین تریـن ولآتیـش لـەلای خـوا بازارەکانیەتی)).

## (٤٧) خێری زۆری هەنگاوەکان بۆ مزگەوتەکان

٢٤٠ـ عَنْ أُبَيِّ بْن كعْبٍ (ﷺ) قال: كانَ رجُلٌ منَ الْأنْصَار بَيْتُهُ أقْصَى بَيْتٍ في الْمَدينَة، فَكانَ لَا تُخْطئُهُ الصَّلَاةُ مَعَ رَسُول اللَّه (ﷺ)، قَال: فتوَجَّعْنَا لَهُ، فقُلْتُ: لَهُ يَا فُلَانُ لوْ أنَّكَ اشْتَرَيْتَ حمَارًا يَقيك منَ الرَّمْضَاء، وَيَقيكَ منْ هَوَامِّ الْأرْضِ. قَال: أمَ وَاللَّه ما أُحبُّ أنَّ بَيْتِي مُطنَّبٌ ببَيْت مُحمَّدٍ (ﷺ)، قَـال: فَحَمَلْتُ بِه حمْلًا حَتَّى أتيْتُ نَبيَّ اللَّه (ﷺ) فَأخْبَرْتُهُ، قَال: فَدَعَاهُ فقَالَ لَهُ مثْلَ ذَلكَ، وَذَكَرَ لَهُ أنَّهُ يَرْجُو في أثَرِه الْأَجْرَ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ (ﷺ): ((إنَّ لَكَ مَا احْتَسَبْتَ)).

(ابـی) کـوری (کعـب) (ﷺ) دەڵـێ: پیـاوێك لـە(انصـار)یـەکان ماڵەکـەی دوورتریـن مـاڵی مەدینەبوو، هیـچ نوێژێکـی نـەدەبوارد لەخزمـەت پێغەمبـەری خوادا(ﷺ) دەڵێ: دڵـم سـووتا بـۆی، وتم: ئـەی فـلآن ئەگـەر کـەرێکت بکڕیایـە بتپـارێزێت لـە گـەرمای هـاوینو بتپـارێزێت لـە مـارو مـێرووی زەوی ، دەڵـێ: سوێند بەخوا حەزناکەم ماڵەکەم لەپاڵ ماڵی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) بێت، دەڵێ: ئەوەم لەدڵما هەڵگرت هەتا هاتمە خزمەت، پێغەمبەری خوا پێم راگەیاند، دەڵێ: بـانگی کـردو ئـەوەی پـێ فەرموو ئـەو دەیـەوێ بـەهۆی ئـەوەوە خـێری دەسـت بکەوێت ، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو:چیت داوا کردووە خوا دەتداتێ.

## (٤٨) رۆیشتن بۆ نوێژەکان گوناه دەسڕێتەوەو پلە بەرزدەکاتەوە

٢٤١ـ عَنْ أبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): ((مَنْ تَطَهَّرَ فِي بَيْتِه ثُمَّ مَشَى إِلَى بَيْتٍ مِنْ بُيُوت اللَّه، لِيَقْضِيَ فَرِيضَةً مِنْ فَرَائِض اللَّـه، كَانَتْ خَطْوَتَـاهُ إِحْدَاهُمَا تَحُطُّ خَطِيئَةً، وَالْأُخْرَى تَرْفَعُ دَرَجَةً)).

(ابوهریـره) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) فەرموویـەتی: ((هەرکـەس لەماڵی خۆیان دەستنوێژ بگرێتو پاشان بڕوات بۆ ماڵێك لەماڵـەکانی خـوا، بـۆ ئەوەی فەرزێك لەفەرزەکان خوا ئەنجام بدات، هەنگاوەکانی یەکێکیان گوناهێك لادەبات، ئەوەیتریان پلەیەك بەرزی دەکاتەوە)).

## (٤٩) بەئارامی هاتن بۆ نوێژو پەلەنەکردن

٢٤٢ـ عن أَبِي قَتَادَةَ (ﷺ) قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ نُصَلِّي مَعَ رَسُولِ اللَّه (ﷺ) فَسَمِعَ جَلَبَةً، فَقَالَ: ((مَا شَأْنُكُمْ)). قَالُوا: اسْتَعْجَلْنَا إِلَى الصَّلَاةِ، قَالَ: ((فَلَا تَفْعَلُوا، إِذَا أَتَيْتُمُ الصَّلَاةَ فَعَلَيْكُمُ السَّكِينَةُ، فَمَا أَدْرَكْتُمْ فَصَلُّوا، وَمَا سَبَقَكُمْ فَأَتِمُّوا)). [بخاري/ الاذان / قول الرجل فاتتنا الصلاة / ٦٠٩]

(ابـو قتـاده) (ﷺ) دەڵـێ: لـەکاتێکدا ئێمـە لەخزمـەت پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) نوێژمـان دەکرد گوێـی لـە دەنگی پەلەپەلیـەك بـوو، فـەرمووی: ئـەوە چیتانـە . وتیان: پەلەمان کرد بۆ نوێژ، فەرمووی: (( دەوا مەکەن، ئەگـەر هـاتن بـۆ نوێـژ دەبـێ ئارامو لەسـەر خۆبن، بەچـەندیا گەیشـتن بیکـەن، ئـەوەش لەپێشـتانەوە کراوە تەواوی بکەن)).

## (٥٠) دەرچوونی ئافرەتـان بۆ مزگەوتەکـان

٢٤٣ـعَنْ زَيْنَـبَ الثَّقَفِيَّةِ (ﷺ) قَالَتْ: قَالَ لَنَـا رَسُولُ اللَّـهِ (ﷺ): ((إِذَا شَـهِدَتْ إِحْدَاكُنَّ الْمَسْجِدَ فَلَا تَمَسَّ طِيبًا)).

(زینب الثقفیة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خـوا (ﷺ) پێـی فەرمووین: (( ئەگـەر ئافرەتێکتان ویستی ئامادەی مزگەوت ببێت با بۆن نەدات لەخۆی)).

## (٥١) ڕێگری لەدەرچوونی ئافرەتـان

٢٤٤ـعَنْ عَمْرَةَ ﴿بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ﴾: أَنَّهَا سَمِعَتْ عَائِشَةَ (ﷺ) زَوْجَ النَّبِيِّ (ﷺ) تَقُولُ: لَوْ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) رَأَى مَا أَحْدَثَ النِّسَاءُ لَمَنَعَهُنَّ الْمَسْجِدَ كَمَا مُنِعَتْ نِسَاءُ بَنِي إِسْرَائِيلَ. قَالَ: فَقُلْتُ لِعَمْرَةَ: أَنِسَاءُ بَنِي إِسْـرَائِيلَ مُنِعْنَ الْمَسْـجِدَ؟ قَالَتْ: نَعَمْ. [بخاري/ صفة الصلاة/ انتظار الناس قيام الامام العالم /٨٣١]

(عمـرة بنـت عبدالرحمـن) دەڵـێ: لەعائشـەی هاوسـەری پێغەمبـەری (ﷺ) بیستووە دەیوت: ئەگەر پێغەمبەری خوا(ﷺ) بیدیایە ئافرەتان چییان داهێناوە* [ کەدێن بۆ مزگـەوت] ڕێگـری دەکـران هـەروەکو ڕێگـری لـەئافرەتانی نـەوەی ئیسـرائیل کـرا، راوی دەڵـێ:بەعـەمرەم وت:ئایـا ئافرەتـانی نـەوەی ئیسـرائیل ڕێگری مزگەوتیان لێکرا؟ وتی: بەڵێ.

* واتە خۆرازاندنەوەو دەرخستنی جوانیان و بۆن لەخۆدان.

## (٥٢) لەکاتی چوونە مزگەوتـا چی دەوترێت

٢٤٥ـ عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ -أَوْ عَنْ أَبِي أُسَيْدٍ- (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ الْمَسْجِدَ فَلْيَقُلِ: اللَّهُمَّ افْتَحْ لِي أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ. وَإِذَا خَرَجَ فَلْيَقُلِ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ)).

لە(ابو حمید) ەوە یا لە (ابی سعید)ەوە (ﷺ) پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ((ئەگەر یەکێکتان چووە ناو مزگەوت بابڵێ: ( اللهم افتح لي ابـواب رحمتـك ) واتە: خوایە دەرگاکانی رەحمەتی خۆتمان بۆ بکەرەوە، کاتێ چووە دەرەوەش با بڵێ: ( اللهم اني اسالك من فضلك) خوایە گیان من داوای خێرو چاکەت لێدەکەم.

## (٥٣) هەر کات چووە مزگەوت بادوو رکات نوێژ بکات

٢٤٦ـ عَنْ أَبِي قَتَادَةَ (ﷺ) قَالَ: دَخَلْتُ الْمَسْجِدَ وَرَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) جَالِسٌ بَيْنَ ظَهْرَانَيِ النَّاسِ، قَالَ: فَجَلَسْتُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((مَا مَنَعَكَ أَنْ تَرْكَعَ رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ تَجْلِسَ)). قَالَ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، رَأَيْتُكَ جَالِسًا وَالنَّاسُ جُلُوسٌ. قَالَ: ((فَإِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ الْمَسْجِدَ فَلَا يَجْلِسْ حَتَّى يَرْكَعَ رَكْعَتَيْنِ)). [بخاري/ المساجد / اذا اتصل المسجد فليركع ركعتين /٤٣٣]

(ابـو قتـادە) (ﷺ) دەڵـێ: چـووە مزگـەوت و پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) لـەناو خەڵکەکەدا دانیشتبوو دەڵێ: منیش دانیشتم، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ((چـی رێـی لێگرتـی دوو رکات نوێـژ بکەیت پێش ئەوەی دابنیشێت))، دەڵـێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا دیم بەرێزتان دانیشتووەو، خەڵکەکەش دانیشتووە، فەرمووی: ئەگەر یەکێکتان هاتە مزگەوتەوە، بادانەنیشێ هەتا دوو رکات نوێـژ دەکات)).

## (٥٤) نەهی کراوە لەدەرچوون لەمزگەوت لەدوای بانگدان

٢٤٧ـ عَنْ أَبِي الشَّعْثَاءِ قَالَ: كُنَّا قُعُودًا فِي الْمَسْجِدِ مَعَ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ)، فَأَذَّنَ الْمُؤَذِّنُ فَقَامَ رَجُلٌ مِنَ الْمَسْجِدِ يَمْشِي، فَأَتْبَعَهُ أَبُو هُرَيْرَةَ بَصَرَهُ حَتَّى خَرَجَ مِنَ الْمَسْجِدِ، فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: أَمَّا هَذَا فَقَدْ عَصَى أَبَا الْقَاسِمِ (ﷺ).

(ابو الشعثاء) دەڵێ: ئێمە لەگەڵ (ابوهریرە) (ﷺ) لەمزگەوت دانیشتبووین، بانگبێژ بانگیدا پیاوێك لەمزگەوتەکە هەستا و رۆیشت ، (ابوهریرە) چاوی تێ بڕی هەتا لەمزگەوتەکە چووە دەرەوە، ئینجا (ابوهریـرە) وتـی: لەراسـتیا ئەو

پیاوە سەرپێچی کرد لە( ابو قاسم) ﴿چونکە دەبوو نوێژەکەی بکات ئینجا بڕوات﴾.

## ( ٥٥ ) کەفارەتی تف ڕۆکردن لە مزگەوت

٢٤٨ـ عَنْ أَنَسِ ابْنِ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((الْبُزَاقُ فِي الْمَسْجِدِ خَطِيئَةٌ، وَكَفَّارَتُهَا دَفْنُهَا)). [بخاري/ المساجد/ كفارة البزاق/٤٠٥]

(انس) کوری (مالك) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((تف ڕۆکردن لەمزگەوت تاوانە، کەفارەتیشی شاردنەوەیەتی))

## ( ٥٦ ) کەراهەتی خواردنی سیرو هاتن بۆ مزگەوت

٢٤٩ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ فِي غَزْوَةِ خَيْبَرَ: ((مَنْ أَكَلَ مِنْ هَذِهِ الشَّجَرَةِ -يَعْنِي الثُّومَ- فَلَا يَأْتِيَنَّ الْمَسَاجِدَ)). [بخاري/ صفة الصلاة/ ٨١٥]

(ابن عمر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەغەزای خەیبەردا فەرمووی: ((هەرکەس لەم درەختەی خوارد . واتە سیر . بانەیەتە مزگەوتەکان)).

## ( ٥٧ ) مەچنە مزگەوت لەکاتی خواردنی سیرو کەوەرو پیازدا

٢٥٠ـ عن جَابِرَ بْنَ عَبْدِالله (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((مَنْ أَكَلَ ثُومًا أَوْ بَصَلًا فَلْيَعْتَزِلْنَا، أَوْ: لِيَعْتَزِلْ مَسْجِدَنَا، وَلْيَقْعُدْ فِي بَيْتِهِ)). وَإِنَّهُ أُتِيَ بِقِدْرٍ فِيهِ خَضِرَاتٌ مِنْ بُقُولٍ، فَوَجَدَ لَهَا رِيحًا، فَسَأَلَ فَأُخْبِرَ بِمَا فِيهَا مِنَ الْبُقُولِ، فَقَالَ: ((قَرِّبُوهَا)). إِلَى بَعْضِ أَصْحَابِهِ، فَلَمَّا رَآهُ كَرِهَ أَكْلَهَا قَالَ: ((كُلْ، فَإِنِّي أُنَاجِي مَنْ لَا تُنَاجِي)). [بخاري/ صفة الصلاة/ ٨١٦]

(جابر) کوری (عبدالله) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((هەرکەس سیروپیازی خوارد با دوور بکەوێتەوە لێمان ((لەمزگەوتەکانمان))و لەماڵی خۆیدا دابنیشێت) هەروەها قابلەمەیەکیان هێنا کە پاقلەمەنی تێدابوو کە بینی بۆنی لێدێت ، پرسیاری لەبارەوە کرد، وەڵامیان دایەوە پاقلەمەنی تێدایە فەرمووی: ((نزیکی بکەنەوە)) لەهەندێ لەهاوەڵانیی، کاتێ چاوی پێی کەوت حەزی نەکرد بیخوات ، فەرمووی: ((بخۆ، من موناجات دەکەم لەگەڵ ئەوەی موناجات ناکات)).

## ( ٥٨ ) دەرکردنی ئەوەی بۆنی پیازو سیری لێ بێت لەمزگەوت

٢٥١ـعَنْ مَعْدَانَ ابْنِ أَبِي طَلْحَةَ: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ (ﷺ) خَطَبَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فَذَكَرَ نَبِيَّ اللَّهِ (ﷺ)، وَذَكَرَ أَبَا بَكْرٍ (ﷺ)، قَالَ: إِنِّي رَأَيْتُ كَأَنَّ دِيكًا نَقَرَنِي ثَلَاثَ

نَقَرَاتٍ، وَإِنِّي لَا أُرَاهُ إِلَّا حُضُورَ أَجَلِي، وَإِنَّ أَقْوَامًا يَأْمُرُونَنِي أَنْ أَسْتَخْلِفَ، وَإِنَّ اللَّهَ لَمْ يَكُنْ لِيُضَيِّعَ دِينَهُ وَلَا خِلَافَتَهُ، وَلَا الَّذِي بَعَثَ بِهِ نَبِيَّهُ (ﷺ)، فَإِنْ عَجِلَ بِي أَمْرٌ فَالْخِلَافَةُ شُورَى بَيْنَ هَؤُلَاءِ السِّتَّةِ الَّذِينَ تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وَهُوَ عَنْهُمْ رَاضٍ، وَإِنِّي قَدْ عَلِمْتُ أَنَّ أَقْوَامًا يَطْعَنُونَ فِي هَذَا الْأَمْرِ، أَنَا ضَرَبْتُهُمْ بِيَدِي هَذِهِ عَلَى الْإِسْلَامِ، فَإِنْ فَعَلُوا ذَلِكَ فَأُولَئِكَ أَعْدَاءُ اللَّهِ الْكَفَرَةُ الضُّلَّالُ، ثُمَّ إِنِّي لَا أَدَعُ بَعْدِي شَيْئًا أَهَمَّ عِنْدِي مِنَ الْكَلَالَةِ، مَا رَاجَعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) فِي شَيْءٍ مَا رَاجَعْتُهُ فِي الْكَلَالَةِ، وَمَا أَغْلَظَ لِي فِي، شَيْءٍ مَا أَغْلَظَ لِي فِيهِ حَتَّى طَعَنَ بِإِصْبَعِهِ فِي صَدْرِي، فَقَالَ: ((يَا عُمَرُ أَلَا تَكْفِيكَ آيَةُ الصَّيْفِ الَّتِي فِي آخِرِ سُورَةِ النِّسَاءِ)). وَإِنِّي إِنْ أَعِشْ أَقْضِ فِيهَا بِقَضِيَّةٍ يَقْضِي بِهَا مَنْ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ، وَمَنْ لَا يَقْرَأُ الْقُرْآنَ، ثُمَّ قَالَ: اللَّهُمَّ إِنِّي أُشْهِدُكَ عَلَى أُمَرَاءِ الْأَمْصَارِ، وَإِنِّي إِنَّمَا بَعَثْتُهُمْ عَلَيْهِمْ لِيَعْدِلُوا عَلَيْهِمْ، وَلِيُعَلِّمُوا النَّاسَ دِينَهُمْ وَسُنَّةَ نَبِيِّهِمْ (ﷺ)، وَيَقْسِمُوا فِيهِمْ فَيْئَهُمْ، وَيَرْفَعُوا إِلَيَّ مَا أَشْكَلَ عَلَيْهِمْ مِنْ أَمْرِهِمْ، ثُمَّ إِنَّكُمْ أَيُّهَا النَّاسُ تَأْكُلُونَ شَجَرَتَيْنِ، لَا أَرَاهُمَا إِلَّا خَبِيثَتَيْنِ، هَذَا الْبَصَلَ وَالثُّومَ، لَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) إِذَا وَجَدَ رِيحَهُمَا مِنَ الرَّجُلِ فِي الْمَسْجِدِ أَمَرَ بِهِ فَأُخْرِجَ إِلَى الْبَقِيعِ، فَمَنْ أَكَلَهُمَا فَلْيُمِتْهُمَا طَبْخًا.

(معدان) كوری(طلحة) دەڵێ: (عمر) كوری(خطاب) رۆژێكی جومعە وتاری دەخوێندەوە یادی پێغەمبەری خوای(ﷺ) كردەوەو، یادی (ابوبكر)ی (ﷺ) كردو ئینجا وتی: من لەخەودا بینیم كەڵەشێرێك سێ دەندوكی لێدام ، من خەوەكە وادەبینم كەنزیك بوونەوەی كۆتایی ژیانمە، خەڵكانێكیش فەرمانم پێدەكەن كە جێگەدارێك دابنێم، لەراستیدا خوای گەورەش ئایینەكەی و خەلافەتەكەی زایە ناكات، ئینجا ئەگەر مردن پەلەی لێكردم خەلافەت راوێژە لەنێوان ئەو شەش كەسەی كە پێغەمبەری خوا(ﷺ) كۆچی دوایی كردو لەوان رازی بوو، من ئەوەش دەزانم كە خەڵكانێك تانە دەدەن لەم ئاینە ﴿ئەوانەی﴾بەم دەستەم لەسەر ئیسلام لێمداون، جا ئەگەر ئەو كارەیان كرد ئەوانەدوژمنانی خواو كافرو رێ لێون بوون، پاشان من شتێك لەدوای خۆم بەجێ ناهێڵم كە گرنگتربێت لەلام لەچۆنێتی دابەشكردنی میرات بۆ كەسوكاری وەكو براو مامە، لەهیچ شتێكدا ئەوەندەی ئەم باسە پرس و رام نەكردووە بەپێغەمبەری خوا(ﷺ) لەهیچ شتێكیشا ئەوەندەی ئەو باسە گیر نەبووە لەگەڵما، هەتا بەدوو پەنجەی كێشاویەتی بەسنگماو فەرموویەتی: ((ئەی عمر

ئایا ئایەتەکەی هاوینی کۆتایی سوورەتی (نساء)ت بەس نییە)) ئەگەر من ژیام بەشێوەیەك حوکمـی تێدادەکـەم کـە ئـەوەی قورئـانی خوێندبـیٚو ئـەوەش کـە نەیخوێندبیٚ بەوشێوەیە بکات، ئینجا فەرمووی: خوایە گیـان مـن تـۆ دەکـەم بـە شایەت بەسەر فەرمانداران ناوچەکاندا، من ئەوانەم بۆیە ناردووە کە دادگەربن لەگـەڵیانداو خـەڵکی فـێری ئـایین و سـوننەتی پێغەمبەرەکـەیان(ﷺ) بکـەن، دەستکەوتەکانیان بەسەردا دابەش بکەن. هەرچیش لێیـان بـوو بەکێشـە بـەرزی بکەنەوەبۆلام ، هەروەها ئێوە ئەی خەڵکینە دوو درەخـت دەخـۆن، بـەپیس دێنـە پێش چاوم، ئـەوەش پیـازو سیرە پێغەمبـەری خـوام(ﷺ) دیـووە ئەگـەر بۆنیـان لــەپیاوێك بهاتایــە فــەرمانی دەکـــرد لەمزگـــەوتا دەیـــانکردە دەرەوە بۆیـــە هەرکەسێکتان دەیخوات با بەکوڵاندن بیانمرێنێت.

## ( ٥٩ ) ڕێگریی کراوە لە بانگەوازکردن بۆ ونبوو لەمزگەوتا

٢٥٢ـ عن أَبي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قال: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): ((مَنْ سَمِعَ رَجُلًا يَنْشُدُ ضَالَّةً فِي الْمَسْجِدِ فَلْيَقُلْ: لَا رَدَّهَا اللَّهُ عَلَيْكَ، فَإِنَّ الْمَسَاجِدَ لَمْ تُبْنَ لِهَذَا)).

(ابوهریرە) (ﷺ) دەڵیٚ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((ئەوەی گوێی لیٚ بوو کە پیاوێك لەمزگـەوتا بانگەواز بۆ شـتی ونبـووی دەکـات، بابڵیٚ خـوا بـۆت نەگێڕێتەوە ، چونکە مزگەوتەکان بۆ ئەوە دروست نەکراون)).

## ( ٦٠ ) ڕێگریکردن لەکردنی گۆڕ بە مزگەوت

٢٥٣ـ عن عَائِشَةَ وَعَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ (ﷺ) قَالَا: لَمَّا نُزِلَ بِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) طَفِقَ يَطْرَحُ خَمِيصَةً لَهُ عَلَى وَجْهِهِ، فَإِذَا اغْتَمَّ كَشَفَهَا عَنْ وَجْهِهِ، فَقَـالَ وَهُـوَ كَذَلِكَ: ((لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الْيَهُودِ وَالنَّصَارَى، اتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِدَ)). يُحَذِّرُ مِثْلَ مَا صَنَعُوا. [بخاري/ المساجد/ الصلاة في البيعة /٤٢٥]

(عائشە) (ﷺ) و عەبدوڵڵای کوری عبـاس(ر.ض)دەڵێـن کـاتیٚ پێغەمبـەر(ﷺ) لەسـەرەمەرگدابوو، سـەرچەفەکەی دەدا بـەدەموچاویدا، کـاتیٚ دڵتـەنگ دەبـوو لایدەبرد لەسـەر دەموچاوی، لەوحاڵـەدا فـەرمووی: ((نـەفرینی خـوا لەجولەکـەو لەگاور کە گۆڕی پێغەمبەرەکانیان کردووە بە مزگەوت)).

## ( ٦١ ) ڕێگریی لەدروستکردنی مزگەوت لەسەر گۆڕەکان

٢٥٤ـ عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ أُمَّ حَبِيبَةَ وَأُمَّ سَلَمَةَ -(ﷺ)- ذَكَرَتَـا كَنِيسَـةً رَأَيْنَـهَا بِالْحَبَشَةِ -فِيهَا تَصَاوِيرُ- لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((إِنَّ أُولَئِكِ إِذَا

كَانَ فِيهِمُ الرَّجُلُ الصَّالِحُ فَمَاتَ بَنَوْا عَلَى قَبْرِهِ مَسْجِدًا، وَصَوَّرُوا، فِيهِ تِلْكِ الصُّوَرَ أُولَئِكِ شِرَارُ الْخَلْقِ عِنْدَ اللَّهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)). [بخاري/ المساجد/ هل تنبش قبور مشركي الجاهلية /٤١٧]

(عائشه)(ر.ض)دەڵـێ: (ام حبیبـه)و (ام سـلمه) (ر.ض)باسـی كڵێسـايەكيان دەكـرد كـه لەحەبەشــه ديويانــه . وێنــەی . پێغەمبــەرێكی خــوای(ﷺ) تێدابـووه، پێغەمبـەر(ﷺ) فـەرمووی: ((ئەوانـه ئەگـەر پياوچاكێكيان تێـدا بوايـەو بمردايـه مزگـەوتيان لەسـەر گۆڕەكـەی دروسـت دەكـرد، ئـەو وێنانەشـيان تێـدا دروسـت دەكرد، ئەوانه لەرۆژی قيامەتدا خراپترين كەسن لای خوا)).

## ( ٦٢ ) هەموو زەويم بۆكراوە بەمزگەوت پاكۆكەريشە

٢٥٥ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((فُضِّلْتُ عَلَى الْأَنْبِيَاءِ بِستٍّ: أُعْطِيتُ جَوَامِعَ الْكَلِمِ وَنُصِرْتُ بِالرُّعْبِ، وَأُحِلَّتْ لِيَ الْغَنَائِمُ، وَجُعِلَتْ لِيَ الْأَرْضُ طَهُورًا وَمَسْجِدًا، وَأُرْسِلْتُ إِلَى الْخَلْقِ كَافَّةً، وَخُتِمَ بِيَ النَّبِيُّونَ)). [بخاري/ نصرت بالرعب مسيرة شهر/ ٢٨١٥]

(ابوهريـره)(ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خوا(ﷺ) فەرموويـەتی: ((بەشـەش شـت رێزم دراوە بەسـەر پێغەمبەرندا: وشـەی پڕمانـام پێدراوە، بەترس خسـتنه دڵـی دوژمنـانم پشـتگيريم لێكـراوە، دەسـتكەوتی جـەنگم بـۆ حـەڵاڵكراوە، كـراوە بـه پاكۆكەر [واته: لەجێی ئاو تيەمومی پێ دەكرێت] كراوە به سـوجدەگايش بـۆم، بۆ هەموو دروستكراوەكان رەوانەكراوم، كۆتايی پێغەمبەران بەمن هاتووە)).

## ( ٦٣ ) نزيكی لەبەربەستەوە

٢٥٦ـ عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ (ﷺ) قَالَ: كَانَ بَيْنَ مُصَلَّى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) وَبَيْنَ الْجِدَارِ مَمَرُّ الشَّاةِ. [بخاري/ سترة المصلي/٤٧٤]

(سـهلی) كـوری( سـعدی السـاعدی) (ﷺ) دەڵـێ: لـەنێوان جـێ نوێژەكـەی پێغەمبەری خواو(ﷺ) ديوارەكەدا بزنه رێيەك هەبوو.

## ( ٦٤ ) فەرمان كردن بەرووكردنه قيبله

٢٥٧ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَجُلًا دَخَلَ الْمَسْجِدَ فَصَلَّى، وَرَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فِي نَاحِيَةٍ... وَفِيهِ: ((إِذَا قُمْتَ إِلَى الصَّلَاةِ فَأَسْبِغِ الْوُضُوءَ، ثُمَّ اسْتَقْبِلِ الْقِبْلَةَ فَكَبِّرْ)). ﴿انظر الحديث: ٢٨٢﴾. [بخاري/ الاستئذان / ٥٨٩٧]

(ابوهریره) (ﷺ) دەڵێ: پیاوێك هاتە مزگەوتو نوێژی کرد، پێغەمبەر(ﷺ) لەسوچێکدا بوو، لەم فەرموودەدا هاتووە ((ئەگەر هەستای بۆ نوێژکردن، بەباشی دەستنوێژ بگرە، ئینجا رووبکەرە قیبلە ، ئینجا ( الله اكبر)ی نوێژ دابەستن بکە)).

## ( ٦٥ ) گۆڕینی قیبلە لەشامەوە بۆ مەککە

٢٥٨ـ عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ (ﷺ) قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) إِلَى بَيْتِ الْمَقْدِسِ سِتَّةَ عَشَرَ شَهْرًا، حَتَّى نَزَلَتِ الْآيَةُ الَّتِي فِي الْبَقَرَةِ ﴿١٤٤﴾﴿وَحَيْثُمَا كُنْتُمْ فَوَلُّوا وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُ﴾ فَنَزَلَتْ بَعْدَمَا صَلَّى النَّبِيُّ (ﷺ)، فَانْطَلَقَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ فَمَرَّ بِنَاسٍ مِنَ الْأَنْصَارِ وَهُمْ يُصَلُّونَ، فَحَدَّثَهُمْ بالحديث، فَوَلَّوْا وُجُوهَهُمْ قِبَلَ الْبَيْتِ. [بخاري/ التمني/ ٦٨٢٥]

(براء)کوڕی (عازب) (ﷺ) دەڵێ: لەخزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) شانزە مانگ نوێژمان رووەو (بەیتول مەقدیس)دەکرد، هەتا ئەم ئایەتەی سوورەتی(البقرة)دابەزی ﴿وحيثما كنتم فولوا وجوهكم شطره﴾کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) لەنوێژ بوویەوە ئایەتەکەی بۆ دابەزی، پیاوێك لەوان رۆیشت تێپەڕی بەلای چەند کەسێکدا لەئەنصارەکان نوێژیان دەکرد، ئەوەی بۆ گێڕانەوە ، ئەوانیش روویان وەرگێڕا بۆ لای کەعبەوە.

## ( ٦٦ ) ئەگەر قامەت کرا ئیتر هیچ نوێژێك ناکرێت جگە لەفەرز

٢٥٩ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ)، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قال: ((أَنَّهُ قَالَ إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ فَلَا صَلَاةَ إِلَّا الْمَكْتُوبَةَ)).

(ابوهریره) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی : ((ئەگەر قامەت کرا ئیتر هیچ نوێژێك نابێ بکرێت جگە لەنوێژە فەرزەکە)).

## ( ٦٧ ) ئەگەر قامەتکرا کەی خەڵکی هەڵدەستن بۆ نوێژ

٢٦٠ـ عَنْ أَبِي قَتَادَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ فَلَا تَقُومُوا حَتَّى تَرَوْنِي)). [بخاري/ الاذان/ ٦١١]

(ابوقتادە) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: ((ئەگەر قامەت کرا هەڵمەستن هەتا دەمبینن)).

## ( ٦٨ ) قامەت کردن لەکاتێکا ئیمام دێتە دەرەوە

٢٦١ـ عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ (ﷺ) قَالَ: كَانَ بِلَالٌ يُؤَذِّنُ إِذَا دَحَضَتْ، فَلَا يُقِيمُ حَتَّى يَخْرُجَ النَّبِيُّ (ﷺ) فَإِذَا خَرَجَ أَقَامَ الصَّلَاةَ حِينَ يَرَاهُ.

(جابر) کوری (سمره) (ﷺ) دەڵێ: کاتێ خۆر لەناوەڕاستی ئاسمان لایدەدا بیلال بانگی دەدا، بەلاّم قامەتی نەدەکرد هەتا پێغەمبەر(ﷺ) [لەماڵ] دەردەچوو، هەر کە پێغەمبەری (ﷺ) دەبینی قامەتی دەکرد.

## ( ٦٩ ) رۆیشتنی ئیمام بۆ خۆشۆردن لەدوای قامەت

٢٦٢ـ عن أَبِي سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ: سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ (ﷺ) يَقُولُ: أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ فَقُمْنَا، فَعَدَّلْنَا الصُّفُوفَ قَبْلَ أَنْ يَخْرُجَ إِلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)، فَأَتَى رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) حَتَّى إِذَا قَامَ فِي مُصَلَّاهُ قَبْلَ أَنْ يُكَبِّرَ، ذَكَرَ، فَانْصَرَفَ، وَقَالَ لَنَا: ((مَكَانَكُمْ)). فَلَمْ نَزَلْ قِيَامًا نَنْتَظِرُهُ حَتَّى خَرَجَ إِلَيْنَا وَقَدِ اغْتَسَلَ، يَنْطُفُ رَأْسُهُ مَاءً، فَكَبَّرَ فَصَلَّى بِنَا. [بخاري/ الغسل/ ٢٥١]

(ابو مسلم) کوری( عبدالرحمن) کوری(عوف) دەڵێ: لە (ابوهریرە)(ﷺ) م بیست دەیووت: قامەتکرا، هەستاین بۆ نوێژ ، ریزەکانمان رێك کرد، پێش ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) بێتە لامان، کاتێ تەشریفی هات چووە شوێنی نوێژکردن، بەلاّم پێشئەوەی تەکبیر بکات بیری کەوتەوە گەرایەوە ، فەرمووی: ((لەجێگای خۆتان بن) ئێمە وەستاین لەجێگای خۆمان چاوەڕێمان کرد هەتا تەشریفی هاتەوە خۆی شۆردبوو، سەری ئاوی لێدەتکا، ئینجا تەکبیری کردو نوێژی بۆکردین)).

## ( ٧٠ ) رێککردنی ریزەکان

٢٦٣ـ عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ (ﷺ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَمْسَحُ مَنَاكِبَنَا فِي الصَّلَاةِ وَيَقُولُ: ((اسْتَوُوا وَلَا تَخْتَلِفُوا فَتَخْتَلِفَ قُلُوبُكُمْ، لِيَلِيَنِي مِنْكُمْ أُولُو الْأَحْلَامِ وَالنُّهَى، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ)). قَالَ أَبُو مَسْعُودٍ: فَأَنْتُمُ الْيَوْمَ أَشَدُّ اخْتِلَافًا.

(ابو مسعود) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستی دەهێنا بەسەر شانمانداو دەیفەرموو: ((رێك بوەستن جیاجیامەبن بادڵەکانتان جیاواز نەبێت، با زاناو خاوەن ژیریەکان نزیك بن لێمەوە، ئینجا ئەوانیتر لەدوایانەوە ئینجا ئەوانیتر لەدوایانەوە)) ( ابومسعود) دەڵێ: بەلاّم ئەمڕۆ ئێوە زیاتر جیاوازن.

## (٧١) خێری ڕیزی پێشەوە

٢٦٤ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((لَوْ يَعْلَمُ النَّاسُ مَا فِي النِّدَاءِ وَالصَّفِّ الْأَوَّلِ، ثُمَّ لَمْ يَجِدُوا إِلَّا أَنْ يَسْتَهِمُوا عَلَيْهِ لَاسْتَهَمُوا، وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِي التَّهْجِيرِ لَاسْتَبَقُوا إِلَيْهِ، وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِي الْعَتَمَةِ وَالصُّبْحِ لَأَتَوْهُمَا وَلَوْ حَبْوًا)). [بخاري/ الاسهام في الاذان / ٥٩٠]

(ابوهریره) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: ((ئەگەر خەڵك بیانزانیایە بانگ‌و ڕیزی یەکەم چیان تێدایە، ئەگەر دەست نەکەوتایە بە تیروپشك نەبێ، تیروپشکیان بۆدەکرد، خۆ ئەگەر بیانزانیایە لەزوو هاتن بۆ نوێژ چ خێرێکی هەیە پێش برکێیان بۆدەکرد، ئەگەر بیانزانیایە نوێژی خەوتنان‌و نوێژی بەیانیاندا چ خێرێك هەیە، ئەگەر بەگاگۆڵکێش بوایە دەهاتن بۆی)).

٢٦٥ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((خَيْرُ صُفُوفِ الرِّجَالِ أَوَّلُهَا، وَشَرُّهَا آخِرُهَا. وَخَيْرُ صُفُوفِ النِّسَاءِ آخِرُهَا، وَشَرُّهَا أَوَّلُهَا)).

(ابوهریره) (ﷺ) دەڵێ: پێغمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((باشترین ڕیزی پیاوان ڕیزی‌یەکەمە، خراپترینیشیان دواریزە، باشترین ڕیزی ئافرەتانیش دواریزیانەو ،خراپترینیشیان یەکەم ڕیزیانە)) *.

## (٧٢) سیواك كردن لەگەڵ هەموو نوێژێکدا

٢٦٦ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ)، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((لَوْلَا أَنْ أَشُقَّ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ –وَفِي حَدِيثِ زُهَيْرٍ: عَلَى أُمَّتِي– لَأَمَرْتُهُمْ بِالسِّوَاكِ عِنْدَ كُلِّ صَلَاةٍ)). [بخاري/ الجمعة/ ٨٤٧]

(ابوهریره) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((ئەگەر لەسەر ئیمانداران لەریوایەتێکی‌تردا لەسەر ئومەتم قورس نەبوایە فەرمانم پێدەکردن کەسیواك بکەن لەگەڵ هەموو نوێژێکدا)).

---

* ( ئەگەر ئافرەت لە مزگەوت لەگەڵ پیاوان نوێژ بکەن، ئەگەر خۆیان بەتەنیا نوێژ بکەن، ئەوا ڕزیی یەم باشترە ).

## (٧٣) خێری (ذکر) لەگەڵ چوونە ناو نوێژ

٢٦٧ـ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ): أَنَّ رَجُلًا جَاءَ فَدَخَلَ الصَّفَّ وَقَدْ حَفَزَهُ النَّفَسُ، فَقَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ حَمْدًا كَثِيرًا طَيِّبًا مُبَارَكًا فِيهِ. فَلَمَّا قَضَى رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) صَلَاتَهُ قَالَ: ((أَيُّكُمُ الْمُتَكَلِّمُ بِالْكَلِمَاتِ)). فَأَرَمَّ الْقَوْمُ، فَقَالَ: ((أَيُّكُمُ الْمُتَكَلِّمُ بِهَا، فَإِنَّهُ لَمْ يَقُلْ بَأْسًا)). فَقَالَ رَجُلٌ: جِئْتُ وَقَدْ حَفَزَنِي النَّفَسُ، فَقُلْتُهَا. فَقَالَ: ((لَقَدْ رَأَيْتُ اثْنَيْ عَشَرَ مَلَكًا يَبْتَدِرُونَهَا أَيُّهُمْ يَرْفَعُهَا)).

(انس) (ﷺ) دەڵێ: پیاوێك بەهەناسە بڕکێ هاتوو چووەریزی نوێژەوە، وتی: ((الحمد لله حمدا كثيرا طيبا مباركا فيه) كاتێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەنوێژەکەی بوویەوە، فەرمووی: ((کێ بوو ئەو وتەیەی وت؟ خەڵکەکە هەموو بێدەنگ بوون، فەرمووی: ((کێتان بوو ئەو قسانەی کرد؛ خراپی نەوتووە)) پیاوێك وتی: من بووم کاتێ هاتم هەناسە بڕکێم بوو ئەوقسەیەم کرد، فەرمووی: ((چاوم لێ بوو دوانزە فریشتە پێشبڕکێیان بوو لەسەر ئەوەی کەکامیان بەرزی بکاتەوە)).

## (٧٤) دەست بەرزکردنەوە لەنوێژا

٢٦٨ـ عن ابْنَ عُمَرَ (ﷺ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِذَا قَامَ لِلصَّلَاةِ رَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى تَكُونَا حَذْوَ مَنْكِبَيْهِ ثُمَّ كَبَّرَ، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَرْكَعَ فَعَلَ مِثْلَ ذَلِكَ، وَإِذَا رَفَعَ مِنَ الرُّكُوعِ فَعَلَ مِثْلَ ذَلِكَ، وَلَا يَفْعَلُهُ حِينَ يَرْفَعُ رَأْسَهُ مِنَ السُّجُودِ. [بخاري / صفة الصلاة/ ٧٠]

(ابن عمر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) کاتێ رادەوەستا بۆ نوێژ هەردوو دەستی بەرزدەکردەوە هەتا دەگەیشتە ئاستی شانی ئینجا تەکبیری دەکرد، کاتێ دەیویست رکوع بەرێت بەهەمان شێوە هەردوودەستی بەرزدەکردەوە، کاتێ لەرکوع بەرزدەبوویەوە هەمان شتی دەکرد، بەڵام کاتێ لەسجود بەرزدەبوویەوە وای نەدەکرد.

## (٧٥) بەچی نوێژ دەست پێدەکات و بەچی کۆتایی دێت

٢٦٩ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَسْتَفْتِحُ الصَّلَاةَ بِالتَّكْبِيرِ، وَالْقِرَاءَةَ بِـ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ وَكَانَ إِذَا رَكَعَ لَمْ يُشْخِصْ رَأْسَهُ وَلَمْ يُصَوِّبْهُ وَلَكِنْ بَيْنَ ذَلِكَ، وَكَانَ إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ لَمْ يَسْجُدْ حَتَّى يَسْتَوِيَ قَائِمًا، وَكَانَ إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ السَّجْدَةِ لَمْ يَسْجُدْ حَتَّى يَسْتَوِيَ جَالِسًا، وَكَانَ يَقُولُ فِي

كُلِّ رَكْعَتَيْنِ التَّحِيَّةَ، وَكَانَ يَفْرِشُ رِجْلَهُ الْيُسْرَى وَيَنْصِبُ رِجْلَهُ الْيُمْنَى، وَكَانَ يَنْهَى عَنْ عُقْبَةِ الشَّيْطَانِ، وَيَنْهَى أَنْ يَفْتَرِشَ الرَّجُلُ ذِرَاعَيْهِ افْتِرَاشَ السَّبُعِ، وَكَانَ يَخْتِمُ الصَّلَاةَ بِالتَّسْلِيمِ.

(عائشه) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەتەكبیر نوێژی دەست پێدەكرد، خوێندنیشی بە ( الحمد لله رب العالمین) دەست پێدەكرد، هەركاتێ ركوعی دەبرد سەری نەزۆر دائەنەواندو نە زۆریش بەرزی دەكردەوە لەوبەینەدا رایدەگرت ، هەركاتێ سەری لەركوع بەرزدەكردەوە سوجدەی نەدەبرد هەتا بەتەواوی راست دەبوویەوە ، هەروەها هەركاتێ سەری لەسوجدە بەرزدەكردەوە ، سوجدەی نەدەبرد هەتا بەرێكی دادەنیشت، هەروەها لەهەموو دوو ركاتێكا تەحیاتێكی دەخوێند، قاچی چەپی لەتەحیاتا رادەخست و قاچی راستی رادەگرت رێگری دەكرد لەشێوە دانیشتنی شەیتان [لەسەرسمتی دادەنیشێ و هەردوو ئەژنۆی بەرزدەكاتەوە دەستیشی لەزەویدا دادەنێ] هەروەها رێگریی كردووە لەوەی دەستەكانی لەكاتی سوجدەدا تەخت لەسەر زەوی رادەكێشێ وەكو درندە ، ئینجا كۆتایی نوێژی بەسەلام دانەوە دەهێنا.

## ( ٧٦ ) تەكبیر لەنوێژدا

٢٧٠- عن أَبي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَال: كَانَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) إِذَا قَامَ إِلَى الصَّلَاةِ يُكَبِّرُ حِينَ يَقُومُ، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَرْكَعُ، ثُمَّ يَقُولُ: ((سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)). حِينَ يَرْفَعُ صُلْبَهُ مِنَ الرُّكُوعِ، ثُمَّ يَقُولُ وَهُوَ قَائِمٌ: ((رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ)). ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَهْوِي سَاجِدًا، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَرْفَعُ رَأْسَهُ، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَسْجُدُ، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَرْفَعُ رَأْسَهُ، ثُمَّ يَفْعَلُ مِثْلَ ذَلِكَ فِي الصَّلَاةِ كُلِّهَا حَتَّى يَقْضِيَهَا، وَيُكَبِّرُ حِينَ يَقُومُ مِنَ الْمَثْنَى بَعْدَ الْجُلُوسِ، ثُمَّ يَقُولُ أَبُو هُرَيْرَةَ: إِنِّي لَأَشْبَهُكُمْ صَلَاةً بِرَسُولِ اللَّه (ﷺ).[بخاري/ صفة الصلاة/٧٥٦]

(ابوهریره) (ﷺ) دەڵێ: هەركاتێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەڵدەستا بۆ نوێژ ، كاتێ رادەوەستا تەكبیری دەكرد، كاتێ ركوعی دەبرد تەكبیری دەكردو دەیفەرموو ((سمع الله لمن حمده)) كاتێ راست دەبوویەوە پشتی بەرزدەكردەوە لەركوع دەیفەرموو: ((ربنا ولك الحمد))، كاتێ دادەبەزی بۆ سوجدە تەكبیری دەكرد، كاتێ دادەبەزی بۆ سوجدەی [دووەم ]تەكبیری دەكرد، كاتێ سەری بەرزدەكردەوە تەكبیری دەكرد ئابەو شێوەیە تا نوێژەكەی تەواو

دەبوو، هەروەها کاتێ لەتەحیاتی دوای رکاتی دووەم هەڵدەستایەوە تەکبیری دەکرد. لەدواییدا(ابوهریره) وتی: نوێژی من لەهەمووتان زیاتر لەنوێژی پێغەمبەری خوا دەچێت.

## (٧٧) رێگری کردن لەوەی پێش ئیمام بکەوی لەتەکبیرو شتی‌تردا

٢٧١ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يُعَلِّمُنَا، يَقُولُ: ((لَا تُبَادِرُوا الْإِمَامَ، إِذَا كَبَّرَ فَكَبِّرُوا، وَإِذَا قَالَ: ﴿وَلَا الضَّالِّينَ﴾ فَقُولُوا: آمِينَ، وَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا، وَإِذَا قَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، فَقُولُوا: رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ)).

(ابوهریره) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فێری دەکردین و دەیفەرموو: پێش (ئیمام) مەکەون، ئەگەر تەکبیری کرد ئێوەش بیکەن، ئەگەر وتی: ﴿ولا الضالين﴾بڵێن (ئامین) ئەگەر رکوعی برد ئێوە رکوع بەرن،ئەگەر وتی: ﴿سمع الله لمن حمده﴾ ئێوەش بڵێن ﴿ربنا ولك الحمد﴾.

## (٧٨) دەبێ مەئموم شوێن ئیمام بکەوێت

٢٧٢ـ عن أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ (ﷺ) قال: سَقَطَ النَّبِيُّ (ﷺ) عَنْ فَرَسٍ فَجُحِشَ شِقُّهُ الْأَيْمَنُ، فَدَخَلْنَا عَلَيْهِ نَعُودُهُ، فَحَضَرَتِ الصَّلَاةُ، فَصَلَّى بِنَا قَاعِدًا فَصَلَّيْنَا وَرَاءَهُ قُعُودًا، فَلَمَّا قَضَى الصَّلَاةَ قَالَ: ((إِنَّمَا جُعِلَ الْإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ، فَإِذَا كَبَّرَ فَكَبِّرُوا، وَإِذَا سَجَدَ فَاسْجُدُوا، وَإِذَا رَفَعَ فَارْفَعُوا، وَإِذَا قَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ فَقُولُوا: رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ، وَإِذَا صَلَّى قَاعِدًا فَصَلُّوا قُعُودًا أَجْمَعُونَ)). [بخاري/ الصلاة في ثياب/ ٣٧١]

(انس) کوری(مالك) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەئەسپێك کەوتە خوارەوە لای راستی رووشابوو، ئێمەچووینە خزمەتی بۆ سەردانی کاتی نوێژ هاتە پێشەوە، بەدانیشتنەوە نوێژی بۆکردین، ئێمەش لەدوایەوە بەدانیشتنەوە نوێژمان کرد، کاتێ نوێژەکە تەواو بوو فەرمووی: ((بۆیە ئیمام دانراوە تا شوێنی بکەون، ئەگەر تەکبیری کرد تەکبیر بکەن، ئەگەر سوجدەی برد سوجدە ببەن، ئەگەر بەرزبوویەوەو بەرزببنەوە، ئەگەر وتی: ﴿ سمع الله لمن حمده﴾ ئێوەش بڵێن: ﴿ ربنا ولك الحمد ﴾ ، هەروەها ئەگەر بەدانیشتنەوە نوێژی کرد ئێوەش هەمووتان بەدانیشتنەوە نوێژ بکەن)).

## (٧٩) لەنوێژا (دەستێك دەخرێتە سەردەستەكەی‌تر)

٢٧٣ـ عن وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ (ﷺ): أَنَّهُ رَأَى النَّبِيَّ (ﷺ) رَفَعَ يَدَيْهِ حِينَ دَخَلَ فِي الصَّلَاةِ كَبَّرَ –وَصَفَ هَمَّامٌ حِيَالَ أُذُنَيْهِ– ثُمَّ الْتَحَفَ بِثَوْبِهِ، ثُمَّ وَضَعَ يَدَهُ الْيُمْنَى عَلَى الْيُسْرَى، فَلَمَّا أَرَادَ أَنْ يَرْكَعَ أَخْرَجَ يَدَيْهِ مِنَ الثَّوْبِ ثُمَّ رَفَعَهُمَا، ثُمَّ كَبَّرَ فَرَكَعَ، فَلَمَّا قَالَ: ((سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)) رَفَعَ يَدَيْهِ، فَلَمَّا سَجَدَ سَجَدَ بَيْنَ كَفَّيْهِ.

(وائل) كوری (حجر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوام(ﷺ) دەیووە كاتێ چۆتە ناو نوێژەوەو تەكبیری كردووە هەردوو دەستی بەرزكرۆتەوە، همام كەراویەكەیە دەڵێ: بەرزكردنەوەی تا ئاستی گوێچكەی بووە. ئینجا عەباكەی پێچاوە لەخۆیەوەو دەستی راستی خستۆتە سەر دەستی چەپی، كاتێ ویستیویەتی ركوع بەرێت دەستی لەعەباكەی دەرهێناوە ئینجا بەرزی كردۆتەوەو تەكبیری كردووەو ركوعی بردووە، كاتێ فەرموویەتی: ﴿ سمع الله لمن حمده ﴾ دەستی بەرزكردۆتەوە، كاتێ سوجدەشی بردوە لەنێوان هەردوو لەپی دەستیا بردوویەتی.

## (٨٠) لەنێوان تەكبیرو فاتیحە خوێندندا چی دەوترێت

٢٧٤ـ عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ (ﷺ)، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ): أَنَّهُ كَانَ إِذَا قَامَ إِلَى الصَّلَاةِ قَالَ: ((وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ حَنِيفًا وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ، إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، لَا شَرِيكَ لَهُ، وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ، وَأَنَا مِنَ الْمُسْلِمِينَ. اللَّهُمَّ أَنْتَ الْمَلِكُ، لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ، أَنْتَ رَبِّي وَأَنَا عَبْدُكَ، ظَلَمْتُ نَفْسِي وَاعْتَرَفْتُ بِذَنْبِي فَاغْفِرْ لِي ذُنُوبِي جَمِيعًا، إِنَّهُ لَا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا أَنْتَ، وَاهْدِنِي لِأَحْسَنِ الْأَخْلَاقِ لَا يَهْدِي لِأَحْسَنِهَا إِلَّا أَنْتَ، وَاصْرِفْ عَنِّي سَيِّئَهَا لَا يَصْرِفُ عَنِّي سَيِّئَهَا إِلَّا أَنْتَ، لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ، وَالْخَيْرُ كُلُّهُ فِي يَدَيْكَ، وَالشَّرُّ لَيْسَ إِلَيْكَ. أَنَا بِكَ وَإِلَيْكَ، تَبَارَكْتَ وَتَعَالَيْتَ. أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ)). وَإِذَا رَكَعَ قَالَ: ((اللَّهُمَّ لَكَ رَكَعْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ، وَلَكَ أَسْلَمْتُ، خَشَعَ لَكَ سَمْعِي وَبَصَرِي، وَمُخِّي وَعَظْمِي وَعَصَبِي)). وَإِذَا رَفَعَ قَالَ: ((اللَّهُمَّ رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ، مِلْءَ السَّمَاوَاتِ وَمِلْءَ الْأَرْضِ، وَمِلْءَ مَا بَيْنَهُمَا، وَمِلْءَ مَا شِئْتَ مِنْ شَيْءٍ بَعْدُ)). وَإِذَا سَجَدَ قَالَ: ((اللَّهُمَّ لَكَ سَجَدْتُ وَبِكَ آمَنْتُ، وَلَكَ أَسْلَمْتُ، سَجَدَ وَجْهِي لِلَّذِي خَلَقَهُ وَصَوَّرَهُ، وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ، تَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ)). ثُمَّ يَكُونُ مِنْ آخِرِ مَا يَقُولُ بَيْنَ التَّشَهُّدِ وَالتَّسْلِيمِ: ((اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ،

وَمَا أَسْرَرْتُ وَمَا أَعْلَنْتُ وَمَا أَسْرَفْتُ، وَمَا أَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّي، أَنْتَ الْمُقَدِّمُ وَأَنْتَ الْمُؤَخِّرُ، لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ)). وفي الرواية: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِذَا اسْتَفْتَحَ الصَّلَاةَ كَبَّرَ ثُمَّ قَالَ: ((وَجَّهْتُ وجهي...)) إِلَى آخره.

(علـى) كورى (ابـي طـالب)(ﷺ) لەپێغەمبەرى خواوە بۆمان دەگێڕێتەوە كە كاتێ هەستاوە بۆ نوێژكردن فەرموويەتى : ( وجهت وجهي للذي فطر السموات والارض حنيفاً ، وما أنا من المشركين ان صلاتي ونسكي ومحياي ومماتي لله رب العالمين لاشريك له وبذلك امرت وانا من المسلمين ) اللهم انت الملك لا اله الا انت، انت ربي وانا عبدك ظلمت نفسي واعترفت بذنبي فاغفرلي ذنوبي جميعاً، انه لايغفر الذنوب الا انت واهدني لاحسن الاخلاق لا يهدي لأحسنها الا انت، واصرف عني سيئها لايصرف عني سيئها الا انت لبيك وسعديك، والخير كله في يديك ، والشر ليس اليك، انابك واليك تباركت وتعاليت استغفرك واتوبجه اليك كاتێ ركوعى دەبرد دەيفەرموو: ( اللهم لك ركعت ، وبك امنت ولك اسلمت خشع لك سمعي وبصري ومخي وعظمي وعصبي)كاتێ لەركوع هەڵدەستايەوە دەيفەرموو: ( اللهم ربنا لك الحمد ملء السموات وملء الارض وملء مابينهما، وملء ماشئت من شيء بعد كاتێ سوجدەى دەبر دەيفەرموو: ( اللهم لك سجدت وبك امنت ولك اسلمت ، سجد وجهي للذي خلقه وصوره وشق سمعه وبصره تبارك الله احسن الخالقين ) ئينجا لەكۆتايى تەحياتداوە پێش سەلام دانەوە دەيفەرموو: ( اللهم اغفر لي ما قدمت وما أخرت وما اسررت وما اعلنت وما اسرفت، وما انت أعلم به مني ، انت المقدم وانت المؤخر لا اله الا انت )لەريوايەتێكيشدا پێغەمبەرى خوا(ﷺ) كاتێ دەستى دەكرد بە نوێژ تەكبيرى دەكردو دەيفەرموو: ( وجهت وجهي ) تا كۆتايى .

## (٨١) بسم الله الرحمن الرحيم ئاشكرا نەكردن لەنوێژدا

٢٧٥ـ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ) قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) وَأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ وَعُثْمَانَ (ﷺ)، فَلَمْ أَسْمَعْ أَحَدًا مِنْهُمْ يَقْرَأُ ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ﴾. [بخاري/ صفة الصلاة/ ٧١٠]

(انس) (ﷺ) دەڵێ: لەخزمەت پێغەمبەرى خواو(ﷺ) ابوبكرو عمرو عثمان (ﷺ) نوێژم كردووە گوێم لەكەسيان نەبووە (بسم الله الرحمن الرحيم ) بخوێنن.

## (٨٢) لەبارەی (بسم الله الرحمن الرحيم)ەوە

٢٧٦ـ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ) قَالَ: بَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) ذَاتَ يَوْمٍ بَيْنَ أَظْهُرِنَا إِذْ أَغْفَى إِغْفَاءَةً، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ مُتَبَسِّمًا، فَقُلْنَا: مَا أَضْحَكَكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: ((أُنْزِلَتْ عَلَيَّ آنِفًا سُورَةٌ، فَقَرَأَ: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ. إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ. فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ. إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ الْأَبْتَرُ﴾. ثُمَّ قَالَ: أَتَدْرُونَ مَا الْكَوْثَرُ)). فَقُلْنَا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: ((فَإِنَّهُ نَهْرٌ وَعَدَنِيهِ رَبِّي (ﷻ)، عَلَيْهِ خَيْرٌ كَثِيرٌ، هُوَ حَوْضٌ تَرِدُ عَلَيْهِ أُمَّتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ، آنِيَتُهُ عَدَدُ النُّجُومِ، فَيُخْتَلَجُ الْعَبْدُ مِنْهُمْ، فَأَقُولُ: رَبِّ إِنَّهُ مِنْ أُمَّتِي، فَيَقُولُ: مَا تَدْرِي مَا أَحْدَثَتْ بَعْدَكَ.

(انس) (ﷺ) دەڵێ جارێكیان پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەناوماندا بوو، سووكە خەوێكی كردوو، ئینجا سەری بەدەم زەردەخەنەوە بەرزكردەوە ، ئێمەش وتمان بۆچی پێدەكەنیت ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ((ئا ئێستا سوورەتێكم بۆ دابەزیوە ، خوێندیەوەو فەرمووی:﴿بسم الله الرحمن الرحيم انا اعطيناك الكوثر فصل لربك وانحر ان شانئك هو الابتر﴾ ئینجا فەرمووی : ((ئایا دەزانن (كوثر) چی‌یە؟)) وتمان: خوا و پێغەمبەرەكەی باشتر دەزانن، فەرمووی: ((روبارێكە پەروەردگارم بەڵێنی پێداوم، خێری زۆری لەسەرە، حەوزێكە لەرۆژی قیامەتدا ئوممەتم دێنە سەری ، جامەكانی بەئەندازەی ژمارەی ئەستێرەكانە، خەڵكێك دادەبڕن لێیان ، منیش دەڵێم: پەروەرگار ئەوە لەئوممەتی منە، ئەویش دەفەرموێت: تۆ نازانی دوای تۆ چییان داهێناوە)).

## (٨٣) (ام القران) واتە (فاتحة) لەنوێژدا خوێندنی واجبە

٢٧٧ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ)، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((مَنْ صَلَّى صَلَاةً لَمْ يَقْرَأْ فِيهَا بِأُمِّ الْقُرْآنِ فَهِيَ خِدَاجٌ -ثَلَاثًا- غَيْرُ تَمَامٍ)). فَقِيلَ لِأَبِي هُرَيْرَةَ: إِنَّا نَكُونُ وَرَاءَ الْإِمَامِ؟ قَالَ: اقْرَأْ بِهَا فِي نَفْسِكَ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((قَالَ اللَّهُ (ﷻ): قَسَمْتُ الصَّلَاةَ بَيْنِي وَبَيْنَ عَبْدِي نِصْفَيْنِ، وَلِعَبْدِي مَا سَأَلَ، فَإِذَا قَالَ الْعَبْدُ: ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ قَالَ اللَّهُ ﴿تَعَالَى﴾: حَمِدَنِي عَبْدِي. وَإِذَا قَالَ: ﴿الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ﴾ قَالَ اللَّهُ ﴿تَعَالَى﴾: أَثْنَى عَلَيَّ عَبْدِي، وَإِذَا قَالَ: ﴿مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ﴾ قَالَ اللَّهُ: مَجَّدَنِي عَبْدِي -وَقَالَ مَرَّةً: فَوَّضَ إِلَيَّ عَبْدِي- فَإِذَا قَالَ: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ قَالَ: هَذَا بَيْنِي وَبَيْنَ عَبْدِي، وَلِعَبْدِي مَا سَأَلَ. فَإِذَا قَالَ:

﴿اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ﴾ قَالَ: هَذَا لِعَبْدِي، وَلِعَبْدِي مَا سَأَلَ)).

(ابوهريره) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموويەتی: ((هەركەس نوێژ بكات (ام القران)ی تیانەخوێنێ ئەوە نوێژەكەی ناتەواوە، ناتەواوە ، ناتەواوە ، كەموكوڕی تێدایە)) جابە (ابوهريره) وترا: ئێمە لەپشت ئیمامەوەین؟ وتی: لەدڵی خۆتدا بیخوێنە من لەپێغەمبەری خوامﷺ بیستووە فەرموويەتی: ((خوای گەورە فەرموويەتی : نوێژم لەنێوان خۆمو بەندەكەمدا كردووە بەدووبەشەوە، بەندەكەش داوای چی كرد دەیدەمێ، هەركاتێ وتی: ( الحمد لله رب العالمین) خوای گەورە دەفەرموێت: بەندەكەم سوپاسی كردم، هەركاتێ وتی: ( الرحمن الرحیم) خوای گەورە دەفەرموێت: بەندەكەم ستایشی كردم، هەركاتێ وتی: (مالك یوم الدین) خوا دەفەرموێت: بەندەكەم گەورەو مەزن سەیری كردم جارێكیش فەرمووی: بەندەكەم هەموشتێكی خۆی دایە دەست من كاتێ وتی: (ایاك نعبد ویاك نستعین) دەفەرموێت: ئەمە لەنێوان منو بەندەكەمدایە، بەندەكەم چی بووێت بۆی دەكەم . كاتێ وتی:﴿اهدنا الصراط المستقیم صراط الذین انعمت علیهم غیر المغضوب علیهم ولا الضالین ﴾ دەفەرموێت: ئەمە تایبەتە بەبەندەكەم داوای چیش بكات بۆی دەكەم.

## ( ٨٤ ) چی دەتوانێ ئەوە بخوێنێ

٢٧٨ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) دَخَلَ الْمَسْجِدَ فَدَخَلَ رَجُلٌ فَصَلَّى، ثُمَّ جَاءَ فَسَلَّمَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَرَدَّ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) السَّلَامَ، قَالَ: ((ارْجِعْ فَصَلِّ فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ)). فَرَجَعَ الرَّجُلُ فَصَلَّى كَمَا ﴿كَانَ﴾ صَلَّى، ثُمَّ جَاءَ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) فَسَلَّمَ عَلَيْهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((وَعَلَيْكَ السَّلَامُ)). ثُمَّ قَالَ: ((ارْجِعْ فَصَلِّ فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ)). حَتَّى فَعَلَ ذَلِكَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، فَقَالَ الرَّجُلُ: وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ مَا أُحْسِنُ غَيْرَ هَذَا، عَلِّمْنِي. قَالَ: ((إِذَا قُمْتَ إِلَى الصَّلَاةِ فَكَبِّرْ، ثُمَّ اقْرَأْ مَا تَيَسَّرَ مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ، ثُمَّ ارْكَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ رَاكِعًا، ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَعْتَدِلَ قَائِمًا، ثُمَّ اسْجُدْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ سَاجِدًا، ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ جَالِسًا، ثُمَّ افْعَلْ ذَلِكَ فِي صَلَاتِكَ كُلِّهَا)). [انظر الحديث: ٢٦١].

(ابوهريره) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاتە مزگەوت، لەوكاتەدا پیاوێكیش هاتە مزگەوتو نوێژی كرد، ئینجا هاتە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ)

سـەلامی لێکـرد، پێغەمبـەر(ﷺ) وەڵامــی ســەلامەکەی دایـەوەو فـەرمووی: ((بگەڕێرەوە نوێژەکەت بکە چونکە تۆ نوێژت نەکردووە، پیاوەکە گەڕایەوەو نوێژەکـەی کـردەوە ئینجـا هاتــەوە خزمـەت پێغەمبـەر(ﷺ) سـەلامی لێکـرد. پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمووی: سەلامیش لەسەر تۆ))، ئینجا فەرمووی: بگەڕێرەوە نوێژەکەت بکەرەوە، چونکە تۆ نوێژت نەکردووە)) هەتاسـیٚجار ئەمـەی کـرد پیاوەکە وتـی: سوێند بەوەی بەهەق تۆی ناردووە ، لەوە باشتر نازانم، فێرم بکە، فەرمووی: ((ئەگەر هەستای بۆ نوێژ تـەکبیر بکـە، چـەندەت بـۆ دەکـرێ قورئان بخوێنە، ئینجا رکوع ببەو بوەستەو لەجووڵە بکەوە، ئینجا بەرزببەرەوە هەتارێك رادەوەستیت، ئینجا سوجدە ببەو بووەستەو لەجووڵە بکەوە ، ئینجا بەرز ببەرەوە تادادەنیشیتو لەجووڵە دەکەویت ئینجا لەهەموو نوێژەکەتدا بەم شێوە بکە)).

## (٨٥) خوێندن لەدوای ئیمامەوە

٢٧٩ـ عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ (ﷺ) قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) صَلَاةَ الظُّهْرِ أَوِ الْعَصْرِ، فَقَالَ: ((أَيُّكُمْ قَرَأَ خَلْفِي بِـ﴿سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى﴾. فَقَالَ رَجُلٌ: أَنَا، وَلَمْ أُرِدْ بِهَا إِلَّا الْخَيْرَ، قَالَ: ((قَدْ عَلِمْتُ أَنَّ بَعْضَكُمْ خَالَجَنِيهَا)).

(عمران کوری(حصین) (ﷺ) دەڵـیٚ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) نوێـژی نیوەڕۆ یا عەسری بۆ کردین، فـەرمووی: ((کێتـان لەپێشـمەوە (سبح اسم ربك الاعلـی)ی خوێند پیاوێك وتـی: من ، هیچ مەبەستم نـەبوو خێر نـەبیٚ، فـەرمووی: هەست دەکەم هەندێکتان خەریکن نوێژەکەم لێتێك دەدەن)).

## (٨٦) الحمد لله و ئامین کردن

٢٨٠ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((إِذَا أَمَّنَ الْإِمَامُ فَأَمِّنُوا، فَإِنَّهُ مَنْ وَافَقَ تَأْمِينُهُ تَأْمِينَ الْمَلَائِكَةِ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ)). قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((آمِينَ)). ﴿بخاري/ صفة الصلاة/ ٧٤٧﴾

(ابوهریرە)(ﷺ) دەڵیٚ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ((ئەگەر ئیمام ئامینی کرد ئێوەش بیکەن، هـەرکامتان ئامینەکـەی لەگـەڵ ئـامینی فریشـتەکاندا یـەك بگرێـت خـوا لەگوناهـە رابووردووەکـانی خۆشـدەبێت)) (ابـن شـهاب) دەڵـیٚ: پێغەمبەری خواش(ﷺ) ئامینی دەکرد)).

## ( ٨٧ ) خوێندن لەنوێژی بەیانیدا

٢٨١ـ عَنْ سِمَاكِ بنِ حَرْبٍ قَالَ: سَأَلْتُ جَابِرَ بْنَ سَمُرَةَ (ﷺ) عَنْ صَلَاةِ النَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالَ: كَانَ يُخَفِّفُ الصَّلَاةَ، وَلَا يُصَلِّي صَلَاةَ هَؤُلَاءِ. قَالَ: وَأَنْبَأَنِي أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) كَانَ يَقْرَأُ فِي الْفَجْرِ بِ﴿ق. وَالْقُرْآنِ الْمَجِيدِ﴾ وَنَحْوِهَا.

(سماك) كوری (حرب) دەڵێ: لە(جابر) كوری(سمره)م پرسی لەبارەی نوێژی پێغەمبەرەوە (ﷺ) وتی: نوێژەكانی بەكورتی دەكرد ، نوێژی ئائەوانەی نەدەكرد [واتە: ئەوانەی زۆر درێژیان دەكردەوە] دەڵێ: ئاگاداری كردم كە پێغەمبەر(ﷺ) لەنوێژی بەیانیدا (( ق ، والقران المجید) و وێنەی ئەوی دەخوێند.

## ( ٨٨ ) خوێندنی قورئان لەنوێژی نیوەڕۆو عەسر

٢٨٢ـ أَبِي قَتَادَةَ (ﷺ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ)يصلي بنا، فيَقْرَأُ فِي الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ: الرَّكْعَتَيْنِ الْأُولَيَيْنِ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ وَسُورَةٍ، وَيُسْمِعُنَا الْآيَةَ أَحْيَانًا، وَيَقْرَأُ فِي الرَّكْعَتَيْنِ الْأُخْرَيَيْنِ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ. ﴿بخاري/ صفة الصلاة/ ٧٤٥﴾

(ابوقتادە (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) نوێژی بۆ دەكردین لەنیوەڕۆو عەسردا لەدوو ركاتی یەكەمدا فاتیحەو سوورەتێكی دەخوێند جارجار ئایەتەكەی دەدا بەگوێماندا، لەدوو ركاتی دوایشدا فاتیحەی دەخوێند.

٢٨٣ـ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كَانَ يَقْرَأُ فِي صَلَاةِ الظُّهْرِ: فِي الرَّكْعَتَيْنِ الْأُولَيَيْنِ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ قَدْرَ ثَلَاثِينَ آيَةً، وَفِي الْأُخْرَيَيْنِ قَدْرَ خَمْسَ عَشْرَةَ آيَةً، أَوْ قَالَ: نِصْفَ ذَلِكَ. وَفِي الْعَصْرِ: فِي الرَّكْعَتَيْنِ الْأُولَيَيْنِ: فِي كُلِّ رَكْعَةٍ قَدْرَ قِرَاءَةِ خَمْسَ عَشْرَةَ آيَةً، وَفِي الْأُخْرَيَيْنِ قَدْرَ نِصْفِ ذَلِكَ.

(ابو سعید الخدری) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) لەنوێژی نیوەڕۆدا، لەدوو ركاتی یەكەمدا، لەهەر ركاتێكدا ئەندازەی سی ئایەتی دەخوێند، لەدوانەكەی تریشدا ئەندازەی پانزە ئایەت یا دەڵێ: نیوەی ئەو لەعەسریشدا لەدوو ركاتی یەكەمدا، لەهەر ركاتێكدا ئەندازەی پانزە ئایەتی دەخوێند، لەدوانەكەی تردا نیوەی ئەو.

## (٨٩) خوێندن لەنوێژی شێواندا

٢٨٤ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (﵁) قَالَ: إِنَّ أُمَّ الْفَضْلِ بِنْتَ الْحَارِثِ سَمِعَتْهُ وَهُوَ يَقْرَأُ ﴿وَالْمُرْسَلَاتِ عُرْفًا﴾ فَقَالَتْ: يَا بُنَيَّ، لَقَدْ ذَكَّرْتَنِي بِقِرَاءَتِكَ هَذِهِ السُّورَةَ، إِنَّهَا لَآخِرُ مَا سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقْرَأُ بِهَا فِي الْمَغْرِبِ. [بخاري / صفة الصلاة/ ٧٢٩]

(ابن عباس) (﵄) دەڵێ: ( ام الفضل )كچی (الحارث) گوێی لە (ابن عباس) بوو کەسوورەتی ﴿ والمرسلات عرفا ﴾ دەخوێند ، ئەویش وتی: رۆڵە گیان ، بەخوێندنی ئەم سوورەتە ئەوەت بیرخستمەوە کە ئەوە دواین سوورەت بوو کەلەپێغەمبەرم بیستووە لەنوێژی شێواندا خوێندویەتی.

## (٩٠) خوێندن لەنوێژی خەوتناندا

٢٨٥ـ عَنْ جَابِرٍ (﵁) قَالَ: كَانَ مُعَاذٌ يُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ)، ثُمَّ يَأْتِي فَيَؤُمُّ قَوْمَهُ، فَصَلَّى لَيْلَةً مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) الْعِشَاءَ، ثُمَّ أَتَى قَوْمَهُ فَأَمَّهُمْ، فَافْتَتَحَ بِسُورَةِ الْبَقَرَةِ، فَانْحَرَفَ رَجُلٌ فَسَلَّمَ، ثُمَّ صَلَّى وَحْدَهُ وَانْصَرَفَ. فَقَالُوا لَهُ: أَنَافَقْتَ يَا فُلَانُ. قَالَ: لَا وَاللَّهِ، وَلَآتِيَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) فَلَأُخْبِرَنَّهُ. فَأَتَى رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّا أَصْحَابُ نَوَاضِحَ، نَعْمَلُ بِالنَّهَارِ، وَإِنَّ مُعَاذًا صَلَّى مَعَكَ الْعِشَاءَ، ثُمَّ أَتَى فَافْتَتَحَ بِسُورَةِ الْبَقَرَةِ. فَأَقْبَلَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَلَى مُعَاذٍ، فَقَالَ: ((يَا مُعَاذُ أَفَتَّانٌ أَنْتَ؟ اقْرَأْ بِكَذَا ﴿وَ﴾اقْرَأْ بِكَذَا)) قَالَ سُفْيَانُ: فَقُلْتُ لِعَمْرٍو: إِنَّ أَبَا الزُّبَيْرِ حَدَّثَنَا عَنْ جَابِرٍ أَنَّهُ قَالَ: ((اقْرَأْ: ﴿وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا﴾ ﴿وَالضُّحَى﴾ ﴿وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَى﴾ وَ﴿سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى﴾. ﴿فَقَالَ عَمْرٌو: نَحْوَ هَذَا﴾.
[بخاري / الجماعة والامامة / ٦٦٨]

(جابر) (﵁) دەڵێ: (معاذ)نوێژی لەخزمەت پێغەمبەردا دەکردو ئینجا دەهات ئیمامەتی بۆ قەومەکەی دەکرد، شەوێکیان نوێ'ژی خەوتنی لەخزمەت پێغەمبەردا (ﷺ)کرد ئینجا هات بۆ ناو قەومەکەی و ئیمامەتی بۆ کردن، بەسوورەتی (البقرة)دەستی پێکرد، پیاوێك ﴿لەریزەکەیدا﴾سەلامی دایەوە ، ئینجا بەتەنها نوێژی کردوو چووە دەرەوە، پێیان وت: تۆ دوو روویت کرد ئەی فلان ، وتی: نەبەخوا، دەیشچمە خزمەت پێغەمبەری خوا ئاگاداری دەکەم، هات بۆ خزمەت پێغەمبەرو(ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئێمە خاوەنی وشتری ئاودێرین بەرۆژدا کاردەکەین، معاذ نوێژی خەوتنی لەخزمەت بەرێزتاندا کردوو، ئینجا هات بۆ لای ئێمەو بەسوورەتی(البقرة) دەستی پێکرد،

پێغەمبـەر(ﷺ) ڕووی‌كـردە (معـاذ) فـەرمووی: ((ئـەی معـاذ ئایـا تـۆ خـەڵك تاقیدەكەیتەوە؟ ئەوە بخوێنە ، ئەوە بخوێنە)).

سـفیان دەڵـێ: بـە(عمـرو)م وت: (ابوزبـیر) لـە(جـابر)ەوە بـۆی گێراینـەوە كەفەرموویەتی:﴿والشمس وضحاها﴾ و ﴿والضحـی﴾ ﴿ واللیل اذا یغشـی﴾ و ﴿ سـبح اسمربـك الاعلـی﴾ بخوێنـە ﴿(عمـرو) وتـی: شـتێك لـەم جـۆرەی فەرموو﴾.

## (٩١) ڕێگری كراوە لە پێش كەوتن لەئیمام لە ركوعو سجوددا

٢٨٦ـ عَنْ أَنَسٍ (رضي الله عنه) قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) ذَاتَ يَوْمٍ، فَلَمَّا قَضَى الصَّلَاةَ أَقْبَلَ عَلَيْنَا ﴿بِوَجْهِهِ﴾ فَقَالَ: ((أَيُّهَا النَّاسُ، إِنِّي إِمَامُكُمْ، فَلَا تَسْبِقُونِي بِالرُّكُوعِ وَ﴿لَا﴾ بِالسُّجُودِ وَلَا بِالْقِيَامِ وَلَا بِالِانْصِرَافِ، فَإِنِّي أَرَاكُمْ ﴿من﴾أَمَامِي وَمِنْ خَلْفِي)). ثُمَّ قَالَ: ((وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، لَوْ رَأَيْتُمْ مَا رَأَيْتُ لَضَحِكْتُمْ قَلِيلًا وَلَبَكَيْتُمْ كَثِيرًا)). قَالُوا: وَمَا رَأَيْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: ((رَأَيْتُ الْجَنَّةَ وَالنَّارَ)).

(انس) (رضي الله عنه) ئەڵێ: ڕۆژێكیان پێغەمبەری خوا(ﷺ) نوێژی بۆ دەكردین ، كەلە نوێژ بوویەوە ڕووی تێكردینو فەرمووی: ((ئەی خەڵكینـە من (ئیمـام)ی ئێـوەم نەلەركوعو نەلە سجودو نەلەهەڵسانەوەداو نەلەسەلامدانەوەدا پێشم مەكەون، من لەپێشەوەو لەدواشمەوە دەتانبینم، ئینجا فەرمووی: سوێند بەوەی گیانی موحەمەدی بەدەستە ئەگەر ئەوەی من دیومە ئێوە بیبینن كەم پێدەكەنن و زۆر دەگرین)) ، وتیان: چیت دیووە ئەی پێغەمبەری خوا ؟ فەرمووی: ((بەهەشت و دۆزەخم دیووە)).

## (٩٢) ڕێگری لەسەربەرزكردنەوە لە پێش ئیمامەوە

٢٨٧ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((مَا يَأْمَنُ الَّذِي يَرْفَعُ رَأْسَهُ فِي صَلَاتِهِ قَبْلَ الْإِمَامِ أَنْ يُحَوِّلَ اللَّهُ صُورَتَهُ فِي صُورَةِ حِمَارٍ)). [بخاري/ الجماعة والامامة/ ٦٥٩]

(ابوهریرە) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویـەتی: ((ئەمین و دڵنیا نەبێ ئەو كەسەی لەپێش ئیمامەوە سەری بەرزدەكاتـەوە لەنوێژەكەیدا كە خوا شێوەی نەگۆڕێتە سەر شێوەی گوێدرێژ )).

## ( ٩٣ ) دەست خستنە سەر ئەژنۆو سڕینەوەی فەرموودەی پێشوو

٢٨٨. عَنْ مُصْعَبِ ابْنِ سَعْدٍ قَالَ: صَلَّيْتُ إِلَى جَنْبِ أَبِي، قَالَ: وَجَعَلْتُ يَدَيَّ بَيْنَ رُكْبَتَيَّ، فَقَالَ لِي أَبِي: اضْرِبْ بِكَفَّيْكَ عَلَى رُكْبَتَيْكَ، قَالَ: ثُمَّ فَعَلْتُ ذَلِكَ مَرَّةً أُخْرَى فَضَرَبَ يَدَيَّ، وَقَالَ: إِنَّا نُهِينَا عَنْ هَذَا، وَأُمِرْنَا أَنْ نَضْرِبَ بِالْأَكُفِّ عَلَى الرُّكَبِ. [بخاري/ صفة الصلاة/ ٧٠٧]

(مصعب) کوری (سعد ﷺ بن ابی وقاصﷺ) دەڵێ: لەتەنیشت باوکمەوە نوێژم دەکرد، وتی: هەردوو دەستم خستە نێوان ئەژنۆکانم باوکم وتی: دەستت بخەرە سەر ئەژنۆکانت، وتی: جارێکی تریش هەروام کرد ، ئینجا کێشای بەدەستماو وتی: ئێمە ڕێگریمان لێکراوە کەئاوا بکەین فەرمانمان پێکراوە کەدەستمان بخەینە سەر ئەژنۆمان.

## ( ٩٤ ) ئەوەی لەرکوعو سجوددا دەوترێت

٢٨٩ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يُكْثِرُ أَنْ يَقُولَ فِي رُكُوعِهِ وَسُجُودِهِ: ((سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَبِحَمْدِكَ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي)). يَتَأَوَّلُ الْقُرْآنَ. [بخاري/ صفة الصلاة/ ٧٨٤]

(عائشە) ر.ض) دەڵ ێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەرکوعو سجودەکانیا زۆرجار دەیفەرموو: ((سبحانك اللهم ربنا وبحمدك، اللهم اغفر لی))*.واتە: ((پاکیو بێگەردیو بێهاوەڵی بۆ تۆ ئەی خوایە، پەروەردگاری ئێمەی، شوکرو سوپاست ئەکەم، ئەی خوایە لێم خۆش ببە)).

## ( ٩٥ ) ڕێگری لەقورئان خوێندن لە رکوعو سجوددا

٢٩٠ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ) قَالَ: كَشَفَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) السِّتَارَةَ، وَالنَّاسُ صُفُوفٌ خَلْفَ أَبِي بَكْرٍ (ﷺ)، فَقَالَ: ((أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّهُ لَمْ يَبْقَ مِنْ مُبَشِّرَاتِ النُّبُوَّةِ إِلَّا الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ، يَرَاهَا الْمُسْلِمُ أَوْ تُرَى لَهُ، أَلَا وَإِنِّي نُهِيتُ أَنْ أَقْرَأَ الْقُرْآنَ رَاكِعًا أَوْ سَاجِدًا، فَأَمَّا الرُّكُوعُ فَعَظِّمُوا فِيهِ الرَّبَّ عَزَّ وَجَلَّ، وَأَمَّا السُّجُودُ فَاجْتَهِدُوا فِي الدُّعَاءِ، فَقَمِنٌ أَنْ يُسْتَجَابَ لَكُمْ)).

(ابن عباس) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) پەردەکەی لادا، لەوکاتەدا خەڵکی لەدوای (ابوبکر)ەوە ڕیز بوون، فەرمووی: ((ئەی خەڵکینە هیچ

---

* بخاري/ صفة الصلاة / التسبيح والدعاء في السجود / ٧٨٤.

لـەمژدەکانی پێغمبەرایـەتی نەماوە جگـە لەخـەونی چاك، موسـڵمان دەیبینـیٚ، یان پێوەی دەبینرێت، ئایا نـازانن من (نـەهی)م لێکراوە کەلەرکوع و سجوددا قورئـان بخوێنـم ، لـەرکوعدا پـەروەردگاری تێـدا بەگـەورەو مــەزن رابگــرن، لەسوجدەشـدا کۆشـش بکـەن لـە دۆعـاو پاڕانــەوەدا، شـایانی ئەوەیـە لێتـان وەربگرێت)).

## ( ٩٦ ) کاتی هەستانەوە لەرکوع چی دەوترێت

٢٩١ـ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (ﷺ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ قَالَ: ((رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ مِلْءُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وما بينهما، وَمِلْءُ مَا شِئْتَ مِنْ شَيْءٍ بَعْدُ، أَهْلَ الثَّنَاءِ وَالْمَجْدِ، أَحَقُّ مَا قَالَ الْعَبْدُ -وَكُلُّنَا لَكَ عَبْدٌ- لَا مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلَا مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلَا يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ)).

(ابو سعید الخدری) (ﷺ) دەڵـێ: کـاتێ پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) سەری لـەرکوع بــەرزدەکردەوە دەیفــەرموو: ئـەی پــەروەردگارمان ســوپاس بــۆ تــۆ پــڕ بەئاسمانەکان و زەوی و نێوانیـان، هــەروەها پــڕی هــەرچی دەتــەویٚ، تەنـها تـۆ شایانی سوپاس و شکۆمەندیت و هـەموو بەندەی تۆین، ئـەوەی تـۆ ئـەیدەیت کـەس نـاتوانێ بیگـرێ تـەوە، تـۆ نـەیدەی کـەس نـاتوانێ بیـدات خـاوەن پلـە سوودی نیە، پلەو پایە لەتۆوەیە.

## ( ٩٧ ) خێری سوجدە و هاندان بۆ زۆر سوجدە بردن

٢٩٢ـ عن مَعْدَانُ بْنُ أَبِي طَلْحَةَ الْيَعْمَرِيُّ قَالَ: لَقِيتُ ثَوْبَانَ مَوْلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ). فَقُلْتُ: أَخْبِرْنِي بِعَمَلٍ أَعْمَلُهُ يُدْخِلُنِي اللَّهُ بِهِ الْجَنَّةَ، أَوْ قَالَ: قُلْتُ: بِأَحَبِّ الْأَعْمَالِ إِلَى اللَّهِ. فَسَكَتَ، ثُمَّ سَأَلْتُهُ فَسَكَتَ، ثُمَّ سَأَلْتُهُ الثَّالِثَةَ فَقَالَ: سَأَلْتُ عَنْ ذَلِكَ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالَ: ((عَلَيْكَ بِكَثْرَةِ السُّجُودِ لِلَّهِ (ﷻ)، فَإِنَّكَ لَا تَسْجُدُ لِلَّهِ (ﷻ) سَجْدَةً إِلَّا رَفَعَكَ اللَّهُ بِهَا دَرَجَةً، وَحَطَّ عَنْكَ بِهَا خَطِيئَةً)). قَالَ مَعْدَانُ: ثُمَّ لَقِيتُ أَبَا الدَّرْدَاءِ، فَسَأَلْتُهُ، فَقَالَ لِي مِثْلَ مَا قَالَ لِي ثَوْبَانُ.

(معـدان) کـوری( طلحـة الیعمـري) دەڵـێ: گەیشـتم بـە ثوبـانی کـارگوزاری پێغەمبەری خوا(وتم: کارێکم پێ بڵێ کەبیکەم و بەوە خوا بمخاتە بەهەشتەوە، یا وتم: خۆشەویسترین کار لای خوا، (ثوبان)بێدەنگ بوو ، ئینجا لێم پرسیەوە، هـەر بێدەنگ بوو، ئینجا بۆ جاری سێیەم لێم پرسـیەوە ، وتـی: لەوبارەیـەوە لەپێغەمبـەری خـوام(ﷺ) پرسـیووە فەرموویـەتی : سـوجدەی زۆر ببـە بـۆ خـوای

گەورە، تۆ هەر سوجدەیەك كەدەیبەیت بۆ خوا ئەو بەوە پلەیە ( بەرزت دەكاتەوە، گوناهێكیشت لێ كەم دەكاتەوە) (معدان) دەڵێ: دوایی گەیشتم بە (ابودرداء) هەمان پرسیارم لێكرد ئەویش هەمان وەڵامی (ثوبان)ی دامەوە .

## ( ٩٨ ) پارانەوە لەسوجدەدا

٢٩٣ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((أَقْرَبُ مَا يَكُونُ الْعَبْدُ مِنْ رَبِّهِ وَهُوَ سَاجِدٌ، فَأَكْثِرُوا الدُّعَاءَ)). [بخاري/ صفة الصلاة /٧٧٩]

(ابوهريره) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: ((نزیكترین كاتی بەندە لەپەروەرگاریەوە، كاتی سوجدە بردنیەتی، كەواتە زۆر بپارێنەوە تیایا)).

## ( ٩٩ ) لەسەر چەند ئەندام سوجدە دەبرێت

٢٩٤ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((أُمِرْتُ أَنْ أَسْجُدَ عَلَى سَبْعَةِ أَعْظُمٍ: الْجَبْهَةِ -وَأَشَارَ بِيَدِهِ عَلَى أَنْفِهِ- وَالْيَدَيْنِ وَالرِّجْلَيْنِ، وَأَطْرَافِ الْقَدَمَيْنِ، وَلَا نَكْفِتَ الثِّيَابَ وَلَا الشَّعْرَ)).

(ابن عباس) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((فەرمانم پێكراوە كەلەسەر حەوت ئێسقان سوجدە بەرم، تەوێڵ [ ناوچاو]بەدەست ئاماژەی بۆلوتیشی كرد هەردوو دەستو هەردوو ئەژنۆ، پەنجەكانی هەردووپێ نەجل و نەقژیش لوول ناكەم [لەنوێژدا].

## ( ١٠٠ ) رێكی لەسجودداو بەرزكردنەوەی ئەنیشكەكان

٢٩٥ـ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((اعْتَدِلُوا فِي السُّجُودِ، وَلَا يَبْسُطْ أَحَدُكُمْ ذِرَاعَيْهِ انْبِسَاطَ الْكَلْبِ)). [بخاري / بەرگی ٢ لا ١١٨٧ اقتران النيرين لا ١٤]

(انس) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: ((لەسوجدەدا رێكو راست بن، باكەستان قۆڵەكانی رانەخات وەكو چۆن سەگ رایدەخات)).

## ( ١٠١ ) دوورخستنەوەی قۆڵ لەلەش

٢٩٦ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَالِكٍ ابْنِ بُحَيْنَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) كَانَ إِذَا سَجَدَ فَرَّجَ يَدَيْهِ عَنْ إِبْطَيْهِ حَتَّى إِنِّي لَأَرَى بَيَاضَ إِبْطَيْهِ. [بخاري/ الصلاة في ثياب/ ٣٨٣]

(عبدالله) كوری (مالك) كوری( بجينه) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) كاتێ سوجدەی دەبرد هەردوو قۆڵی لەبن باڵی دوور دەخستەوە هەتا من سپیایی بن باڵیم دەبینی.

## (١٠٢) دانیشتن لەسەر هەردووپێ

٢٩٧. عن طَاوُسًا قال: قُلْنَا لِابْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ) فِي الْإِقْعَاءِ عَلَى الْقَدَمَيْنِ؟ فَقَالَ: هِيَ السُّنَّةُ، فَقُلْنَا ﴿لَهُ﴾: إِنَّا لَنَرَاهُ جَفَاءً بِالرَّجُلِ؟ فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: بَلْ هِيَ سُنَّةُ نَبِيِّكَ (ﷺ).

(طاوس) دەڵێ: پرسیمان لە(ابن عباس) (ﷺ) لەبارەی دانیشتن لەسەر هەردوو پاژنەی پێ؟ وتی: سوننەتە ، پێمان وت: ئێمە وایدەبینین کەزەحمەتە؟ بەڵام (ابن عباس) وتی: بەڵکو سوننەتی پێغەمبەرەکەتە(ﷺ) [مەبەست دانیشتنی نێوان هەردوو سوجدەکەیە].

## (١٠٣) تەحیات لەنوێژدا

٢٩٨ـ عَنْ حِطَّانَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الرَّقَاشِيِّ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ (ﷺ) صَلَاةً، فَلَمَّا كَانَ عِنْدَ الْقَعْدَةِ قَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: أُقِرَّتِ الصَّلَاةُ بِالْبِرِّ وَالزَّكَاةِ، قَالَ: فَلَمَّا قَضَى أَبُو مُوسَى الصَّلَاةَ وَسَلَّمَ انْصَرَفَ، فَقَالَ: أَيُّكُمُ الْقَائِلُ كَلِمَةَ كَذَا وَكَذَا؟ قَالَ: فَأَرَمَّ الْقَوْمُ، ثُمَّ قَالَ: أَيُّكُمُ الْقَائِلُ كَلِمَةَ كَذَا وَكَذَا؟ فَأَرَمَّ الْقَوْمُ، فَقَالَ: لَعَلَّكَ يَا حِطَّانُ قُلْتَهَا؟ قَالَ: مَا قُلْتُهَا، وَلَقَدْ رَهِبْتُ أَنْ تَبْكَعَنِي بِهَا، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: أَنَا قُلْتُهَا، وَلَمْ أُرِدْ بِهَا إِلَّا الْخَيْرَ، فَقَالَ أَبُو مُوسَى: أَمَا تَعْلَمُونَ كَيْفَ تَقُولُونَ فِي صَلَاتِكُمْ، إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ خَطَبَنَا، فَبَيَّنَ لَنَا سُنَّتَنَا، وَعَلَّمَنَا صَلَاتَنَا فَقَالَ: ((إِذَا صَلَّيْتُمْ فَأَقِيمُوا صُفُوفَكُمْ، ثُمَّ لِيَؤُمَّكُمْ أَحَدُكُمْ، فَإِذَا كَبَّرَ فَكَبِّرُوا، وَإِذْ قَالَ: ﴿غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ﴾ فَقُولُوا: آمِينَ، يُجِبْكُمُ اللَّهُ، فَإِذَا كَبَّرَ وَرَكَعَ فَكَبِّرُوا وَارْكَعُوا، فَإِنَّ الْإِمَامَ يَرْكَعُ قَبْلَكُمْ وَيَرْفَعُ قَبْلَكُمْ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): فَتِلْكَ بِتِلْكَ، وَإِذَا قَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، فَقُولُوا: اللَّهُمَّ رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ، يَسْمَعُ اللَّهُ لَكُمْ، فَإِنَّ اللَّهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى قَالَ عَلَى لِسَانِ نَبِيِّهِ (ﷺ): سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، وَإِذَا كَبَّرَ وَسَجَدَ فَكَبِّرُوا وَاسْجُدُوا، فَإِنَّ الْإِمَامَ يَسْجُدُ قَبْلَكُمْ، وَيَرْفَعُ قَبْلَكُمْ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): فَتِلْكَ بِتِلْكَ، وَإِذَا كَانَ عِنْدَ الْقَعْدَةِ فَلْيَكُنْ مِنْ أَوَّلِ قَوْلِ أَحَدِكُمْ: التَّحِيَّاتُ الطَّيِّبَاتُ الصَّلَوَاتُ لِلَّهِ، السَّلَامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلَامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ)).

((حطان)كورى ( عبدالله الرقاشى) دەلْىْ: لەگەلْ ( ابو موسى الاشعرى)دا نويْژيْكم كرد، كاتىْ كاتى دانيشتن هات پياويْك لەو خەلْكە وتى: نويْژ كراوە بەهاوتاى چاكەو زەكات. دەلْىْ: كاتىْ (ابوموسى) لەنويْژەكەى بوويەوە سەلامى دايەوە ، وتى: كيْتان بوو قسەيەكى ئاواوئاواى‌كرد؟ خەلْكەكە هەموو بيْدەنگ بوون كەس وەلاْمى نەدايەوە، ئينجا وتى: كيْتان بوو قسەيەكى ئاواو ئاواى كرد؟ خەلْكەكە بيْدەنگ بوون‌و كەس وەلاْمى نەدايەوە بۆيە وتى: ئەى (حطان) لەوانەيە تۆ وتبيْتت؟ وتى: نەموتووە ، دەترسام سەرزەنشتم بكەيت.

پياويْك لەو خەلْكە وتى: من بووم وتم . مەبەستيشم تەنها خيْر بوو، (ابو موسى) وتى: نازانم لەنويْژەكانتانا چى دەلْيْن، پيْغەمبەرى خوا( ﷺ) وتارى بۆداين‌و سوننەتەكانى بۆ ڕوون كردينەوە، نويْژەكانى فيْركردين‌و فەرمووى: ((ئەگەر نويْژتان كرد ريزەكانتان ريْك بكەن، ئەگەر وتى: ((غير المغضوب عليهم ولا الضالين )بلْيْن: امين ، خواى گەورە نزاتان گيرادەكات. ئەگەر تەكبيرى كرد تەكبير بكەن‌و ركوع ببەن، ئيمام لەپيْش ئيْوەوە ركوع دەبات‌و لەپيْش ئيْوەشەوە بەرزدەبيْتەوە فەرمووى: ئەمە يان بەوە ( ئەم پيْشكەوتنە بەودواكەوتنە)* ئەگەر وتى: (سمع الله لمن حمده) بلْيْن: ( اللهم ربنا لك الحمد ) خوا ليْتان دەبيستىْ، چونكە خواى گەورە لەسەرزمانى پيْغەمبەرەكەى (ﷺ) فەرموويەتى: ( سمع الله لمن حمده) ئينجا ئەگەر تەكبيرى كردو سوجدەى برد، ئيْوەش تەكبير بكەن‌و سوجدە ببەن، چونكە ئيمام لەپيْش ئيْوەوە سوجدە دەبات، لەپيْش ئيْوەشەوە بەرزدەبيْتەوە، ئينجا پيْغەمبەرى خوا(ﷺ) فەرمووى: ئەمەشيان بەوە، ئينجا ئەگەر لەدانيشتنا بوو بايەكەم قسەى هەريەكيْكتان : (التحيات لله والصلوات لله، السلام عليك أيها النبي ورحمة الله وبركاته ، السلام علينا وعلى عباد الله الصالحين ،، اشهد أن لا اله الا الله واشهد أن محمدا عبده ورسوله).

٢٩٩ـ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنه) أَنَّهُ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) يُعَلِّمُنَا التَّشَهُّدَ كَمَا يُعَلِّمُنَا السُّورَةَ مِنَ الْقُرْآنِ، فَكَانَ يَقُولُ: ((التَّحِيَّاتُ الْمُبَارَكَاتُ الصَّلَوَاتُ الطَّيِّبَاتُ لِلَّهِ، السَّلَامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلَامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ

* ئەوەندەى ئيمام پيْشدەكەويْت نويْژگەرەكان دوادەكەون لەهەلْسو كەوتا.

الصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ)). وَفِي رِوَايَةِ ابْنِ رُمْحٍ: كَمَا يُعَلِّمُنَا الْقُرْآنَ﴾.

(ابن عباس) (﵄) دەڵـێ: پێغەمبـەری خوا(ﷺ) تـەحیاتی فێردەکردین وەکو فێری سوورەتێ قورئانمان بکات، دەیفەرموو: ( التحیات المبارکات والصلوات الطیبات لله، السلام علیك ایها النبي ورحمة الله وبرکاته ، السلام علینا وعلی عباد الله الصالحین ، اشهد ان لا اله الا الله واشهد ان محمداً رسول الله) .

## ( ١٠٤ ) لەنوێژا پەنا لەچی دەگیرێت

٣٠٠ــ عـن عَائِشَـةَ (﵂) زَوْجَ النَّبِـيِّ (ﷺ): أَنَّ النَّبِـيَّ (ﷺ) كَـانَ يَدْعُـو فِـي الصَّلَاةِ: ((اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَأَعُـوذُ بِـكَ مِـنْ فِتْنَـةِ الْمَسِـيحِ الدَّجَّالِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُـوذُ بِـكَ مِـنَ الْمَـأْثَمِ وَالْمَغْرَمِ)). قَالَتْ: فَقَالَ لَهُ قَائِلٌ: مَا أَكْثَرَ مَا تَسْتَعِيذُ مِنَ الْمَغْرَمِ يَا رَسُولَ اللَّـهِ؟ فَقَالَ: ((إِنَّ الرَّجُلَ إِذَا غَرِمَ حَدَّثَ فَكَذَبَ، وَوَعَدَ فَأَخْلَفَ)). [بخاري/ صفة الصلاة / الدعاء قبل السلام/ ٧٩٨].

(عائشـە) (ر.ض)هاوسـەری پێغەمبـەری خوا (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) لـەنوێژا دەپاڕایەوە : خوایـە مـن پـەنادەگرم بـەتۆ لەسـزای گـۆڕو لەفیتنـەی جـەجاڵو، پـەنادەگرم بـەتۆ لـە فیتنـەی ژیـانو مـردن، خوایـە پـەنادەگرم بـەتۆ لەهەرشـتێ تووشی گوناهم بکات، لەقەرزێك کەنادرێتـەوە عائیشە دەڵـێ: یـەکێ وتـی (ئەی پێغەمبەری خوا) بۆ ئەوەندە پـەنا دەگری لەقـەرزاری؟ فەرمووی: ((پیاو ئەگـەر قەرزاربوو قسـەدەکاتو درۆدەکات، بەڵێن دەداتو نایباتـە سەر)).

## ( ١٠٥ ) نزا لەنوێژدا

٣٠١. عَنْ أَبِي بَكْرٍ (﵁): أَنَّهُ قَالَ لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ): عَلِّمْنِي دُعَاءً أَدْعُو بِهِ فِي صَلَاتِي. فَقَالَ: ((قُلِ: اللَّهُمَّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي ظُلْمًا كَبِيرًا ــ وَقَالَ قُتَيْبَةُ: كَثِيرًا ــ وَلَا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا أَنْتَ، فَاغْفِرْ لِي مَغْفِرَةً مِنْ عِنْدِكَ، وَارْحَمْنِي، إِنَّكَ أَنْتَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ)). [بخاري/ قوله تعالی: ﴿ وكان الله سميعاً بصيرا ﴾ ٦٩٥٣].

(ابوبکــر) (﵁) دەڵـــێ: وتم بەپێغەمبــەری خـــوا(ﷺ) نزایـــەکم فێربکـــە لەنوێژەکانما بیڵێم، ئەویش فەرمووی: ( اللهم انـي ظلمـت نفسـي ظلماً كبيراً ــ قتیبە دەڵـێ : ــ کثیراً ولا یغفـر الذنـوب الا انـت ، فـاغفر لي مغفـرة مـن عنـدك ، وارحمـني ، انك أنت الغفور الرحیم ) واتە: خوایـە گیـان مـن ستەمێکی زۆرو

گەورەم لەخۆم کردووە کەسیش لەگوناه خۆشنابێت جگە لەتۆ ، دە خۆت لێم خۆش ببەو بەزەییت پێما بێتەوە ، تەنها تۆ لێبوردەو میهرەبانی).

## ( ١٠٦ ) نەفرین کردن لەشەیتان لەنوێژاو پەناگرتن بەخوا لێی

٣٠٢ـ عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ (ﷺ) قَالَ: قَامَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فَسَمِعْنَاهُ يَقُولُ: ((أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْكَ)). ثُمَّ قَالَ: ((أَلْعَنُكَ بِلَعْنَةِ اللَّهِ)). ثَلَاثًا وَبَسَطَ يَدَهُ كَأَنَّهُ يَتَنَاوَلُ شَيْئًا، فَلَمَّا فَرَغَ مِنَ الصَّلَاةِ، قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَدْ سَمِعْنَاكَ تَقُولُ فِي الصَّلَاةِ شَيْئًا لَمْ نَسْمَعْكَ تَقُولُهُ قَبْلَ ذَلِكَ؟ وَرَأَيْنَاكَ بَسَطْتَ يَدَكَ. قَالَ: ((إِنَّ عَدُوَّ اللَّهِ إِبْلِيسَ جَاءَ بِشِهَابٍ مِنْ نَارٍ لِيَجْعَلَهُ فِي وَجْهِي، فَقُلْتُ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْكَ، ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ قُلْتُ: أَلْعَنُكَ بِلَعْنَةِ اللَّهِ التَّامَّةِ، فَلَمْ يَسْتَأْخِرْ، ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ أَرَدْتُ أَخْذَهُ، وَاللَّهِ لَوْلَا دَعْوَةُ أَخِينَا سُلَيْمَانَ لَأَصْبَحَ مُوثَقًا يَلْعَبُ بِهِ وِلْدَانُ أَهْلِ الْمَدِينَةِ)).

(ابودرداء)( ﷺ) دەڵێ: پێەمبەری خوا (ﷺ) هەستا دەستی کرد بەنوێژکردن گوێمان لێ بوو دەیفەرموو: (اعوذ بالله منك ) پەنادەگرم بەخوا لەتۆ ، ئینجا سێجار فەرمووی: ((نەفرینت لێدەکەم بەنەفرینی خوا.(سێجار) دەستیشی درێژکرد وەکو شتێك بگرێت، کاتێ لەنوێژ بوویەوە، وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) گوێمان لێ بوو لەنوێژەکەتدا شتێکت دەفەرموو کەپێشتر لێمان نەبیستبووی؟ چاویشمان لێ بوو دەستت درێژدەکرد، فەرمووی: ((ئیبلیس دوژمنی خوا سەرە بزوتکێکی هێنابوو دەیویست بیدات بەسەروچاوما، منیش سێجار وتم: پەنادەگرم بەخوا لەتۆ، ئینجا سێجار وتم: نەفرینت لێدەکەم بەنەفرینە تەواوەکانی خوا بەڵام نەچووە دواوە، پاشان ویستم بیگرم سوێند بەخوا ئەگەر پاڕانەوەکەی سلێمانی برام نەبوایە ئەبەسترایەوەو منداڵانی خەڵکی مەدینە گەمەیان پێدەکرد)).

## ( ١٠٧ ) سڵاوات لەسەر پێغەمبەر( ﷺ )

٣٠٣ـعَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الْأَنْصَارِيِّ (ﷺ) قَالَ: أَتَانَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وَنَحْنُ فِي مَجْلِسِ سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ، فَقَالَ لَهُ بَشِيرُ بْنُ سَعْدٍ: أَمَرَنَا اللَّهُ تَعَالَى أَنْ نُصَلِّيَ عَلَيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَكَيْفَ نُصَلِّي عَلَيْكَ؟ قَالَ: فَسَكَتَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) حَتَّى تَمَنَّيْنَا أَنَّهُ لَمْ يَسْأَلْهُ، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((قُولُوا: اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى ﴿آلِ﴾ إِبْرَاهِيمَ. وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ فِي الْعَالَمِينَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ. وَالسَّلَامُ كَمَا قَدْ عَلِمْتُمْ)).

(ابـو مسـعود الانصـاری) (ﷺ) دەڵـێ: ئێمـە لـەلای (سـەعد) کوری (عبـادە) دانیشتبووین ، پێغەمبەری خوا(ﷺ) هات بۆ ناومان ، (بشر) کوری (سعد) پێی وت: خوایگـەورە فـەرمانی پێکردووین کەسـڵاواتت لەسـەر بدەیـن ئـەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ، چۆن سڵاواتت لەسەر بدەین؟ پێغەمبەر(ﷺ) بێدەنگ بوو، ئەوەندەی پێ چوو خۆزگەمان دەخواست کە ئەو پرسیارەی لێنەکرایا ئینجا فەرمووی : ( بڵێن : اللهم صلی علی محمد وعلی ال محمد ، كما صليت علی ابراهيم وبارك علی محمد ، وعلی ال محمد كماباركت علی ال ابراهيم في العالمين انك حميد مجيد والسلام كما قد علمتم ).

## ( ١٠٨ ) سەلام دانەوە لەنوێژا

٣٠٤ـ عَنْ عَامِرِ ابْنِ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ (ﷺ) قَالَ: كُنْتُ أَرَى رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يُسَلِّمُ عَنْ يَمِينِهِ وَعَنْ يَسَارِهِ، حَتَّى أَرَى بَيَاضَ خَدِّهِ.

(عامر) کوری (سعد) (ﷺ) دەڵێ: من دەمبینی پێغەمبەری خوا(ﷺ) سەلامی دەدایەوە بەلای راستیو بەلای چەپیدا هەتا سپیایی رووومەتیم دەبینی.

## ( ١٠٩ ) کەراهەتی ئاماژە کردن بەدەست لەکاتی سەلام دانەوەدا

٣٠٥. عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ (ﷺ) قَالَ: كُنَّا إِذَا صَلَّيْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) قُلْنَا: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ، السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ، وَأَشَارَ بِيَدِهِ إِلَى الْجَانِبَيْنِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((عَلَامَ تُومِئُونَ بِأَيْدِيكُمْ كَأَنَّهَا أَذْنَابُ خَيْلٍ شُمْسٍ؟ إِنَّمَا يَكْفِي أَحَدَكُمْ أَنْ يَضَعَ يَدَهُ عَلَى فَخِذِهِ، ثُمَّ يُسَلِّمُ عَلَى أَخِيهِ مَنْ عَلَى يَمِينِهِ وَشِمَالِهِ)).

(جابر) کوری (سمره) (ﷺ) دەڵێ: ئێمە ئەگەر لەخزمەت پێغەمبەری خوادا (نوێژمان بکردایە، دەمانوت: السلام عليكم ورحمه الله ، السلام عليكم ورحمه الله ، بەدەست ئاماژەی بۆ هەردو لاکەی کرد، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ((بۆچی بەدەست ئاماژە دەکەی هەر دەڵێی کلکی ئەسپی (تۆرە) ئەوەندە بەسە بۆ یەکێکتان کەدەستی بخاتە سەر رانیی، ئینجا سەلام بکات لەبراکەی لەلای راستیەوەو لەلای چەپەوە)).

## ( ١١٠ ) چی دەوترێت دوای سەلام دانەوە لەنوێژ

٣٠٦ـ عَنْ وَرَّادٍ مَوْلَى الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ (ﷺ) قَالَ: كَتَبَ الْمُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ إِلَى مُعَاوِيَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) كَانَ إِذَا فَرَغَ مِنَ الصَّلَاةِ وَسَلَّمَ قَالَ: ((لَا إِلَهَ إِلَّا

اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَـهُ الْحَمْـدُ وَهُوَ عَلَـى كُلِّ شَيْءٍ قَديـرٌ. اللَّهُمَّ لَا مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلَا مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْـتَ، وَلَـا يَنْفَعُ ذَا الْجَـدِّ مِنْكَ الْجَدُّ)). [بخاري/ صفة الصلاة/ الذكر بعد الصلاة / ٨٠٦].

(وراد) كاگوزاری (المغيره) كوری (شعبه) (ﷺ) دەڵـێ: (مغيره) كـوری(شـعبه) نووسی بۆ (معاويه) (ﷺ) كاتێ پێـغەمبەری خوا(ﷺ) لەنوێژ دەبوويەوەو سەلامی دەدايەوە، دەيفەرموو: ( لا اله الا الله وحده لا شريك له له الملك وله الحمد وهـو على كل شي قدير، اللهم لا مانع لما اعطيت ولا معطي لما منعت ولاينفع ذالجد منك الجد) واتە: هيچ خوايەك نييە جگە لە(اللـه) تاكو تەنيايـەو بـێ شەريكە، موڵك هـەمووی هـی ئەوە سـوپاس تـەنيا بۆئـەوە ، ئـەويش دەسـەڵاتی بەسـەر هەموو شتێكدا هەيە، ئەی خوايـە، ئەوەی تۆ دەيبەخشيت بـەری لێ ناگيرێت. ئەوەی تۆ نەيبەخشيت كەس نـاتوانێ بيبەخشێت، خـاوەن سامانەكان سـوود لەسامان و دەسەڵاتيان وەرناگرن لەلای تۆ)).

## ( ١١١ ) تەكبير لەدوای نوێژ

٢٠٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ) قَالَ: كُنَّا نَعْرِفُ انْقِضَاءَ صَلَـاةِ رَسُولِ اللَّـهِ (ﷺ) بِالتَّكْبِيرِ. [بخاري/ صفة الصلاة / الذكر بعد الصلاة /٨٠٦]

(ابن عبـاس) (ﷺ) دەڵـێ: ئێمـە بە تـەكبير دەمـانزانی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) لەنوێژ بۆتەوە [مەبەست لە زكری دوای نوێژە].

## ( ١١٢ ) سبحان الله والحمد لله والله اكبر دوای نوێژ

٢٠٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ)، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((مَنْ سَبَّحَ اللَّهَ فِي دُبُرِ كُلِّ صَلَاةٍ ثَلَاثًا وَثَلَاثِينَ، وَحَمِدَ اللَّهَ ثَلَاثًا وَثَلَاثِينَ، وَكَبَّرَ اللَّهَ ثَلَاثًا وَثَلَاثِينَ، فَتْلِكَ تِسْعَةٌ وَتِسْعُونَ، وَقَالَ تَمَامَ الْمِائَةِ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَـا شَرِيكَ لَـهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَـهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَـى كُـلِّ شَـيْءٍ قَدِيـرٌ. غُفِـرَتْ خَطَايَـاهُ، وَإِنْ كَـانَتْ مِثْـلَ زَبَـدِ الْبَحْرِ)).

(ابوهريرة) (ﷺ) لەپێغەمبەری خواوە بۆمـان دەگێڕێتـەوە كە فەرموويـەتی: ((هەركەس لەدوای هەموو نوێژێك سی‌وسـێ‌جار (سبحان الله)و سی‌وسـێ‌جار( الحمد لله)و سی‌وسێ‌جار( الله اكبر) بكات كە دەكاتە نەوەدو نۆ، بۆ تەواوكردنی سەدەكەش بڵێ: ( لا اله الا الله وحده لاشريك له له الملك وله الحمد وهو على كل

## ( ١٦٧ ) سوننەتی پێش نوێژو دوای نوێژ

٣٦٧ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ) قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) قَبْلَ الظُّهْرِ سَجْدَتَيْنِ، وَبَعْدَهَا سَجْدَتَيْنِ، وَبَعْدَ الْمَغْرِبِ سَجْدَتَيْنِ، وَبَعْدَ الْعِشَاءِ سَجْدَتَيْنِ، وَبَعْدَ الْجُمُعَةِ سَجْدَتَيْنِ، فَأَمَّا الْمَغْرِبُ وَالْعِشَاءُ وَالْجُمُعَةُ، فَصَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) فِي بَيْتِهِ. [البخاري/ التطوع/ ١١١٩]

(ابن عمر) (ﷺ) دەڵێ: لەخزمەت پێغەمبەری خوادا(ﷺ) لەپێش نیوەڕۆدا دوو سوجدەمان بردووە، دوای نیوەڕۆش دوو سوجدە، دوای شێوانیش دوو سوجدە، لەدوای خەوتنانیش دوو سوجدە، لەدوای جومعەیش دووسوجدە، بەڵام شێوان و خەوتنان و جومعە لەخزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) لەماڵەوە نوێژم کرد[دوو سوجدە واتە دوورکات] .

## ( ١٦٨ ) سوننەت بەشەوو رۆژ

٣٦٨ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شَقِيقٍ (ﷺ) قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ (ﷺ) عَنْ صَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) عَنْ تَطَوُّعِهِ، فَقَالَتْ: كَانَ يُصَلِّي فِي بَيْتِي قَبْلَ الظُّهْرِ أَرْبَعًا ثُمَّ يَخْرُجُ، فَيُصَلِّي بِالنَّاسِ ثُمَّ يَدْخُلُ فَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ، وَكَانَ يُصَلِّي بِالنَّاسِ الْمَغْرِبَ ثُمَّ يَدْخُلُ فَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ، وَيُصَلِّي بِالنَّاسِ الْعِشَاءَ وَيَدْخُلُ بَيْتِي فَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ، وَكَانَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ تِسْعَ رَكَعَاتٍ فِيهِنَّ الْوِتْرُ، وَكَانَ يُصَلِّي لَيْلًا طَوِيلًا قَائِمًا وَلَيْلًا طَوِيلًا قَاعِدًا، وَكَانَ إِذَا قَرَأَ وَهُوَ قَائِمٌ رَكَعَ وَسَجَدَ وَهُوَ قَائِمٌ، وَإِذَا قَرَأَ قَاعِدًا رَكَعَ وَسَجَدَ وَهُوَ قَاعِدٌ، وَكَانَ إِذَا طَلَعَ الْفَجْرُ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ. [بخاري/ التطوع/ ١١٢٧]

(عبدالله) کوری(شقیق) (ﷺ) دەڵێ: پرسیارم لە(عائشه)( رضی الله عنها)کرد لەبارەی نوێژی سوننەتی پێغەمبەری خواوە(ﷺ) وتی: لەماڵەوە لەپێش نیوەڕۆدا چوار رکاتی دەکرد، ئینجا لەماڵی دەردەچوو نوێژی بۆ خەڵکەکەش دەکرد، ئینجا دەهاتەوە ماڵەوە دوورکاتی دەکرد، نوێژی شێوانی بەخەڵکەکە دەکرد، ئینجا دەهاتە ماڵەوە دوورکاتی دەکرد، نوێژی خەوتنانی بەخەڵکەکە دەکرد، دەهاتە ماڵەکەی من دوورکاتی دەکرد، لەشەودا نۆرکاتی دەکرد وەتریشی تێدابوو، هەروەها شەوێك بەپێوە نوێژی دەکرد، شەوێکی درێژیش بەدانیشتنەوە کاتێ بەپێوە نوێژی دەکرد لەحاڵەتی وەستانەوە دەچووە (رکوع)و (سجود) ، کاتێکیش بەدانیشتنەوە نوێژی دەکرد لەحاڵەتی

دانیشتنەوە(ركوع)و (سجود)ی دەبرد. كاتێكیش سپێدە دەردەكەوت دووركاتی دەكرد.

## (١٦٩) نوێژی سوننەت لەمزگەوتا

٣٦٩ـ عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ (ﷺ) قَالَ: احْتَجَرَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) حُجَيْرَةً بِخَصَفَةٍ أَوْ حَصِيرٍ، فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يُصَلِّي فِيهَا، قَالَ: فَتَتَبَّعَ إِلَيْهِ رِجَالٌ، وَجَاءُوا يُصَلُّونَ بِصَلَاتِهِ، قَالَ: ثُمَّ جَاءُوا لَيْلَةً، فَحَضَرُوا وَأَبْطَأَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَنْهُمْ، قَالَ: فَلَمْ يَخْرُجْ إِلَيْهِمْ، فَرَفَعُوا أَصْوَاتَهُمْ، وَحَصَبُوا الْبَابَ، فَخَرَجَ إِلَيْهِمْ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) مُغْضَبًا، فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((مَا زَالَ بِكُمْ صَنِيعُكُمْ حَتَّى ظَنَنْتُ أَنَّهُ سَيُكْتَبُ عَلَيْكُمْ، فَعَلَيْكُمْ بِالصَّلَاةِ فِي بُيُوتِكُمْ، فَإِنَّ خَيْرَ صَلَاةِ الْمَرْءِ فِي بَيْتِهِ إِلَّا الصَّلَاةَ الْمَكْتُوبَةَ)). وفي روايـة: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) اتَّخَذَ حُجْرَةً فِي الْمَسْجِدِ مِنْ حَصِيرٍ. [بخاري/ الجماعة و الإمامة/ ٦٩٨]

(زیـد) كـوری(ثـابت)(ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) ژوورێكـی بچكۆلـەی بەحەسیر دروست كـرد جارێكیـان پێغەمبـەر(ﷺ) دەرچـوو نوێـژی تێدابكـات، چەند پیـاوێك بەشـوێنیدا رۆشـتن، هـاتن لەدوایـەوە نوێـژ بكـەن، جـارێكیتر شەوێكیان هاتن‌و ئامادەبوون، بەڵام پێغەمبـەر(ﷺ) دواكـەوت، وتـی: نـەهات بۆ لایـان، ئینجـا دەنگیـان بـەرزكردەوەو زیخیـان كێشـا بەدەرگاكـەدا، ئینجـا پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاتـە دەرەوەو تورەیـی پێـوە دیاربوو، فەرموی: (( لەسـەر كردارەكەتان [واتـە: نوێژكردنـی سـوننەت بەبـەردەوامی لەمزگـەوتدا] ئـەوەندە بـەردەوامن، گومـان دەبـەم لەسـەرتان فـەرزبكرێت، كەواتـە لـەماڵی خۆتـاندا نوێژەكانتـان [(واتـە: سـوننەتەكان)] بكـەن، خـێرترین نوێـژی مـرۆڤ ئەوەیـە كەلەماڵەوە بیكات، جگە لەنوێژی فەرز)).

## (١٧٠) نوێژی سوننەت لەماڵەوە

٣٧٠ـ عَنْ جَابِرٍ ﴿بن عبد الله﴾ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((إِذَا قَضَى أَحَدُكُمُ الصَّلَاةَ فِي مَسْجِدِهِ، فَلْيَجْعَلْ لِبَيْتِهِ نَصِيبًا مِنْ صَلَاتِهِ، فَإِنَّ اللَّهَ جَاعِلٌ فِي بَيْتِهِ مِنْ صَلَاتِهِ خَيْرًا.

(جابر) كوری( عبدالله)( دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) فەرموویـەتی: ((ئەگـەر یەكێكتان لەمزگەوت لەنوێژ بویەوە، بابەشی ماڵەوەش نوێژ بهێڵێتەوە چونكە خوای گەورە خێری داناوە بۆ نوێژەكانی ماڵەوەیش)).

### (١٧١) هەریەك لەئێوە با بەچالاکی نوێژ بکات، ئەگەر ماندوبوو بادابنیشێت

٣٧١ـ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ) قَالَ: دَخَلَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) الْمَسْجِدَ، وَحَبْلٌ مَمْدُودٌ بَيْنَ سَارِيَتَيْنِ، فَقَالَ: ((مَا هَذَا)). قَالُوا: لِزَيْنَبَ تُصَلِّي، فَإِذَا كَسِلَتْ أَوْ فَتَرَتْ أَمْسَكَتْ بِهِ. فَقَالَ: ((حُلُّوهُ، لِيُصَلِّ أَحَدُكُمْ نَشَاطَهُ، فَإِذَا كَسِلَ أَوْ فَتَرَ قَعَدَ)). [بخاري/ التهجد/ ١٠٩٩]

(انس) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) چووە مزگەوت، گوریسێك لەنێوان دوو کۆڵەکەدا بەسترابوو، فەرمووی: ((ئەمە چییە)) وتیان: هی زەینەبە نوێژدەکات، کاتێ هیلاك دەبێت یان بێهێز دەبێت دەستی پێوە دەگرێت، ئەویش(ﷺ) فەرمووی: ((بیکەنەوە، هەریەکێکتان چەند توانای بوو نوێژ بکات، ئەگەر نەیتوانی یان هیلاك بوو بادابنیشێت)).

### (١٧٢) خۆشەویشترین کار لای خوا بەردەوامترینیانە

٣٧٢ـ عَنْ عَلْقَمَةَ قَالَ: سَأَلْتُ أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ عَائِشَةَ (ﷺ)، قَالَ: قُلْتُ: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ، كَيْفَ كَانَ عَمَلُ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، هَلْ كَانَ يَخُصُّ شَيْئًا مِنَ الْأَيَّامِ؟ قَالَتْ: لَا، كَانَ عَمَلُهُ دِيمَةً، وَأَيُّكُمْ يَسْتَطِيعُ مَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَسْتَطِيعُ؟ [بخاري/ الرقاق/ ٦١٠١]

(علقمه)(ﷺ) دەڵێ: (لەعائشه) (ﷺ) دایکی ئیماندارانم پرسی: ئەی دایکی ئیمانداران کاری پێغەمبەری خوا(ﷺ) چۆن بوو، ئایا هەندێك لەرۆژەکانی تایبەت دەکرد؟ وتی: نەخێر کاری بەردەوام بووە ئایا کێتان دەتوانێ ئەوەی کەپێغەمبەری خوا(ﷺ) توانیویەتی؟

### (١٧٣) چەند دەتوانن ئەوەندە کاربکەن

٣٧٣ـ عن عَائِشَةَ (ﷺ) زَوْجَ النَّبِيِّ (ﷺ): أَنَّ الْحَوْلَاءَ بِنْتَ تُوَيْتِ بْنِ حَبِيبِ بْنِ أَسَدِ ابْنِ عَبْدِ الْعُزَّى مَرَّتْ بِهَا وَعِنْدَهَا رَسُولُ اللَّه (ﷺ)، فَقُلْتُ: هَذِهِ الْحَوْلَاءُ بِنْتُ تُوَيْتٍ، وَزَعَمُوا أَنَّهَا لَا تَنَامُ اللَّيْلَ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((لَا تَنَامُ اللَّيْلَ؟ خُذُوا مِنَ الْعَمَلِ مَا تُطِيقُونَ، فَوَاللَّهِ لَا يَسْأَمُ اللَّهُ حَتَّى تَسْأَمُوا)). [بخاري/ الإيمان/ ٤٣]

(عائشە) (ﷺ) هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ) دەڵێ: (حولاء) کچی (تویت) بەلایدا تێپەڕی، پێغەمبەری خوای(ﷺ) لەلا بوو ، وتم: ئەمە حولاء کچی(تویت)ە کەدەڵێن گوایە بەشەو ناخەوێ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((شەوناخەوێ؟ چەند

دەتوانن ئەوەندە کاربکەن، سوێند بەخوا، خوا ماندوو نابێت [لەپاداشت بۆ نوسینتان] هەتا ئێوە [لەکارکردن]ماندوو دەبن.

## ( ١٧٤ ) شەونوێژی پێغەمبەرو( ﷺ ) پارانەوەکانی

٣٧٤ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنه) قَالَ: بِتُّ لَيْلَةً عِنْدَ خَالَتِي مَيْمُونَةَ، فَقَامَ النَّبِيُّ (ﷺ) مِنَ اللَّيْلِ فَأَتَى حَاجَتَهُ، ثُمَّ غَسَلَ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ، ثُمَّ نَامَ، ثُمَّ قَامَ، فَأَتَى الْقِرْبَةَ فَأَطْلَقَ شِنَاقَهَا، ثُمَّ تَوَضَّأَ وُضُوءًا بَيْنَ الْوُضُوءَيْنِ وَلَمْ يُكْثِرْ، وَقَدْ أَبْلَغَ، ثُمَّ قَامَ فَصَلَّى، فَقُمْتُ فَتَمَطَّيْتُ، كَرَاهِيَةَ أَنْ يَرَى أَنِّي كُنْتُ أَنْتَبِهُ لَهُ، فَتَوَضَّأْتُ، فَقَامَ فَصَلَّى، فَقُمْتُ عَنْ يَسَارِهِ، فَأَخَذَ بِيَدِي فَأَدَارَنِي عَنْ يَمِينِهِ، فَتَتَامَّتْ صَلَاةُ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) مِنَ اللَّيْلِ ثَلَاثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً، ثُمَّ اضْطَجَعَ فَنَامَ حَتَّى نَفَخَ (ﷺ)، وَكَانَ إِذَا نَامَ نَفَخَ، فَأَتَاهُ بِلَالٌ فَآذَنَهُ بِالصَّلَاةِ، فَقَامَ فَصَلَّى وَلَمْ يَتَوَضَّأْ، وَكَانَ فِي دُعَائِهِ: ((اللَّهُمَّ اجْعَلْ فِي قَلْبِي نُورًا، وَفِي بَصَرِي نُورًا، وَفِي سَمْعِي نُورًا، وَعَنْ يَمِينِي نُورًا، وَعَنْ يَسَارِي نُورًا، وَفَوْقِي نُورًا، وَتَحْتِي نُورًا، وَأَمَامِي نُورًا، وخَلْفِي نُورًا، وَعَظِّمْ لِي نُورًا)). قَالَ كُرَيْبٌ: وَسَبْعًا فِي التَّابُوتِ. فَلَقِيتُ بَعْضَ وَلَدِ الْعَبَّاسِ، فَحَدَّثَنِي بِهِنَّ فَذَكَرَ: ((عَصَبِي وَلَحْمِي وَدَمِي وَشَعْرِي وَبَشَرِي)) وَذَكَرَ خَصْلَتَيْنِ.
[بخاري/ الدعوات/ ٥٩٥٧]

(ابن عباس)(رضي الله عنه) دەڵێ: شەوێکیان لای پووره(میمونه)م مامەوە، شەو پێغەمبەر(ﷺ) هەستا چووە دەرەوە بۆسەرئاو، ئینجا دەستو دەموچاوی شۆردو هاتەوە خەوتەوە، ئینجا هەستایەوە، هاتە لای کونەی ئاوەکەوە دەستنوێژێکی مام ناوەندی گرت کەزۆر پێیەوە خەریك نەبوو، بەڵام تەواویش بوو ، ئنجا هەستاو دەستیکرد بە نوێژکردن ، منیش هەستامو خۆم کێشایەوە ﴿وەکو ئێستا بەئاگاهاتبمەوە﴾ بۆئەوەی ئەو وانەزانێ کەمن بەئاگابوومو ئاگام لێی بووە، دەستنوێژم گرت، ئەوهەستایەوە بۆ نوێژ ، منیش لەلای چەپییەوە راوەستام، بەڵام دەستی گرتمو خستمیە لای راستییەوە نوێژی ئەو شەوەی پێغەمبەر(ﷺ) بەسیانزە رکات تەواو بوو، پاشان راکشاو نوست هەتا پرخەی لێوەهات پێغەمبەر کەدەخەوت پرخەی دەهات، ئینجا بلال هات ئاگاداری کرد کەکاتی نوێژە، هەستاودەستیکرد بەنوێژکردنو دەستنوێژی نەگرت.﴿پاشان لەخوا پاڕایەوەو﴾ لەپاڕانەوەکەشیدا ئەمە هەبوو: ((خوایە گیان (نور)و رووناکی بخەرە دڵمەوە، رووناکی بخەرەوە بینینمەوە، روناکی بخەره

بیستنمەوە، ڕووناکی بخەرە لای ڕاستمەوە، ڕووناکی بخەرە لای چەپمەوە، ڕووناکی لەسەرمەوە ڕووناکی لەژێرمەوە ، ڕووناکی لەبەردەمما، ڕووناکی لەپشتمەوە، ڕووناکی گەورەو فراوان بکەی بۆم.

(کریب) دەڵێ: حەوت شوێنیتریشی وت لەلاشەی ئادەمیزاد (من لەبیرم چوون) بەلام گەیشتم بە یەکێ لەنەوەی عباس باسی ئەو حەوتەی بۆکردم کەئەمانەن: دەمارەکانم، گۆشتم، خوێنم، مووەکانم، پێستم، دووشتی تریشی وت: ﴿لەبیرم نەماون﴾ .

٣٧٥ـ عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِذَا قَامَ مِنَ اللَّيْلِ لِيُصَلِّيَ، افْتَتَحَ صَلَاتَهُ بِرَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ.

عائشه (رضي الله عنها) دەڵێ:پێغەمبەری خوا(ﷺ) کە لەشەودا هەڵدەستا بۆ نوێژکردن، بەدوو ڕکاتی سووك دەستی پێدەکرد.

## (١٧٥) پاڕانەوەی پێغەمبەر(ﷺ) لەکاتی شەو نوێژدا

٣٧٦ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) كَانَ يَقُولُ إِذَا قَامَ إِلَى الصَّلَاةِ مِنْ جَوْفِ اللَّيْلِ: ((اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ نُورُ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ، وَلَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ قَيَّامُ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ، وَلَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ رَبُّ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ، أَنْتَ الْحَقُّ، وَوَعْدُكَ الْحَقُّ، وَقَوْلُكَ الْحَقُّ، وَلِقَاؤُكَ حَقٌّ، وَالْجَنَّةُ حَقٌّ، وَالنَّارُ حَقٌّ، وَالسَّاعَةُ حَقٌّ. اللَّهُمَّ لَكَ أَسْلَمْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ، وَعَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ، وَإِلَيْكَ أَنَبْتُ، وَبِكَ خَاصَمْتُ، وَإِلَيْكَ حَاكَمْتُ. فَاغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَأَخَّرْتُ، وَ ﴿ما﴾ أَسْرَرْتُ وَأَعْلَنْتُ، أَنْتَ إِلَهِي، لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ)). [بخاري/ التوحيد/ ٧٠٦٠]

(ابن عباس) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەگەر لەقوڵایی شەودا هەستابایە بۆ نوێژکردن دەیفەرموو: ((خوایەگیان، سوپاس بۆ تۆیە ، تۆ ڕووناکی ئاسمانەکان و زەویت، سوپاس بۆ تۆ ، تۆ ڕاگری ئاسمانەکان و زەویت، سوپاس بۆ تۆ، پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی لەناویاندایە، تۆ ڕاستیت بەڵێنەکەت ڕاستە، قسەکانت ڕاستن، بەدیدار گەیشتنت ڕاستە، بەهەشت ڕاستە، ئاگر ڕاستە، ڕۆژی قیامەت ڕاستە، خوایە، تەنها خۆم بەتۆ سپاردووە، ئیمانم بەتۆ هێناوە، تەنها پشتم بەتۆ بەستووە، بۆلای تۆ دەگەڕێمەوە، لەپێناو تۆداو بەپشتیوانی تۆ دژایەتی ﴿بێباوەڕان﴾م کردووە، تەنها بۆلای شەرعەکەی تۆ دەگەڕێمەوە، دە خۆش ببە لەگوناهە

پێشـوەکان و دواییــەکانم، لەوانـەش کەشـاردومنەتەوەو لەوانــەش کەئاشـکرام کـردوون، تۆ فریـادڕەس و فـەرمانڕەوای منـی هیـچ فریـادڕەس و فەرمانڕەوایــەك نییە جگە لەتۆ)).

### ( ١٧٦ ) چۆنیەتی شەونوێژو ژمارەی رکاتەکانی

٣٧٧ـ عَنْ عَائِشَةَ (﵂) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ ثَلَاثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً، يُوتِرُ مِنْ ذَلِكَ بِخَمْسٍ، لَا يَجْلِسُ فِي شَيْءٍ إِلَّا فِي آخِرِهَا.

(عائشە) (﵂) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەشـەودا سیانزە رکات نوێـژی دەکرد، لەوانە پێنج رکاتی بەسەریەکەوە دەکرد، دانەدەنیشت ، [واتە:تەحیاتی نەدەخوێند]تا دوا رکات واتە ئەو پێنج رکاتەی بەیەك تحیات کردووە﴾.

### ( ١٧٧ ) شەونوێژ دوودووەو وەتریش یەك رکاتە لەکۆتایی شەودا

٣٧٨ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (﵄): أَنَّ رَجُلًا سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) عَنْ صَلَاةِ اللَّيْلِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((صَلَاةُ اللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى، فَإِذَا خَشِيَ أَحَدُكُمُ الصُّبْحَ صَلَّى رَكْعَةً وَاحِدَةً تُوتِرُ لَهُ مَا قَدْ صَلَّى)). [بخاري/ الوتر/ ٩٤٦]

(ابن عمر)(﵄) دەڵێ: پیاوێك پرسیاری لەپێغەمبەری خوا(ﷺ) کـرد لـەبارەی شــەونوێژەوە؟ پێغەمبــەر(ﷺ)فــەرمووی: ((نوێــژی شــەو دوو دووە، ئەگــەر یەکێکتان ترسا رۆژ ببێتـەوە، باتاکە رکاتێك ئەو نوێژانـەی کردوونــی تاکیـان بکاتەوە)).

### ( ١٧٨ ) شەونوێژ بە پێوەو بەدانیشتنەوە

٣٧٩ـ عَنْ عَائِشَةَ (﵂) قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقْرَأُ فِي شَيْءٍ مِنْ صَلَاةِ اللَّيْلِ جَالِسًا، حَتَّى إِذَا كَبِرَ قَرَأَ جَالِسًا، حَتَّى إِذَا بَقِيَ عَلَيْهِ مِنَ السُّورَةِ ثَلَاثُونَ أَوْ أَرْبَعُونَ آيَةً قَامَ فَقَرَأَهُنَّ، ثُمَّ رَكَعَ. [بخاري/ التهجد/ ١٠٩٣]

(عائشە) (﵂) دەڵێ: نەمدیوە پێغەمبـەر(ﷺ) بەدانیشـتنەوە قورئـان بخوێنـێ لەنوێژدا، هەتا بەساڵاچوو، کەبەساڵاچوو ئینجا بەدانیشتنەوە دەیخوێند، هـەتا لەسوورەتێکا سی چل ئایـەتی دەما ئینجا هەڵدەستایەوە بـەپێوە دەیخوێنـد ، ئینجا رکوعی دەبرد).

## ( ١٧٩ )گەراهەتیهەیە
## پیاو هەموو شەوەکە بخەوێو نوێژی تێدا نەکات

٣٨٠ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مسعود (ﷺ) قَالَ: ذُكِرَ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) رَجُلٌ نَامَ لَيْلَةً حَتَّى أَصْبَحَ، قَالَ: ((ذَاكَ رَجُلٌ بَالَ الشَّيْطَانُ فِي أُذُنَيْهِ)) أَوْ قَالَ: ((فِي أُذُنِهِ)). [بخاري/ التهجد/ ١٠٩٣]

(عبدالله) کوری(مسعود) (ﷺ) دەڵێ: لەخزمەت پێغەمبەری خوادا(ﷺ) باسی پیاوێکیـان کـرد کـە شـەوێکیان هـەتا نوێـژی بـەیانی خـەوتووە، فـەرمووی: ((ئەوەپیاوێکە شەیتان میزی کردۆتە گوێکانیەوە)) یافەرمووی ((گوییەوە)).

## ( ١٨٠ ) ئەگەر کەسێك لەنوێژدا وەنەوزیدا باڕاکشێت

٣٨١ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: ((إِذَا نَعَسَ أَحَدُكُمْ فِي الصَّلَاةِ فَلْيَرْقُدْ حَتَّى يَذْهَبَ عَنْهُ النَّوْمُ، فَإِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا صَلَّى وَهُوَ نَاعِسٌ، لَعَلَّهُ يَذْهَبُ يَسْتَغْفِرُ فَيَسُبُّ نَفْسَهُ)). [بخاري/ الوضوء/ ٢٠٩]

(عائشه) (ﷺ) دەڵێ پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ((ئەگەر یەکێکتان لەنوێژا خەوەنوچکـە بردیـەوە، باڕاکشـێت، تاخەوەکـەی دەڕوات، چونکـە ئەگـەر بەخەواڵویی نوێژ بکات لەوانەیە لەباتی ئەوەی داوای لێخۆشبوون بکات قسە بەخۆی بڵێت)).

## ( ١٨١ ) ئەوەی گرێکانی شەیتان دەکاتەوە

٣٨٢ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) -يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ (ﷺ)- قَالَ: ((يَعْقِدُ الشَّيْطَانُ عَلَى قَافِيَةِ رَأْسِ أَحَدِكُمْ ثَلَاثَ عُقَدٍ إِذَا نَامَ، بِكُلِّ عُقْدَةٍ يَضْرِبُ: عَلَيْكَ لَيْلًا طَوِيلًا، فَإِذَا اسْتَيْقَظَ فَذَكَرَ اللَّهَ ﴿ﷻ﴾ انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ، وَإِذَا تَوَضَّأَ انْحَلَّتْ عَنْهُ عُقْدَتَانِ، فَإِذَا صَلَّى انْحَلَّتِ الْعُقَدُ، فَأَصْبَحَ نَشِيطًا طَيِّبَ النَّفْسِ، وَإِلَّا أَصْبَحَ خَبِيثَ النَّفْسِ كَسْلَانَ)). [بخاري/ التجهد/ ١٠٩١]

لـە(ابوهریـرە)وە (ﷺ) کەدەیگـەیاندە پێغەمبـەر(ﷺ) پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی: ((ئەگـەر یـەکێکتان خـەوت شـەیتان سـێ گـرێ دەدات لەپشـتی سەری، لەهەر گرێیەکیدا دەڵێ: لەشەوێکی درێژدا بخەوە، بەڵام ئەگەر هەستاو ناوی خوای هێنا ﴿ عزوجل ﴾گرێیەکیان دەکرێتەوە، ئەگەر دەستنوێژی گرت دووەمیشیان دەکرێتەوە، ئینجا ئەگـەر نوێـژی کـرد هەرسـێکیان دەکرێنـەوە، ئینجا چالاکو دەروون ئاسودە دەبێت، ئەگەر وانەکات دڵپیس و تەمەڵ دەبێت)).

## ( ١٨٢ ) لەشەودا ساتێك هەیە كە دۆعای تێدا وەردەگیرێت

٣٨٣ـ عَنْ جَابِرٍ (ﷺ) قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: ((إِنَّ فِي اللَّيْلِ لَسَاعَةً، لَا يُوَافِقُهَا رَجُلٌ مُسْلِمٌ يَسْأَلُ اللَّهَ خَيْرًا مِنْ أَمْرِ الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ إِلَّا أَعْطَاهُ، إِيَّاهُ وَذَلِكَ كُلَّ لَيْلَةٍ)).

(جابر) (ﷺ) دەڵێ: بیستوومە لەپێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ((لەشەودا ساتێك هەیە ئەگەر موسڵمان رێكەوتی بكات لەكاتێكا لەخوا دەپارێتەوە بۆ كاری خێری دنیاو قیامەت ئەوا داواكاریەكەی بۆ دابین دەكات، ئەوساتەش لەهەموو شەوێكدا هەیە)).

## ( ١٨٣ ) هاندان بۆ پارانەوەو یادی خوا لەكۆتایی شەودا

٣٨٤ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) أن رَسُولِ اللَّه (ﷺ) قَالَ: ((يَنْزِلُ اللَّهُ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا كُلَّ لَيْلَةٍ، حِينَ يَمْضِي ثُلُثُ اللَّيْلِ الْأَوَّلُ، فَيَقُولُ: أَنَا الْمَلِكُ أَنَا الْمَلِكُ. مَنْ ذَا الَّذِي يَدْعُونِي فَأَسْتَجِيبَ لَهُ؟ مَنْ ذَا الَّذِي يَسْأَلُنِي فَأُعْطِيَهُ؟ مَنْ ذَا الَّذِي يَسْتَغْفِرُنِي فَأَغْفِرَ لَهُ، فَلَا يَزَالُ كَذَلِكَ حَتَّى يُضِيءَ الْفَجْرُ)).

(ابوهریره) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: ((هەموو شەوێك كاتێ سێیەكی شەو تێدەپەڕێت ،خوای گەورە دادەبەزێتە ئاسمانی یەكەمی دنیاو دەفەرموێت: ( من پادشام، من یەكەمی پادشام، كێ داخوازی هەیە لێم باوەڵامی بدەمەوە، كێیە داواكاریی لێم هەیە تابیدەمێ؟ كێیە داوای لێخۆشبوونم لێدەكات تالێی خۆشبم ، هەر بەوشێوەیە دەبێ هەتا بەرەبەیان ڕووندەبێتەوە)).

## ( ١٨٤ ) پوختەی باسی شەونوێژو

## كەسێ نەیكرد لەبەر خەویا لەبەر نەخۆشی

٣٨٥ـ عَنْ زُرَارَةَ: أَنَّ سَعْدَ بْنَ هِشَامِ ابْنِ عَامِرٍ أَرَادَ أَنْ يَغْزُوَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ (ﷻ)، فَقَدِمَ الْمَدِينَةَ، فَأَرَادَ أَنْ يَبِيعَ عَقَارًا ﴿لَهُ﴾ بِهَا، فَيَجْعَلَهُ فِي السِّلَاحِ وَالْكُرَاعِ، وَيُجَاهِدَ الرُّومَ حَتَّى يَمُوتَ، فَلَمَّا قَدِمَ الْمَدِينَةَ لَقِيَ أُنَاسًا مِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ، فَنَهَوْهُ عَنْ ذَلِكَ، وَأَخْبَرُوهُ: أَنَّ رَهْطًا سِتَّةً أَرَادُوا ذَلِكَ فِي حَيَاةِ نَبِيِّ اللَّهِ (ﷺ)، فَنَهَاهُمْ نَبِيُّ اللَّهِ (ﷺ) وَقَالَ: ((أَلَيْسَ لَكُمْ فِيَّ أُسْوَةٌ)). فَلَمَّا حَدَّثُوهُ بِذَلِكَ رَاجَعَ امْرَأَتَهُ وَقَدْ كَانَ طَلَّقَهَا، وَأَشْهَدَ عَلَى رَجْعَتِهَا، فَأَتَى ابْنَ عَبَّاسٍ فَسَأَلَهُ عَنْ وِتْرِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)؟ فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: أَلَا أَدُلُّكَ عَلَى أَعْلَمِ أَهْلِ الْأَرْضِ بِوِتْرِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)؟

قَالَ: مَنْ؟ قَالَ: عَائِشَةُ (ﷺ)، فَأْتِهَا فَاسْأَلْهَا، ثُمَّ ائْتِنِي فَأَخْبِرْنِي بِرَدِّهَا عَلَيْكَ. فَانْطَلَقْتُ إِلَيْهَا، فَأَتَيْتُ عَلَى حَكِيمِ بْنِ أَفْلَحَ، فَاسْتَلْحَقْتُهُ إِلَيْهَا، فَقَالَ: مَا أَنَا بِقَارِبِهَا، لِأَنِّي نَهَيْتُهَا أَنْ تَقُولَ فِي هَاتَيْنِ الشِّيعَتَيْنِ شَيْئًا، فَأَبَتْ فِيهِمَا إِلَّا مُضِيًّا. قَالَ: فَأَقْسَمْتُ عَلَيْهِ فَجَاءَ، فَانْطَلَقْنَا إِلَى عَائِشَةَ (ﷺ) فَاسْتَأْذَنَّا عَلَيْهَا، فَأَذِنَتْ لَنَا، فَدَخَلْنَا عَلَيْهَا، فَقَالَتْ: أَحَكِيمٌ؟ فَعَرَفَتْهُ، فَقَالَ: نَعَمْ. فَقَالَتْ: مَنْ مَعَكَ؟ قَالَ: سَعْدُ بْنُ هِشَامٍ، قَالَتْ: مَنْ هِشَامٌ؟ قَالَ: ابْنُ عَامِرٍ، فَتَرَحَّمَتْ عَلَيْهِ، وَقَالَتْ خَيْرًا -قَالَ قَتَادَةُ: وَكَانَ أُصِيبَ يَوْمَ أُحُدٍ- فَقُلْتُ: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ أَنْبِئِينِي عَنْ خُلُقِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَتْ: أَلَسْتَ تَقْرَأُ الْقُرْآنَ؟ قُلْتُ: بَلَى، قَالَتْ: فَإِنَّ خُلُقَ نَبِيِّ اللَّهِ (ﷺ) كَانَ الْقُرْآنَ، قَالَ: فَهَمَمْتُ أَنْ أَقُومَ وَلَا أَسْأَلَ أَحَدًا عَنْ شَيْءٍ حَتَّى أَمُوتَ، ثُمَّ بَدَا لِي فَقُلْتُ: أَنْبِئِينِي عَنْ قِيَامِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ). فَقَالَتْ: أَلَسْتَ تَقْرَأُ: ﴿يَا أَيُّهَا الْمُزَّمِّلُ﴾؟ قُلْتُ: بَلَى، قَالَتْ: فَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ افْتَرَضَ قِيَامَ اللَّيْلِ فِي أَوَّلِ هَذِهِ السُّورَةِ، فَقَامَ نَبِيُّ اللَّهِ (ﷺ) وَأَصْحَابُهُ حَوْلًا، وَأَمْسَكَ اللَّهُ خَاتِمَتَهَا اثْنَيْ عَشَرَ شَهْرًا فِي السَّمَاءِ حَتَّى أَنْزَلَ اللَّهُ فِي آخِرِ هَذِهِ السُّورَةِ التَّخْفِيفَ، فَصَارَ قِيَامُ اللَّيْلِ تَطَوُّعًا بَعْدَ فَرِيضَةٍ. قَالَ: قُلْتُ: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ أَنْبِئِينِي عَنْ وِتْرِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ). فَقَالَتْ: كُنَّا نُعِدُّ لَهُ سِوَاكَهُ وَطَهُورَهُ، فَيَبْعَثُهُ اللَّهُ مَا شَاءَ أَنْ يَبْعَثَهُ مِنَ اللَّيْلِ، فَيَتَسَوَّكُ وَيَتَوَضَّأُ وَيُصَلِّي تِسْعَ رَكَعَاتٍ، لَا يَجْلِسُ فِيهَا إِلَّا فِي الثَّامِنَةِ، فَيَذْكُرُ اللَّهَ وَيَحْمَدُهُ وَيَدْعُوهُ، ثُمَّ يَنْهَضُ وَلَا يُسَلِّمُ، ثُمَّ يَقُومُ فَيُصَلِّ التَّاسِعَةَ، ثُمَّ يَقْعُدُ فَيَذْكُرُ اللَّهَ وَيَحْمَدُهُ وَيَدْعُوهُ، ثُمَّ يُسَلِّمُ تَسْلِيمًا يُسْمِعُنَا، ثُمَّ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ بَعْدَ مَا يُسَلِّمُ وَهُوَ قَاعِدٌ، وَتِلْكَ إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً يَا بُنَيَّ، فَلَمَّا سَنَّ نَبِيُّ اللَّهِ (ﷺ) وَأَخَذَهُ اللَّحْمُ أَوْتَرَ بِسَبْعٍ، وَصَنَعَ فِي الرَّكْعَتَيْنِ مِثْلَ صَنِيعِهِ الْأَوَّلِ، فَتِلْكَ تِسْعٌ يَا بُنَيَّ، وَكَانَ نَبِيُّ اللَّهِ (ﷺ) إِذَا صَلَّى صَلَاةً أَحَبَّ أَنْ يُدَاوِمَ عَلَيْهَا، وَكَانَ إِذَا غَلَبَهُ نَوْمٌ أَوْ وَجَعٌ عَنْ قِيَامِ اللَّيْلِ صَلَّى مِنَ النَّهَارِ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً، وَلَا أَعْلَمُ نَبِيَّ اللَّهِ (ﷺ) قَرَأَ الْقُرْآنَ كُلَّهُ فِي لَيْلَةٍ، وَلَا صَلَّى لَيْلَةً إِلَى الصُّبْحِ، وَلَا صَامَ شَهْرًا كَامِلًا غَيْرَ رَمَضَانَ. قَالَ: فَانْطَلَقْتُ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ فَحَدَّثْتُهُ بِحَدِيثِهَا، فَقَالَ: صَدَقَتْ لَوْ كُنْتُ أَقْرَبُهَا أَوْ أَدْخُلُ عَلَيْهَا لَأَتَيْتُهَا حَتَّى تُشَافِهَنِي بِهِ. قَالَ: قُلْتُ: لَوْ عَلِمْتُ أَنَّكَ لَا تَدْخُلُ عَلَيْهَا مَا حَدَّثْتُكَ.

(زرارة)دەڵـێ: (سعد) کوری(هشام) کوری(عـامر) (ﷺ) ویسـتی غـەزابکات لەرێی خـوا(عزوجل) هات بۆ مەدینە، ویستی ئەو زەوییەی لەمەدینە هەیبوو

بیفرۆشێت، بیدات بەچەك و تفاقی جەنگی، بۆئەوەی تا ئەمرێت غەزای رومی پێبکات، کەهاتەمەدینە گەیشت بەچەند کەسێك لەخەڵکی مەدینە، رێگایان نەدا ئەوکارە بکات، پێیان راگەیاند کە لەسەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) کۆمەڵێکی شەش کەسی ویستیان ئەو کارە بکەن، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) رێگای پێنەدان و پێی فەرموون: (( ئایا لەمنا پێشەنگی و سەر مەشقی نابینن؟ )) کاتێ ئەوەیان بۆسەعد گێرایەوە، سەعد ژنەکەی گێرایەوە ژێرسایەی خۆی کەپێشتر تەڵاقی دابوو، شایەتیشی لەسەر گێڕانەوەی ژنەکەی گرت، ئینجا سەعد هاتە خزمەت(ابن عباس). پرسیاری وەتری پێغەمبەری(ﷺ) لێکرد، ئەویش پێی وت: بۆ کەسێکت نیشان نەدەم کەلەخەڵکی سەرزەویدا لەهەموو کەس شارەزاترە بە وەتری پێغەمبەری خوا( ؟ وتی: کێیە؟ وتی(عائیشە) (رضی الله عنها). بچۆ بۆ لای، لێی بپرسەو، لەدواییدا هەواڵەکەش بۆ من بهێنەرەوە. ﴿سەعد دەڵێ﴾کەوتمە رێ بۆ لای (عائشە) ، لەرێگادا چووم بۆ لای (حکیم) کوری (افلح) داوام لێکرد کەلەگەڵما بێت وتی: من نایەم بۆلای، چونکە ئاگادارم کرد کە لەناکۆکی نێوان ئەو دوو کۆمەڵە(علی و معاویە)دا هیچ نەڵێ، بەڵام گوێی نەدایێ و قسەی تێداکرد. سەعد وتی: سوێندم خوارد کەبێت (حەکیم) ئینجا هات و چووین بۆ لای عائیشە، داوای مۆڵەتمان لێکرد، ئەویش مۆڵەتی داین ، چووینە ژوورەوە، عائیشە وتی: تۆ حەکیمی ؟ ناسیی ، وتی: بەڵێ، ئەویش وتی: کێت لەگەڵدایە؟ وتی: (سەعد کوری هیشام) وتی: کام هیشام؟ وتی: کوری(عامر) دۆعای خێری بۆکردو ناوی بەچاك برد. (قتادە) دەڵێ:عامر(ﷺ) لەجەنگی (احد) شەهیدبوو.

سەعد دەڵێ: بەعائیشەم وت: ئەی دایکی ئیمانداران، ئاگادارم بکە لەرەوشتی پێغەمبەر(ﷺ) وتی: ئایا تۆ قورئان ناخوێنی؟ وتم: بەڵێ،وتی: رەوشتی پێغەمبەر(ﷺ) قورئان بووە ، ویستم هەستم و هەتا ماوم هیچ شتێ لەکەس نەپرسم، دوایی بیرم کردەوە وتم: ئاگادارم بکە لەبارەی هەستانی شەوی بۆ شەونوێژ، ئەویش وتی: ئایا ﴿ یا ایها المزمل ﴾ناخوێنی؟ وتم: بەڵێ. وتی: خوای گەورە لەسەرەتای ئەم سوورەتەدا شەونوێژی فەرزکرد هەتا ساڵێك پێغەمبەرو (ﷺ) هاوەڵانی کردیان، خوای گەورە کۆتایی ئەم سوورەتەی دوانزە مانگ لەئاسمانا هێشتەوەو نەیناردە خوارەوە، لەدوای ساڵێك لەکۆتایی

ئـەم سـوورەتەدا ئاسـانكاریی نـاردە خـوارەوەو كــردی بەســوونەت. دوای فەرزبوونی.

سەعد دەڵێ: پرسیم لەعائیشەو وتم: ئەی دایكی ئیمانداران ئاگادارم بكە لەوەتری پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش وتـی: سیواك‌و ئاوی دەستنوێژمان بۆ ئامادە دەكـرد ئـەوەندەی خواویستی لەسـەر بوایـە لەشـەوودا بێـداری دەكـردەوەو سیواكی دەكردو، دەستنوێژی دەشت‌و نۆ ركاتی دەكرد، لەركاتی هەشـتەما نـەبێ لـەهیچیاندا دانەدەنیشت، كەدادەنیشـت یـادو سوپاسـی خوای‌دەكـردو دۆعـای دەكـرد، سـەلامی نەدەدایـەوە هەڵدەسـتایەوە ركـاتی نۆیـەكی دەكـرد، لەپاشـا دادەنیشـت‌و یـادو سوپاسـی خـواو دۆعـای دەكـردو ئینجـا سـەلامی دەدایەوە دەیدا بەگوێماندا.

ئینجا دووركاتی بەدانیشتنەوەدەكرد ئەوە یانزە ركات ئەی كوری شیرینم كـاتێ پیربوو، گۆشتی گرت حـەوت ركـات وەتـری دەكـرد، هـەرچۆن دووركـاتی بەدانیشتنەوە لەدوای نۆركاتەكە دەكـرد، لـەدوای حەوتەكـەش دووركاتەكـەی بەدانیشـتنەوە دەكـرد ئـەوەنۆركات ئـەی كوری‌شـیرینم ، پێغەمبـەر(ﷺ) هـەر نوێژێكی بكردایە حەزی دەكرد كەبەردەوام بێت لەسەری. هەركاتیێكیش خـەو یا ئازار زۆری بۆ بهێنایـەو نەیتوانیایە شـەو هەسـتێ بـەرۆژدا دوانـزە ركـاتی دەكـرد. هـەرگیز ئاگـادارنیم كەپێغەمبـەر(ﷺ) لەشـەوێكدا هـــەموو قورئـــانی خوێندبێـت، هیـچ شـەوێك هەتابـەیانی نوێـژی نـەكردووە جگـە لەلـەمانگی رەمەزانیش هیچ مانگێك بەتەواوی بەرۆژو نەبووە.

سەعد دەڵێ: چووم بۆلای (ابن عبسا) (ﷺ) وەلامەكەی (عائیشە)م (رضی الله عنها) بۆ بردەوە ئـەویش وتـی: راسـتی وتـووە، ئەگـەر مـن بچومایـە بـۆلای‌و سەردانم بكردایە، ئەچووم بۆئەوەی لەدەمی خۆی ئەمەم ببیستایە سەعد وتـی: ئەگـەر بمزانیایە كـەتۆ لێـی دڵگرانـی‌و سەردانی ناكـەیت ، فەرموودەكـەیم بـۆ نەدەگێرایتەوە.

## ( ١٨٥ ) نوێژی وتر

٣٨٦ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: مِنْ كُلِّ اللَّيْلِ قَدْ أَوْتَرَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)،مـن أول الليل، وأوسطه، وآخره، فَانْتَهَى وِتْرُهُ إِلَى السَّحَرِ. [بخاري/ الوتر/ ٩٥١]

عائیشه(رضی الله عنها) دەڵێ: لەهەموو کاتەکانی شەودا پێغەمبەر( وەتری کـردووە، لەســـەرتای شـــەوداو لەناوەراســـتی شـــەوداو، لـــەکۆتایی شـــەودا، ﴿لەکۆتایی تەمەنیدا ﴾وەترەکەی بردۆتە کاتی پارشێو.

## ( ١٨٦ ) لەوەترو دوورکاتی بەرەبەیاندا

٣٨٧ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ سِيرِينَ (ﷺ) قَالَ: سَأَلْتُ ابْنَ عُمَرَ، قُلْتُ: أَرَأَيْتَ الرَّكْعَتَيْنِ قَبْلَ صَلَاةِ الْغَدَاةِ أُطِيلُ فِيهِمَا الْقِرَاءَةَ؟ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى وَيُوتِرُ بِرَكْعَةٍ. قَالَ: قُلْتُ: إِنِّي لَسْتُ عَنْ هَذَا أَسْأَلُكَ. قَالَ: إِنَّكَ لَضَخْمٌ، أَلَا تَدَعُنِي أَسْتَقْرِئُ لَكَ الْحَدِيثَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى، وَيُوتِرُ بِرَكْعَةٍ، وَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْغَدَاةِ كَأَنَّ الْأَذَانَ بِأُذُنَيْهِ.
[بخاري/ الوتر/ ٩٤٦]

(انس) کوری( سیرین) (ﷺ) دەڵـێ: لە(ابن عمر) پرسی وتم: ئایا ئاگاداری لەدوورکاتی پێش نوێژی بەیانی ئایا خویندنی بەدرێژی تیا دەخوێنـد؟ وتـی: پێغەمبەر(ﷺ) لەشەودا دوورکات نوێژی دەکردو وەتریشی بەیەك رکات ، وتم من ئەوەت لێ ناپرسم، وتی: تۆ زلی [واتە گێلی] ئایا ناهێڵی هەموو فەرمودەکەت بۆ بخوێنمەوە : پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەشەودا جوت جوت نوێژی دەکرد، بەیەك رکاتیش دوایی دەهێنا، دوورکاتیشی دەکرد پێش نوێژی بەیانی وەکو بانگەکە [مەبەستی قامەتە] لەگوێیدا بزرنگێتەوە [واتە: دوورکاتی کورتی دەکرد].

## ( ١٨٧ ) ئەوەی دەترسێ لەکۆتایی شەودا بەئاگانەیەتەوە با لەسەرەتاوە وەتر بکات

٣٨٨ـ عَنْ جَابِرٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((مَنْ خَافَ أَنْ لَا يَقُومَ مِنْ آخِرِ اللَّيْلِ فَلْيُوتِرْ أَوَّلَهُ، وَمَنْ طَمِعَ أَنْ يَقُومَ آخِرَهُ فَلْيُوتِرْ آخِرَ اللَّيْلِ، فَإِنَّ صَلَاةَ آخِرِ اللَّيْلِ مَشْهُودَةٌ، وَذَلِكَ أَفْضَلُ)).

(جابر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: ( ئەوەی دەترسێ لەکۆتایی شەودا بەئاگانەیەتەوە بالەســەرەتای شـەوەوە وەترەکـەی بکـات، ئەوکەسەیش کە بتەمایە لەکۆتایی شەودا هەستێ با لەکۆتایی شەودا وەترەکەی بکات، چونکە نوێژی کۆتایی شەو فریشتەکان شایەتی بۆ دەدەن ، ئەمەشیان باشترە).

## (١٨٨) وەتـر بكەن پێش ئەوەی ڕۆژ بێتەوە

٣٨٩ـ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخـدري (ﷺ): أَنَّ النَّبِـيَّ (ﷺ) قَـالَ: ((أَوْتِـرُوا قَبْـلَ أَنْ تُصْبِحُوا)).

(ابو سعيد) كوری(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( وەتربكەن پێش ئەوەی ڕۆژبێتەوە).

## (١٨٩) خێری قورئان خوێندن لەنوێژدا

٣٩٠ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): ((أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ إِذَا رَجَعَ إِلَى أَهْلِه أَنْ يَجِدَ فِيه ثَلَاثَ خَلِفَاتٍ عِظَامٍ سِمَانٍ)). قُلْنَا: نَعَمْ. قَالَ: ((فَثَلَاثُ آيَاتٍ يَقْرَأُ بِهِنَّ أَحَدُكُمْ فِي صَلَاتِه خَيْرٌ لَهُ مِنْ ثَلَاثِ خَلِفَاتٍ عِظَامٍ سِمَانٍ)).

(ابوهريره) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: ئایا یەكێكتان پێی خۆشە كاتێ گەڕایەوە بۆ ماڵەوەیان، لەوێ سێ وشتری ئاوسی گەورەی قەڵەو لەماڵیان بێت) وتمان: بەڵێ فەرمووی: دە هەركەسێكتان لەنوێژەكەیدا سێ ئایەت بخوێنێ باشترە بۆی لەسێ وشتری ئاوسی گەورەی قەڵەو).

## (١٩٠) سوورەتەكانی (المفصل)[1]

٣٩١ـ عَنْ أَبِي وَائِلٍ (ﷺ) قَالَ: غَدَوْنَا عَلَى عَبْدِ اللَّه ابْنِ مَسْعُودٍ (ﷺ) يَوْمًا بَعْدَ مَا صَلَّيْنَا الْغَدَاةَ، فَسَلَّمْنَا بِالْبَابِ فَأَذِنَ لَنَا، قَالَ: فَمَكَثْنَا بِالْبَابِ هُنَيَّةً. قَالَ: فَخَرَجَتِ الْجَارِيَةُ فَقَالَتْ: أَلَا تَدْخُلُونَ؟ فَدَخَلْنَا فَإِذَا هُوَ جَالِسٌ يُسَبِّحُ، فَقَالَ: مَا مَنَعَكُمْ أَنْ تَدْخُلُوا وَقَدْ أُذِنَ لَكُمْ؟ فَقُلْنَا: لَا، إِلَّا أَنَّا ظَنَنَّا أَنَّ بَعْضَ أَهْلِ الْبَيْتِ نَائِمٌ. قَالَ: ظَنَنْتُمْ بِآلِ ابْنِ أُمِّ عَبْدٍ غَفْلَةً؟ قَالَ: ثُمَّ أَقْبَلَ يُسَبِّحُ حَتَّى ظَنَّ أَنَّ الشَّمْسَ قَدْ طَلَعَتْ، فَقَالَ: يَا جَارِيَةُ انْظُرِي هَلْ طَلَعَتْ؟ قَالَ: فَنَظَرَتْ فَإِذَا هِيَ لَمْ تَطْلُعْ؟ فَأَقْبَلَ يُسَبِّحُ، حَتَّى ﴿إِذَا﴾ ظَنَّ أَنَّ الشَّمْسَ قَدْ طَلَعَتْ، قَالَ: يَا جَارِيَةُ انْظُرِي هَلْ طَلَعَتْ؟ فَنَظَرَتْ فَإِذَا هِيَ قَدْ طَلَعَتْ. فَقَالَ: الْحَمْدُ لِلَّه الَّذِي أَقَالَنَا يَوْمَنَا هَذَا. فَقَالَ مَهْدِيٌّ: وَأَحْسِبُهُ قَالَ: وَلَمْ يُهْلِكْنَا بِذُنُوبِنَا. قَالَ: فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: قَرَأْتُ الْمُفَصَّلَ الْبَارِحَةَ كُلَّهُ. قَالَ: فَقَالَ عَبْدُ اللَّه: هَذًّا كَهَذِّ الشِّعْرِ، إِنَّا لَقَدْ سَمِعْنَا الْقَرَائِنَ، وَإِنِّي

---

[1] المفصل: بەشی كۆتایی قورئانە كە سوورەتەكانی كورتن و ئایەتەكانیش كورتن لەسوورەتی الحجراتەوە دەست پێدەكەن هەندێك رای جیاوازیش هەیە.

لَأَحْفَظُ الْقَرَائِنَ الَّتِي كَانَ يَقْرَؤُهُنَّ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ثَمَانِيَةَ عَشَرَ مِنَ الْمُفَصَّلِ، وَسُورَتَيْنِ مِنْ آلِ ﴿حم﴾. [بخاري/ فضائل القرآن/ ٤٧٥٦]

(ابووائل) (ﷺ) دەڵێ: ڕۆژێكیان لەبەرەبەیاندا دوای نوێژی بەیانی چووین بۆ لای (عبداللە) كوڕی(مسعود) (ﷺ) لەدەرگادرا سەلاممان كرد، ئەویش فەرمووی لێكردین، دەڵێ: كەمێك لەدەرگاكەدا وەستاین كە هاتە دەرەوەو وتی: ئایا نایەنە ژوورەوە؟ چووینە ژوورەوە دەبینین دانیشتووە تەزبیحات دەكات، وتی: چی رێی لێگرتن نەیەنە ژوورەوە خۆ فەرمووتان لێكرا؟ وتمان: ئێمە گومانمان وابوو كەخێزانی ماڵ نوستوون ، وتی: ئایاگومان وادەبەن بەكەسوكاری (ابن ام عبدالله) كەبێئاگابن؟ ئینجا دەستی كردەوەو بەتەزبیحات هەتا وای گومان برد كەخۆر كەوتووە، وتی: ئەی كەنیزەك تەماشا بكە بزانە خۆر كەوتووە كەئەویش تەماشای كرد هێشتا خۆرنەكەوتبوو، وتی: ئەی كەنیزەك : تەماشا بكە بزانە خۆر كەوتووە؟ تەماشای كرد خۆرنەكەوتبوو ئەویش فەرمووی: سوپاس بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیان كە ئەمرۆیش بەگوناهەكانمان نەیگرتین، پیاوێك لەخەڵكەكە وتی: ئەمشەوی رابوردوو هەمو سوورەتەكانی (المفصل)م گشت خوێندەوە، (عبدالله) وتی: دیارە بەپەلە وەك شیعر خوێندووتە، ئگاداربە كەمن (قرائن)ەكانم بیستووە لەپێغەمبەری خوا(ﷺ)و لەبەریشمن ئەوانەی كە پێغەمبەر(ﷺ) دەیخوێندەوە كە هەژدە سوورتن لە(المفصل)و دوو سوورەتیش لەگروپی حامیمەكان.

## (١٩١) ئەوەی لەبارەی نوێژی رەمەزاندا هاتووە

٣٩٢ـ عن عَائِشَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) خَرَجَ مِنْ جَوْفِ اللَّيْلِ، فَصَلَّى فِي الْمَسْجِدِ، فَصَلَّى رِجَالٌ بِصَلَاتِهِ، فَأَصْبَحَ النَّاسُ يَتَحَدَّثُونَ بِذَلِكَ، فَاجْتَمَعَ أَكْثَرُ مِنْهُمْ، فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فِي اللَّيْلَةِ الثَّانِيَةِ فَصَلَّوْا بِصَلَاتِهِ، فَأَصْبَحَ النَّاسُ يَذْكُرُونَ ذَلِكَ، فَكَثُرَ أَهْلُ الْمَسْجِدِ مِنَ اللَّيْلَةِ الثَّالِثَةِ، فَخَرَجَ فَصَلَّوْا بِصَلَاتِهِ، فَلَمَّا كَانَتِ اللَّيْلَةُ الرَّابِعَةُ عَجَزَ الْمَسْجِدُ عَنْ أَهْلِهِ، فَلَمْ يَخْرُجْ إِلَيْهِمْ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فَطَفِقَ رِجَالٌ مِنْهُمْ يَقُولُونَ: الصَّلَاةَ، فَلَمْ يَخْرُجْ إِلَيْهِمْ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) حَتَّى خَرَجَ لِصَلَاةِ الْفَجْرِ، فَلَمَّا قَضَى الْفَجْرَ أَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ ثُمَّ تَشَهَّدَ، فَقَالَ: ((أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّهُ لَمْ يَخْفَ عَلَيَّ شَأْنُكُمُ اللَّيْلَةَ، وَلَكِنِّي خَشِيتُ أَنْ تُفْرَضَ عَلَيْكُمْ صَلَاةُ اللَّيْلِ فَتَعْجِزُوا عَنْهَا)). وفي رواية: ذلك في رمضان. [بخاري/ الجمعة/ ٨٨٢]

(عائشه) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) شەوێکیان چووه مزگەوت نوێژی کرد، چەند پیاوێك نوێژیـان لەگـەڵدا کـرد ، خـەڵکی بـۆ سـبەینێ باسـی ئـەو نوێژەیـان کـرد ، خەڵك زۆرتـر کۆبوویـەوەو لـەدوای پێغەمبـەرەوە(ﷺ) نوێژیـان کرد ، بۆ سبەینێ باس لـەونوێژەکرا، لەشەوی سێیەمدا ئامادبووانی مزگەوت زۆرتربوون ، کاتێ هاته دەرەوە بۆ مزگەوت نوێژیـان لەگەڵداکرد، کـاتێ شـەوی چوارەم هات مزگەوتەکە کەسی تری نەدەگرت، پێغەمبەر(ﷺ) ئەو شەوە نەچوو بۆ مزگەوت کەنوێژیان بۆ بکات، بۆیە کەسانێك دەستیان کـرد بەقسـەکردن‌و دەیانوت: نوێژ، بەڵام پێغەمبەر ئەو شـەوە نەچوو بـۆ مزگـەوت کەنوێژیان بـۆ بکات، بۆیـە کەسانێك دەسـتیان کردبەقسـەکردن‌و دەیـانوت: نوێـژ ، بـەڵام پێغەمبەر(ﷺ) نەچوو بۆ ناویان، هەتا کاتی نوێژی بەیانی هات، کاتێ نوێژی بـەیانی کۆتـایی هـات رووی کـردە خەڵکەکـە، ئینجـا شـایەتومانێکی هێنـاو فەرمووی: ((کاروباری ئەمشەوی ئێوە بەمن شاراوە نەبوو لەوەترسام کـەنوێژی شەو فەرز بکرێـت لەسەرتان ئێوەش نەتوانن بیکـەن)) لەریوایەتێکیشا : ئـەوە لەرەمەزاندابوو.

## (١٩٢) هاندان بۆ شەونوێژی رەمەزان

٣٩٣ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يُرَغِّبُ فِي قِيَامِ رَمَضَانَ مِنْ غَيْرِ أَنْ يَأْمُرَهُمْ فِيهِ بِعَزِيمَةٍ، فَيَقُولُ: ((مَنْ قَامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ)). فَتُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وَالْأَمْرُ عَلَى ذَلِكَ، ثُمَّ كَانَ الْأَمْرُ عَلَى ذَلِكَ فِي خِلَافَةِ أَبِي بَكْرٍ، وَصَدْرًا مِنْ خِلَافَةِ عُمَرَ (ﷺ) عَلَى ذَلِكَ. [بخاري/ الإيمان/ ٣٧]

(ابوهریـره) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) هـانی دەدا بۆشـەونوێژی رەمەزان بەبێ‌ئەوەی فـەرمانیان پێ‌بکات، دەیفەرموو: ((هەرکـەس لەرەمـەزاندا بەبروای تەواوو بەهیوای پاداشتەوە شەونوێژ بکات، خوا لەگوناهە پێشوەکانی خۆش دەبێت)) هەتا پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی دوایی کـردو کـار بـەم شێوەیە بـوو ، لەسەردەمی ابوبکرو سەرەتای خەلافەتی عمریشدا (ﷺ) هـەر بـەو شێوەیە بـوو [مەبەست لەنوێژی تەراویحه].

# (٦) بەشەكانی جومعە

## ( ١ ) ڕێنمایی ئەم ئوممەتە بۆ دۆزینەوەی ڕۆژی جومعە

٣٩٤ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): ((نَحْنُ الْآخِرُونَ الْأَوَّلُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَنَحْنُ أَوَّلُ مَنْ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ، بَيْدَ أَنَّهُمْ أُوتُوا الْكِتَابَ مِنْ قَبْلِنَا، وَأُوتِينَاهُ مِنْ بَعْدِهِمْ، فَاخْتَلَفُوا، فَهَدَانَا اللَّهُ لِمَا اخْتَلَفُوا فِيهِ مِنَ الْحَقِّ، فَهَذَا يَوْمُهُمْ الَّذِي اخْتَلَفُوا فِيهِ هَدَانَا اللَّهُ لَهُ -قَالَ: يَوْمُ الْجُمُعَةِ- فَالْيَوْمَ لَنَا، وَغَدًا لِلْيَهُودِ، وَبَعْدَ غَدٍ لِلنَّصَارَى)). [بخاري/ الجمعة/ ٨٣٦]

(ابوهریرە)( دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: ( ئێمە دواین ئوممەتین [لەدنیادا] لەقیامەتا یەكەمین، ئێمە یەكەمین لەچوونە بەهەشتا، ئەگەرچی ئەوان لەپێش ئێمەوە كتێبیان بۆ هاتووە ، ئێمە لەدوای ئەوان بۆمان هاتووە ئەوان جیاوازیان تێكەوت ، خوا ڕێنمای ئێمەی كرد لەو جیاوازیەی ئەوانی تێكەوت، ئەمە ئەو ڕۆژەیە كە ئەوان جیاوازیان هەبوو لەسەری خوارێنمایی ئێمەی كرد بۆی ئەمرۆ بۆ ئێمەیە، سبەینێ بۆ جوولەكە، دووسبەی بۆ مەسیحی).

## ( ٢ ) گەورەیی جومعە

٣٩٥ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: ((خَيْرُ يَوْمٍ طَلَعَتْ عَلَيْهِ الشَّمْسُ يَوْمُ الْجُمُعَةِ، فِيهِ خُلِقَ آدَمُ، وَفِيهِ أُدْخِلَ الْجَنَّةَ، وَفِيهِ أُخْرِجَ مِنْهَا، وَلَا تَقُومُ السَّاعَةُ إِلَّا فِي يَوْمِ الْجُمُعَةِ))

(ابوهریرە)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ((چاكترین ڕۆژێ كەخۆری تێدا هەڵهاتبێت ڕۆژی جومعەیە لەوڕۆژەدا ئادەم دروست كراوە، لەوڕۆژەدا خراوەتە بەهەشتەوە ، لەوڕۆژەشدا لەبەهەشت دەركرا، ڕۆژی قیامەتیش نایەت لەڕۆژی جومعەدا نەبێ)).

## ( ٣ ) ساتێك لەڕۆژی جمعەدایە

٣٩٦ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ أَبُو الْقَاسِمِ (ﷺ) ((إِنَّ فِي الْجُمُعَةِ لَسَاعَةً، لَا يُوَافِقُهَا مُسْلِمٌ قَائِمٌ يُصَلِّي، يَسْأَلُ اللَّهَ خَيْرًا إِلَّا أَعْطَاهُ إِيَّاهُ)). وَقَالَ بِيَدِهِ يُقَلِّلُهَا: يُزَهِّدُهَا. [بخاري/ الجمعة/ ٨٩٣]

(ابوهريره) (ﷺ) دەڵێ: (ابو اقاسم)(ﷺ) فەرموويەتی: ((بەراستی لەرۆژی جومعەدا كاتێك هەیە، ئەگەر موسڵمان رێكەوتی بكات لەنوێژابێت و، لەخوابپارێتەوە بۆشتی خێر، دەیداتێ)) [راوی دەڵێ: بەدەست ئامارژەی بۆ ئەوە دەكرد كەكاتەكە كوورتە].

٣٩٧ـ عَنْ أَبِي بُرْدَةَ بْنِ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ قَالَ: قَالَ لِي عَبْدُ اللَّه بْنُ عُمَر (ﷺ): أَسَمِعْتَ أَبَاكَ يُحَدِّثُ عَنْ رَسُولِ اللَّه (ﷺ) فِي شَأْنِ سَاعَةِ الْجُمُعَةِ؟ قَالَ: قُلْتُ: نَعَمْ، سَمِعْتُهُ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((هِيَ مَا بَيْنَ أَنْ يَجْلِس الْإِمَامُ إِلَى أَنْ تُقْضَى الصَّلَاةُ)).

(ابو برده) كوری( ابو موسى الاشعری) دەڵێ: (عبدالله) كوری( عمر) (ﷺ) پێی وتم: ئایا بیستوتە لەباوكت باسی ئەوكاتەی رۆژی جومعە بكات؟ دەڵێ: وتم، بەڵێ، بیستوومە لێی دەیووت: لەپێغەمبەری خوام (ﷺ) بیستووە دەیفەرمو: ئەوكاتەیە كەئیمام دادەنیشێ ﴿لەسەر دوانگە﴾ هەتا نوێژ تەواو دەبێت).

## (٤) ئەوەی لەنوێژی بەیانی جومعەدا دەخوێنرێت

٣٩٨ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كَانَ يَقْرَأُ فِي صَلَاةِ الْفَجْرِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ: ﴿الم تَنْزِيلُ..﴾ السَّجْدَةِ، وَ﴿هَلْ أَتَى عَلَى الْإِنْسَانِ حِينٌ مِنَ الدَّهْرِ﴾. وَأَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كَانَ يَقْرَأُ فِي صَلَاةِ الْجُمُعَةِ سُورَةَ الْجُمُعَةِ وَالْمُنَافِقِينَ.

(ابن عباس) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) لەنوێژی بەیانیی رۆژی جومعەدا ئەمانەی دەخوێند: ﴿الم تنزيل ...﴾ السجدة و ﴿هل اتى على الانسان حين من الدهر﴾ هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) لەنوێژی جمعەدا سوورەتی( الجمعه)و (المنافقين)ی دەخوێند.

## (٥) خۆشۆردن لەجومعەدا

٣٩٩ـ عن أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: بَيْنَمَا عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ (ﷺ) يَخْطُبُ النَّاسَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، إِذْ دَخَلَ عُثْمَانُ ابْنُ عَفَّانَ فَعَرَّضَ بِهِ عُمَرُ (ﷺ) فَقَالَ: مَا بَالُ رِجَالٍ يَتَأَخَّرُونَ بَعْدَ النِّدَاءِ؟ فَقَالَ عُثْمَانُ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، مَا زِدْتُ حِينَ سَمِعْتُ النِّدَاءَ أَنْ تَوَضَّأْتُ ثُمَّ أَقْبَلْتُ. فَقَالَ عُمَرُ: وَالْوُضُوءَ أَيْضًا؟ أَلَمْ تَسْمَعُوا رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمْ إِلَى الْجُمُعَةِ فَلْيَغْتَسِلْ)). [بخاري/ الجمعة/ ٨٣٨]

(ابوهريـره) (ﷺ) دەڵـێ: لـەکاتێکا (عمـر) کـوڕی( خطـاب) وتـاری ڕۆژی جومعەی دەدا، (عثمان) کوڕی( عفان) هاتە ژوورەوەو (عمر) ئامۆژاەیەکی بۆ کرد( ﷺ) وتی: هۆی چیـیە پیـاوانێك دوادەکـەون دوای بانگ؟ عثمـان وتـی: ئەی ئەمیری ئیمانداران ، هیچم نەکرد هەر کە گوێم لەبانگ بوو دەستنوێژم شتو هاتم، عمر وتـی: دەسـتنوێژیش؟ ئایا نەتانبیسـتووە کەپێغەمبـەری خـوا(ﷺ) فەرموویەتی: ((ئەگەر کەسێکتان هات بۆ نوێژی جومعە باخۆی بشووات)).

## ( ٦ ) بۆنی خۆش و سیواك لە جومعەدا

٤٠٠ـ عن أبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((غُسْـلُ يَـوْمِ الْجُمُعَةِ عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ، وَسِوَاكٌ، وَيَمَسُّ مِنَ الطِّيبِ مَا قَـدَرَ عَلَيْـهِ)). [بخاري/ الجمعة/ ٨٤٠]

(ابو سعيد الخدری) (– دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (خۆشتنی ڕۆژی جومعە لەسەر هەرکەسێکی باڵغە لەگەڵ سیواك کردن و چەندیش بتوانێت بۆنی خۆش لەخۆی بدات).

## ( ٧ ) خێری زووهاتن بۆ مزگەوت لەڕۆژی جومعەدا

٤٠١ـ عن أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((إِذَا كَانَ يَـوْمُ الْجُمُعَةِ كَانَ عَلَى كُلِّ بَابٍ مِنْ أَبْوَابِ الْمَسْجِدِ مَلَائِكَةٌ يَكْتُبُونَ الْأَوَّلَ فَالْأَوَّلَ، فَإِذَا جَلَسَ الْإِمَامُ طَوَوُا الصُّحُفَ، وَجَاءُوا يَسْتَمِعُونَ الذِّكْرَ. وَمَثَلُ الْمُهَجِّرِ كَمَثَلِ الَّذِي يُهْدِي الْبَدَنَةَ، ثُمَّ كَالَّذِي يُـهْدِي بَقَـرَةً، ثُـمَّ كَالَّذِي يُـهْدِي الْكَبْشَ، ثُـمَّ كَـالَّذِي يُـهْدِي الدَّجَاجَةَ، ثُمَّ كَالَّذِي يُهْدِي الْبَيْضَةَ)). [بخاري/ الجمعة/ ٨٨٧]

(ابوهريـره)(ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) فەرموويـەتی: ((ئەگـەر ڕۆژی جومعـە بـوو، لەسەر هەردەرگایـە لـەدەرگاکانی مزگـەوت فریشـتە ڕادەوەسـتن و ئەوکەسانە دەنووسن کەیەك لەدوای یەك لەپێش خەڵکیـەوە دێن بـۆ مزگەوت ، کاتی ئیمام دێت و دادەنیشێت تۆمارەکانیان دەپێچنەوە، دێن گوێ لـەزیکرەکان دەگرن، نموونـەی ئەوکەسـەی زوو دێـن بـۆ مزگـەوت وەکـو کەسـێك وایـە کـە وشترێکی کردبێ بەخێر پاش ئەو وەکو کەسێك وایە مانگایەکی کردبێ بەخێر، پاش ئەویش وەکو کەسێك وایـە مـەڕێکی کردبـێ بـەخێر، پاش ئـەویش وەکـو کەسێك کەمریشکێکی کردبێ بـەخێر، پاش ئەویش وەکو کەسێك هێلکەیـەکی کردبێ بەخێر)).

## ( ٨ ) نوێژە جومعە لەکاتی نیوەڕۆدایە

٤٠٢ـ عن سَلَمَةَ بْنِ الْأَكْوَعِ (ﷺ) قَالَ: كُنَّا نُجَمِّعُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) إِذَا زَالَتِ الشَّمْسُ، ثُمَّ نَرْجِعُ نَتَتَبَّعُ الْفَيْءَ. [المغازي/ ٣٩٢٥]

کاتیٚ خۆر لایدەدا ﴿لەناوەراستی ئاسمان﴾لەخزمەت پێغەمبەری خوادا(ﷺ) نوێژی هەینیمان دەکرد، پاشان بەبن سێبەرەکاندا دەگەراینەوە.

## ( ٩ ) دانانی دوانگە( مینبەر) بۆ پێغەمبەری خوا( ﷺ ) و نوێژکردن لەسەری

٤٠٣ـ عن أَبِي حَازِمٍ: أَنَّ نَفَرًا جَاءُوا إِلَى سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (ﷺ) قَدْ تَمَارَوْا فِي الْمِنْبَرِ مِنْ أَيِّ عُودٍ هُوَ؟ فَقَالَ: أَمَا وَاللَّهِ، إِنِّي لَأَعْرِفُ مِنْ أَيِّ عُودٍ هُوَ؟ وَمَنْ عَمِلَهُ؟ وَرَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) أَوَّلَ يَوْمٍ جَلَسَ عَلَيْهِ، قَالَ: فَقُلْتُ لَهُ، يَا أَبَا عَبَّاسٍ فَحَدِّثْنَا، قَالَ: أَرْسَلَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِلَى امْرَأَةٍ –قَالَ أَبُو حَازِمٍ: إِنَّهُ لَيُسَمِّهَا يَوْمَئِذٍ–: ((انْظُرِي غُلَامَكِ النَّجَّارَ يَعْمَلْ لِي أَعْوَادًا أُكَلِّمُ النَّاسَ عَلَيْهَا)). فَعَمِلَ هَذِهِ الثَّلَاثَ دَرَجَاتٍ، ثُمَّ أَمَرَ بِهَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فَوُضِعَتْ هَذَا الْمَوْضِعَ، فَهِيَ مِنْ طَرْفَاءِ الْغَابَةِ، وَلَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَامَ عَلَيْهِ فَكَبَّرَ وَكَبَّرَ النَّاسُ وَرَاءَهُ، وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ، ثُمَّ رَفَعَ فَنَزَلَ الْقَهْقَرَى حَتَّى سَجَدَ فِي أَصْلِ الْمِنْبَرِ، ثُمَّ عَادَ حَتَّى فَرَغَ مِنْ آخِرِ صَلَاتِهِ، ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ فَقَالَ: ((يَا أَيُّهَا النَّاسُ، ﴿إِنِّي﴾ إنما صَنَعْتُ هَذَا لِتَأْتَمُّوا بِي، وَلِتَعَلَّمُوا صَلَاتِي)). [بخاري/ الجمعة/ ٨٧٥]

(ابو حازم) دەڵێ: چەند کەسێك هاتن بۆ لای (سهل) کوری(سعد) ( وتویژیان بوو لەسەر دوانگە کەئاخۆ لە چدارێکە ؟ وتی: بەخوا من دەزانم لەچ دارێك دروستکراوە، کێش دروستی کردووە؟

یەکەم جاریش کەپێغەمبەر(ﷺ) لەسەری دانیشت چاوم لێی بووە دەڵێ پێم وت: ئەی (ابن عباس) قسەمان بۆ بکە، ئەویش وتی: پێغەمبەر(ﷺ) ناردی بۆلای ئافرەتێك (ابو حازم) دەڵێ: لەوڕۆژەدا ناوی بردووە: پێی فەرمووە: ((بەغولامە دارتاشەکەت بڵێ چەند دارێکم بۆ بتەنێ کەبچمەسەری و قسە بۆ خەڵکی بکەم )) ئەویش ئەم سێ پلەیەی بۆ دروست کردووە، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانیکرد لەم جێگایەدا دانرا، ئەودارەش دارگەزەکانی دارستانەکەی [نزیك مەدینەبوو]چاویشم لێبوو کەپێغەمبەر(ﷺ) لەسەر مینبەرەکە بەپشتا دابەزیو لەبنی مینبەرەکەدا سوجدەی برد، ئینجا گەڕایەوە سەر مینبەرەکە هەتا لەهەموو نوێژەکەی بوویەوە ، ئینجا ڕووی‌کردە خەڵکەکەو

فەرمووی: ئەی خەڵكینە [من]بۆیە ئەمەم دروستكردووە كەلەنوێژەكاندا شوێنم بكەون و چاوتان لێم بێ لەنوێژە كەمدا چی‌دەكەم[1].

**( ١٠ ) سەرەتای وتار**

٤٠٤ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ): أَنَّ ضِمَادًا قَدمَ مَكَّةَ: وَكَانَ مِنْ أَزْد شَنُوءَةَ، وكَانَ يَرْقِي مِنْ هَذِهِ الرِّيحِ، فَسَمِعَ سُفَهَاءَ مِنْ أَهْلِ مَكَّةَ يَقُولُونَ: إِنَّ مُحَمَّدًا مَجْنُونٌ، فَقَالَ: لَوْ أَنِّي رَأَيْتُ هَذَا الرَّجُلَ، لَعَلَّ اللَّهَ يَشْفِيهِ عَلَى يَدَيَّ. قَالَ: فَلَقِيَهُ، فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ إِنِّي أَرْقِي مِنْ هَذِهِ الرِّيحِ، وَإِنَّ اللَّهَ يَشْفِي عَلَى يَدِي مَنْ شَاءَ، فَهَلْ لَكَ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((إِنَّ الْحَمْدَ لِلَّهِ، نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ، مَنْ يَهْدِهِ اللَّهُ فَلَا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلَا هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، أَمَّا بَعْدُ)). قَالَ: فَقَالَ أَعِدْ عَلَيَّ كَلِمَاتِكَ هَؤُلَاءِ. فَأَعَادَهُنَّ عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، قَالَ: فَقَالَ: لَقَدْ سَمِعْتُ قَوْلَ الْكَهَنَةِ، وَقَوْلَ السَّحَرَةِ، وَقَوْلَ الشُّعَرَاءِ، فَمَا سَمِعْتُ مِثْلَ كَلِمَاتِكَ هَؤُلَاءِ، وَلَقَدْ بَلَغْنَ نَاعُوسَ الْبَحْرِ. قَالَ: فَقَالَ: هَاتِ يَدَكَ أُبَايِعْكَ عَلَى الْإِسْلَامِ، قَالَ: فَبَايَعَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((وَعَلَى قَوْمِكَ)). قَالَ: وَعَلَى قَوْمِي، قَالَ: فَبَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) سَرِيَّةً فَمَرُّوا بِقَوْمِهِ، فَقَالَ صَاحِبُ السَّرِيَّةِ لِلْجَيْشِ: هَلْ أَصَبْتُمْ مِنْ هَؤُلَاءِ شَيْئًا؟ فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: أَصَبْتُ مِنْهُمْ مِطْهَرَةً، فَقَالَ: رُدُّوهَا فَإِنَّ هَؤُلَاءِ قَوْمُ ضِمَادٍ.

(ابن عباس) (ﷺ) دەڵێ (ضماد) كە لەخێڵی (ازد شنوءة) بوو هات بۆ مەككە، نوشتەی شێتی‌و دەست لێوەشاندنی جنۆكەی دەكرد، ، بیستی لەگەمژەكانی خەڵكی مەككە كە محمد شێتە، ئەویش وتی: ئەگەر ئەوپیاوەم بدیایە ، بەڵكو خوا لەسەردەستی مندا چاكی بكاتەوە، وتی: گەیشت بەپێغەمبەر(ﷺ) وتی: ئەی محمد من نوشتە بۆ ئەو بایە[مەبەستی شێتی بووە] دەكەم، خوای گەورەش هەركەسێك بیەوێ لەسەردەستی مندا چاكی دەكاتەوە، ئەی بۆ تۆیشی نەكەم؟ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ((سوپاس بۆ خوا، سوپاسی دەكەین پشتی پی‌دەبەستین، هەركەس خوا رێنمایی بكات كەس رێی

---

[1] (عەسقەلانی لەراڤەی بوخاریدا لەسەر ئەم فەرموودەیە دەڵێ: بۆیە بەپشتا هاتۆتە خوارەوە تارووی لەقیبلە وەرنەچەرخێت، چونكە لەسەرەوە جێگای سوجدەی نەبووە ، لەبەر ئەوەش لەسەر مینەبەرەكە نوێژی كردووە هەتا نوێژگەران چاویان لەهەڵسوكەوتی بێت فێربن)

لێون ناكات، هەركەسیش خوارێی لێون بكات، ڕێ نیشاندەری نییە، شایەتی دەدەم كەجگە لە(الله) هیچ خوایەك نییە، و موحەمەدیش بەندەو ڕەوانەكاروی ئەوە، دوای ئەمە ضماد وتی: ئەو وشانەم بۆ بڵێرەوە، پێغمبەر(ﷺ) سێجار بۆی وتەوە، وتی: من قسەی كاهنەكانم بیستووە، قسەی جادوو گەرانیش ، قسەی شاعیرانیش ، بەلاّم قسەی وەك ئەمانەی تۆم نەبیستووە، ئەمانە گەیشتوونە قولاّیی دەریا، ئینجا وتی: دەستت بێنە با موسڵمان ببم وتی: بەیعەتی پێكردو پێغەمبەریش بەیعەتی لێوەرگرتو فەرمووی: ئەمە بۆ قەومەكەیشت وتی(بەڵێ) بۆ قەومەكەیشم، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) دەستەیەكی ناردوو چوون بۆلای قەومەكەی ، سەردەستەكە بە سوپاكەی وت: ئایاهیچتان لەم خەڵكە سەندووە؟ پیاوێك لەقەومەكەی وتی: یەك مەتارەم دەستكەوتووە لێیان ، ئەویش وتی بیگێڕەوە بۆیان ئەمانە قەومی(ضماد)ن.

## ( ١١ ) دەنگ بەرزكردنەوە لەوتاردا

٤٠٥ـ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِذَا خَطَبَ احْمَرَّتْ عَيْنَاهُ وَعَلَا صَوْتُهُ، وَاشْتَدَّ غَضَبُهُ، حَتَّى كَأَنَّهُ مُنْذِرُ جَيْشٍ، يَقُولُ: صَبَّحَكُمْ وَمَسَّاكُمْ، وَيَقُولُ: ((بُعِثْتُ أَنَا وَالسَّاعَةُ كَهَاتَيْنِ)). وَيَقْرُنُ بَيْنَ إِصْبَعَيْهِ: السَّبَّابَةِ وَالْوُسْطَى، وَيَقُولُ: ((أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّ خَيْرَ الْحَدِيثِ كِتَابُ اللَّهِ، وَخَيْرُ الْهُدَى هُدَى مُحَمَّدٍ (ﷺ)، وَشَرُّ الْأُمُورِ مُحْدَثَاتُهَا، وَكُلُّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ)). ثُمَّ يَقُولُ: ((أَنَا أَوْلَى بِكُلِّ مُؤْمِنٍ مِنْ نَفْسِهِ، مَنْ تَرَكَ مَالًا فَلِأَهْلِهِ، وَمَنْ تَرَكَ دَيْنًا أَوْ ضَيَاعًا فَإِلَيَّ وَعَلَيَّ)).

(جابر) كوری(عبدالله) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) كاتێ وتاری دەخوێندەوە هەردوو چاوی سووردەبوویەوە دەنگی بەرز دەبوویەوە، توورە دەبوو، هەر دەتگوت ئاگاداركەرەوەیە لەهاتنی لەشكرێك دەیفەرموو: (( ئەو سوپایە لەوانەیە بەیانی یا ئێوارە بدات بەسەرتاندا)). هەروەها دەیفەرموو: ((من و ڕۆژی قیامەت وەكو ئەم دوانە نێراوین) دوو پەنجەی شایەتومان و ناوەڕاستی پێكەوە جووت دەكرد ، [واتە پەنجەی شایەتومان چەندی زیاترە لەپەنجەی ناوەڕاست، هاتنی من و ڕۆژی قیامەت ئەوەندەیان بەینە] ئینجا فەرمووی: ((پاشان ، باشترین وتە كتێبی خوایە، باشترین ڕێنماییش ڕێنمایی محمدە(ﷺ) خراپترین كاریش داهێنراوەكانیانە، هەموو داهێنراوێكیش

گومراییە)) ئینجا فەرموی: ((من بۆ هەموو ئیماندارێك لەخۆی [بۆ خۆی] لەپێشترم، هەرکەس سامانی بەجێهێشت بۆ خێزانەکەی هەرکەسیش قەرزاریی یا منداڵی وردی بەجێهێشت بۆ منو لەسەرمنە)).

## ( ١٢ ) کوورتی وتار

٤٠٦ـ عن أَبُو وَائِلٍ (ﷺ) قالَ: خَطَبَنَا عَمَّارٌ (ﷺ) فَأَوْجَزَ وَأَبْلَغَ، فَلَمَّا نَزَلَ قُلْنَا: يَا أَبَا الْيَقْظَانِ، لَقَدْ أَبْلَغْتَ وَأَوْجَزْتَ، فَلَوْ كُنْتَ تَنفَّسْتَ. فَقَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((إِنَّ طُولَ صَلَاةِ الرَّجُلِ وَقِصَرَ خُطْبَتِهِ مَئِنَّةٌ مِنْ فِقْهِهِ، فَأَطِيلُوا الصَّلَاةَ وَاقْصُرُوا الْخُطْبَةَ، وَإِنَّ مِنَ الْبَيَانِ سِحْرًا)).

(ابووائل) (ﷺ) دەڵێ: (عمار)(ﷺ) وتارێکی بۆ خوێندینەوە کورتو رەوان، کاتێ دابەزیو وتمان: ئەی (ابو یقظان) وتارێکی کورتو رەوانت بۆداین ئەگەر هەناسەیەکت بدایە [واتە درێژتر بوایە]، ئەویش وتی: من لەپێغەمبەری خوام (ﷺ) بیستووە، فەرموویەتی: (( لەراستیدا درێژیی نوێژی پیاوو کورتیی وتاری نیشانەی شارەزاییەتی لەئاینیا، نوێژەکانتان درێژ بکەنەوەو وتارەکانتان کورت، قسەی رەوان کاریگەریی جادووی هەیە)).

## ( ١٣ ) ئەوەی کەلابردنی لەوتاردا دروست نییە

٤٠٧ـ عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ (ﷺ): أَنَّ رَجُلًا خَطَبَ عِنْدَ النَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالَ: مَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ رَشَدَ، وَمَنْ يَعْصِهِمَا فَقَدْ غَوَى. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((بِئْسَ الْخَطِيبُ أَنْتَ، قُلْ: وَمَنْ يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ)). قَالَ ابْنُ نُمَيْرٍ: فَقَدْ غَوِيَ.

(عدی) کوری(حاتم) (ﷺ) دەڵێ: پیاوێك لەخزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) وتاریکی خوێندەوە وتی: هەرکەس گوێرایەڵی خواو پێغەمبەربێت، ئەوە رێی راستی دۆزیوەتەوە، هەر کەسیش لێیان یاخی بێت ئەوە سەر لێشواوە ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((وتاربێژێکی خراپی، بڵێ: هەرکەس لەخواو پێغەمبەرەکەی یاخی ببێ)).

## ( ١٤ ) ئاماژە بە پە نجە لەوتاردا

٤٠٨ـ عَنْ أُمِّ هِشَامٍ بِنْتِ حَارِثَةَ بْنِ النُّعْمَانِ (ﷺ) قَالَتْ: لَقَدْ كَانَ تَنُّورُنَا وَتَنُّورُ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) وَاحِدًا سَنَتَيْنِ أَوْ سَنَةً وَبَعْضَ سَنَةٍ، وَمَا أَخَذْتُ ﴿ق وَالْقُرْآنِ الْمَجِيدِ﴾ إِلَّا عَنْ لِسَانِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، يَقْرَؤُهَا كُلَّ يَوْمِ جُمُعَةٍ عَلَى الْمِنْبَرِ إِذَا خَطَبَ النَّاسَ.

(ام هشام) كچی (حارثة) كوری(نعمان) (رضي الله عنها)دەڵێ: ماوەی دووساڵ یا ساڵێكو چەند مانگێ تەنووری ئێمەو پێغەمبەری خوا (ﷺ) یەك تەنور بوو ، من ( ق والقران المجید) م تەنها لەزمانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ﴿نەبێ لەكەسی ترم وەرنەگرتووە﴾ كە هەموو جومعەیەك لەسەر مینبەر وتاری بۆ خەڵكەكە دەدا دەیخوێندەوە.

## ( ١٥ ) خوێندنی قورئان لەوتاردا لەسەر مینبەر

٤٠٩ـ عَنْ حُصَيْنٍ، عَنْ عُمَارَةَ بْنِ رُؤَيْبَةَ (ﷺ) قَالَ: رَأَى بِشْرَ بْنَ مَرْوَانَ عَلَى الْمِنْبَرِ رَافِعًا يَدَيْهِ، فَقَالَ: قَبَّحَ اللَّهُ هَاتَيْنِ الْيَدَيْنِ، لَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) مَا يَزِيدُ عَلَى أَنْ يَقُولَ بِيَدِهِ هَكَذَا وَأَشَارَ بِإِصْبَعِهِ الْمُسَبِّحَةِ.

(حصين) لە(عمار) كوری( رۆیبە) وە بۆمان دەگێڕێتەوە دەڵێ: (بشری) كوری (مروان) ی دیووە لەسەر مینبەر هەردوو دەستی بەرزدەكردەوە، ئەویش وتی: خوا ئەو دوو دەستە نابووت كات، چونكە من پێغەمبەرم(ﷺ) دیووە ئاماژەی تەنها بەپەنجەی شایەتومانی دەكرد.

## ( ١٦ ) لەبارەی ئایەتی

## ﴿ واذا رأوا تجارة او لهواً انفضوا اليها وتركوك قائماً ﴾

٤١٠ـ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كَانَ يَخْطُبُ قَائِمًا يَوْمَ الْجُمُعَةِ، فَجَاءَتْ عِيرٌ مِنَ الشَّامِ، فَانْفَتَلَ النَّاسُ إِلَيْهَا، حَتَّى لَمْ يَبْقَ إِلَّا اثْنَا عَشَرَ رَجُلًا، فَأُنْزِلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ الَّتِي فِي الْجُمُعَةِ: ﴿وَإِذَا رَأَوْا تِجَارَةً أَوْ لَهْوًا انْفَضُّوا إِلَيْهَا وَتَرَكُوكَ قَائِمًا﴾ الآية. [بخاري/ الجمعة/ ٨٩٤]

(جابر) كوری( عبدالله) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) رۆژی جومعە بەپێوە وتاری دەخوێندەوە، كاروانێك لەشامەوە هات، خەڵكی ناومزگەوتەكە چوون بەدەم كاروانەكەوەو تەنها دوانزە كەسیان مایەوە، بۆیە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە لەجومعەدا ﴿ واذا رأوا تجارة أو لهواً انفضوا اليها وتركوك قائماً ﴾ واتە: هەركاتێ بازرگانیەك یا یاریەكیان دی بەرەو رووی دەرۆن و بەپێوە تۆ بەجێ دەهێڵن).

## ( ١٧ ) چی لەنوێژی جومعەدا دەخوێنرێت

٤١١ـ عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ (ﷺ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَقْرَأُ فِي الْعِيدَيْنِ وَفِي الْجُمُعَةِ بِـ﴿سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى﴾ وَ ﴿هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ الْغَاشِيَةِ قَالَ وَإِذَا اجْتَمَعَ الْعِيدُ وَالْجُمُعَةُ فِي يَوْمٍ وَاحِدٍ يَقْرَأُ بِهِمَا أَيْضًا فِي الصَّلَاتَيْنِ

(نعمان) کوری (بشیر)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەهەردوو جەژنەکەو لەجومعەدا ﴿ سبح اسم ربك الاعلى ﴾ و ﴿ هل اتاك حديث الغاشية ﴾ ی دەخوێند ، دەڵێ: ئەگەر جەژن و جومعەش بەیەك رۆژدا بونایە لەهەردوو نوێژەکەدا دەیخوێندن.

## ( ١٨ ) فێرکردن لەکاتی وتاردا

٤١٢ـ عن أَبي رِفَاعَةَ (ﷺ) قال: انْتَهَيْتُ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) وَهُوَ يَخْطُبُ، قَالَ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، رَجُلٌ غَرِيبٌ جَاءَ يَسْأَلُ عَنْ دِينِهِ، لَا يَدْرِي مَا دِينُهُ؟ قَالَ: فَأَقْبَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وَتَرَكَ خُطْبَتَهُ حَتَّى انْتَهَى إِلَيَّ، فَأُتِيَ بِكُرْسِيٍّ حَسِبْتُ قَوَائِمَهُ حَدِيدًا، قَالَ: فَقَعَدَ عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وَجَعَلَ يُعَلِّمُنِي مِمَّا عَلَّمَهُ اللَّهُ، ثُمَّ أَتَى خُطْبَتَهُ فَأَتَمَّ آخِرَهَا.

(ابو رفاعه) دەڵی: گەیشتینە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) وتاری دەخوێندەو، دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) غەریبێك هاتووە پرسیار لەئاینەکەی دەکات، نازانێ ئاینەکەی چیە؟ دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) وازی لەوتارەکەی هێناو رووی کردەوە من کورسیەکی هێنا وابزانم قاچەکانی ئاسن بوو ، لەسەری دانیشت و لەوەی خوافێری کردبوو فێری دەکردم ، ئینجا دەستی کردەوە بەوتارەکەی هەتا تەواوی کرد.

## ( ١٩ ) دانیشتنی نێوان دوو وتاری جومعە

٤١٣ـ عن جَابِرُ بْنُ سَمُرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) كَانَ يَخْطُبُ قَائِمًا ثُمَّ يَجْلِسُ، ثُمَّ يَقُومُ فَيَخْطُبُ قَائِمًا. فَمَنْ نَبَّأَكَ أَنَّهُ كَانَ يَخْطُبُ جَالِسًا فَقَدْ كَذَبَ، فَقَدْ وَاللَّهِ صَلَّيْتُ مَعَهُ أَكْثَرَ مِنْ أَلْفَيْ صَلَاةٍ.

(جابر) کوری( سمره) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەپێوە وتاری دەدا، ئینجا دادەنیشت پاشان هەڵدەستایەوە بەپێوە وتاری دووەمی دەدا ، هەرکەس پێت بڵێ کەبەدانیشتنەوە وتاری دەدا درۆی کردووە، سوێندە بەخوا من زیاتر لەدوو هەزار نوێژم لەخزمەتیا کردووە.

## ( ٢٠ ) کورتکردنەوەی نوێژو وتار

٤١٤ـ عنْ جابر بْن سمُرة (ﷺ) قال: كُنْتُ أُصلِّي مع رسُول اللّه (ﷺ)، فكانتْ صلاتُهُ قصْدًا وخُطْبتُهُ قصْدًا.

(جابر) کوری(سمره) (ﷺ) دەڵێ: من لەخزمەت پێغەمبەری خوادا(ﷺ) نوێژم دەکرد، پێغەمبەر(ﷺ) نوێژەکەی و وتارەکەیشی مام ناوەندی بوو ﴿نەکورتو نەدرێژ﴾.

## ( ٢١ ) هەرکەس لەکاتی وتار خوێندنەوەدا هاتە ژوورەوە بادوو رکات نوێژ بکات

٤١٥ـ عَنْ جَابِرٍ (ﷺ) قَال: جَاءَ سُلَيْكٌ الْغطفَانِيُّ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، وَرَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) قَاعِدٌ عَلَى الْمِنْبرِ، فقعدَ سُلَيْكٌ قَبْل أنْ يُصلِّيَ، فقالَ لَهُ النَّبِيُّ (ﷺ): ((أَرَكَعْتَ رَكْعَتَيْنِ)). قالَ: لا، قالَ: ((قُمْ فارْكَعْهُمَا)). [بخاري/ الجمعة/ ٨٨٨]

(جابر) کوری (عبدالله) (ﷺ) دەڵێ: رۆژی جومعە (سلیك الغطفاني) هات پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەمینبەردا دانیشتبوو، سلیك پێش ئەوەی نوێژ بکات دانیشت ، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو ((ئایا دوورکات نوێژت کرد)) وتی: نەخێر ، فەرمووی: ((دەهەستە بیانکە)).

## ( ٢٢ ) گوێگرتن بۆ وتار

٤١٦ـ عن أَبِي هُرَيْرةَ (ﷺ): أنَّ رَسُولَ اللّه (ﷺ) قَالَ: ((إِذَا قُلْتَ لِصَاحِبِكَ أَنْصِتْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، والْإمامُ يَخْطُبُ، فقَدْ لغَوْتَ)). [بخاري/ الجمعة/ ٨٩٢]

(ابوهریرە) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ((ئەگەر بەهاوەڵەکەتت وت گوێ بگرە لەرۆژی جومعەدا ، ئیمام وتاری دەخوێندەوە، ئەوە قرەقرت کردووە)).

## ( ٢٣ ) خێری ئەوەی بێدەنگ گوێدەگرێت لەجومعەدا

٤١٧ـ عنْ أَبِي هُرَيْرةَ (ﷺ) عَن النّبِيِّ (ﷺ) قَال: ((مَنِ اغْتَسل ثُمَّ أتى الْجُمُعَةَ، فصلَّى ما قُدِّر لهُ، ثُمّ أنْصت حتّى يفْرُغ منْ خُطْبته، ثُمّ يُصلِّي معهُ، غُفر لهُ ما بيْنهُ وبيْن الْجُمُعَة الْأُخْرى، وفضْلُ ثلاثة أيّامٍ)).

(ابوهریرە) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ((هەرکەس خۆی شۆردو هات بۆ نوێژی جومعەو ئەوەندەی لەچارەی نوسراوە کەنوێژی کردووە،

ئینجا گویْ بیست بوو هەتا لەوتارەكەی دەبێتەوە، ئینجا نوێژی لەگەڵ ئیمام كرد خوا لەگوناهی نێوان ئەم جومعەو جومعەكەی تری خۆشدەبێت و سێ رۆژی تریش)).

## ( ٢٤ ) نوێژ لەدوای نوێژی جومعه لەمزگەوتا

٤١٨ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((إِذَا صَلَّيْتُمْ بَعْدَ الْجُمُعَةِ فَصَلُّوا أَرْبَعًا)). و فِي رِوَايَةٍ قَالَ سُهَيْلٌ: ((فَإِنْ عَجِلَ بِكَ شَيْءٌ فَصَلِّ رَكْعَتَيْنِ فِي الْمَسْجِدِ، وَرَكْعَتَيْنِ إِذَا رَجَعْتَ)).

(ابوهریره) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: ((ئەگەر دوای نوێژی جومعه نوێژتان كرد چوار ركات بكەن، لەریوایەتێكیشا دەفەرموێت: ((ئەگەر بەهۆی شتێكەوە پەلەت بوو دوو ركات لەمزگەوت بكەو كە گەرایتەوە ماڵەوەش دووركات بكە)).

## ( ٢٥ ) نوێژ دوای جومعه لەماڵەوە

٤١٩ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ): أَنَّهُ كَانَ إِذَا صَلَّى الْجُمُعَةَ انْصَرَفَ فَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ فِي بَيْتِهِ، ثُمَّ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَصْنَعُ ذَلِكَ.

(عبدالله) كوری(عمر) (ﷺ) دەڵێ: كاتێ نوێژی جومعەی دەكرد دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە دوو ركاتی دەكرد، ئینجا دەیوت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) وایدەكرد.

## ( ٢٦ ) راستەوخۆ نوێژ ناكرێت دوای جومعه

٤٢٠ـ عن عُمَرُ بْنُ عَطَاءٍ: أَنَّ نَافِعَ ابْنَ جُبَيْرٍ أَرْسَلَهُ إِلَى السَّائِبِ ابْنِ أُخْتِ نَمِرٍ، يَسْأَلُهُ عَنْ شَيْءٍ رَآهُ مِنْهُ مُعَاوِيَةُ (ﷺ) فِي الصَّلَاةِ، فَقَالَ: نَعَمْ، صَلَّيْتُ مَعَهُ الْجُمُعَةَ فِي الْمَقْصُورَةِ، فَلَمَّا سَلَّمَ الْإِمَامُ قُمْتُ فِي مَقَامِي فَصَلَّيْتُ، فَلَمَّا دَخَلَ أَرْسَلَ إِلَيَّ. فَقَالَ: لَا تَعُدْ لِمَا فَعَلْتَ. إِذَا صَلَّيْتَ الْجُمُعَةَ فَلَا تَصِلْهَا بِصَلَاةٍ حَتَّى تَكَلَّمَ أَوْ تَخْرُجَ، فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) أَمَرَنَا بِذَلِكَ: أَنْ لَا تُوصَلَ صَلَاةٌ بِصَلَاةٍ حَتَّى نَتَكَلَّمَ أَوْ نَخْرُجَ.

(عمر) كوری( عطاء) دەڵێ: (نافع) كوری( جبیر) ناردی بۆلای (سائب) خوشكەزای (نمیر) پرسیاری شتێكی لێكرد كەمعاویە لەوی دیووە لەنوێژدا ، ئەویش وتی: بەڵێ، من لە(مقصوره) نوێژم لەگەڵ كردووە كاتێ ئیمام سەلامی دایەوە، لەجێگای خۆم هەستامو نوێژم كرد، كاتێ چووە ژوورەوە ناردی بەدواماو وتی: ئەوەی كردت مەیكەرەوە كاتێ نوێژی جومعەت كرد نوێژی

بەدوادامەکـە هـەتا قسـەدەکەیت یـان دەچیتـە دەرەوە، چونکـە پێغەمبـەری خوا(ﷺ) فەرمانی بەوەکردووە کە نوێژ بەدوای نوێـژدا مەکەن هـەتا قسـەدەکەن یان دەچنە دەرەوە.

## ( ٢٧ ) هەرەشەکردن لەوازهێنان لەجومعە

٤٢١ـ عن الْحَكَمُ بْنُ مِينَاءَ: أَنَّ عَبْدَ اللَّه بْنَ عُمَرَ وَأَبَا هُرَيْرَةَ (رضي الله عنهم) حَدَّثَاهُ: أَنَّهُمَا سَمِعَا رَسُولَ اللَّه (ﷺ) يَقُولُ عَلَى أَعْوَاد مِنْبَرِه، ((لَيَنْتَهِيَنَّ أَقْوَامٌ عَنْ وَدْعِهِمُ الْجُمُعَاتِ أَوْ لَيَخْتِمَنَّ اللَّهُ عَلَى قُلُوبِهِمْ، ثُمَّ لَيَكُونُنَّ مِنَ الْغَافِلِينَ)).

(حکم) کوری( مینا)ی‌ە دەڵێ: (عبدالله) کوری (عمر) (ابوهریره)(رضي الله عنهم) قسەیان بـۆ کـردووە: ئـەوان بیسـتوویانە لەپێغەمبـەری خـوا(ﷺ) لەسـەر مینبەرەکـەی دەیفەرموو: ((ئەوانەی نوێژی جومعە ناکەن باواز لەو رەفتارەیان بهێنن یان خوا مۆری رەش دەنێت بەسەر دڵیانداو پاشان دەچنە ریزی غافلأنەوە)).

# (٧) جەژنەكان

## (١) وازهێنان لەبانگو قامەت لەجەژنەكاندا

٤٢٢ـ عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ (ﷺ) قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) الْعِيدَيْنِ غَيْرَ مَرَّةٍ وَلَا مَرَّتَيْنِ، بِغَيْرِ أَذَانٍ وَلَا إِقَامَةٍ.

(جابر) كوڕی(سمرە)(ﷺ) دەڵێ: لەخزمەت پێغەمبەری خوادا نوێژی دووجەژنەكەم كردووە زیاتر جارو دووجار بەبێ بانگو قامەت.

## (٢) نوێژەی جەژنەكان لە پێش وتاردا

٤٢٣ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ) قَالَ: شَهِدْتُ صَلَاةَ الْفِطْرِ مَعَ نَبِيِّ اللَّهِ (ﷺ) وَأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ وَعُثْمَانَ (ﷺ)، فَكُلُّهُمْ يُصَلِّيهَا قَبْلَ الْخُطْبَةِ ثُمَّ يَخْطُبُ، قَالَ: فَنَزَلَ نَبِيُّ اللَّهِ (ﷺ) كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَيْهِ حِينَ يُجَلِّسُ الرِّجَالَ بِيَدِهِ. ثُمَّ أَقْبَلَ يَشُقُّهُمْ حَتَّى جَاءَ النِّسَاءَ وَمَعَهُ بِلَالٌ، فَقَالَ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا جَاءَكَ الْمُؤْمِنَاتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَى أَنْ لَا يُشْرِكْنَ بِاللَّهِ شَيْئًا﴾ فَتَلَا هَذِهِ الْآيَةَ حَتَّى فَرَغَ مِنْهَا، ثُمَّ قَالَ حِينَ فَرَغَ مِنْهَا: ((أَنْتُنَّ عَلَى ذَلِكِ)). فَقَالَتِ امْرَأَةٌ وَاحِدَةٌ لَمْ يُجِبْهُ غَيْرُهَا مِنْهُنَّ: نَعَمْ يَا نَبِيَّ اللَّهِ، لَا يُدْرَى حِينَئِذٍ مَنْ هِيَ. قَالَ: ((فَتَصَدَّقْنَ)). فَبَسَطَ بِلَالٌ ثَوْبَهُ، ثُمَّ قَالَ: ((هَلُمَّ فِدًى لَكُنَّ أَبِي وَأُمِّي)). فَجَعَلْنَ يُلْقِينَ الْفَتَخَ وَالْخَوَاتِمَ فِي ثَوْبِ بِلَالٍ. [بخاري/ العيدين/ ٩٣٦]

(ابن عباس) (ﷺ) دەڵێ: ئامادەی نوێژی جەژنی ڕەمەزان بووم، لەخزمەت پێغەمبەری خواو(ﷺ) هەروەها لەخزمەت (ابوبكر)و (عمر)و (عثمان) (ڕەزای خوایان لێبێت) هەموویان لەپێش وتاردا نوێژیان دەكرد ئینجا وتاریان دەدا، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) دابەزی هەردەڵێی چاوم لێیەتی كاتێ بەدەستی پیاوەكانی دادەنیشانەوە،ئینجا ڕیزەكانی دەبڕی هەتا گەیشتە ناو ئافرەتەكانەوە بیلالی لەگەڵدابوو، فەرمووی: ﴿یا ایها النبي اذا جاءك المؤمنات یبایعنك علی أنلا یشركن بالله شیئاً﴾ ئەم ئایەتەی خوێندەوە هەتا تەواوی كرد، ئینجا فەرمووی: (( ئایا ئێوەلەسەر ئەم بەڵێنەن)) كەس وەڵامی نەدایەوە جگە لەیەك ئافرەتیان وتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ئەو كاتە نەزانرا كێبوو، فەرمووی: ((دەخێر بكەن)) بیلالیش جلەكەی خۆی ڕاسختو، وتی: بهێنن باوكو دایكم

بـەقوربانیاتان بێت) ئینجا ئافرەتەکان ئەموسـتیلەی گـەورە گـەورەو ئەڵقـەیان دەخستە ناو جلەکەی بیلالەوە.

## ( ٣ ) ئەوەی لەنوێژی جەژنەکاندا دەخوێنرێ

٤٢٤ـ عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ: أَنَّ عُمَرَ ابْنَ الْخَطَّابِ (ﷺ) سَأَلَ أَبَا وَاقِدٍ اللَّيْثِيَّ: مَا كَانَ يَقْرَأُ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فِي الْأَضْحَى وَالْفِطْرِ؟ فَقَالَ: كَانَ يَقْرَأُ فِيهِمَا بِـ ﴿ق وَالْقُرْآنِ الْمَجِيدِ﴾ وَ ﴿اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانْشَقَّ الْقَمَرُ﴾.

(عبیدالله) کوری( عبدالله) دەڵێ: (عمر) کوری( خطاب) (ﷺ) پرسیاریکرد لە(ابو واقد اللیثي )، ئایا پێغەمبەری خوا لـەنوێژی جـەژنی قوربان و رەمەزاندا چی خوێند؟ ئەویش وتی: لەو دوو نوێـژەدا ﴿ق و القران المجیـد﴾ و ﴿اقتربت الساعة وانشق القمر﴾ی دەخوێند .

## ( ٤ ) پێش نوێژی جەژنی دوای نوێژی جەژن سوننەت ناکرێت

٤٢٥ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) خَرَجَ يَوْمَ أَضْحَى أَوْ فِطْرٍ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، لَمْ يُصَلِّ قَبْلَهَا وَلَا بَعْدَهَا. ثُمَّ أَتَى النِّسَاءَ وَمَعَهُ بِلَالٌ، فَأَمَرَهُنَّ بِالصَّدَقَةِ، فَجَعَلَتِ الْمَرْأَةُ تُلْقِي خُرْصَهَا وَتُلْقِي سِخَابَهَا. [بخاري/ العلم/ ٩٨]

(ابن عبـاس) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) لـەرۆژی جـەژنی قوربانـدا یـا رەمەزاندا لەماڵ چووە دەرەوە دوورکات نوێژی کرد، نەلەپێشیەوە نوێـژی کـرد نەلەدوایـەوە، ئینجـا هاتـە نـاو ئافرەتـەکان بیـلالی لەگەڵدابوو، فەرمانی پێکـردن کەخێربکـەن، ئینجـا هەرژنە ملوانکەو ئەڵقەی ئاڵتونیـان دەهاویشتە سـەر ئـەو جلەی بیلال رایخستبوو.

## ( ٥ ) چوونی ئافرەتـان بۆ نوێژی جەژن

٤٢٦ـ عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ (ﷺ) قَالَتْ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أَنْ نُخْرِجَهُنَّ فِي الْفِطْرِ وَالْأَضْحَى: الْعَوَاتِقَ وَالْحُيَّضَ وَذَوَاتِ الْخُدُورِ، فَأَمَّا الْحُيَّضُ فَيَعْتَزِلْنَ الصَّلَاةَ، وَيَشْهَدْنَ الْخَيْرَ وَدَعْوَةَ الْمُسْلِمِينَ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ: إِحْدَانَا لَا يَكُونُ لَهَا جِلْبَابٌ؟ قَالَ: لِتُلْبِسْهَا أُخْتُهَا مِنْ جِلْبَابِهَا)). [بخاري/ الحيض/ ٣١٨]

(ام عطية) (رضی الله عنها) دەڵێ : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی پێکردین کەئافرەتان بنێرین بۆ نوێژی جەژنی رەمەزان و قوربان [لەوانەش] کچە عازەب ، ئەوانـــەی لەحـــەیزدان، ئەوانـــەش کـــەخۆیان دەرنەدەخســـت حـــەیزدارەکان کەنارگیردەبوون بەڵام ئامادەی خێرو دۆعـای موسڵمانەکان دەبوون، وتم: ئـەی

پێغەمبەری خوا(ﷺ) یەكێكمان بالاّ پۆشی نییە ؟ فەرمووی: ((باخوشكەكەی بیخاتە ژێر عەباكەی خۆیەوە)).

## (٦) كەنیزەكەكان چی دەڵێن لەجەژندا

٤٢٧ـ عَنْ عَائِشَةَ (﵂) قالَتْ: دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وَعِنْدِي جارِيتانِ تُغَنِّيانِ بِغِنَاءِ بُعَاثٍ، فَاضْطَجَعَ عَلَى الْفِرَاشِ وَحَوَّلَ وَجْهَهُ، فَدَخَلَ أَبُو بَكْرٍ (﵁) فَانْتَهَرَنِي وَقَالَ: مِزْمَارُ الشَّيْطَانِ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)؟ فَأَقْبَلَ عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالَ: ((دَعْهُمَا)). فَلَمَّا غَفَلَ غَمَزْتُهُمَا فَخَرَجَتَا وَكَانَ يَوْمَ عِيدٍ، يَلْعَبُ السُّودَانُ بِالدَّرَقِ وَالْحِرَابِ، فَإِمَّا سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) وَإِمَّا قَالَ: ((تَشْتَهِينَ تَنْظُرِينَ))؟ فَقُلْتُ: نَعَمْ، فَأَقَامَنِي وَرَاءَهُ، خَدِّي عَلَى خَدِّهِ، وَهُوَ يَقُولُ: ((دُونَكُمْ يَا بَنِي أَرْفِدَةَ)). حَتَّى إِذَا مَلِلْتُ قَالَ: ((حَسْبُكِ)). قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: ((فَاذْهَبِي)). [بخاري/ العيدين/ ٩٠٧]

عائشە (﵂) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) هاتە ژوورەوەو دوو كەنیزەك لەلای من گۆرانی قەلاّی (بعاث) یان دەوت، لەسەر جێگاكە راكشاو رووی وەرگێرا، لەوكاتەدا (ابوبكر) هاتە ژوورەوە لێم توورەبوو وتی: جوزەلەی شەیتان لەلای پێغەمبەری خوادا(ﷺ) ؟ پێغەمبەر(ﷺ) رووی‌كردە ئەبوبەكرو فەرمووی: ((وازیان لێ بێنە)) كاتێ پێغەمبەر(ﷺ) چاوی لێی نەبوو بەچاو ئامازەی بۆ كردن‌و چوونە دەرەوە، ئەو رۆژە رۆژی جەژن بوو، دوورەشپێست بەسەرنێزە و قەڵغان یاریان دەكرد، منیش خۆم داوامكرد لەپێغەمبەری خوا(ﷺ) یان ئەو فەرمووی حەزدەكەیت سەیر بكەیت وتم: بەڵێ: ئەویش خستمیە دوای خۆیەوە، رومەتم لەسەر روومەتی بوو سەری خستبووە سەرشانم دەیفەرموو: ((بەردەوام بن ئەی نەوەی ئەرفیدە)) هەتا بێ‌تاقەت بووم ئینجا فەرمووی: ((بەستە)) وتم : بەڵێ فەرمووی: ((دەبڕۆ)).

# (٨) نوێژی ڕێبوار

## ( ١ ) کورتکردنەوەی نوێژی ڕێبوار لەکاتی ئاسایشدا

٤٢٨. عنْ يَعْلَى بْنِ أُمَيَّةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قُلْتُ لِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ (رضي الله عنه): ﴿لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَنْ تَقْصُرُوا مِنَ الصَّلَاةِ إِنْ خِفْتُمْ أَنْ يَفْتِنَكُمِ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ ﴿النساء ١٠١﴾ فَقَدْ أَمِنَ النَّاسُ؟ فَقَالَ: عَجِبْتُ مِمَّا عَجِبْتَ مِنْهُ، فَسَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: ((صَدَقَةٌ تَصَدَّقَ اللَّهُ بِهَا عَلَيْكُمْ، فَاقْبَلُوا صَدَقَتَهُ)).

(يعلى) کوری (اميه) (رضي الله عنه) دەڵێ: بە(عمر) کوری (خطاب)م (رضي الله عنه) وت ( خوا لەقورئاندا فەرموویەتی: ﴿ ليس عليكم جناح ان تقصروا من الصلاة ، ان خفتم ان يفتنكم الذين كفروا ﴾ ﴿الناء:١٠١﴾واتە: ئەگەر ترستان هەبوو کەکافرەکان تووشی گێچەڵتان بکەن نوێژەکانتان کورت بکەنەوە قەیناکا. بەلاَم ئێستا خەڵکی لەئاسایشدان؟ عمر وتی: منیش وەکو تۆ سەرم سووڕمابو، بۆیە پرسیارم کرد لەپێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەبارەیەوە، ئەویش فەرمووی: ((خەلاَتێکە خوا بەئێوەی بەخشیووە، ئێوەش وەری بگرن)).

٤٢٩ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنهما) قَالَ: فَرَضَ اللَّهُ الصَّلَاةَ عَلَى لِسَانِ نَبِيِّكُمْ (صلى الله عليه وسلم) فِي الْحَضَرِ أَرْبَعًا وَفِي السَّفَرِ رَكْعَتَيْنِ، وَفِي الْخَوْفِ رَكْعَةً.

(ابن عباس) (رضي الله عنهما) دەڵێ: خوای گەورە لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەتان (صلى الله عليه وسلم) نوێژی لەسەر ئێوە فەرزکردووە، چوار رکات لەجێداو دوورکاتیش لەسەفەردا ، لەکاتی ترسیشدا یەك رکات [مەبەست ئەوەیە یەك رکات لەگەڵ ئیمامدا دوایی خۆیشی رکاتێ بکات] [اقتران ٦/٤٢٣]

## ( ٢ ) لەچ سەفەرێکدا نوێژ کورت دەکرێتەوە

٤٣٠ـ عن أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ (رضي الله عنه) قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) الظُّهْرَ بِالْمَدِينَةِ أَرْبَعًا، وَصَلَّيْتُ مَعَهُ الْعَصْرَ بِذِي الْحُلَيْفَةِ رَكْعَتَيْنِ.

(انس) کوری (مالك) (رضي الله عنه) دەڵێ: لەخزمەت پێغەمبەری خوادا(صلى الله عليه وسلم) لەمەدینە نوێژی نیوەڕۆم کردووە، چوار رکات، هەروەها نوێژی عەسرم لە (ذي الحليفة) لەخزمەتیا کردووە، دوورکات.

## ( ٣ ) کورتکردنەوەی نوێژ لەحەجدا

٤٣١ـ عَنْ أنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) مِنَ الْمَدِينَةِ إِلَى مَكَّةَ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ حَتَّى رَجَعَ. قُلْتُ: كَمْ أقَامَ بِمَكَّةَ؟ قَالَ: عَشْرًا. وفي الرواية: خَرَجْنَا مِنَ الْمَدِينَةِ إِلَى الْحَجِّ.

(انس) کوری( مالك) (ﷺ) دەڵێ: لەخزمەت پێغەمبەری خوادا(ﷺ) لەمەدینە بەرەو مەککە دەرچووین، دورکات دوورکات نوێژی کرد هەتا گەراینەوە ، وتم: چەندە لەمەککەمایەوە؟ وتی: دەرۆژ ، لەریوایەتێکیشا دەڵێ: لەمەدینە دەرچووین بۆ حەج.

## ( ٤ ) کورتکردنەوەی نوێژ لەمینا

٤٣٢ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ) قَالَ: صَلَّى النَّبِيُّ (ﷺ) بِمِنًى صَلَاةَ الْمُسَافِرِ وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ وَعُثْمَانُ (ﷺ) ثَمَانِيَ سِنِينَ، أَوْ قَالَ: سِتَّ سِنِينَ، قَالَ حَفْصٌ -يعني ابن عاصم- وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يُصَلِّي بِمِنًى رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ يَأْتِي فِرَاشَهُ، فَقُلْتُ: أيْ عَمِّ لَوْ صَلَّيْتَ بَعْدَهَا رَكْعَتَيْنِ؟ قَالَ: لَوْ فَعَلْتُ لَأَتْمَمْتُ الصَّلَاةَ.

(ابن عمر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) لە(مینا) نوێژی سەفەری کردو. (ابوبکر)و (عمر)و (عثمان)یش (رەزای خوایان لێبێت) بەهەمان شێوە هەشت ساڵ ، یا وتی: شەش ساڵ کردیان ؛ (حفص) واتە (ابن عاصم) دەڵێ: (ابن عمر) لەمینا دوورکات نوێژی دەکردو دەهاتە سەر جێگاکەی ، منیش وتم: ئەی مامە ئەگەر دوورکاتی تریشت بکردایە؟ ئەگەر بمکردایە هەر نوێژەکەم بەتەواوی دەکرد.

## ( ٥ ) کۆکردنەوەی دوونوێژ لەسەفەردا

٤٣٣ـ عَنْ أنَسِ بن مالك (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ): إِذَا عَجِلَ عَلَيْهِ السَّفَرُ يُؤَخِّرُ الظُّهْرَ إِلَى أوَّلِ وَقْتِ الْعَصْرِ فَيَجْمَعُ بَيْنَهُمَا، وَيُؤَخِّرُ الْمَغْرِبَ حَتَّى يَجْمَعَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ الْعِشَاءِ، حِينَ يَغِيبُ الشَّفَقُ.

لە(انس) کوری(مالك)(ﷺ) کەپێغەمبەرەوە(ﷺ) هەرکات پەلەی بوایە لەرۆیشتنیان نوێژی نیوەرۆی دوادەخست بۆ سەرەتای کاتی نوێژی عەسرو پێکەوە کۆی دەکردنەوە نوێژی شێوانیشی دوادەخست هەتا لەکاتی ئاوابوونی ئاسۆدا لەگەڵ خەوتناندا کۆی دەکردەوە.

## ( ٦ ) کۆکردنەوەی دوو نوێژ لەنیشتنگادا

٤٣٤. عَنْ ابْنِ عَبـاسٍ (ﷺ) قَـالَ: جَمَعَ رَسُولُ اللهِ(ﷺ) بَيْنَ الظُّهْرِ وَالعَصْرِ ، وَالمَغْرِبِ وَالعِشَاء ، بالمَدِينَة فِي غَيْرِ خَوْفٍ وَلاَ مَطَر. فِي حَدِيث وَكِيع قَالَ: قُلْتُ لأبنِ عَبَاسٍ : لِمَ فَعَلَ ذَلِكَ؟ قَالَ: كَيْلاَ يُحْرِجَ أُمَتَهُ. وَفِي حَدِيث أَبِي مُعَاوِيَة: قِيلَ لِأبْنِ عَبَاسٍ: مَا أرادَ الى ذَلِكَ؟ قَالَ: أرادَ أن لاَ يَحْرِج امَتَهُ.

(ابن عباس) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) نوێـژی نیـوەڕۆو عەسـرو، نوێژی شێوان و خەوتنانی لەمەدینەدا بەبێ ترس‌و بەبێ باران کۆکردۆتەوە، لە فەرموودەی وکیعدا دەڵێ: بە (ابن عباس)م وت: بۆچی وای کردووە؟ لەوەڵامدا وتی: بۆئەوەی ئوممەتەکەی ناڕەحەت نەکات لەفەرموودەی (ابو معاویە)یەشدا بە(ابن عباس) وتراوە: مەبەستی چی بووە لەو کارەی؟ وتویەتی: ویستویەتی ئوممەتەکەی نارەحەت نەبن.

## ( ٧ ) نوێژ لەهەوارگەدا لەکاتی باراندا

٤٣٥. عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ): أَنَّهُ نَادَى بِالصَّلَاةِ فِي لَيْلَةٍ ذَاتِ بَرْدٍ وَرِيحٍ وَمَطَرٍ، فَقَالَ فِي آخِرِ نِدَائِهِ: أَلَا صَلُّوا فِي رِحَالِكُمْ، أَلَا صَلُّوا فِي الرِّحَالِ. ثُمَّ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) كَانَ يَأْمُرُ الْمُؤَذِّنَ إِذَا كَانَتْ لَيْلَةٌ بَارِدَةٌ أَوْ ذَاتُ مَطَرٍ فِي السَّفَرِ أَنْ يَقُولَ: ((أَلَا صَلُّوا فِي رِحَالِكُمْ)).

لـە(ابـن عمـر) ەوە (ﷺ) لەشـەوێکی سـاردو بـاراندا بـانگی کـرد بـۆ نوێـژ لەکۆتایی بانگکردنەکەیدا وتی: لە جێگەو ڕێگەی خۆتاندا (لەهەوارگەدا نوێـژ بکـەن) ئینجـا وتـی: پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) فـەرمانی دەکـرد بـەبانگدەر ئەگـەر شەوێکی سـاردیان بـاران بوایـە لـەکاروانـدا کەبڵێت ((نوێـژ بکـەن لەسـەر جلـی ولاغەکانتان)).

پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەگەر شەوێك باران یا سەرمابوا یا فەرمانی دەرکرد بەبانگ بێژەکە کە بڵێت: ئاگاداربن لەهەوارگەی خۆتاندا نوێژەکانتان بکەن).

## ( ٨ ) سوننەت نەکردن لەسەفەردا

٤٣٦ـ عن حَفْصِ بْنِ عَاصِمٍ قَالَ: صَحِبْتُ ابْنَ عُمَرَ (ﷺ) فِي طَرِيقِ مَكَّةَ، قَالَ: فَصَلَّى لَنَا الظُّهْرَ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ أَقْبَلَ وَأَقْبَلْنَا مَعَهُ حَتَّى جَاءَ رَحْلَهُ، وَجلسَ وَجَلَسْنَا مَعَهُ، فَحَانَتْ مِنْهُ الْتِفَاتَةٌ نَحْوَ حَيْثُ صَلَّى، فَرَأَى نَاسًا قِيَامًا، فَقَالَ: مَا يَصْنَعُ هَؤُلَاءِ؟ قُلْتُ: يُسَبِّحُونَ، قَالَ لَوْ كُنْتُ مُسَبِّحًا لَأَتْمَمْتُ صَلَاتِي، يَا ابْنَ أَخِي إِنِّي

صَحِبْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) فِي السَّفَرِ فَلَمْ يَزِدْ عَلَى رَكْعَتَيْنِ حَتَّى قَبَضَهُ اللَّهُ، وَصَحِبْتُ أَبَا بَكْرٍ (ﷺ) فَلَمْ يَزِدْ عَلَى رَكْعَتَيْنِ حَتَّى قَبَضَهُ اللَّهُ، وَصَحِبْتُ عُمَرَ (ﷺ) فَلَمْ يَزِدْ عَلَى رَكْعَتَيْنِ حَتَّى قَبَضَهُ اللَّهُ، ثُمَّ صَحِبْتُ عُثْمَانَ فَلَمْ يَزِدْ عَلَى رَكْعَتَيْنِ حَتَّى قَبَضَهُ اللَّهُ، وَقَدْ قَالَ اللَّهُ تعالى: ﴿لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ﴾ ﴿الأحزاب:٢١﴾.

(حفص) کوڕی( عاصم) دەڵێ: بووم بەهاوڕێی (ابن عمر) (ﷺ) لەڕێگای مەککەدا وتی: نوێژی نیوەڕۆی بەدوورکات بۆ کردین ، ئینجا هەستاو ئێمەش لەگەڵیا هستاین هەتا گەیشتە، بارگەکەی، دانیشتو ئێمەیش لەگەڵیا دایشتین، ئینجا لای کردەوە بەلای ئەو شوێنەدا کەنوێژی لێ کردبوو ، بینی کەسانێك بەپێوەن، وتی: ئەگەر سوننەتم بکردایە نوێژەکەم بەتەواوی دەکرد، ئەی برازام من لەکارواندا، لەخزمەت پێغەمبەری خوادا(ﷺ) بووم لەدوو رکات زیاتری نەکردووە هەتا خوابردیەوە بۆ لای خۆی، هەروەها هاوڕێیەتی ابوبکرم (ﷺ) کردووە لەدوورکات زیاتری نەکردووە هەتا خوا بردوویەتەوە بۆ لای خۆی، هەروەها هاوڕێیەتی (عمر) (ﷺ) کردووە ئەویش لەدوو رکات زیاتری نەکردووە هەتا خوا بردویەتەوە بۆ لای خۆی، ئینجا هاوڕێیەتی عثمان م کردووە لەدوورکات زیاتری نەکردووە هەتا خوابردیەوە بۆ لای خوا، خوای گەورەش فەرموویەتی: ﴿لقد كان لكم في رسول الله اسوة حسنة﴾

## ( ٩ ) نوێژی سوننەت بەسەر وڵاغەوە لەکارواندا

٤٣٧ـ عن ابن عمر (ﷺ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يُسَبِّحُ عَلَى الرَّاحِلَةِ قِبَلَ أَيِّ وَجْهٍ تَوَجَّهَ، وَيُوتِرُ عَلَيْهَا، غَيْرَ أَنَّهُ لَا يُصَلِّي عَلَيْهَا الْمَكْتُوبَةَ.

(ابن عمر)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێغەمبەری خوا، ( نوێژی سوننەتی بەسەروڵاغەوە دەکرد ڕووی لەهەر شوێنێك بوایە، نوێژی وەتریشی بەسەرەوە دەکرد، بەڵام نوێژی فەرزی بەسەرەوە نەدەکرد.

## ( ١٠ ) ئەگەر لەکاروان بهاتایەتەوە لەمزگەوت دوورکاتی دەکرد

٤٣٨ـ عَنْ جَابِرِ ابْنِ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: خَرَجْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فِي غَزَاةٍ، فَأَبْطَأَ بِي جَمَلِي وَأَعْيَا، ثُمَّ قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) قَبْلِي وَقَدِمْتُ بِالْغَدَاةِ، فَجِئْتُ الْمَسْجِدَ، فَوَجَدْتُهُ عَلَى بَابِ الْمَسْجِدِ، قَالَ: ((الْآنَ حِينَ قَدِمْتَ)). قُلْتُ: نَعَمْ. قَالَ:

((فدعْ جمَلَك، وادْخُلْ فصَلِّ رَكْعَتَيْنِ)). قَالَ: فَدَخَلْتُ فصَلَّيْتُ ثُمَّ رَجعْتُ. [بخاري/ الوتر/ ٩٥٥].

(جابر) کوری( عبدالله) (ﷺ) دەڵێ: لەخزمەت پێغەمبەری خوادا (ﷺ) لەغەزایەکدا دەرچووم وشترەکەم ماندو بوو، دوای خستم ، پێغەمبەر (ﷺ) لەپێش مندا گەیشتبوو، من لەپێش نیوەڕۆدا گەیشتم هاتم بۆ مزگەوت، پێغەمبەرم (ﷺ) لەدەرگای مزگەوتەکەدا تووش بوو فەرمووی: ((ئائێستا دەگەیت؟)) وتم: بەڵێ : فەرمووی: ((واز لەوشترەکەت بێنە بچۆرە ژوورەوە دوورکات نوێژ بکە)) وتی: چوومە ژوورەوە دوو رکاتم کردو گەرامەوە).

## ( ١١ ) لەبارەی نوێژی ترسەوە

٤٣٩ـ عَنْ جَابِرٍ (ﷺ) قَالَ: غَزَوْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) قَوْمًا مِنْ جُهَيْنَةَ، فَقَاتَلُونَا قِتَالًا شَدِيدًا، فَلَمَّا صَلَّيْنَا الظُّهْرَ قَالَ الْمُشْرِكُونَ: لَوْ مِلْنَا عَلَيْهِمْ مَيْلَةً لَاقْتَطَعْنَاهُمْ. فَأَخْبَرَ جِبْرِيلُ (عليه السلام) رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) ذَلِكَ، فَذَكَرَ ذَلِكَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)، قَالَ: وَقَالُوا إِنَّهُ سَتَأْتِيهِمْ صَلَاةٌ هِيَ أَحَبُّ إِلَيْهِمْ مِنَ الْأَوْلَادِ. فَلَمَّا حَضَرَتِ الْعَصْرُ، قَالَ صَفَّنَا صَفَّيْنِ، وَالْمُشْرِكُونَ بَيْنَنَا وَبَيْنَ الْقِبْلَةِ. قَالَ: فَكَبَّرَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وَكَبَّرْنَا، وَرَكَعَ فَرَكَعْنَا، ثُمَّ سَجَدَ وَسَجَدَ مَعَهُ الصَّفُّ الْأَوَّلُ، فَلَمَّا قَامُوا سَجَدَ الصَّفُّ الثَّانِي، ثُمَّ تَأَخَّرَ الصَّفُّ الْأَوَّلُ وَتَقَدَّمَ الصَّفُّ الثَّانِي فَقَامُوا مَقَامَ الْأَوَّلِ، فَكَبَّرَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وَكَبَّرْنَا، وَرَكَعَ فَرَكَعْنَا، ثُمَّ سَجَدَ مَعَهُ الصَّفُّ الْأَوَّلُ وَقَامَ الثَّانِي، فَلَمَّا سَجَدَ الصَّفُّ الثَّانِي ثُمَّ جَلَسُوا جَمِيعًا سَلَّمَ عَلَيْهِمْ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ). قَالَ أَبُو الزُّبَيْرِ: ثُمَّ خَصَّ جَابِرٌ أَنْ قَالَ: كَمَا يُصَلِّي أُمَرَاؤُكُمْ هَؤُلَاءِ. [بخاري/ البيوع/ ١٩٩١]

(جابر) کوری (عبدالله) (ﷺ) دەڵێ: لەخزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) غەزامان کرد لەگەڵ تیرەیەکدا لە( جوهەینە)، جەنگێکی سەختیان لەگەڵدا کردین، کاتێ نوێژی نیوەڕۆمان کرد، موشریکەکان وتیان: ئەگەر هێرشێکی بەهێز بکەینە سەریان لەرەگوریشە دەریان دەهێنین جوبرەئیل (علیه السلام) ئەو هەواڵەی گەیاندە پێغەمبەر (ﷺ) پێغەمبەریش (ﷺ) ئاگاداری ئێمەی کرد، راوی دەڵێ: ئەوان کاتی نوێژ کردنیان دێت، کەلەمنداڵەکانیان خۆشتریان دەوێت، کاتێ کاتی عەسرهات کردینی بەدوو ریزەوە ، موشریکەکان لەنێوان ئێمەو قیبلەدابوون، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) تەکبیری کردو ئێمەش تەکبیرمان کرد،

ركوعی برد ئێمەش ركوعمان برد، ئینجا ریزی یەكەم دواكەوتن لە ئیمام ریزی دووەم پێشكەوتن وەك ریزی یەكەم، پێغەمبەر (ﷺ) تەكبیری كرد ئێمە تەكبیرمان كرد، ركوعی برد ئێمەیش ركوعمان برد، ئینجا سوجدەی برد ریزی‌یەكەم لەگەڵیا سوجدەی برد، دووەم بەپێوەمانەوە كاتێ ریزی دووەم سوجدەی برد ئینجا هەمووپێكەوە دانیشتن پێغەمبەر(ﷺ) سەلامی دایەوە.

## ( ١٢ ) لەبارەی نوێژی ڕۆژگیرانەوە

٤٤٠ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: خَسَفَت الشَّمْسُ فِي عَهْد رَسُول اللَّه (ﷺ)، فَقَامَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) يُصَلِّي، فَأَطَالَ الْقِيَامَ جِدًّا، ثُمَّ رَكَع فَأطَالَ الرُّكُوعَ جِدًّا، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ فَأَطَالَ الْقِيَام جِدًّا، وَهُوَ دُونَ الْقِيَامِ الْأَوَّل، ثُمّ رَكَعَ فَأطَال الرُّكُوعَ جِدًّا وَهُوَ دُونَ الرُّكُوعِ الْأَوَّل، ثُمَّ سَجَدَ، ثُمَّ قَامَ فَأطَالَ الْقِيَام وَهُوَ دُونَ الْقِيَام الْأَوَّل، ثُمّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ وَهُوَ دُونَ الرُّكُوعِ الْأَوَّلِ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ فَقَامَ، فَأطَال الْقِيَامَ وَهُوَ دُونَ الْقِيَامِ الْأَوَّل، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعِ وَهُوَ دُونَ الرُّكُوعِ الْأَوَّل، ثُمّ سَجَدَ، ثُمَّ انْصَرَفَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) وَقَدْ تَجَلَّتِ الشَّمْسُ، فَخَطَبَ النَّاسَ، فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْه، ثُمَّ قَالَ: ((إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ مِنْ آيَاتِ اللَّه، وَإِنَّهُمَا لَا يَنْخَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلَا لِحَيَاتِه، فَإِذَا رَأَيْتُمُوهُمَا فَكَبِّرُوا، وَادْعُوا اللَّهَ وَصَلُّوا وَتَصَدَّقُوا. يَا أُمَّةَ مُحَمَّدٍ، إِنْ مِنْ أَحَدٍ أَغْيَرَ مِنَ اللَّه أَنْ يَزْنِيَ عَبْدُهُ أَوْ تَزْنِيَ أَمَتُهُ. يَا أُمَّةَ مُحَمَّدٍ، وَاللَّه لَوْ تَعْلَمُونَ مَا أَعْلَمُ لَبَكَيْتُمْ كَثِيرًا وَلَضَحِكْتُمْ قَلِيلًا، أَلَا هَلْ بَلَّغْتُ)).

(عائشە) دەڵێت: لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) خۆرگیرا، پێغەمبەر (ﷺ) هەستاو دەستیكرد بە نوێژكردن، زۆر بەپێوە راوەستاو درێژەی پێدا، پاشان ركوعی بردوو لەمیشدا زۆرمایەوە . ئینجا هەڵسایەوە لێرەشدا زۆرمایەوە، بەڵام بەقەدەر وەستانی یەكەم نەبوو. ئینجا ركوعی بردەوە درێژەی بەمیشدا، بەڵام بەقەدەر ركوعی یەكەم نەمایەوە، پاشان سوجدەی برد. ئینجا هەستایەوەو درێژەی‌دا بەوەستان، بەڵام بەقەدەر وەستانی یەكەم نەمایەوە، پاشان ركوعی برد درێژەیدا بەركوع بەڵام بەقەدەر ركوعی یەكەم نەمایەوە، ئینجا سەری بەرزكردەوە زۆرمایەوە بەپێوە بەڵام بەقەدەر وەستانی یەكەم نەبوو، ئینجا سجودی برد، پاشان سەلامی دایەوە، لەوكاتەدا خۆر بەربووبوو، ئینجا وتارێكی بۆ خەڵكەكەدا. سوپاسی خوای كردو فەرمووی: ((خۆرومانگ دوونیشانەی خوان بۆ مردنی هیچ كەس ناگیرێن یا بۆ ژیانی ، ئەگەر دیتان

گیران تەکبیر بکەن لەخوا بپاڕێنەوە، نوێژ بکەن ، خێرو خێرات بکەن ، ئەی ئوممەتی محەمەد ، کەس نییە بەقەدەر خوا بەغیرەتر بێت لەوەی کەبەندەیەکی زینا بکات، ئەی ئوممەتی محەمەد، سوێند بەخوا ئەگەر ئەوەی من دەیزانم ئێوە بتانزانیایە. زۆر دەگریان‌و کەم پێدەکەنین، ئایا پێم ڕاگەیاندن)).

٤٤١ ـ عَنْ ابْنِ عَبَاسٍ (ﷺ) قَالَ: صَلى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) حِينَ كُسِفَتِ الشَمْسُ ثَمَانِي رَكعَاتٍ فِي اَرْبَعِ سَجَدَاتٍ.

(ابن عباس) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) کاتێ خۆرگیرا هەشت رکوعی برد لەگەڵ چوار سوجدەدا [واتە: لەهەر کاتێکدا چوار رکوع‌و دوو سوجدە].

## ( ١٣ ) لەبارەی نوێژە بارانەوە

٤٤٢ . عَنْ عَبْدُالله بنُ زَيْدِ الأنْصَارِيِّ (ﷺ) : انَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) خَرَجَ الى المُصَلى يَسْتَسْقِي ، وَانَّهُ لَمَا اراد ان يَدْعُوَ اسْتَقْبَلَ القِبْلَةَ وَحَوَلَ رِدَاءَهُ. وَفِي روايَةٍ: فجعَل الى النَّاسِ ظَهْرَهُ يَدْعُو الله ، واسْتَقْبَلَ القِبْلَـةَ، وَحَوَّلَ رِدَاءهُ ثُمَّ صَلى رَكْعَتَيْن.

(عبدالله)ی کوڕی (زید الانصاری) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) چووە دەرەوە بۆ نوێژەبارانە، هەروەها کاتێ ویستی لەخوا بپاڕێتەوە ڕوویکردە قیبلەو چاکەتەکەی هەڵگێڕایەوە، لەریوایەتێکیشدا : پشتی کردە خەڵکەکەو لەخوا دەپاڕایەوە ، ڕویشی کردبووە قیبلەو چاکەتەکەی هەڵگێڕایەوە دوو رکات نوێژی کرد.

## ( ١٤ ) لەبارەی فەڕو خێری بارانەوە

٤٤٣ ـ عَنْ انسٍ (ﷺ) قَالَ: أصَابَنَا وَنَحْنُ مَعَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) مَطَرٌ. قَالَ: فَحَسَرَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) ثَوْبَهُ حَتَى اصَابَهُ مِنَ المَطَرِ ، فقُلْنَا : يَا رَسُولَ اللهِ لِمَ صَنَعْتَ هَذَا ؟ قَالَ: ((لأنَّهُ حَدِيثُ عَهْدٍ بِرَبِهِ)).

(انس) (ﷺ) دەڵێ: ئێمە لەخزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) بووین ، بارانمان لێباری ، پێغەمبەر (ﷺ) بەشێکی کراسەکەی لادا تاباران لەشی تەڕکرد، وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆچی واتکرد ؟ فەرمووی: ((چونکە تازە لەلای پەروەردگاریەوە هاتووە)).

## ( ١٥ ) پەناگرتن بەخوا لەکاتی باوبۆراندا.

٤٤٤ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) أنَّهَا قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) إِذَا عَصَفَتِ الرِّيحُ قَالَ: ((اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ خَيْرَهَا وَخَيْرَ مَا فِيهَا، وَخَيْرَ مَا أُرْسِلَتْ بِهِ وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا وَشَرِّ مَا فِيهَا، وَشَرِّ مَا أُرْسِلَتْ بِهِ)). قَالَتْ: وَإِذَا تَخَيَّلَتِ السَّمَاءُ تغَيَّرَ لَوْنُهُ، وَخَرَجَ وَدَخَلَ، وَأَقْبَلَ وَأَدْبَرَ، فَإِذَا مَطرتْ سُرِّيَ عَنْهُ فَعَرَفْتُ ذَلِكَ فِي وَجْهِهِ، قَالَتْ عَائِشَةُ (ﷺ): فَسَأَلْتُهُ، فَقَالَ: ((لَعَلَّهُ يَا عَائِشَةُ كَمَا قَالَ قَوْمُ عَادٍ: ﴿فَلَمَّا رَأَوْهُ عَارِضًا مُسْتَقْبِلَ أَوْدِيَتِهِمْ قَالُوا هَذَا عَارِضٌ مُمْطِرُنَا﴾ [الاحقاف: ٢٤]. [بخاري/ بدء الخلق/ ٣٠٣٤]

عائشە (ﷺ) دەڵـێ: هـەرکاتێ باهـەڵی بکردایـە پێغەمبـەر (ﷺ) دەیفەرموو ((خوایە گیان خێری ئەم بایەو خێری ئەوەش کە تیایەتی خێری ئەوەش کە بۆی ڕەوانەکراوە لەتۆ داواکـارم، پـەنادەگرم بـەتۆ لـە خراپەی ئەم بایەو خراپەی ئەوەی کە تیایەتی و خراپەی ئەوەش کە بۆی ڕەوانەکراوە)). هەروەها وتویەتی: هەرکاتێ ئاسمان هەور بوایە پێغەمبەر (ﷺ) ڕەنگـی دەگۆڕا، دەهـات و دەچوو، کە بـاران دەبـاری ئینجـا ئاسـایی دەبـووەوە، مـن ئـەوەم بەڕوخسـاریدا دەزانـی، بۆیـە لێـم پرسـی: ئـەویش فـەرموی: ((ئـەی عائشـە لەوانەیە هـەر وەکو حاڵەتەکەی قـەومی عـاد بێت (کـە خوای گەورە لە ئایەتێکدا لەسەر زمانیان دەفەرموێت: ﴿کاتـێ هەورەکـەیان دی ڕوو بە شیو ودۆڵەکانیان دێت، وتیان: ئەمـە هەورێکە بارانمـان بـۆ دەبارێنـێ﴾ بەڵام ئەوە بوو هەور و سزای خوایی بوو).

## ( ١٦ ) بای ڕۆژهەڵات و بای ڕۆژئاوا

٤٤٥ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: ((نُصِرْتُ بِالصَّبَا، وَأُهْلِكَتْ عَادٌ بِالدَّبُورِ)). [بخاري/ الاستسقاء/ ٩٨٨٤]

(ابن عباس) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ((مـن بەهۆی بـای ڕۆژهەڵاتەوە پشتیوانیم لێ کراوە، قەومی عاد بەبای خۆرئاوا تیاچوون)).

# بەشی مردن و جەنازە

## (١) سەردانی نەخۆش

٤٤٦ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رضي الله عنهما) أَنَّهُ قَالَ: كُنَّا جُلُوسًا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) إِذْ جَاءَهُ رَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ، فَسَلَّمَ عَلَيْهِ، ثُمَّ أَدْبَرَ الْأَنْصَارِيُّ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((يَا أَخَا الْأَنْصَارِ، كَيْفَ أَخِي سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ)). فَقَالَ: صَالِحٌ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((مَنْ يَعُودُهُ مِنْكُمْ)). فَقَامَ وَقُمْنَا مَعَهُ، وَنَحْنُ بِضْعَةَ عَشَرَ مَا عَلَيْنَا نِعَالٌ وَلَا خِفَافٌ وَلَا قَلَانِسُ وَلَا قُمُصٌ، نَمْشِي فِي تِلْكَ السِّبَاخِ حَتَّى جِئْنَاهُ، فَاسْتَأْخَرَ قَوْمُهُ مِنْ حَوْلِهِ، حَتَّى دَنَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وَأَصْحَابُهُ الَّذِينَ مَعَهُ.

(عبدالله ی کوڕی عومەر (رضي الله عنهما) دەڵێ: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا (ﷺ) دانیشتبوین پیاوێك لە پشتیوانان هات بۆ خزمەتی و سەلامی لێ کرد، پاشان پشتی هەڵکرد و ڕۆی. پێغەمبەر (ﷺ) پرسی: ((ئەی برای (انصار)ی براکەم (سعدی کوڕی عبادە) چۆنە؟)) ئەویش ووتی: چاکە. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((کێ دەیەوێت بچێ بۆ سەردانی)) ئینجا ئەو هەستاو ئێمەش هەستاین دەپانزە کەسێك دەبووین، نەنەعل و نەخوف و نەپێڵاومان لە پێدانەبوو، کڵاو و کراسیشمان لەبەردا نەبوو، بەسەر زەویەکی شۆردا ڕۆیشتین تا گەیشتینە لای، هەندێ لە خزمانی کەلەدەوری بوون، چونە دواوە بۆ ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ هاوەڵانیدا لێی نزیك ببنەوە.

## (٢) چی دەوترێت لای نەخۆش و لای مردوو

٤٤٧ـ عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((إِذَا حَضَرْتُمُ الْمَرِيضَ أَوِ الْمَيِّتَ فَقُولُوا خَيْرًا، فَإِنَّ الْمَلَائِكَةَ يُؤَمِّنُونَ عَلَى مَا تَقُولُونَ)). قَالَتْ: فَلَمَّا مَاتَ أَبُو سَلَمَةَ أَتَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ أَبَا سَلَمَةَ قَدْ مَاتَ، قَالَ: ((قُولِي: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي وَلَهُ، وَأَعْقِبْنِي مِنْهُ عُقْبَى حَسَنَةً)). قَالَتْ: فَقُلْتُ، فَأَعْقَبَنِي اللَّهُ مَنْ هُوَ خَيْرٌ لِي مِنْهُ مُحَمَّدًا (ﷺ).

(أم سلمە) (رضي الله عنها) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: کاتێك چوونە لای نەخۆش یان مردوو، شتی چاك بڵێن، چونکە فریشتەکان ئامین بۆنزاکانتان دەکەن، وتی: کاتێ کە (ابو سلمە) وەفاتی کرد، چوم بۆ خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ)، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) (ابو سلمە) کۆچی دوایی کرد، ئەویش

فەرمووی، بڵێ: ((خوایە لەمنیش و لەویش خۆش ببە و عاقیبەتێکی باش بەدوایدابێنە)). (ام سلمە) (ﷺ) دەڵێ: منیش ئەوەم وت، ئەوەتە خوا لەو چاکتری پێ بەخشیم کە (محمد)ە (ﷺ).

## (٣) لاالەالاالله بدرێت بەگوێی ئەو کەسانەدا کەلە سەرەمەرگدان

٤٤٨ـ عن أبي سعيدٍ الْخُدْرِيِّ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((لَقِّنُوا مَوْتَاكُمْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ)).

(ابو سعيد الخدری) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ((لاالەالاالله بدەن بەگوێی مردووەکانتاندا)). واتە: ئەوانەی کەلە سەرەمەرگدان.

## (٤) هەرکەسێ حەزبەدیداری خوا بکات خواش حەزبە دیداری ئەو دەکات

٤٤٩ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قالتْ: قالَ رسُولُ اللَّه (ﷺ): ((مَنْ أَحَبَّ لِقَاءَ اللَّهِ أَحَبَّ اللَّهُ لِقَاءَهُ، وَمَنْ كَرِهَ لِقَاءَ اللَّه كَرِهَ اللَّهُ لِقَاءَهُ)). فَقُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللَّه، أَكَراهيةُ الْمَوْتِ؟ فَكُلُّنَا نَكْرهُ الْمَوْتَ. فقَالَ: ((لَيْسَ كَذَلِك، ولكِنَّ الْمُؤْمِنَ إِذَا بُشِّرَ برحْمَةِ اللَّه وَرِضْوَانِه وَجَنَّتِه أَحَبَّ لِقَاءَ اللَّه، فَأَحَبَّ اللَّهُ لِقَاءَهُ. وَإِنَّ الْكَافِرَ إِذَا بُشِّرَ بِعَذَابِ اللَّه وَسَخَطِه، كَرِهَ لِقَاءَ اللَّه وَكَرِهَ اللَّهُ لِقَاءَه)).

[وَفِي رواية عَنْ شُرَيْحِ بْنِ هَانِئٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قال: قَال رَسُولُ اللَّه (ﷺ): ((مَنْ أَحَبَّ لِقَاءَ اللَّه أَحَبَّ اللَّهُ لِقَاءَهُ، وَمَنْ كَرِهَ لِقَاءَ اللَّه، كَرِهَ اللَّهُ لِقَاءَهُ)). قَالَ: فَأَتَيْتُ عَائِشَةَ فَقُلْتُ: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِين، سمعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ يَذْكُرُ عَنْ رسُول اللَّه (ﷺ) حَدِيثًا، إِنْ كانَ كَذَلِكَ فقَدْ هَلَكْنَا. فَقَالَتْ: إِنَّ الْهَالِكَ مَنْ هَلَكَ بِقَوْلِ رَسُولِ اللَّه (ﷺ)، وما ذَاكَ؟ قَال: قَال رَسُولُ اللَّه (ﷺ): ((مَنْ أَحَبَّ لِقَاءَ اللَّه أَحَبَّ اللَّهُ لِقَاءَهُ، وَمَنْ كَرِهَ لِقَاءَ اللَّه كَرِه اللَّهُ لِقَاءَهُ)) وليْسَ مِنَّا أَحدٌ إِلَّا وَهُوَ يَكْرَهُ الْمَوْتَ؟ فَقَالَتْ: قَدْ قَالَهُ رَسُولُ اللَّه (ﷺ)، ولَيْسَ بِالَّذي تَذْهَبُ إِلَيْه، وَلَكِنْ إِذَا شَخَصَ الْبَصَرُ، وحَشْرَجَ الصَّدْرُ، واقْشَعَرَّ الْجِلْدُ، وتَشَنَّجتِ الْأَصابِعُ، فعِنْدَ ذَلِكَ مَنْ أَحَبَّ لِقَاءَ اللَّه أَحَبَّ اللَّهُ لِقَاءَهُ، ومَنْ كَرِهَ لِقَاءَ اللَّه كَرِهَ اللَّهُ لِقَاءَهُ]. [بخاري الرقاق/ ٦١٤٢]

(عائشە) (ﷺ) دەڵێ: ((پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (هەرکەس حەزبە دیداری خوا بکات خوایش حەزبە دیداری ئەو دەکات، هەرکەسیش حەزبە دیداری خوا نەکات، خواش حەز بەدیداری ناکات)). منیش وتم: باشە ئەی پێغەمبەری خوا،

ئایا حەزنەکردن لە مردن ئەوە دەگەیەنیت؟ کەسمان حەز لەمردن ناکەین؟ فەرمووی: ((ئەوە، وانیە، بەڵکو کاتێك ئیماندار مژدەی ڕەحمەت و ڕەزامەندی و بەهەشتی خوایی پێ دەدرێت، حەز بەدیداری خوا دەکات، خواش حەز بەدیداری ئەو دەکات، کافریش کاتێ مژدەی سزا و قینی خوای دەدرێتێ حەزبە دیداری خوا ناکات و خواش چارەی ئەوی ناوێت)). لەڕیوایەتی (شریح ی کوڕی هانی)دا هاتووە کە (ابو هريرە) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ((ئەوەی حەزبەدیداری خوا بکات خواش حەزبەدیداری دەکات، ئەوەش حەز بەدیداری ناکات، خواش حەزبە دیداری ئەو ناکات)). (شریح) دەڵێت: (منیش چووم بۆلای عائشە و پێم وت: ئەی دایکی ئیمانداران گوێم لە (ابوهریرە) وە بوو فەرمودەیەکی لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕایەوە، جا ئەگەر وابێت، ئەوە هەمومان تیاچووین، ئەویش ووتی: تیاچوو ئەو کەسەیە کەبە گوفتاری پێغەمبەر (ﷺ) تیابچێت.

-ئەو گوفتارە کامەیە؟ (شریح) دەڵێ: ((ئەوەی حەزبەدیداری خوا بکات خواش حەزبەدیداری دەکات، ئەوەش حەز بەدیداری ناکات، خواش حەزبە دیداری ناکات)) کەسیشمان نیە ڕقی لەمردن نەبێت. عائشە وتی: ڕاستە پێغەمبەر (ﷺ) ئەمەی فەرمووە، بەلاَم بەو شێوەیە نیە تۆبۆی دەچێت، بەڵکو ئەمە ئەو کاتەیە کەچاو ئەبڵەق دەبێت، هەناسە سوار دەبێت، موچرکە بە پێستدا دێت، پەنجەکان گرژ دەبن، ئالەو کاتەدا، ئەوەی حەزبە دیداری خوا دەکات، خواش حەز بەدیداری دەکات، ئەوەش حەز بەدیداری ناکات خواش حەزبە دیداری ناکات.

## ( ٥ )گومانباشی بەخوای گەورە لەسەرە مەرگدا

٤٥٠- عَنْ جَابِرٍ (ﷺ) قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) قَبْلَ وَفَاتِهِ بِثَلَاثٍ يَقُولُ: ((لَا يَمُوتَنَّ أَحَدُكُمْ إِلَّا وَهُوَ يُحْسِنُ بِاللَّهِ الظَّنَّ)).

(جابر) (ﷺ) دەڵێ: سێ ڕۆژ پێش وەفاتی لەپێغەمبەرم بیست (ﷺ) دەیفەرموو: ((باهەرکەسێکتان دەمرێت گومانی باش بەخوای گەورە ببات)).

## ( ٦ ) چاولێکنانی مردوو.. نزاکردن بۆی لەکاتی سەرەمەرگدا.

٤٥١- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (ﷺ) قَالَتْ: دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَلَى أَبِي سَلَمَةَ وَقَدْ شَقَّ بَصَرُهُ فَأَغْمَضَهُ. ثُمَّ قَالَ: ((إِنَّ الرُّوحَ إِذَا قُبِضَ تَبِعَهُ الْبَصَرُ)). فَضَجَّ نَاسٌ

منْ أَهْلِه، فَقَالَ: ((لَا تَدْعُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ إِلَّا بِخَيْرٍ، فإِنَّ الْمَلَائِكَةَ يُؤَمِّنُونَ عَلَى مَا تَقُولُونَ، ثُمَّ قَالَ: ((اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِأَبِي سَلَمَةَ، وَارْفَعْ دَرَجَتَهُ فِي الْمَهْدِيِّينَ، وَاخْلُفْهُ فِي عَقِبِهِ فِي الْغَابِرِينَ، وَاغْفِرْ لَنَا وَلَهُ يَا رَبَّ الْعَالَمِينَ، وَافْسَحْ لَهُ فِي قَبْرِه وَنَوِّرْ لَهُ فِيه)).

(ام سلمه) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) هات بۆلای (ابوسلمه) چاوی کرابۆوە، چاوەکانی لێکنان و فەرموی: ((کاتێ گیان دەردەچێت چاو لەدوای دەڕوانێت)). هەندێ لە خزمانی دەنگی (گریانیان) لێ بەرزبویەوە، فەرمووی: ((نزای خێر نەبێت لە خۆتانی مەکەن چونکە فریشتەکان آمین بۆ نزاکانتان دەکەن)). ئینجا فەرمووی: ((خوایە لە (ابوسلمه) خۆش ببە، پلەو پایەی لە ریزی هیدایەتدراواندا بەرز بکەرەوە، خۆت سەرپەرشتی ئەو نەوانەی بکە کە لەدوای بەجێ ماون، لە ئێمەش و لەویش خۆش ببە ئەی پەروەردگاری جیهانەکان، گۆڕەکەشی بۆ فراوان و گوشاد و ڕوناك بکە)).

## (٧) داپۆشینی مردوو

٤٥٢ـ عن عَائِشَةَ أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ (ﷺ) قَالَتْ: سُجِّيَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) حِينَ مَاتَ بِثَوْبِ حِبَرَةٍ. [بخاري/ اللباس/ ٤٧٧]

عائشه (ﷺ) دەڵێ: کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی کرد بە پارچە قوماشێکی سەوز داپۆشرا.

## ٨-گیانی باوەڕداران و گیانی بێ باوەڕان

٤٥٣ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: إِذَا خَرَجَتْ رُوحُ الْمُؤْمِنِ تَلَقَّاهَا مَلَكَانِ يُصْعِدَانِهَا، قَالَ حَمَّادٌ: فَذَكَرَ مِنْ طِيبِ رِيحِهَا وَذَكَرَ الْمِسْكَ، قَالَ: وَيَقُولُ أَهْلُ السَّمَاءِ: رُوحٌ طَيِّبَةٌ، جَاءَتْ مِنْ قِبَلِ الْأَرْضِ، صَلَّى اللَّهُ عَلَيْكِ وَعَلَى جَسَدٍ كُنْتِ تَعْمُرِينَهُ. فَيُنْطَلَقُ بِهِ إِلَى رَبِّهِ عَزَّ وَجَلَّ. ثُمَّ يَقُولُ: انْطَلِقُوا بِهِ إِلَى آخِرِ الْأَجَلِ. قَالَ: وَإِنَّ الْكَافِرَ إِذَا خَرَجَتْ رُوحُهُ، قَالَ حَمَّادٌ: وَذَكَرَ مِنْ نَتْنِهَا وَذَكَرَ لَعْنًا، وَيَقُولُ أَهْلُ السَّمَاءِ: رُوحٌ خَبِيثَةٌ جَاءَتْ مِنْ قِبَلِ الْأَرْضِ، قَالَ: فَيُقَالُ: انْطَلِقُوا بِهِ إِلَى آخِرِ الْأَجَلِ، قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: فَرَدَّ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) رَيْطَةً كَانَتْ عَلَيْهِ عَلَى أَنْفِهِ هَكَذَا.

(ابوهریره) ﷺ دەڵێ: کاتێ گیانی ئیماندار دەردەچێت، دوو فریشتە پێشوازی لێ دەکەن و بەرزی دەکەنەوە (حماد کە یەکێکە لە ڕاویەکان) دەڵێ: جا باسی بۆنخۆشی و باسی میسکی کرد (کەلەو گیان و ڕۆحە پاکەوە دەبیسرێت)

بۆیە نیشتەجێکانی ئاسمان دەڵێن: گیانێکی پاك و چاکە و لە زەویەوە هاتووە. دەك ڕەحمەتی خوات لێ بێت، لەسەر ئەو لاشەیەش کە بەتۆ ئاوەدان بوو. ئەوسا دەبرێت بۆ لای پەروەردگاری ئەویش دەفەرموێت: ((بیبەن بۆ ئەوپەڕی شوێنی دیاری کراوی خۆی)). کافریش کە گیانی دەردەچێت (حماد) دەڵێت (ابوهریرە) باسی بۆگەنی کردو نەفرینیشی لێ کرد، خەڵکی ئاسمان دەڵێن: گیانێکی پیسە لە زەویەوە هاتووە، ئینجا فەرمان دەدرێت: بیبەن بۆ ئەوپەڕی ئەو شوێنەی کە بۆی دیاری کراوە. جا (ابوهریرە) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پارچە قوماشێکی بەسەر شانەوە بوو لوتی خۆی پێ گرت.

## (٩) دان بەخۆداگرتن لەسەرەتای بەڵاوە

٤٥٤ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) أَتَى عَلَى امْرَأَةٍ تَبْكِي عَلَى صَبِيٍّ لَهَا، فَقَالَ لَهَا: ((اتَّقِي اللَّهَ وَاصْبِرِي)). فَقَالَتْ: وَمَا تُبَالِي بِمُصِيبَتِي. فَلَمَّا ذَهَبَ قِيلَ لَهَا: إِنَّهُ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)، فَأَخَذَهَا مِثْلُ الْمَوْتِ، فَأَتَتْ بَابَهُ فَلَمْ تَجِدْ عَلَى بَابِهِ بَوَّابِينَ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ لَمْ أَعْرِفْكَ، فَقَالَ: ((إِنَّمَا الصَّبْرُ عِنْدَ أَوَّلِ صَدْمَةٍ)). أَوْ قَالَ: ((عِنْدَ أَوَّلِ الصَّدْمَةِ)). [بخاري/ الجنائز/ ١٢٢٣]

(انس ی کوڕی مالك) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئافرەتێکی بینی بەسەر منداڵەکەیدا دەگریا، پێی فەرموو: ((لەخوا بترسە و دان بەخۆتدا بگرە)). ژنەکە وتی: دیارە تۆ لێقەومانەکەی منت لا گرنگ نییە!!، کە پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆیشت پێیان وت: ئەوە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ). ئافرەتەکە لەهۆش خۆی چوو وەك مردووی لێهات، پاشان خۆی گەیاندە دەرگاکەی، دەرگاوانی لەدەرگاکەیدا نەبینی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا نەمناسیت.. ئەویش فەرموی: ((دان بەخۆدا گرتن دەبێ لەسەرەتای بەڵاوە بێت)).

## (١٠) پاداشتی ئەو کەسەی کە منداڵی دەمرێت و بەتەمای پاداشتی خوایە.

٤٥٥ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ لِنِسْوَةٍ مِنَ الْأَنْصَارِ: لَا يَمُوتُ لِإِحْدَاكُنَّ ثَلَاثَةٌ مِنَ الْوَلَدِ، فَتَحْتَسِبَهُ، إِلَّا دَخَلَتِ الْجَنَّةَ)). فَقَالَتِ امْرَأَةٌ مِنْهُنَّ: أَوِ اثْنَيْنِ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: ((أَوِ اثْنَيْنِ)). [وبإسناد آخر عنه مرفوعاً: ((لا يموت لأحد من المسلمين ثلاثة من الولد فتمسه النار، إلاَّ تحلة القسم))]. [بخاري/ الجنائز/ ١١٩٢،١١٩٣]

(ابو هريره) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) بەهەندێ لە ئافرەتانی (انصار)ی فەرموو ((هەرکەسێك لە ئێوە سێ منداڵی بمرێت و ڕازی بێت بەفەرمانی خوا و بەئومێدی پاداشت بێت دەچێتە بەهەشتەوە)). ئافرەتێکیان وتی: ئەی ئەگەر دوانیش بن ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)؟ فەرموی: ((بادوانیش بن)). لەڕێگەیەکی ترەوە هەر (ابوهريره) دەیگەیەنێ بە پێغەمبەر (ﷺ) کە فەرمویەتی: ((هیچ موسڵمانێك نی‌یە سێ منداڵی بمرێت و ئاگری بەرکەوێت مەگەر بۆ ناوی سوێند)) [کە مەبەست ئەم ئایەتەیە]... ﴿وان منكم الاواردها﴾ مريم/١٧. واتە: هیچ کەسێك لەئێوە نی‌یە کە ئاگری دۆزەخ نەبینێت و بەسەریا تێنەپەڕێت.

## (١١) لەکاتی لێقەوماندا چی دەوترێت

٤٥٦ـ عن أُمِّ سَلَمَةَ (ﷺ) قالت: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) يَقُولُ: ((مَا مِنْ عَبْدٍ تُصِيبُهُ مُصِيبَةٌ فَيَقُولُ: إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ، اللَّهُمَّ أْجُرْنِي فِي مُصِيبَتِي، وَأَخْلِفْ لِي خَيْرًا مِنْهَا، إِلَّا أَجَرَهُ اللَّهُ فِي مُصِيبَتِهِ وَأَخْلَفَ لَهُ خَيْرًا مِنْهَا)). قَالَتْ: فَلَمَّا تُوُفِّيَ أَبُو سَلَمَةَ قُلْتُ كَمَا أَمَرَنِي رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فَأَخْلَفَ اللَّهُ لِي خَيْرًا مِنْهُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ).

(ام سلمه) (ﷺ) دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەر (ﷺ) بوو دەیفەرموو: ((هەرکەسێك توشی بەڵایەك بێت و بڵێت: (انا لله وانا اليه راجعون)). ﴿ئێمە هەر خوا خاوەنمانە و هەر بۆلای ئەویش دەگەڕێینەوە﴾. خوایە پاداشتم بدەرەوە لەسەر ئەو بەڵایەی توشم هاتوە و چاکتر لەوەی لێت سەندوم پێم ببەخشە، خوا پاداشتی چاکتری دەداتەوە و چاکتری پێ دەبەخشێت (ام سلمه) دەڵێت: کاتێ (ابوسلمه) وەفاتی کرد، من ئەوەم وت کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێدام، ئیتر ئەوە بوو خوای گەورە هاوسەری لەو چاکتری ێ بەخشیم کە پێغەمبەری خوایە (ﷺ).

## (١٢) گریان لەسەر مردوو

٤٥٧ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (ﷺ) قَالَ: اشْتَكَى سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ شَكْوَى لَهُ فَأَتَى رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَعُودُهُ مَعَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ وَسَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ وَعَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (ﷺ)، فَلَمَّا دَخَلَ عَلَيْهِ وَجَدَهُ فِي غَشِيَّةٍ فَقَالَ: ((أَقَدْ قَضَى)). قَالُوا: لَا يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَبَكَى رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)، فَلَمَّا رَأَى الْقَوْمُ بُكَاءَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)

بَكَوْا، فَقَالَ: ((أَلَا تَسْمَعُونَ؟ إِنَّ اللَّهَ لَا يُعَذِّبُ بِدَمْعِ الْعَيْنِ، وَلَا بِحُزْنِ الْقَلْبِ، وَلَكِنْ يُعَذِّبُ بِهَذَا -وَأَشَارَ إِلَى لِسَانِهِ- أَوْ يَرْحَمُ)). [بخاري/ الجنائز/ ١٢٤٢]

(عبدالله کوڕی عمر) (ﷺ) دەڵێ: (سعدی کوڕی عبادە) ناساغیەکی هەبوو پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ (عبدالرحمن کوڕی عوف و سعدی کوڕی ابی وقاص و عبدالله ی کوڕی مەسعود) (ﷺ)، چون بۆ سەردانی، کاتێ کە چونە ژوورەوە بۆلای لەهۆش خۆی چووبوو، فەرمووی: ((ئایا تەوابوو)) وتیان: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ). پێغەمبەر (ﷺ) دەستی کرد بەگریان ، کاتێ خەڵکەکە گریانی پێغەمبەری خوایان بینی، هەمو دەستیان کرد بە گریان پاشان فەرموی: ((ئایا نەتان بیستووە کە خوا سزا نادات لەسەر فرمێسکی چاو، لەسەر غەمباری دڵ، بەڵکو بەهۆی ئەمەوە سزا دەدات -ئاماژەی بۆ زمانی کرد- یان ڕەحم دەکات)).

## (١٣) هەڕەشە لەسەر شین و شەپۆڕ

٤٥٨- عن أَبِي مَالِكٍ الْأَشْعَرِيَّ (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: ((أَرْبَعٌ فِي أُمَّتِي مِنْ أَمْرِ الْجَاهِلِيَّةِ، لَا يَتْرُكُونَهُنَّ: الْفَخْرُ فِي الْأَحْسَابِ، وَالطَّعْنُ فِي الْأَنْسَابِ، وَالْاسْتِسْقَاءُ بِالنُّجُومِ، وَالنِّيَاحَةُ. وَقَالَ: النَّائِحَةُ إِذَا لَمْ تَتُبْ قَبْلَ مَوْتِهَا، تُقَامُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَعَلَيْهَا سِرْبَالٌ مِنْ قَطِرَانٍ وَدِرْعٌ مِنْ جَرَبٍ)).

(ابو مالك الاشعری) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ((چوار شت لەناو ئوممەتمدا هەیە لەکرداری سەردەمی نەفامین و (ئافرەتان) دەست بەرداری نابن: خۆ هەڵکێشان بەڕەچەڵەك و بنەماڵە، تانە و تەشەر لە تیرە و تایفە، بەتەمابوونی باران بە هۆی ئەستێرەکانەوە، شین و شەپۆڕ لەکاتی لێقەوماندا.

هەروەها فەرمویەتی: ((ئەو ژنەی دەلاوێتەوە ئەگەر پێش مەرگی تەوبە نەکات لە ڕۆژی قیامەتدا کە زیندوو دەکرێتەوە، کراسێکی قەتران و گەڕ لەشی دادەپۆشێت وەك زرێپۆشی لەبەردا بێت)).

**( ١٤ ) لەئێمە نییە ئەوەی یەخەی خۆی دەدڕێ و لە ڕومەتی خۆی دەدا و..**

٤٥٩ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مسعود (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((لَيْسَ مِنَّا مَنْ ضَرَبَ الْخُدُودَ، أَوْ شَقَّ الْجُيُوبَ، أَوْ دَعَا بِدَعْوَى الْجَاهِلِيَّةِ)). وفي لفظ: ((وَشَقَّ... وَدَعَا)) بِغَيْرِ أَلِفٍ. [بخاري/ الجنائز/ ١٢٣٥]

(عبدالله ی کوڕی مسعود) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ((لە ئێمە نییە ئەوەی لە ڕومەتی خۆی دەدا یان یەخەی خۆی دادەڕێت، یاخود دەنگ و هاواری لێ بەرز دەبێتەوە وەك سەردەمی نەفامی)).

**( ١٥ ) مردوو ئازار دەدرێت بەهۆی گریانی زیندووانەوە**

٤٦٠ـ عَنْ عَمْرَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ (ﷺ): أَنَّهَا سَمِعَتْ عَائِشَةَ (ﷺ) -وَذُكِرَ لَهَا أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ يَقُولُ: إِنَّ الْمَيِّتَ لَيُعَذَّبُ بِبُكَاءِ الْحَيِّ- فَقَالَتْ عَائِشَةُ: يَغْفِرُ اللَّهُ لِأَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَمَا إِنَّهُ لَمْ يَكْذِبْ، وَلَكِنَّهُ نَسِيَ أَوْ أَخْطَأَ، إِنَّمَا مَرَّ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَلَى يَهُودِيَّةٍ يُبْكَى عَلَيْهَا، فَقَالَ: ((إِنَّهُمْ لَيَبْكُونَ عَلَيْهَا، وَإِنَّهَا لَتُعَذَّبُ فِي قَبْرِهَا)). [بخاري/ الجنائز/ ١٢٢٧]

(عەمرەی کچی عبدالرحمن) بیستویەتی لە عائشە، کە بۆیان باس کردوە کە (عبدالله ی کوڕی عومەر) وتویەتی : مردوو سزادەدرێت بەگریانی زیندو عائشە وتی: خوا لە (ابوعبدالرحمن) خۆش بێت، خۆ درۆشی نەکردوە بەڵکو یان بیری چووە، یان هەڵەی کردووە، ئەگینا پێغەمبەر (ﷺ) بەلای [گۆڕی] ژنە جولەکەیەکدا تێپەڕیوە، بەسەریەوە دەگریان، بۆیە فەرمووی ((ئەوانە دەگرین لەسەری، لە حاڵێکدا ئەو لە گۆڕەکەیدا سزا دەدرێت)).

**( ١٦ ) مردوو، یان خۆی ئاسودە دەبێت یان..**

٤٦١ـ عَنْ أَبِي قَتَادَةَ بْنِ رِبْعِيٍّ (ﷺ): أَنَّهُ كَانَ يُحَدِّثُ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) مُرَّ عَلَيْهِ بِجَنَازَةٍ، فَقَالَ: ((مُسْتَرِيحٌ وَمُسْتَرَاحٌ مِنْهُ)). قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا الْمُسْتَرِيحُ وَالْمُسْتَرَاحُ مِنْهُ؟ فَقَالَ: ((الْعَبْدُ الْمُؤْمِنُ يَسْتَرِيحُ مِنْ نَصَبِ الدُّنْيَا، وَالْعَبْدُ الْفَاجِرُ يَسْتَرِيحُ مِنْهُ الْعِبَادُ وَالْبِلَادُ وَالشَّجَرُ وَالدَّوَابُّ)). [بخاري/ الرقاق/ ٦١٤٧]

(ابو قتادەی کوڕی ڕوبعی) (ﷺ) باسی ئەوەی کردووە کە: جارێکیان جەنازەیەك بەلای پێغەمبەردا (ﷺ) برا، فەرموی: ((ئەوە ئاسودەیە و ئاسودەن

لەدەستی))، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) : ئاسودەیە و ئاسودەن لەدەستی یانی چی؟!

فەرموی: ((بەندەی ئیماندار لەدەست کێشەو ناخۆشیەکانی دنیا ڕزگاری دەبێت و ئاسودیە، بەندەی تاوانکاریش خەڵکی وولات و دار و درەخت و ئاژەڵ لەدەستی ئاسودە دەبن)).

## (١٧) شۆردنی مردوو

٤٦٢ـ عَنْ أُمِّ عَطِيَّة (رضي الله عنها) قالتْ: لَمَّا مَاتَتْ زَيْنَبُ بِنْتُ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((اغْسِلْنَهَا وِتْرًا: ثَلَاثًا أَوْ خَمْسًا، وَاجْعَلْنَ فِي الْخَامِسَةِ كَافُورًا، أَوْ: شَيْئًا مِنْ كَافُورٍ، فَإِذَا غَسَلْتُنَّهَا فَأَعْلِمْنَنِي)). قالتْ: فَأَعْلَمْنَاهُ، فَأَعْطَانَا حقْوَهُ وقَالَ: ((أَشْعِرْنَهَا إِيَّاهُ)). [بخاري/ الجنائز/ ١١٩٥]

((ام عطيه)) (رضي الله عنها) دەڵێ: کاتێ (زینب)ی کچی پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی کرد، پێغەمبەر (ﷺ) پێی وتین: ((باشتنەکەی تاك بێت سێ، یان پێنج جار، لە پێنجەمدا کافور لەسەر لاشەی دانێن، یان کەمێك کافور. جاکاتی لەشتنی بونەوە ئاگادارم بکەن)). (ام عطیه) دەڵێ :ئێمەش ئاگادارمان کرد، ئەویش پۆشتە ماڵێکی داینێ و فەرموی: (لەشی پێ داپۆشن).

## (١٨) کفنی مردوو

٤٦٣ـ عنْ عائشَة (رضي الله عنها) قَالَتْ: كُفِّنَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فِي ثَلَاثَةِ أَثْوَابٍ بِيضٍ، سحُولِيَّةٍ مِنْ كُرْسُفٍ، لَيْسَ فِيهَا قَمِيصٌ ولا عِمَامَةٌ، أَمَّا الْحُلَّةُ فَإِنَّمَا شُبِّهَ عَلَى النَّاس فيها أَنَّهَا اشْتُرِيَتْ لَهُ لِيُكَفَّنَ فِيهَا، فَتُرِكَتِ الْحُلَّةُ، وَكُفِّنَ فِي ثَلَاثَةِ أَثْوَابٍ بِيضٍ سَحُولِيَّةٍ، فأَخَذَهَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي بَكْرٍ، فقالَ: لأَحْبِسَنَّهَا حَتَّى أُكَفِّنَ فِيهَا نَفْسِي، ثُمَّ قَال: لَوْ رَضِيهَا اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ لِنَبِيِّهِ (ﷺ) لَكَفَّنَهُ فِيها، فَبَاعَهَا وَتَصَدَّقَ بِثَمَنِهَا. [بخاري/ الجنائز/ ١٢٠٥]

(عائشه) (رضي الله عنها) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) لەسێ بەرگی سپی کفنی بەبالآبڕا کە لە لۆکە دروست کرابوون، نەکراس و نەمێزەری تیا نەبوو، ئەودوو پارچە قوماشەش کە لەیەك دەچن و خەڵکی مردووی خۆیانی پێ کفن دەکەن، ئەویشیان بۆ کڕی تا کفن بکرێت تێیدا، بەلاّم لەوەدا کفن نەکرا، بەڵکو لەسێ بەرگە سپیەدا کفن کرا کە لە لۆکە دوست کرابوو، ئیتر دوپارچە قوماشەکە (عەبدوڵلای کوڕی ابوبکر) هەڵی گرت و وتی: ئەمە هەڵدەگرم بۆ خۆم تاتیایدا

کفن بکرێم، پاشانیش وتی ئەگەر خوا ڕازی لەسەر بوایە کە بۆ پێغەمبەرەکەی بێت، ئەوە تیایدا کفن دەکرا، ئیتر فرۆشتی و پارەکەی کرد بەخێر.

## ( ١٩ ) کفن دەبێ بەتەواوی بکرێت

٤٦٤ـ عن جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللّه (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) خَطَبَ يَوْمًا، فَذَكَرَ رَجُلًا مِنْ أَصْحَابِهِ قُبِضَ فَكُفِّنَ فِي كَفَنٍ غَيْرِ طَائِلٍ، وَقُبِرَ لَيْلًا، فَزَجَرَ النَّبِيُّ (ﷺ) أَنْ يُقْبَرَ الرَّجُلُ بِاللَّيْلِ حَتَّى يُصَلَّى عَلَيْهِ، إِلَّا أَنْ يُضْطَرَّ إِنْسَانٌ إِلَى ذَلِكَ، وَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): ((إِذَا كَفَّنَ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ فَلْيُحَسِّنْ كَفَنَهُ)).

(جابری کوڕی عبدالله) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆژێك وتاری داو باسی پیاوێك لە هاوەڵانی کردکە وەفاتی کردووە و کفنێکی ناتەواوی بۆ کراوە و لەشەودا نێژراوە، پێغەمبەر (ﷺ) بەتوندی قەدەغەی ئەوەی کردوو فەرمووی: ((نابێت هیچ کەسێك بەشەو بنێژرێت، تا نوێژی لەسەر دەکرێت، مەگەر کەسێك ناچاربێت)) هەروەها فەرمویەتی: ((ئەگەر کەسێك لە ئێوە کفنی بۆ براکەی ئامادەکرد، بابەچاکی و تێر و تەواوی بیکات)).

## ( ٢٠ ) پەلەکردن لە بەڕێ کردنی تەرمدا

٤٦٥ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((أَسْرِعُوا بِالْجِنَازَةِ، فَإِنْ تَكُ صَالِحَةً فَخَيْرٌ -[لَعَلَّهُ قَالَ] تُقَدِّمُونَهَا عَلَيْهِ، وَإِنْ تَكُ غَيْرَ ذَلِكَ فَشَرٌّ تَضَعُونَهُ عَنْ رِقَابِكُمْ)). [بخاري/ الجنائز/ ١٢٥٢]

(ابو هريره) ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((پەلەبکەن لەبردنی جەنازەدا، ئەگەر چاك و خواناس بێت، ئەوە زوو بەخۆشی و شادی دەگەیەنن، بەڵام ئەگەر وانەبوو، ئەوە شەڕ و خراپەیەکە لە کۆڵی خۆتانی دەکەنەوە)).

## ( ٢١ ) قەدەغەکردنی ئافرەتان لە شوێنکەوتنی جەنازە

٤٦٦ـ عَنْ أُمِّ عطِيَّةَ (ﷺ) قالتْ: كُنَّا نُنْهَى عَنِ اتِّبَاعِ الْجَنَائِزِ، وَلَمْ يُعْزَمْ عَلَيْنَا. [بخاري/ الجنائز/ ١٢١٩]

(ام عطيه) (ﷺ) دەڵێ: ئێمە ڕێگریمان لێ دەکرا لە شوێنکەوتنی جەنازە بەڵام زۆر جەختیشی لەسەر نەدەکرا.

## (٢٢) هەستان لەبەر جەنازە

٤٦٧ ـ عَنْ جابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّه (ﷺ) قَالَ: مَرَّتْ جِنَازَةٌ، فَقَامَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وَقُمْنَا مَعَهُ، فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّهَا يَهُودِيَّةٌ! فَقَالَ: ((إِنَّ الْمَوْتَ فَزَعٌ، فَإِذَا رَأَيْتُمُ الْجَنَازَةَ فَقُومُوا لَهَا)). [بخاري/ الجنائز/ ١٢٤٩]

(جابری کوڕی عبدالله) (ﷺ) دەڵێ: جەنازەیەک تێپەڕی، پێغەمبەر (ﷺ) هەستا لەبەری و ئێمەش هەستاین و وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوە ئافرەتێکی جولەکەیە، فەرمووی: ((بەڕاستی مردن سامناکە، ئەگەر جەنازەتان بینی هەستن لەبەری)).

## (٢٣) سڕینەوەی هەڵسان بۆ جەنازە

٤٦٨ـ عن عليّ (ﷺ) قَالَ: رَأَيْنَا رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَامَ فَقُمْنَا، وَقَعَدَ فَقَعَدْنَا. يَعْنِي فِي الْجَنَازَةِ.

(علی) (ﷺ) دەڵێ: ئێمە بینیمان پێغەمبەر (ﷺ) هەڵدەستا، ئێمەش هەڵدەستاین، دادەنیشت، ئێمەش دادەنیشتین بۆ جەنازە.

## (٢٤) جێگەی وەستانی (امام) لە نوێژی مردودا

٤٦٩ـ عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ (ﷺ) قَالَ: صَلَّيْتُ خَلْفَ النَّبِيِّ (ﷺ) وَصَلَّى عَلَى أُمِّ كَعْبٍ، مَاتَتْ وَهِيَ نُفَسَاءُ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) لِلصَّلَاةِ عَلَيْهَا وَسَطَهَا. [بخاري/ / الجنائز/ ١٢٦٧]

(سمرەی کوڕی جندب) (ﷺ) دەڵێ: لەپشت پێغەمبەرەوە (ﷺ) نوێژم کرد لەکاتێکدا کە نوێژی لەسەر (ام کعب) کرد کە بەسەر منداڵەوە وەفاتی کردبوو، پێغەمبەر (ﷺ) لەکاتی نوێژەکەدا لەناوەڕاستی جەنازەکەدا وەستا.

## (٢٥) (تكبیر) لەسەر جەنازە

٤٧٠ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) نَعَى لِلنَّاسِ النَّجَاشِيَ فِي الْيَوْمِ الَّذِي مَاتَ فِيهِ، فَخَرَجَ بِهِمْ إِلَى الْمُصَلَّى، وَكَبَّرَ أَرْبَعَ تَكْبِيرَاتٍ. [بخاري/ الجنائز/ ١٢٦٨]

(ابو هریرە) (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵی مەرگی نەجاشی ڕاگەیاند لەو ڕۆژەدا کە تیایدا مردبوو، خەڵکەکەی برد بۆ جێ نوێژەکە و چوارجار (الله اكبر)ی فەرموو.

## (٢٦) (الله اكبر) پێنج جاریش هاتووە

٤٧١ـ عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى قَالَ: كَانَ زَيْدٌ (ﷺ) يُكَبِّرُ عَلَى جَنَائِزِنَا أَرْبَعًا، وَإِنَّهُ كَبَّرَ عَلَى جَنَازَةٍ خَمْسًا، فَسَأَلْتُهُ؟ فَقَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يُكَبِّرُهَا.

(عبدالرحمن ی کوڕی ابو لیلی) دەڵێ: (زید) (ﷺ) چوارجار لەسەر جەنازەی ئێمە (الله اكبر)ی دەکرد، جارێکیان لەسەر جەنازەیەك پێنج جار (الله اكبر)ی کرد، منیش پرسیارم لێ کرد، لە وەڵامدا وتی: پێغەمبەر (ﷺ) دەیکردن.

## (٢٧) نزا بۆ مردوو

٤٧٢ـ عن عَوْفَ بْنَ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَلَى جَنَازَةٍ، فَحَفِظْتُ مِنْ دُعَائِهِ وَهُوَ يَقُولُ: ((اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ وَارْحَمْهُ، وَعَافِهِ وَاعْفُ عَنْهُ، وَأَكْرِمْ نُزُلَهُ وَوَسِّعْ مُدْخَلَهُ، وَاغْسِلْهُ بِالْمَاءِ وَالثَّلْجِ وَالْبَرَدِ، وَنَقِّهِ مِنَ الْخَطَايَا كَمَا نَقَّيْتَ الثَّوْبَ الْأَبْيَضَ مِنَ الدَّنَسِ، وَأَبْدِلْهُ دَارًا خَيْرًا مِنْ دَارِهِ، وَأَهْلًا خَيْرًا مِنْ أَهْلِهِ، وَزَوْجًا خَيْرًا مِنْ زَوْجِهِ. وَأَدْخِلْهُ الْجَنَّةَ، وَأَعِذْهُ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، و مِنْ عَذَابِ النَّارِ)). قَالَ حَتَّى تَمَنَّيْتُ أَنْ أَكُونَ أَنَا ذَلِكَ الْمَيِّتَ.

(عوف ی کوڕی مالك) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر تەرمێك نوێژی کردو نزای کرد، منیش لە نزاکەی ئەمەم لەبەر کرد: ((خوایە گیان لێی خۆش ببە و ڕەحمی پێ بکە، ئاسودەی بکە و چاوپۆشی لێ بکە، ڕێزی بگرەو شوێنی فراوانی پێ ببەخشە، بە ئاو و بەفر و تەرزە بیشۆ، لە گوناە پاکی بکەرەوە هەروەکو چۆن پۆشاکی سپی پاك ئەبێتەوە لە چڵك و پیسی، ماڵ و حاڵێکی چاکتر لەوەی خۆی پێ ببەخشە، کەس و کارێکی چاکتریش لەکەس و کارەکەی، هاوسەرێکی چاکتریش لە هاوسەرەکەی، بیخەرەبەهەشتیشەوە. پەناشی بدە لە سزای گۆڕ و سزای ئاگر)). ئالەو کاتەدا پڕ بەدڵ ئاواتم دەخواست [خۆزگە] ئەو مردوە من بومایە.

## (٢٨) نوێژی جەنازە لە مزگەوتدا

٤٧٣ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ): أَنَّهَا لَمَّا تُوُفِّيَ سَعْدُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ (ﷺ) أَرْسَلَ أَزْوَاجُ النَّبِيِّ (ﷺ) أَنْ يَمُرُّوا بِجَنَازَتِهِ فِي الْمَسْجِدِ، فَيُصَلِّينَ عَلَيْهِ، فَفَعَلُوا. فَوُقِفَ بِهِ عَلَى حُجَرِهِنَّ، يُصَلِّينَ عَلَيْهِ، أُخْرِجَ بِهِ مِنْ بَابِ الْجَنَائِزِ الَّذِي كَانَ إِلَى الْمَقَاعِدِ، فَبَلَغَهُنَّ أَنَّ النَّاسَ عَابُوا ذَلِكَ، وَقَالُوا: مَا كَانَتِ الْجَنَائِزُ يُدْخَلُ بِهَا الْمَسْجِدَ! فَبَلَغَ ذَلِكَ عَائِشَةَ، فَقَالَتْ: مَا أَسْرَعَ النَّاسَ إِلَى أَنْ يَعِيبُوا مَا لَا عِلْمَ لَهُمْ بِهِ! عَابُوا عَلَيْنَا أَنْ

يُمَرَّ بِجَنَازَةٍ فِي الْمَسْجِدِ، وَمَا صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَلَى سُهَيْلِ بْنِ بَيْضَاءَ إِلَّا فِي جَوْفِ الْمَسْجِدِ.

(عائشە) (ﷺ) دەڵێ: کاتێ (سعدی کوڕی ابو وقاص) وەفاتی کرد هاوسەرانی پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵیان نارد کە حەزدەکەن سەری جەنازەکەی بدەن و نوێژی لەسەر بکەن، خەڵکەکە ڕێیان پێدان و بردیان لەبەردەم ژوورەکانیاندا [کە دەروازەی لەسەر مزگەوت بوو]. جەنازەکە لەبەردەم ژووری هاوسەراندا وەستێنرا، هاوسەرانی پێغەمبەریش نوێژیان کرد لەسەری، پاشان لە دەرگای تەرم کردنە دەرەوە جەنازەکەیان بردە شوێنێ پێیان دەوت (مقاعد) کە خەڵکی تیایدا دائەنیشتن بۆ ئەنجامدانی کاروباری خۆیان و دەست نوێژ گرتن. هەواڵ گەیشت بە هاوسەران کە خەڵکی ئەمەیان پێ باش نەبوو، وتیان: جاران تەرم بەوجۆرە نەدەبرایە ناو مزگەوت. ئەم هەواڵە گەیشتە عائشة، بۆیە وتی: خەڵکی چەندە پەلە دەکەن لە شتێکدا کە لێی نازانن و عەیبداری دەکەن. ڕەخنەیان لێگرتین کە تەرمێ برایە مزگەوت: لەکاتێکدا پێغەمبەری خوا لەناو مزگەوتا نوێژی کرد لەسەر سوهەیلی کوڕی بیضاء.

## (٢٩) نوێژی مردوو لەسەر گۆڕ

٤٧٤ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ امْرَأَةً سَوْدَاءَ كَانَتْ تَقُمُّ الْمَسْجِدَ -أَوْ شَابًّا- فَفَقَدَهَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فَسَأَلَ عَنْهَا -أَوْ عَنْهُ- فَقَالُوا: مَاتَ، [ماتت] قَالَ: ((أَفَلَا كُنْتُمْ آذَنْتُمُونِي)). قَالَ: فَكَأَنَّهُمْ صَغَّرُوا أَمْرَهَا أَوْ أَمْرَهُ، فَقَالَ: ((دُلُّونِي عَلَى [قبرها] قَبْرِهِ)). فَدَلُّوهُ فَصَلَّى عَلَيْهَا، ثُمَّ قَالَ: ((إِنَّ هَذِهِ الْقُبُورَ مَمْلُوءَةٌ ظُلْمَةً عَلَى أَهْلِهَا، وَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يُنَوِّرُهَا لَهُمْ بِصَلَاتِي عَلَيْهِمْ)). [بخاري/ الجنائز/ ١٢٧٢]

(ابو هريره) (ﷺ) دەڵێ: ئافرەتێکی ڕەش پێست، یا لاوێك گسکی مزگەوتی دەدا، پێغەمبەر (ﷺ) چاوی بۆ گێڕا، دیار نەبو، هەواڵی پرسی، وتیان: مرد. پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: ((نەدەبوو ئاگادارتان بکردمایە؟)). پێدەچوو ئەوان بەکەمیان زانیبێت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: ((گۆڕەکەیم نیشان بدەن)) ئەوانیش نیشانیان دا، ئەویش نوێژی لەسەر کرد و فەرموی: ((ئەم گۆڕانە پڕن لە تاریکی بۆ نیشتەجێکانی، بێگومان خوای گەورە بە نوێژ کردنی من لەسەریان بۆیان ڕوناك دەکاتەوە)).

## (٣٠) خۆکوژیی

٤٧٥- عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ (ﷺ) قَالَ: أُتِيَ النَّبِيُّ (ﷺ) بِرَجُلٍ قَتَلَ نَفْسَهُ بِمَشَاقِصَ، فَلَمْ يُصَلِّ عَلَيْهِ.

(جابری کوڕی سمره) (ﷺ) دەڵێ: جارێك [تەرمی] پیاوێکیان هێنا بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) کە بەتیرێکی دەم پان خۆی کوشتبوو، بەڵام نوێژی لەسەر نەکرد.

## (٣١) خێری نوێژی جەنازە و شوێنکەوتنی

٤٧٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((مَنْ شَهِدَ الْجَنَازَةَ حَتَّى يُصَلِّيَ عَلَيْهَا فَلَهُ قِيرَاطٌ، وَمَنْ شَهِدَهَا حَتَّى تُدْفَنَ فَلَهُ قِيرَاطَانِ)). قِيلَ وَمَا الْقِيرَاطَانِ؟ قَالَ: ((مِثْلُ الْجَبَلَيْنِ الْعَظِيمَيْنِ)). [بخاري/ الجنائز/ ١٢٦١]

(ابو هريره) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ((ئەوەی بەدیار جەنازەیەکەوە بێت هەتا نوێژی لەسەر دەکرێت قیراتێکی دەست دەکەوێت، ئەوەش شوێنی دەکەوێت هەتا دەینێژن ئەوە دوو قیراتی دەست دەکەوێت)) پرسیاریان کرد: دووقیرات چین؟!. فەرموی: ((وەك دووکەژی گەورە وایە)) [لەسامان و پاداشت]

## (٣٢) ئەوەی سەدکەس نوێژی لەسەر بکات

٤٧٧- عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((مَا مِنْ مَيِّتٍ تُصَلِّي عَلَيْهِ أُمَّةٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ يَبْلُغُونَ مِائَةً -كُلُّهُمْ يَشْفَعُونَ لَهُ- إِلَّا شُفِّعُوا فِيهِ)).

(عائشه) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ((هەر مردوویەك سەدکەس نوێژی لەسەر بکەن و هەمووشیان بۆی بپاڕێنەوە-تکایان بۆی گیرا دەبێت)).

## (٣٣) ئەوەی چل کەس نوێژی لەسەر بکات

٤٧٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ): أَنَّهُ مَاتَ ابْنٌ لَهُ بِقُدَيْدٍ أَوْ بِعُسْفَانَ، فَقَالَ: يَا كُرَيْبُ، انْظُرْ مَا اجْتَمَعَ لَهُ مِنَ النَّاسِ، قَالَ: فَخَرَجْتُ، فَإِذَا نَاسٌ قَدِ اجْتَمَعُوا لَهُ، فَأَخْبَرْتُهُ. فَقَالَ: تَقُولُ: هُمْ أَرْبَعُونَ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: أَخْرِجُوهُ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((مَا مِنْ رَجُلٍ مُسْلِمٍ يَمُوتُ، فَيَقُومُ عَلَى جَنَازَتِهِ أَرْبَعُونَ رَجُلًا، لَا يُشْرِكُونَ بِاللَّهِ شَيْئًا، إِلَّا شَفَّعَهُمُ اللَّهُ فِيهِ)).

(ابن عباس) (ﷺ) کوڕێکی لە (قدید) یان (عسفان)[١] مرد، وتی: (کریب) سەیرکە؛ بزانە چەند کەس کۆبونەتەوە لەسەری، منیش چووم بینیم خەڵکێك کۆبونەتەوە لەدەوری هەواڵەکەم بۆ بردەوە وتی: تۆ دەڵێی چل کەسێك دەبن؟

وتم: بەڵێ، وتی: بیهێنە دەرەوە، چونکە من لە پێغەمبەری خوام (ﷺ) بیستووە کە فەرمویەتی: ((هەرکەسێکی موسڵمان بمرێت و چل کەس ئامادەی کفن کردن و ناشتنی بن و نوێژی لەسەر بکەن لەوانەی کە هیچ هاوەڵێك بۆ خوا بڕیار نادەن، خوای گەورە تکایان گیرا دەکات بۆی)).

## (٣٤) باسی چاکەو خراپەی مردوو.

٤٧٩ـ عَنْ أَنَس بْن مَالِكٍ (ﷺ) قال: مُرّ بِجنَازَةٍ فَأُثْنِيَ عَلَيْهَا خَيْرًا، فقَالَ نَبِيُّ اللّه (ﷺ): ((وَجَبتْ وجَبتْ وَجبَتْ)). ومُرّ بِجَنَازَةٍ فَأُثْنِيَ عَلَيْهَا شَرًّا، فقَالَ نَبِيُّ اللّه (ﷺ): ((وجبتْ وَجبتْ وَجبتْ)). قَالَ عُمَرُ: فدًى لَكَ أَبِي و أُمِّي، مُرَّ بجنَازَةٍ فَأُثْنِي عليْهَا خَيْرٌ، فقُلْت: وَجبتْ وجبتْ وَجبتْ. وَمُرّ بجَنَازة فأُثْني عليْها شرٌّ، فقُلْت: وَجَبَتْ وجبتْ وَجَبَتْ. فقَال رسُولُ اللّه (ﷺ): ((مَنْ أَثنَيْتُمْ عَلَيْه خَيْرًا وَجَبَتْ لهُ الْجنّةُ، ومَنْ أَثنَيْتُمْ عليْه شَرًّا وجبَتْ لَهُ النَّارُ. أَنْتُمْ شُهَدَاءُ اللّه في الْأَرْض، أَنْتُمْ شُهداءُ اللّه في الْأَرْض، أَنْتُمْ شُهداءُ اللّه فِي الْـأَرْض)). [بخاري/ الجنائز/ ١٣٠١]

(انس ی کوڕی مالك) (ﷺ) دەڵێ: جەنازەیەك برا (ئیمانداران) بەباشی ناویان هێنا، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((مسۆگەر بوو، مسۆگەر بوو، مسۆگەر بوو))، جەنازەیەکی تریشیان برد (ئیمانداران) بەباشی ناویان نەهێنا، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((مسۆگەر بوو، مسۆگەر بوو، مسۆگەر بوو)) (عمر) (ﷺ) وتی: دایك و باوکم بەقوربانت بێت: جەنازەیەك براو بەباشی ناوی برا فەرمووت: مسۆگەر بوو، مسۆگەر بوو، مسۆگەر بوو. جەنازەیەکی تر هێنرا بە خراپی ناوی برا، فەرموت: مسۆگەر بوو، مسۆگەر بوو، مسۆگەر بوو. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((ئەوەی ئێوە بەچاکی ناوی ببەن ئەوە بەهەشتی بۆ مسۆگەرە، ئەوەش وەسفی بەخراپە دەکەن، ئەوە دۆزەخی بۆ مسۆگەرە، ئێوە شایەتی خوای گەورەن لە زەویدا)).

---

[١] دووشوێنن لە نێوان مەککە و مەدینەدا .

## ( ٣٥ ) بەسواریی رۆشتن لەگەڵ جەنازەدا

٤٨٠ـ عنْ جابر بْن سمُرة (ﷺ) قال: صلَّى رسُولُ اللّه (ﷺ) على ابْن الدَّحْداح، ثُمّ أُتي بفرسٍ عُرْيٍ، فعقلهُ رجُلٌ فركبهُ، فجعل يتوقَّصُ به ونحْنُ نتّبعُهُ نسْعى خلْفهُ، قال: فقال رجُلٌ من الْقوْم: إنّ النّبيّ (ﷺ) قال: ((كمْ منْ عذْقٍ مُعلّقٍ أوْ مُدلًّى في الْجنّة لابْن الدّحْداح)).

(جابری کوڕی سمرە) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی کرد لەسەر (ابن الدحداح) پاشان ئەسپێکی پشت ڕووت هێنرا و پیاوێك جڵەوی گرت، پێغەمبەر (ﷺ) سواری ئەسپەکە بوو، ئەسپەکەش لۆقەی دەکرد، ئێمەش بە شوێنیەوە بوین و بەپەلە بەدوایدا دەڕۆیشتین (جابر) دەڵێ: یەکێك لەو خەڵکە وتی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((چەندەها هێشوی هەڵواسراوو شۆڕبۆوە لە بەهەشتدا بۆ (ابن الدحداح) [ئامادەیە].

## ( ٣٦ ) قەیفە لەناو قەبردانان

٤٨١ـ عن ابْن عبّاسٍ (ﷺ) قال: جُعل في قبْر رسُول اللّه (ﷺ) قطيفةٌ حمْراءُ.

(ابن عباس) (ﷺ) دەڵێ: لەناو ئارامگاکەی پێغەمبەردا (ﷺ) قەیفەیەکی سور دانرا.

## ( ٣٧ ) کەندر و خشت هەڵچنین لەسەر مردوو

٤٨٢ـ عَنْ عَامر بْن سعْد: أنّ سعْد بْن أبي وقّاص (ﷺ) قال في مرضه الّذي هلك فيه: الْحدُوا لي لحْدًا، وانْصبُوا عليّ اللّبن نصْبًا، كما صُنع برسُول اللّه (ﷺ).

(عامری کوڕی سعد) دەڵێ: (سعدی کوڕی ابو وقاص) لەکاتی ئەو نەخۆشییەدا کە وەفاتی تیاکرد وتی: کەندرێکم بۆ لێ بدەن و خشتم لەسەر دابنێن، هەروەکو چۆن بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) کرا.

## ( ٣٨ ) فەرمان کردن بەتەخت کردنی گۆڕ

٤٨٣ـ عنْ أبي الْهيّاج الْأسديّ قال: قال لي عليُّ بْنُ أبي طالب (ﷺ): ((ألا أبْعثُك على ما بعثني عليْه رسُولُ اللّه (ﷺ): أنْ لا تدع تمْثالا إلّا طمسْتهُ، ولا قبْرًا مُشْرفًا إلّا سوّيْتهُ.

(ابو هیاج الاسدی) دەڵێ: (علی کوڕی ابو طالب) (ﷺ) پێی وتم: ئایا نەتنێرم بۆ کارێك کە پێغەمبەر (ﷺ) منی بۆ نارد؟ هیچ پەیکەرێك مەهێڵە و

هەمووی تەفر و تونا بکە، هەرچی گۆڕی قوت کراوەش هەیە، هەمووی تەخت بکە.

## (٣٩) ناپەسەندی بینا لەسەر گۆڕ و گەچکاری کردنی گۆڕ.

٤٨٤ـ عنْ جابر (رضي الله عنه) قالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّه (ﷺ) أنْ يُجَصَّصَ الْقَبْرُ وَأنْ يُقْعَدَ عَلَيْه، وأنْ يُبْنَى عليْه.

(جابر) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) قەدەغەی ئەوەی کرد کە گۆڕ گەچکاری بکرێت و لەسەری دابنیشن و بینای لەسەر بکرێت.

## (٤٠) حاڵی مردوو لە ئێواران و بەیانیاندا

٤٨٥ـ عن ابْن عُمر (رضي الله عنه): أنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) قالَ: ((إنَّ أحَدَكُمْ إذَا مَاتَ عُرِضَ عَلَيْه مَقْعَدُهُ بالْغَدَاة وَالْعَشيِّ: إنْ كَانَ منْ أهْل الْجَنَّة فمنْ أهْلِ الْجَنَّة، وإنْ كَانَ منْ أهْل النَّار فمنْ أهْل النَّار، يُقَالُ: هذَا مَقْعَدُكَ حَتَّى يَبْعَثَكَ اللَّهُ إلَيْهِ يَوْمَ الْقِيَامَة)). [بخاري الجنائز/ ١٣١٣]

(ابن عمر) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((هەرکەس لە ئێوە کە دەمرێت شوێنەکەی لەبەیانیان و ئێوارانـدا نیشان دەدرێـت، ئەگەر لەخەڵکی بەهەشت بێ، ئەوە خەڵکی بەهەشتە، خۆ ئەگەر خەڵکی دۆزەخ بێت، ئەوە خەڵکی دۆزەخە، ئینجا پێی دەوترێت: ئەمە جێگەی تۆیە هەتا ڕۆژی قیامەت خوای گەورە زیندوت دەکاتەوە بۆلای خۆی)).

## (٤١) پرسیاری دووفریشتەکە لەکاتی خستنە گۆڕدا.

٤٨٦ـ عن أنَسُ بْنُ مَالكٍ (رضي الله عنه) قالَ: قَالَ نَبِيُّ اللَّه (ﷺ): ((إنَّ الْعَبْدَ إذَا وُضعَ في قَبْره، وَتولَّى عَنْهُ أصْحَابُهُ، إنَّهُ لَيَسْمَعُ قَرْعَ نعَالهمْ. [زادَ في الرواية: إذا انصرفوا]. قَالَ: يأْتيه ملَكان فيُقْعدَانه، فيَقُولَان لَهُ: مَا كُنْتَ تقُولُ في هَذَا الرَّجُلِ؟ قالَ: فأمَّا الْمُؤْمنُ فيَقُولُ: أشْهَدُ أنَّهُ عَبْدُ اللَّه وَرَسُولُهُ. قالَ: فيُقَالُ لَهُ: ((انْظُرْ إلى مقْعَدك منَ النَّار قدْ أبْدَلَك اللَّهُ به مَقْعَدًا منَ الْجَنَّة. قَالَ نَبِيُّ اللَّه (ﷺ): ((فيرَاهُمَا جَميعًا)). قالَ قتادةُ: وَذُكرَ لَنَا أنَّهُ يُفْسَحُ لَهُ في قَبْره سَبْعُونَ ذراعًا، ويُمْلأُ عليْه خَضرًا إلى يوْم يُبْعَثُونَ. [بخاري/ الجنائز/ ١٢٧٣]

(انس کوڕی مالك) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((کاتێ ئادەمیزاد دادەنرێت لە گۆڕەکەیدا و هاوەڵانی بەجێی دەهێڵن، ئەو دەنگی پێڵاوەکانیان دەبیسێت... دووفریشتە دێن و دایدەنیشێنن و دەڵێن: تۆ کاتی

خۆی دەربارەی ئەم پیاوە چیت دەوت؟ ئیماندار دەڵێت: من شایەتی دەدەم کە ئەو بەندە و پێغەمبەری خودایە، ئەوسا پێی دەوترێت: تەماشای جێگەی خۆت بکە لەدۆزەخ دا، خوای گەورە بۆی گۆڕیویت بە جێگەیەکی تر لە بەهەشتدا)). جا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: ((هەردوکیان دەبینێت)). (قتادە) دەڵێ: بۆمان باسکرا کە گۆڕەکەی بۆ فراوان دەکرێت بە ئەندازەی حەفتا باڵ و بۆی پڕدەکرێت لە سەوزایی تا ئەو ڕۆژەی زیندوو دەکرێتەوە.

## (٤٢) دەربارەی ئایەتی (يثبت الله الذين امنوا..)

٤٨٧- عَن الْبراء بْنِ عازبٍ (ﷺ) عن النَّبيِّ (ﷺ) قال: ﴿يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ﴾ [فقال]: نزلتْ في عذابِ الْقبْر، فيُقَالُ لهُ: مَنْ ربُّك؟ فيقُولُ: ربِّي اللَّهُ، ونَبِيِّي مُحَمَّدٌ (ﷺ)، فذلكَ قوْلُهُ عزَّ وجلَّ: ﴿يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحيَاةِ الدُّنْيَا وفِي الْآخِرَةِ﴾ [إبراهيم: ٢٧]. [بخاري الجنائز/ ١٣٠٣]

(بەرائی کوڕی عازب) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ((﴿يثبت الله الذين امنوا بالقول الثابت...﴾ دەربارەی سزای ناوگۆڕ دابەزیوە...کاتێك پێی دەوترێت پەروەردگارت کێیە؟ دەڵێت: پەروەردگارم الله یە و محمدیش (ﷺ) پێغەمبەرمە، جا ئائەوەیە کە خوای گەورە دەربارەی فەرمویەتی ﴿يثبت الله الذين امنوا بالقول الثابت في الحياة الدنيا وفي الاخرة﴾)). ابراهيم٢٧. واتە: خوا ئیماندار پابەند و پایەدار دەکات لەسەر بەڵێن و گوفتاری دامەزراو و پایەدار لە ژیانی دونیا ولە قیامەتیشدا..

## (٤٣) پەناگرتن لە سزای گۆڕ

٤٨٨- عن زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ (ﷺ) قَالَ: بيْنَمَا النَّبِيُّ (ﷺ) فِي حَائِطٍ لِبَنِي النَّجَّارِ عَلَى بَغْلَةٍ لَهُ، ونَحْنُ مَعَهُ، إِذْ حَادَتْ بِهِ فَكَادَتْ تُلْقِيهِ، وإِذَا أَقْبُرٌ سِتَّةٌ أَوْ خَمْسَةٌ أَوْ أَرْبَعَةٌ -قَالَ: كَذَا كَانَ يَقُولُ الْجُرَيْرِيُّ- فَقَالَ: ((مَنْ يَعْرِفُ أَصْحَابَ هَذِهِ الْأَقْبُرِ)). فَقَالَ رَجُلٌ: أَنَا، قَالَ: ((فَمَتَى مَاتَ هَؤُلَاءِ)). قَالَ: مَاتُوا فِي الْإِشْرَاكِ. فَقَالَ: ((إِنَّ هَذِهِ الْأُمَّةَ تُبْتَلَى فِي قُبُورِهَا، فَلَوْلَا أَنْ لَا تَدَافَنُوا لَدَعَوْتُ اللَّهَ أَنْ يُسْمِعَكُمْ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ الَّذِي أَسْمَعُ مِنْهُ)). ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَيْنَا بِوَجْهِهِ فَقَالَ: ((تَعَوَّذُوا بِاللَّهِ مِنْ عَذَابِ النَّارِ)). قَالُوا: نَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ عَذَابِ النَّارِ. فَقَالَ: ((تَعَوَّذُوا بِاللَّهِ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ)). قَالُوا: نَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ. قَالَ: ((تَعَوَّذُوا بِاللَّهِ مِنَ الْفِتَنِ مَا ظَهَرَ

منْهَا وما بطن)). قالُوا: نعُوذُ بِاللَّه منَ الْفِتَنِ، مَا ظهَرَ منْهَا ومَا بَطَنَ. قَالَ: ((تعوّذُوا بِاللَّه منْ فِتْنةِ الدّجَّال)). قالُوا: نعُوذُ باللَّه منْ فتْنَة الدَّجَّال.

(زید کوڕی ثابت) (ﷺ) دەڵێ: لەکاتێکدا پێغەمبەر (ﷺ) لەباخەکەی (بنو نجاردا) بەسەر هێسترەکەیەوە بوو، ئێمەش لە خزمەتیدا بوین لە پڕ هێسترەکەی سڵەمیەوەو خەریك بوو بیخاتە خوارەوە، سەیرمان کرد شەش یان یان پێنج یان چوار قەبر [لەو ناوەدابوون]، پێغەمبەر (ﷺ) پرسی ((کێ مردووی ئەم گۆڕانە دەناسێ؟)).

پیاوێك وتی: من.. پێغەمبەر پرسی: ((کەی ئەوانە مردون ؟)) کابرا وتی: لەسەردەمی شیرکدا مردون.. پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: ((بەڕاستی ئەم خەڵکە توشی سەختی و ناخۆشی دەبن لە گۆڕەکانیاندا، ئەگەرلەبەرئەوە نەبێت کە نەوەکو یەکتر نەنێژن، لەخوا دەپاڕامەوە کەدەنگی سزای ناو گۆڕ وەك من ببیستن)).

پاشان پێغەمبەر (ﷺ) ڕوی تێکردین و فەرموی: ((پەنا بگرن بەخوا لە سزای ئاگر)) هەموو وتیان: پەنا دەگرین بەخوا لە سزای ئاگر، ئیجا فەرموی: ((پەنا بگرن بەخوا لە سزای ناوگۆڕ)) هەموو وتیان: پەنا دەگرین بە خوا لە سزای ناوگۆڕ، پاشان فەرموی: ((پەنا بگرن بەخوا لە فیتنەی ئاشکرا و پەنهان)). هەموو وتیان: پەنا دەگرین بەخوا لە فیتنەی ئاشکرا و پەنهان، لەوەودوا فەرموی: ((پەنا بگرن بەخوا لە فیتنە و ئاشوبی دەجال)) هەموو وتیان: پەنا دەگرین بەخوا لە فیتنە و ئاشوبی دەجال.

## (٤٤) سزادانی جوو لە گۆڕەکانیاندا

٤٨٩ـ عَنْ أَبِي أَيُّوبَ (ﷺ) قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بَعْدَ مَا غَرَبَت الشَّمْسُ، فَسَمِعَ صَوْتًا، فَقَالَ: ((يَهُودُ تُعَذَّبُ فِي قُبُورِهَا)). [بخاري/ الجنائز/ ١٣٠٩]

(ابو ایوب) (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) دوای خۆرئاوابوون چوە دەرەوە گوێی لەدەنگێك بوو، فەرموی: ((ئەوە جولەکەکانن لە گۆڕەکانیاندا سزا دەدرێن)).

### (٤٥) دەربارەی سەردانی گۆڕستان و دوعای لێخۆش بوون بۆیان

٤٩٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: زَارَ النَّبِيُّ (ﷺ) قَبْرَ أُمِّهِ، فَبَكَى وَأَبْكَى مَنْ حَوْلَهُ، فَقَالَ (ﷺ): ((اسْتَأْذَنْتُ رَبِّي فِي أَنْ أَسْتَغْفِرَ لَهَا، فَلَمْ يُؤْذَنْ لِي. وَاسْتَأْذَنْتُهُ فِي أَنْ أَزُورَ قَبْرَهَا فَأُذِنَ لِي، فَزُورُوا الْقُبُورَ، فَإِنَّهَا تُذَكِّرُ الْمَوْتَ)).

(ابو هريره) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) سەردانی گۆڕی دایکی کرد، گریا و دەوروبەری گشت کردە گریان، دوایی فەرموی: ((داوام لە پەروەردگارم کرد کە مۆڵەتم بدات تا داوای لێ خۆشبوون بۆ دایکم بکەم، بەلاّم مۆڵەت نەدرام، ئینجا داوای سەردانی گۆڕەکەیم کرد بۆ ئەوە مۆڵەت درام.. جا ئێوەش سەردانی گۆڕستان بکەن، چونکە مردنتان بیردەخاتەوە)).

٤٩١- عَنِ بُرَيْدَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): (([كنت] نَهَيْتُكُمْ عَنْ زِيَارَةِ الْقُبُورِ فَزُورُوهَا، وَنَهَيْتُكُمْ عَنْ لُحُومِ الْأَضَاحِيِّ فَوْقَ ثَلَاثٍ فَأَمْسِكُوا مَا بَدَا لَكُمْ، وَنَهَيْتُكُمْ عَنِ النَّبِيذِ إِلَّا فِي سِقَاءٍ، فَاشْرَبُوا فِي الْأَسْقِيَةِ كُلِّهَا، وَلَا تَشْرَبُوا مُسْكِرًا)).

(بريده) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ((من سەردانی گۆڕستانم لێ قەدەغە کردبوون، ئێستە سەردانی بکەن، هەروەها قەدەغەی هەڵگرتنی گۆشتی قوربانیم لێ کردبوون زیاتر لە سێ ڕۆژ، بەلاّم ئێستا چەند دەتانەوێ هەڵیبگرن، قەدەغەی [خواردنەوەی] شەربەت و خۆشاوم لێ کردبوون لە کوندەدا نەبێت، ئێستا بۆتان هەیە لە هەموو دەفرێکدا بیخۆن، هیچ شتێکی سەرخۆشکەریش مەخۆنەوە)).

### (٤٦) سەلام کردن لە خەڵکی گۆڕستان و دوعا بۆکردنیان.

٤٩٢- عن مُحَمَّدَ بْنَ قَيْسٍ أَنَّهُ قَالَ يَوْمًا: أَلَا أُخبِرُكُمْ عَنِّي وَعَنْ أُمِّي؟ قَالَ: فَظَنَنَّا أَنَّهُ يُرِيدُ أُمَّهُ الَّتِي وَلَدَتْهُ، قَالَ: قَالَتْ عَائِشَةُ: أَلَا أُحَدِّثُكُمْ عَنِّي وَعَنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)؟ قُلْنَا: بَلَى، قَالَ: قَالَتْ: لَمَّا كَانَتْ لَيْلَتِي الَّتِي [كَانَ] النَّبِيُّ (ﷺ) فِيهَا عِنْدِي انْقَلَبَ فَوَضَعَ رِدَاءَهُ، وَخَلَعَ نَعْلَيْهِ فَوَضَعَهُمَا عِنْدَ رِجْلَيْهِ، وَبَسَطَ طَرَفَ إِزَارِهِ عَلَى فِرَاشِهِ فَاضْطَجَعَ، فَلَمْ يَلْبَثْ إِلَّا رَيْثَمَا ظَنَّ أَنْ قَدْ رَقَدْتُ، فَأَخَذَ رِدَاءَهُ رُوَيْدًا، وَانْتَعَلَ رُوَيْدًا، وَفَتَحَ الْبَابَ [رُوَيْداً] فَخَرَجَ ثُمَّ أَجَافَهُ رُوَيْدًا، فَجَعَلْتُ دِرْعِي فِي رَأْسِي، وَاخْتَمَرْتُ، وَتَقَنَّعْتُ إِزَارِي، ثُمَّ انْطَلَقْتُ عَلَى إِثْرِهِ، حَتَّى جَاءَ الْبَقِيعَ، فَقَامَ فَأَطَالَ الْقِيَامَ، ثُمَّ رَفَعَ يَدَيْهِ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ انْحَرَفَ، فَانْحَرَفْتُ، فَأَسْرَعَ فَأَسْرَعْتُ،

فهرول فهرولتُ، فأَحْضَرَ فأَحْضَرْتُ فسَبَقْتُهُ، فدَخَلْتُ، فلَيْس إلَّا أن اضْطَجَعْتُ، فدخل فقَالَ: ((مَا لك يا عائشُ حَشْيا رابيةً)). قالتْ: قُلتُ: لا شَيْء، قال: ((لتُخْبِرِيني أوْ لَيُخْبِرَنِّي اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ)). قالتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللّه بِأبِي أنْتَ وَأمِّي، فأخْبَرْتُهُ، قَالَ: ((فَأنْت السَّوَادُ الَّذي رَأيْتُ أمَامِي)). قُلْتُ: نَعَمْ، فلَهَدَنِي فِي صَدْرِي لَهْدَةً أوْجَعَتْنِي، ثُمَّ قَالَ: ((أظَنَنْت أنْ يَحِيفَ اللّهُ عَلَيْك وَرَسُولُهُ)). قالتْ: مَهْمَا يَكْتُم النَّاسُ يَعْلَمْهُ اللّهُ، نَعَمْ. قَالَ: ((فَإِنَّ جِبْرِيلَ أتَانِي حِينَ رَأيْت فنَادَانِي فَأخْفَاهُ مِنْك، فَأَجَبْتُهُ فأَخْفَيْتُهُ مِنْك، وَلَمْ يَكُنْ يَدْخُلُ عَلَيْك وَقَدْ وَضَعْت ثِيَابَك، وَظَنَنْتُ أنْ قَدْ رَقَدْت فكَرِهْتُ أنْ أُوقِظَك، وَخَشِيتُ أنْ تَسْتَوْحِشِي، فقَالَ: إنَّ رَبَّك يَأْمُرُك أنْ تَأْتِيَ أهْلَ الْبَقِيعِ، فتَسْتَغْفِرَ لَهُمْ)). قالَتْ: قُلْتُ: كَيْفَ أقُولُ لَهُمْ يَا رَسُول اللّه؟ قَالَ: ((السَّلَامُ عَلَى أهْلِ الدِّيَارِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُسْلِمِينَ، وَيَرْحَمُ اللّهُ الْمُسْتَقْدِمِينَ مِنَّا وَالْمُسْتَأْخِرِينَ، وَإِنَّا إِنْ شَاءَ اللّهُ بِكُمْ لَلَاحِقُونَ)).

ڕۆژێك (محمدی كوڕی قیس) وتی: ئایا دەربارەی خۆم و دایكم شتێكتان بۆ بگێڕمەوە، ئەوانیش وتیان، وامانزانی ئەو دایكە دەڵێیت كە لێی بووە.. بەڵام وتی (عائشە) (ﷺ) بۆی گێڕاینەوەو وتی: حەزدەكەن ڕوداوێكی نێوان خۆم و پێغەمبەرتان (ﷺ) بۆ باس بكەم؟ هەموو وتمان: بەڵێ... ئەویش وتی: ئەو شەوەی كە نۆرەم بوو پێغەمبەر (ﷺ) لام بمێنێتەوە هات و عەباكەی دانا و نەعلەكانی داكەند و لای قاچی داینا لایەكی كراسەكەی ڕاخست و ڕاكشا، زۆری پێنەچوو وای زانی خەوم لێ كەوتوە، بەهێواشی عەباكەی كۆكردەوە و نەعلەكانی لەپێ كردو لەسەر خۆ دەرگاكەی كردەوە و چووە دەرەوە و لەسەر خۆ دایخست، منیش كراسەكەم لەبەر كرد و پۆشتە ماڵەكەم كردە ڕوپۆش و شوێنی كەوتم هەتا گەیشتە (بقیع)، ئەوسا بینیم وەستا و زۆریش وەستا، سێ جار دەستەكانی بەرزكردەوە ئینجا ئەو لای دا، منیش لامدا، ئەو پەلەی كرد، منیش پەلەم كرد، ئەو زیاتر پێی هەڵگرت منیش زیاتر پێم هەڵگرت، ئەو ڕایكردو منیش ڕام كردو پێشی كەوتم و چومە ژورەوە و خێرا ڕاكشام، ئەویش هاتە ژورەوە و فەرموی: ((ئەوە چیتە عائشە وا هەناسە بڕكێتە)) منیش وتم: هیچم نییە. فەرموی: ((یان پێم دەڵێیت، یان زاتی لطیف و ئاگا پێم دەڵێت)). منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا... ئەی خۆشەویست تر لە باوك و دایكم. ئیتر هەموشتێكم بۆگێڕایەوە. ئەویش فەرموی: ((كەواتە ئەوتارماییەی كەلە

پێشـمەوە دەمبینـی تۆبویـت؟)) وتم:بـەڵێ. ئەوسـا هـەردوو دەسـتی مـاڵی بەسنگمداوئێشـی پـێ گـەیاندم،ئینجا فـەرمووی: ((بۆچـی وات زانـی خـواو پێغەمبەرەکـەی سـتەمت لێ دەکـەن؟)) منیـش وتم: هەرچـەندە خـەڵکی نهێنییەکانیان بشارنەوە خوا ئاگای لێیەتی.. ئینجا فەرموی: ((جوبرەئیل علیه السلام هاتەلام، بانگی لێ کردم، لەتۆی شاردەوە، منیش وەڵامم دایەوە و لەتۆم شاردەوە، ئەو نـەدەکرا بێتـە ژورەوە چونکـە تـۆ پۆشـاکەکانت دانـابوو، مـن وامزانـی تۆ خەوتویت، حـەزم نـەکرد خەبـەرت بکەمـەوە و ترسـام لـەوەی کـە (بەتەنهایی) بترسیت.. جوبرئیل پێی وتم: پەروەردگارت فەرمانت پێ دەدات کە بچیت بۆلای خەڵکی (بقیع) و داوای لێ خۆشبونیان بۆبکەیت)). عائشە وتـی: ئەی من چیان پێ بڵێم ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: ((بڵێ: سلاوتان لێ بێت ئەی خـەڵکی ئەم شوێنە لە ئیمـانداران و موسـڵمانان، خـوا ڕەحـم بکـات بەوانـەمان کە زومـردون و ڕۆیشتون، بەوانـەشمان کـە هێشتا مـاون، بێ گومـان ئێمەش هەرکاتێك خوا ویستی لەسەر بێت بەئێوە دەگەین)).

## (٤٧) دانیشتن لەسەر گۆڕ و نوێژ کردن لەسەری

٤٩٣ـ عنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رسُولُ اللَّه (ﷺ): ((لأنْ يجْلِس أحدُكمْ علَى جمْرَةٍ، فتُحْرِق ثِيَابَهُ فتخْلُص إِلَى جِلْدِه، خَيْرٌ لهُ منْ أنْ يجْلِس على قبْرٍ)).

(ابو هريره) (ﷺ) دەڵێ:پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((ئەگەر کەسێك لە ئێوە لەسـەر پشکۆیەك دابنیشێت هەتا پۆشاکەکەی دەسـوتێت و دەگاتـە پێسـتی، هێشتا ئەوەی چاکترە لەوەی لەسەر گۆڕێك دابنیشێت)).

٤٩٤ـ عنْ أَبِي مرْثدٍ الْغنوِيِّ (ﷺ) قال: قال رسُول اللَّه (ﷺ): ((لا تجْلسُوا علَى الْقُبُورِ، ولا تُصلُّوا إِلَيْهَا)).

(ابو مرثد الغنوي) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((لەسەر گۆڕ دامەنیشن و لە نوێژدا ڕوی تێ مەکەن)).

## (٤٨) باسی چاکەی چاکەکار

٤٩٥ـ عَنْ أَبِي ذرّ (ﷺ) قَالَ: قيلَ لرَسُول اللَّـه (ﷺ): أَرَأَيْتَ الرَّجُل يَعْمَل الْعَمَل مِنَ الْخَيْرِ وَيَحْمَدُهُ النَّاسُ عَلَيْه؟ قَال: ((تلْك عَاجِلُ بُشْرَى الْمُؤْمِن)).

(ابـو ذر) ﷺ دەڵـێ: پرسـیار کـرا لـە پێغەمبـەر (ﷺ): ڕای جـەنابت چۆنـە دەربـارەی ئـەو کەسـەی چاکە دەکات و خـەڵکی سوپاسـی دەکـەن؟ فـەرمووی: ((ئەوە مژدە پێشەکی‌یە بۆ ئیماندار)).

# (١٠) بەشی زەکات

## (١) باسی فەرزبوونی زکات

٤٩٦ . عن ابْنِ عبَّاس اَنَّ مُعاذًا قَالَ بَعثَنِي رَسُولُ اللّه (ﷺ) قَالَ: ((إِنَّكَ تَأْتِي قَوْمًا مِنْ اَهْلِ الْكِتَاب، فادْعُهُمْ إِلى شَهادَةِ أَنْ لَا إِلهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنِّي رَسُولُ اللّه، فَإِنْ هُمْ أَطاعُوا لذلك: فَأَعْلِمْهُمْ أَنّ اللّه افْتَرَض عَلَيْهِمْ خَمْسَ صلَوَاتٍ فِي كُلِّ يَوْمٍ ولَيْلَةٍ، فَإِنْ أَطاعُوا لذلك: فَأَعْلِمهُمْ أَنّ اللّه افْتَرَضَ عَلَيْهِمْ صَدَقَةً تُؤْخَذُ مِنْ أَغْنيائهمْ فتُردُّ فِي فُقرائهمْ، فإنْ هُمْ أطاعُوا لذلك: فَإِيَّاكَ وكَرائمَ أَمْوَالِهِمْ، واتَّقِ دَعْوَة الْمظْلُوم، فَإِنَّهُ لَيْسَ بَيْنَها وَبيْن اللّه حِجابٌ)). [بخاري/ الزكاة/ ١٤٢٥]

(ابن عباس) (ﷺ) دەڵێ: (معاذ) وتویەتی: پێغەمبەر (ﷺ) بەرێی کردم و فەرمووی: ((تۆ دەگەیت بەکەسانێك لەخاوەن کتێبەکان بانگیان بکە بۆ شایەتمان (ان لا اله الا الله وانی رسول الله). جا ئەگەر ئەوان ملکەچ بوون بۆ ئەوە. تێیان بگەیەنە کە خوا لەشەوو ڕۆژێکدا پێنج جار نوێژی لەسەر فەرز کردوون. ئەگەر ملکەچ بوون بۆ ئەوەش، ئەوە تێیان بگەیەنە کە خوا زەکاتێکی لەسەر فەرزکردون کە لە دەوڵەمەندەکانیان وەردەگیرێت و دەدرێت بە هەژارەکانیان، جا ئەگەر ملکەچ بوون بۆ ئەوەش، ئەوە نەکەیت ماڵە بەنرخ و گران بەهاکانیان لێوەربگریت، خۆشت لە نزای ستەم لێکرا و بپارێزە، چونکە بەڕاستی لەنێوان ئەو و خوای گەورەدا هیچ پەردەیەك نی‌یە.

## (٢) زەکات لەچی دەردەکرێت؟

٤٩٧ـ عنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ، صَدَقَةٌ وَلَا فِيمَا دُونَ خَمْسِ ذَوْدٍ صَدَقَةٌ، وَلَا فِيمَا دُونَ خَمْسِ أَوَاقٍ صَدَقَةٌ)). [بخاري/ الزكاة/ ١٣٤٠]

(ابو سعیدی خدری) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((لە دانەوێڵەو خورمادا زەکات نی‌یە تا دەگاتە پێنج (اوسق) [کە بەرامبەرە بە ٦٥٣ کغم]، لە پێنج سەر حوشتریش زەکات نییە، لە پێنج (ئوقیە) زیویش کەمتر زەکاتی ناکەوێت)).

## (٣) دە یەك و بیست یەك

٤٩٨ـ عن جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّه (ﷺ): أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ (ﷺ) قال: ((فيمَا سقت الْأَنْهَارُ وَالْغَيْمُ الْعُشُورُ، وَفِيمَا سُقِيَ بِالسَّانِيَةِ نِصْفُ الْعُشْرِ)).

(جابری كوڕی عبدالله) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: ((ئەوەی بەباران یان بەئاوی ڕوبار پێ دەگات ئەوە زەكاتەكەی دە یەكە ئەوەش بەوشترو (كەرەستەی تر) ئاو دەدرێت ئەوە زەكاتەكەی نیوەی دەیەكە [واتە بیست یەك].

## (٤) پێشخستنی زەكات یان دەرنەكردنی زەكات.

٤٩٩ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: بَعَثَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) عُمَرَ عَلَى الصَّدَقَة، فَقِيلَ: مَنَعَ ابْنُ جَمِيلٍ وَخَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ وَالْعَبَّاسُ عَمُّ رَسُولِ اللَّه (ﷺ). فَقَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): ((مَا يَنْقِمُ ابْنُ جَمِيلٍ إِلَّا أَنَّهُ كَانَ فَقِيرًا فَأَغْنَاهُ اللَّهُ، و أَمَّا خَالِدٌ فَإِنَّكُمْ تَظْلِمُونَ خَالِدًا، قَد احْتَبَسَ أَدْرَاعَهُ وَأَعْتَادَهُ فِي سَبِيلِ اللَّه وَأَمَّا الْعَبَّاسُ فَهِيَ عَلَيَّ وَمِثْلُهَا مَعَهَا)). ثُمَّ قَالَ: ((يَا عُمَرُ، أَمَا شَعَرْتَ أَنَّ عَمَّ الرَّجُلِ صِنْوُ أَبِيه)). [بخاري/ الزكاة/ ١٣٩٩]

(ابو هريره) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) (عومەری كوڕی خطاب)ی نارد بۆ كۆكردنەوەی زەكات..وتیان: (ابن جمیل) و (خالدی كوڕی وەلید) و (عەباس)ی مامی پێغەمبەر (ﷺ) زەكاتیان نەداوە. پێغەمبەر (ﷺ) كە هەواڵی پێدرا فەرموی: ((ابن جمیل لەوە ڕقی هەستاوە كە هەژار بوو خوا دەوڵەمەندی كرد!!، بەڵام خالد ئێوە ستەمی لێ دەكەن، چونكە ئەو زرێپۆش و تفاقی جەنگی لەڕێگەی خوادا داناوە ، (عەباس)یش هەرچی دەكەوێت لەسەر من بۆی دەدەم و ئەوەندەی تریشی دەخەمە سەر، پاشان فەرموی ئەی عومەر نازانی مامی هەركەسێك لەجێی باوكیەتی)).

## (٥) زەكات نەدەر

٥٠٠ـ عَنْ أَبِي ذَرّ (ﷺ) قَالَ: انْتَهَيْتُ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) وَهُوَ جَالِسٌ فِي ظِلِّ الْكَعْبَة، فَلَمَّا رَآنِي قَالَ: ((الْأَخْسَرُونَ وَرَبِّ الْكَعْبَة)). قَالَ: فَجِئْتُ حَتَّى جَلَسْتُ، فَلَمْ أَتَقَارَّ أَنْ قُمْتُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّه، فِدَاكَ أَبِي وَأُمِّي، مَنْ هُمْ؟ قَالَ: ((هُمُ الْأَكْثَرُونَ أَمْوَالًا، إِلَّا مَنْ قَالَ هَكَذَا وَهَكَذَا وَهَكَذَا –مِنْ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ وَعَنْ يَمِينِهِ وَعَنْ شِمَالِهِ– وَقَلِيلٌ مَا هُمْ. مَا مِنْ صَاحِبِ إِبِلٍ وَلَا بَقَرٍ وَلَا غَنَمٍ، لَا يُؤَدِّي زَكَاتَهَا، إِلَّا جَاءَتْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْظَمَ مَا كَانَتْ وَأَسْمَنَهُ، تَنْطَحُهُ بِقُرُونِهَا، وَتَطَؤُهُ

بِأَظْلَافِهَا، كُلَّمَا نَفِدَتْ أُخْرَاهَا عَادَتْ عَلَيْهِ أُولَاهَا، حَتَّى يُقْضَى بَيْنَ النَّاسِ)).
[بخاري/ الزكاة/ ١٣٩١]

(ابو ذر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) لە سێبەری کەعبەدا دانیشتبو، چومە خزمەتی کاتێ منی بینی فەرمووی: ((بەخاوەنی کەعبە ئەوانە زۆر خەسارۆمەندن)). ئۆقرەم نەگرت هەستام و وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دایك و باوکم بەقوربانت بێ، کێن ئەوانە؟ فەرمووی: ((ئەوانەی کە ماڵ و دارایییان زۆرە، مەگەر کەسێ بڵێ: هاو هاو ها، لەبەردەم و لەپشتەوە و بەڕاست و بە چەپدا ببەخشێ، ئەوانەش کەمن، هیچ خاوەن وشترو گاگەل و مەڕو ماڵاتێك نیە لە ڕۆژی قیامەتدا کەبۆیان دەهێنرێتە مەیدان، هەمو گەورەتر و قەڵەوتریشن بەشاخ دەدەن لەخاوەنەکەیان و دەیانخەنە ژێر سمیانەوە، کاتێ سەرەی هەموویان تەواو دەبێت سەرلەنوێ دەست پێ دەکەنەوە هەتا لێپرسینەوە لەناو خەڵکیدا تەواو دەبێت.

٥٠١ـ عن أبي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قال: قَال رَسُولُ اللَّه (ﷺ): ((مَا مِنْ صَاحِبِ ذَهَبٍ وَلَا فِضَّةٍ، لَا يُؤَدِّي مِنْهَا حَقَّهَا، إِلَّا إِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ صُفِّحَتْ لَهُ صَفَائِحَ مِنْ نَارٍ، فَأُحْمِيَ عَلَيْهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ، فَيُكْوَى بِهَا جَنْبُهُ وَجَبِينُهُ وَظَهْرُهُ، كُلَّمَا بَرَدَتْ أُعِيدَتْ لَهُ، فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ، حَتَّى يُقْضَى بَيْنَ الْعِبَادِ، فَيَرَى سَبِيلَهُ: إِمَّا إِلَى الْجَنَّةِ، وَإِمَّا إِلَى النَّارِ)). قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَالْإِبِلُ؟ قَالَ: ((وَلَا صَاحِبُ إِبِلٍ لَا يُؤَدِّي مِنْهَا حَقَّهَا، وَمِنْ حَقِّهَا حَلَبُهَا يَوْمَ وِرْدِهَا، إِلَّا إِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ بُطِحَ لَهَا بِقَاعٍ قَرْقَرٍ، أَوْفَرَ مَا كَانَتْ، لَا يَفْقِدُ مِنْهَا فَصِيلًا وَاحِدًا، تَطَؤُهُ بِأَخْفَافِهَا وَتَعَضُّهُ بِأَفْوَاهِهَا، كُلَّمَا مَرَّ عَلَيْهِ أُولَاهَا رُدَّ عَلَيْهِ أُخْرَاهَا، فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ، حَتَّى يُقْضَى بَيْنَ الْعِبَادِ، فَيَرَى سَبِيلَهُ: إِمَّا إِلَى الْجَنَّةِ وَإِمَّا إِلَى النَّارِ)). قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَالْبَقَرُ وَالْغَنَمُ؟ قَالَ: ((وَلَا صَاحِبُ بَقَرٍ وَلَا غَنَمٍ لَا يُؤَدِّي مِنْهَا حَقَّهَا، إِلَّا إِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ بُطِحَ لَهَا بِقَاعٍ قَرْقَرٍ، لَا يَفْقِدُ مِنْهَا شَيْئًا، لَيْسَ فِيهَا عَقْصَاءُ وَلَا جَلْحَاءُ وَلَا عَضْبَاءُ، تَنْطَحُهُ بِقُرُونِهَا وَتَطَؤُهُ بِأَظْلَافِهَا، كُلَّمَا مَرَّ عَلَيْهِ أُولَاهَا رُدَّ عَلَيْهِ أُخْرَاهَا، فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ، حَتَّى يُقْضَى بَيْنَ الْعِبَادِ، فَيَرَى سَبِيلَهُ: إِمَّا إِلَى الْجَنَّةِ وَإِمَّا إِلَى النَّارِ)). قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَالْخَيْلُ؟ قَالَ: ((الْخَيْلُ ثَلَاثَةٌ: هِيَ لِرَجُلٍ وِزْرٌ، وَهِيَ لِرَجُلٍ سِتْرٌ، وَهِيَ لِرَجُلٍ أَجْرٌ، فَأَمَّا الَّتِي هِيَ لَهُ وِزْرٌ: فَرَجُلٌ رَبَطَهَا رِيَاءً وَفَخْرًا وَنِوَاءً

عَلَى أَهْلِ الْإِسْلَامِ، فَهِيَ لَهُ وِزْرٌ. وَأَمَّا الَّتِي هِيَ لَهُ سِتْرٌ. فَرَجُلٌ رَبَطَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ ثُمَّ لَمْ يَنْسَ حَقَّ اللَّهِ فِي ظُهُورِهَا وَلَا رِقَابِهَا، فَهِيَ لَهُ سِتْرٌ. وَأَمَّا الَّتِي هِيَ لَهُ أَجْرٌ فَرَجُلٌ رَبَطَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ لِأَهْلِ الْإِسْلَامِ، فِي مَرْجٍ وَرَوْضَةٍ. فَمَا أَكَلَتْ مِنْ ذَلِكَ الْمَرْجِ أَوِ الرَّوْضَةِ مِنْ شَيْءٍ إِلَّا كُتِبَ [الله] لَهُ عَدَدَ مَا أَكَلَتْ حَسَنَاتٌ، وَكُتِبَ لَهُ عَدَدَ أَرْوَاثِهَا وَأَبْوَالِهَا حَسَنَاتٌ، وَلَا تَقْطَعُ طِوَلَهَا فَاسْتَنَّتْ شَرَفًا أَوْ شَرَفَيْنِ، إِلَّا كَتَبَ اللَّهُ لَهُ عَدَدَ آثَارِهَا وَأَرْوَاثِهَا حَسَنَاتٍ، وَلَا مَرَّ بِهَا صَاحِبُهَا عَلَى نَهْرٍ فَشَرِبَتْ مِنْهُ، وَلَا يُرِيدُ أَنْ يَسْقِيَهَا، إِلَّا كَتَبَ اللَّهُ لَهُ عَدَدَ مَا شَرِبَتْ حَسَنَاتٍ)). قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَالْحُمُرُ؟ قَالَ: ((مَا أُنْزِلَ عَلَيَّ فِي الْحُمُرِ شَيْءٌ إِلَّا هَذِهِ الْآيَةَ الْفَاذَّةَ الْجَامِعَةَ: ﴿فَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ، وَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ﴾ [الزلزلة: ٧-٨]. [بخاري/ الزكاة/ ١٣٣٧،١٣٣٨]

(ابو هريره) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: ((هیـچ خـاوەن زێـڕ و زیوێـك نیـیە كـە حەقەكـەی (زەكاتەكـەی) نـەدات لـە ڕۆژی قیامــەتدا، پلێتـی ئاگرینی بۆ ئامادە دەكرێت كە لە ئاگری دۆزەخدا سوور كراوەتەوە، لاتەنیشت و ناوچـاوو پشـتی پـێ داخ دەكرێـت، هـەر كـاتێك سـارد بوویـەوە بـۆی تـازە دەكرێتـەوە، لە ڕۆژێكدا كەماوەكـەی پـەنجا هەزارسـاڵە، هـەتا دادوەری لـەنێوان هـەموو بـەندەكاندا تـەواو دەكرێـت، پاشـان ڕێگـەی نیشـان دەدرێـت یـان بــۆ بەهەشت یان بۆ دۆزەخ)). وتـرا: ئـەی پێغەمبـەر (ﷺ) ئـەی حوشتر؟ فـەرمووی: ((خاوەنی حوشتریش هـەندێ لەمافەكەی ئەوەیە لەڕۆژی هێنانیدا بۆ سەرئاو بدۆشرێ و بەشی نەدارانی لێ بدرێت، ئەگەرنا لە ڕۆژی قیامـەتدا لە دەشـتێكی كاكی بەكاكی تەختدا دێت و قەڵەوترو گەورەترە تەنانـەت بەچكەكەشیان لێ ون نییە، خاوەنەكانیان دەخەنە ژێر پێیانەوە و گازیان لێدەگرن، كاتێ سەرەتاكان تـەواودەبن و دێنـە كۆتـایی سـەرلەنوێ دەسـت پـێ دەكەنـەوە، لـە ڕۆژێكـدا كـە ماوەكـەی پـەنجا هـەزار ساڵە هـەتا دادوەری لـەنێوان هـەموو بـەندەكاندا تـەواو دەكرێـت، پاشـان ڕێگـەی خـۆی نیشان دەدرێـت، یـان بـۆ بەهەشـت یـان بـۆ دۆزەخ)).وتـرا:ئـەی پێغەمبـەر (ﷺ)ئـەی گاگـەل و مـاڵات؟ فـەرمووی: ((خـاوەنی گاگـەل ومـاڵاتیش ئەوەی كـە لەسـەری پێویسـتە نەیبەخشێت،كەڕۆژی قیامـەت هات دەشتێكی فراوانی سەختی بۆ ساز دەكرێت،هیچیان لێون نـەبووە.هیچیـان شـاخ كەوانـەیی،یـان كوڵ،یـان شـاخ شـكاونین،بەشـوێن لەخاوەنـەكانیاندەدەن،

سمیان پیادەنێن، کاتێ سەرەتاکانیان تەواودەبێ و دێنە کۆتایی سـەرلەنوێ دەست پێ دەکەنەوە لە ڕۆژێکدا کەماوەکەی پەنجا هەزار ساڵە هەتا دادوەری لەنێوان هەموو بەندەکاندا تەواو دەکرێت، پاشان ڕێگەی خۆی نیشان دەدرێت، یان بۆ بەهەشت یان بۆ دۆزەخ)). وترا: ئەی پێغەمبەر ئەی ئەسپ؟ فەرمووی: ((ئەسپ سێ جۆرە بۆ هەندێ کەس هۆی توشبونی تاوانە، بۆ هەندێکیش هۆی پاراستن و پۆشینە بۆ هەندێ کەسی تریش دەستکەوت و پاداشتە، جا ئەوەی کەتاوانە بـۆی، پیاوێکـە، بـۆ خۆدەرخستن و شـانازی و دژایـەتی موسـڵمانان ڕایگرتووە، ئەوە بۆ ئەو تاوانە، ئەوەش بۆی دەبێـە قەڵغان لـە ئاگر، کەسێکە لەبەرخوا ڕایگرتبێت، حەقی خوا فەرامۆش نەکات لەبەکارهێنانی‌دا بۆ سواری و بەخشینی بۆ جیهاد، ئەوە بۆی دەبێـە قەڵغان، بەڵام ئەوەی کە بووە هـۆی پاداشـت، ئـەوە کەسـێکە بۆخـوا ڕایگرتبێـت بـۆ بـەرژەوەندی موسـڵمانان، لەدەشتێکی فراوانـی سـەوزەلأنیدا، هـەموو ئـەو گژوگیایانـەی کـە لـەو دەشتە فراوانـە سـەوزەدا دەیخـوات بـۆی دەنووسـرێ بـە چاکـە بەئـەندازەی ئـەوەی خواردوویـەتی، تەنانـەت هـەموو پاشـەڕۆ و میزەکەشـی بـە چاکـە بـۆی دەنووسرێت، ئەگەر پەتەکەی بپچڕێت تەپۆڵکەیەك یان دوو تەپۆڵکە سەرکەوت خوابەقـەدەر جـێ پێکـانی و پاشـەڕۆکانی چاکـەی‌بۆ تۆماردەکـات، کـاتێ خاوەنەکەی دەیباتە سەر هەر چەم و ڕوبارێك بـۆ ئەوەی ئـاوی بـدات، خـوا بەئەندازەی ئەو ئاوەی دەیخواتەوە چاکەی بۆ دەنوسێت)). ئینجا وترا: ئەی گوێ درێژ؟ فەرمووی: ((دەربارەی گوێ درێژ هیچم بۆ دانەبەزیوە مەگەر ئەم ئایەتە ناوازە و گشتگیرە: ﴿فمن يعمل مثقال ذرة خيراً يره ومن يعمل مثقال ذرة شراً يره﴾)) [الزلزال٧،٨].

## ( ٦ ) هەڕەشە لەوانەی ماڵ و سامان قایم دەکەن

٥٠٢ـ عَن الْأَحْنَف بْن قَيْس قَال: كُنْتُ فِي نَفرٍ مِنْ قُرَيْشٍ فَمَرَّ أَبُو ذَرّ (ﷺ) وَهُو يقُولُ: بَشِّر الْكَانزين بكيّ فِي ظُهُورِهِمْ يخْرُجُ مِنْ جُنُوبِهِمْ، وَبِكَيّ مِنْ قِبل أَقْفائهمْ يخْرُجُ مِن جِباههِمْ، قَال: ثُمَّ تَنحّى فَقعَد، قَال: قُلْتُ: منْ هذا؟ قَالُوا: هَذَا أَبُو ذَرّ. قَال: فقُمْتُ إِلَيْه فقُلْتُ: ما شَيْءٌ سَمِعْتُكَ تَقُولُ قُبَيْلُ؟ قَال: مَا قُلْتُ إِلَّا شَيْئًا قدْ سَمِعْتُهُ مِنْ نَبِيِّهِمْ (ﷺ)، قَال: قُلْتُ: مَا تَقُولُ فِي هَذَا الْعطاء؟ قَال: خُذْهُ، فإِنّ فِيه الْيوْم معُونَةً، فإِذَا كان ثَمنًا لِدِينِكَ فَدعْهُ.

(احنف ی کوڕی قیس) دەگێڕێتەوە: لەگەڵ دەستەیەك لە قوڕەیشیەکاندا بوم (ابو ذر) (ﷺ) تێپەڕی، بەدەم ڕۆیشتنەوە دەیوت: مژدە بدە بەو کەسانەی کـە سـامان قـایم دەکـەن بـەداخ کردنێـك کـە دەنرێـت بەپشـتیانەوە و لەلاتەنیشتیانەوە دەردەچێـت، وە بـە داخێکـی تریـش بەپشـت سـەریاندا و لەناچاوانیانـەوە دەردەچێت.. پاشان کـەناری گـرت و دانیشـت. پرسـیم ئەمـە کێـیـە؟ وتیـان: (ابـو ذر)ە. منیـش چـوم بـۆلای و وتم: ئـەوە چـی بـوو تـاوێك لەمەوپێش لێم بیستی، وتـی:شتێکم ووت کە لـە پێغەمبەرەکەیانم بیستووە... منیش وتم: ئەی دەربارەی ئەوەی کـە پێمـان دەبەخشرێـت ڕات چۆنـە.وتـی: وەری بگرە چونکە ئەمڕۆ بەکەڵکت دێت، بەڵام ئەگەر بووبە هـۆی فرۆشـتنی ئاینەکەت وازی لێ بهێنە.

## ( ٧ ) فەرمان بە ڕازی کردنی کۆکەرەوانی زەکات

٥٠٣- عَنْ جَرِير بْنِ عَبْد اللَّه (ﷺ) قَالَ: جَاءَ نَاسٌ مِن الْأَعْرَابِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فقَالُوا: إِنَّ نَاسًا مِنَ الْمُصَدِّقِينَ يَأْتُونَنَا فَيَظْلِمُونَنَا، قَال: فقَال رَسُولُ اللَّه (ﷺ): ((أَرْضُوا مُصَدِّقِيكُمْ)). قَالَ جَرِيرٌ: مَا صَدرَ عَنِّي مُصَدِّقٌ مُنْذُ سمعْتُ هذا مِنْ رَسُولِ اللَّه (ﷺ) إِلَّا وَهُوَ عَنِّي رَاضٍ.

(جریری کوڕی عبدالله) (ﷺ) وتی: خەڵکێکی بیابان نشین هاتن بۆ خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) وتیان: کەسانێك لە کارمەندانی کۆکردنەوەی زەکـات دێـن بـۆ لامان و ستەممان لێ دکەن- پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: ((ئەو کەسانە ڕازی بکەن کە زەکاتتـان لێ وەردەگرن)). (جریر) دەڵـێ: لـەو کاتـەوە ئـەو فەرمودەیـەم لـە پێغەمبەر (ﷺ) بیستووە، هیچ زەکات کۆکەرەوەیەك لـەلام نەڕۆیشتوە لێم ڕازی نەبوبێت.

## ( ٨ ) نزا بۆ زەکات هێنەر

٥٠٤- عن عَبْدُ اللَّه بْنُ أَبِي أَوْفَى (ﷺ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) إِذَا أَتَاهُ قَوْمٌ بِصَدَقَتِهِمْ قَالَ: ((اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَيْهِمْ)). فَأَتَاهُ أَبِي أَبُو أَوْفَى بِصَدَقَتِهِ، فقَالَ: ((اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى آلِ أَبِي أَوْفَى)). [بخاري/ الزكاة/ ١٤٢٦]

(عبدالله کـوڕی ابـو اوفـی) (ﷺ) دەگێڕێتـەوە... پێغەمبـەر (ﷺ) هـەرکاتێ هۆزێك زەکاتیان بۆ بهێنایە دەیفەرموو: ((خوایە ڕەحمەت و میهرەبانی خۆت بە سـەریاندا بڕێژە)). ڕۆژێك باوکم (ابو اوفی) زەکاتەکـەی بـۆ هێنـا... پێغەمبـەر

(ﷺ) فەرموی: ((خوایە ڕەحمەت و میهرەبانی خۆت بڕێژە بەسـەر ماڵی (ابـو اوفی)دا)).

## (٩) زەکاتدان بەباوەڕ دانەمەزراو

٥٠٥ـ عن سَعْدِ بن ابي وقاص (ﷺ) قَالَ: قسَمَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) قَسْمًا. فَقُلْتُ: يا رَسُولَ اللَّه أَعْطِ فُلانًا فَإِنَّهُ مُؤْمِنٌ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): ((أَوْ مُسْلِمٌ)). أَقُولُهَا ثَلَاثًا ويُرَدِّدُهَا عَلَيَّ ثَلَاثًا: ((أَوْ مُسْلِمٌ)). ثُمَّ قَالَ: ((إِنِّي لَأُعْطِي الرَّجُلَ، وَغَيْرُهُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْهُ، مَخَافَةَ أَنْ يَكُبَّهُ اللَّهُ فِي النَّارِ)). [بخاري/ الزكاة/ ١٤٠٨]

(سعدی کوڕی ابـو وقـاص) (ﷺ) دەگێڕێتـەوە- پێغەمبـەر (ﷺ) هـەندێ زەکاتی دابەش کرد، وتم: ئـەی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) بەشـی فـلان بـدە، خـۆ بڕواداره... پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: ((یان موسڵمانە)). من سێ جار ئەمەم وت، ئەویش سێ جار دوبارەی کردەوە، پاشان فەرموی: من جاری واهەیە بەشی کەسێك دەدەم، بەڵام کەسی تر هەیە لەو خۆشترم دەوێت کەچی بەشیشی نادەم، چونکە دەترسم خوای گەورە بەڕودا بیخاتە دۆزەخەوە.

## (١٠) زەکاتدان بە نۆ موسڵمان

٥٠٦ـ عَنْ أَنَس بْنِ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: لَمَّا كَانَ يَوْمُ حُنَيْنٍ أَقْبَلتْ هَوَازِنُ وَغَطَفَانُ وَغَيْرُهُمْ بِذَرَارِيِّهِمْ وَنَعَمِهِمْ، وَمَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) يَوْمَئِذٍ عَشَرَةُ آلَافٍ وَمَعَهُ الطُّلَقَاءُ، فَأَدْبَرُوا عَنْهُ حَتَّى بَقِيَ وَحْدَهُ، قَالَ: فَنَادَى يَوْمَئِذٍ نِدَاءَيْنِ لَمْ يَخْلِطْ بَيْنَهُمَا شَيْئًا، قَال: فَالْتَفَتَ عَنْ يَمِينِهِ فَقَالَ: ((يَا مَعْشَرَ الْأَنْصَارِ)). فَقَالُوا: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللَّه أَبْشِرْ نَحْنُ مَعَكَ. قَالَ: ثُمَّ الْتَفَتَ عَنْ يَسَارِهِ فَقَالَ: ((يا مَعْشَرَ الْأَنْصَارِ)). قَالُوا: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللَّه أَبْشِرْ نَحْنُ مَعَكَ. قَالَ: وَهُوَ عَلَى بَغْلَةٍ بَيْضَاءَ، فَنَزَلَ، فَقَالَ: ((أَنَا عَبْدُ اللَّه وَرَسُولُهُ)). فَانْهَزَمَ الْمُشْرِكُونَ، وَأَصَاب رَسُولُ اللَّه (ﷺ) غَنَائِمَ كَثِيرَةً، فَقَسَمَ فِي الْمُهَاجِرِينَ وَالطُّلَقَاءِ، ولَمْ يُعْطِ الْأَنْصَارَ شَيْئًا، فَقَالَتِ الْأَنْصَارُ: إِذَا كَانَتِ الشِّدَّةُ فَنَحْنُ نُدْعَى، وَتُعْطَى الْغَنَائِمُ غَيْرَنا. فَبَلَغَهُ ذَلِكَ فَجَمَعَهُمْ فِي قُبَّةٍ، فقال: ((يَا مَعْشَرَ الْأَنْصَارِ، ما حَدِيثٌ بَلَغَنِي عَنْكُمْ)). فَسَكَتُوا، فقال: ((يَا مَعْشَرَ الْأَنْصَارِ أَمَا تَرْضَوْنَ أَنْ يَذْهَبَ النَّاسُ بِالدُّنْيَا، وَتَذْهَبُونَ بِمُحَمَّدٍ (ﷺ) تَحُوزُونَهُ إِلَى بُيُوتِكُمْ)). قَالُوا: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّه رَضِينَا. قَالَ: فَقَالَ: ((لَوْ سَلَكَ النَّاسُ وَادِيًا، وَسَلَكَتِ الْأَنْصَارُ شِعْبًا، لَأَخَذْتُ شِعْبَ الْأَنْصَارِ)). قَالَ هِشَامٌ -يَعْنِي ابْن

زيد بن انس بن مالك- فَقُلْتُ: يَا أَبَا حَمْزَةَ، أَنْتَ شَاهِدٌ ذَاكَ؟ قَالَ: وَأَيْنَ أَغِيبُ عَنْهُ. [بخاري/ الخمس/ ٢٩٧٨]

(انس کوڕی مالك) (ﷺ) دەڵێ: ڕۆژی غەزای (حنین) تیرەی (هوازن و غطفان) وئەوانی تر هاتن بە خۆیان و ماڵ و منداڵ و ماڵاتیانەوە، ئەو ڕۆژە پێغەمبەر (ﷺ) دەهەزار کەسی لە خزمەتدا بوو جگە لەوانەی کە لەڕزگار کردنی مەککەدا ئازادی کردن، کەچی هەموو پشتیان هەڵکرد و هەڵاتن تەنها خۆی مایەوە، بۆیە ئەو ڕۆژە دوو جار بانگی کرد نێوانیشیان ئەوەندە نەبوو... ڕوی کردە لای ڕاست و فەرمووی: ((ئەی دەستەی پشتیوانان))... ئەوانیش خێرا وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەر (ﷺ) مژدەبێ ئێمە هەموو لە خزمەتداین، ئەوسا ڕوی کردە لای چەپ و هەر فەرمووی: ((ئەی دەستی پشتیوانان)) ئەوانیش خێرا وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەر (ﷺ) مژدەبێ ئێمە هەموو لە خزمەتداین، جا پێغەمبەر (ﷺ) بەسەر پشتی هێسترێکی سپییەوە بوو دابەزی و فەرمووی: ((من بەندە و پێغەمبەری خوام)). ئەوسا بێ باوەڕان تێك شکان، پێغەمبەر (ﷺ) دەستکەوتێکی زۆری بەدەست هێناو دابەشی کرد لەنێوان کۆچبەران و ئازادکراواندا، بەڵام هیچی نەدا بە پشتیوانان، بۆیە پشتیوانان وتیان: لەکاتی تەنگانەدا ئێمە بانگ دەکرێین، کەچی دەستکەوتیش دەدرێ بەکەسانی تر، جا ئەم قسەیە گەیشتەوە بە پێغەمبەر (ﷺ) بۆیە هەموویانی لە ژێر دەوارێکی گومەزیدا کۆکردەوە، ئینجا فەرمووی: ((ئەی کۆمەڵی پشتیوانان، ئەو قسەو باسە چییە کەلای ئێوەوە پێم گەیشتووە؟)). هەموو بێ دەنگ بوون، فەرمووی: ((ئەی کوڕی پشتیوانان، ئایا حەز دەکەن خەڵکی دنیا بەرێت، بەڵام ئێوە محمد (ﷺ) بەرنەوە بۆ ناو ماڵەکانتان)). هەموو وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئێمە بەوە ڕازین. ئینجا فەرمووی: ((ئەگەر خەڵکی ڕێگەی دۆڵێك بگرنەبەر و پشتیوانان ڕێگەیەکی تر، من ڕێگەی پشتیوانان دەگرمە بەر)). جا بە (هیشام ی کوڕی زەید)م وت: ئەی (ابو حمزه) تۆ شایەت و ئامادەی ئەو ڕوداوە بویت؟ لەوەڵامدا وتی: بەڵێ، ئەی چۆن لەوێ نابم؟

٥٠٧- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (ﷺ) قال: بَعَثَ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ (ﷺ) إِلَى رَسُولِ اللَّه (ﷺ) من الْيَمن بِذَهَبَةٍ فِي أَدِيمٍ مَقْرُوظٍ، لَمْ تُحَصَّلْ مِنْ تُرَابِهَا، قَالَ: فَقَسَمَهَا بَيْنَ أَرْبَعَةِ نَفَرٍ: بَيْنَ عُيَيْنَةَ بْنِ حِصْنٍ وَالْأَقْرَعِ بْنِ حَابِسٍ وَزَيْدِ الْخَيْلِ،

والرَّابِعُ: إمَّا علْقمةُ بْنُ عُلاثةَ، وإمَّا عَامرُ بْنُ الطُّفَيْل، فقال رَجُلٌ منْ أصْحَابِه: كُنَّا نَحْنُ أحقَّ بهذَا منْ هؤُلَاء، قال: فبلغ ذلك النَّبِيَّ (ﷺ)، فقال: ((ألَا تأْمَنُوني وَأَنَا أمِينُ منْ في السَّمَاء، يأْتيني خبرُ السَّماء صَبَاحًا ومَساءً)). قال: فقامَ رَجُلٌ غَائرُ الْعَيْنيْن، مُشْرفُ الْوَجْنَتيْن، نَاشِزُ الْجبْهَة، كَثُّ اللِّحْيَة، مَحْلُوقُ الرَّأْسِ، مُشَمَّرُ الْإِزار، فقال: يا رَسُول الله اتَّقِ الله. فقال: ((وَيْلكَ أوَلسْتُ أحَقَّ أهْلِ الْأَرْض أنْ يتَّقي الله)). قال: ثُمَّ ولَّى الرَّجُلُ، فقال خَالدُ بْنُ الْوَليد: يَا رَسُولَ الله ألَا أضْربُ عُنُقَهُ؟ فقال: ((لَا، لعلَّهُ أنْ يَكُون يُصَلِّي)). قال خَالدٌ: وكَمْ منْ مُصَلٍّ يَقُولُ بلسَانه ما ليْس في قلْبه. فقال رسُولُ الله (ﷺ): ((إنِّي لَمْ أُومَرْ أنْ أُنَقِّبَ عَنْ قُلُوبِ النَّاس، ولَا أشُقَّ بُطُونَهُمْ)). قال: ثُمَّ نظرَ إليْه وهُو مُقَفٍّ، فقال: ((إنَّهُ يَخْرُجُ منْ ضِئْضِئِ هذا قَوْمٌ يتْلُون كتاب الله رطْبًا، لا يُجَاوِزُ حَنَاجِرَهُمْ، يَمْرُقُون من الدِّين كما يمْرُقُ السَّهْمُ من الرَّمِيَّة)). قال: أظُنُّهُ قال: ((لئنْ أدْركْتُهُمْ لَأَقْتُلَنَّهُمْ قَتْلَ ثَمُودَ)). [بخاري/ اغلمغازي ٤٠٩٤]

(ابو سعيد الخدرى) (ﷺ) دەڵێ: (عەلى كورِى ابوطالب) لەيەمەنەوە پارچە ئاڵتونێكى لە پارچە چەرمێكى خۆشكراو بەجەوت رەوانە كرد بۆ پێغەمبەر (ﷺ) كەهێشتا پاڵفتە نەكرابوو لە خۆڵەكەى ئەويش بەشى كرد لەنێوان چوار كەسدا (عينەى كورِى بدر، اقرع ى كورِى حابس، زيد الخيل) چوارهەمەكەشيان يان (علقمەى كورِى علانە، يان عامرى كورِى طفيل) بوو يەكێك لە هاوەڵان ووتى: ئێمە لە پێشتر بووين ئابەوە تا ئەوانە... ئەو قسەيە گەيشتەوە بە پێغەمبەر (ﷺ) بۆيە فەرمووى: ((باشە، ئێوە متمانە بەمن ناكەن، لەكاتێكدا من متمانەپێكراوى ئەو زاتەم كە لەسەروو ئاسمانەكانەوەيە، بەيانيان و ئێواران هەواڵم لە ئاسمانەوە بۆ دێت)). كەچى پياوێكى چاوبەقوڵاچووى دەموچاو قوپاوى ناوچاو قۆقزى ريش پرِى سەرتاشراوى چاك هەڵكراو وتى: ئەى پێغەمبەرى خوا (ﷺ) لە خوا بترسە!! فەرمووى: ((واوەيلا بۆ تۆ، مەگەر من لە هەموو دانيشتوانى سەرزەوى لەپێشتر نيم بۆ ئەوەى لە خوابترسم؟)). كابرا روى وەرگێراو رۆيشت...(خاليدى كورِى وەليد) وتى: ئەى پێغەمبەرى خوا ئەوە ملى نەپەرێنم؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووى: ((نەخێر، چونكە لەوانەيە نوێژ بكات)). خالد وتى: چەندەها نوێژگەر هەيە كەبەزمان شتێك دەڵێن كەلە دڵياندا نىيە... پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووى: ((من فەرمانم پىێ نەدراوە دڵى خەڵكى

بكەمەوە و سكيان هەڵبدڕم))، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) سەیری كابری كرد كە ڕوی وەرچەرخان و ڕۆی. فەرموی: ((لەنەوەی ئەمە كەسانێك دەبن كە زمانیان پاراوە بە دەوركردنەوەی قورئـان، بەڵام لە گەرویان ناترازێت، لـەدین دەردەچـن وەك چـۆن تـیر لەلاشەی نێچـیر دەردەچـێ)). وابـزانم فەرمووشـی: ((ئەگـەر پێیـان گەیشتم وەكو قەومی (ثمود) هەمویان لەناو دەبەم)).

## (١١) زەكات حەڵاڵ نیيە بۆ پێغەمبەر و بنەماڵەكەی

٥٠٨ـ عن أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قال: أَخَذَ الْحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ (رضي الله عنه) تَمْرَةً مِنْ تَمْرِ الصَّدَقَةِ، فَجَعَلَهَا فِي فِيهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((كِخْ كِخْ، ارْمِ بِهَا، أَمَا عَلِمْتَ أَنَّا لَا نَأْكُلُ الصَّدَقَةَ)). [بخاري/ الزكاة/ ١٤٢٠]

(ابـو هريـره) (رضي الله عنه) دەڵـێ: (حسن كوڕی عـەلی) (رضي الله عنه) دەنكـە خورمايـەكی لـە خورمای زەكات هەڵگرت و نایـەدەمی، پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: ((كخـە، كخـە، فڕێی بدە، ئەی نازانی زەكات بۆ ئێمە حەڵاڵ نیيە؟)).

## (١٢) نابێ ئال و بەیتی پێغەمبەر (ﷺ) كارمەندی كۆكردنەوەی زەكات بن.

٥٠٩ـ عن عَبْدَ الْمُطَّلِبِ بْنَ رَبِيعَةَ بْنِ الْحَارِثِ قَالَ: اجْتَمَعَ رَبِيعَةُ بْنُ الْحَارِثِ وَالْعَبَّاسُ بْنُ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ فَقَالَا: وَاللَّهِ لَوْ بَعَثْنَا هَذَيْنِ الْغُلَامَيْنِ -قَالَ: لِي وَلِلْفَضْلِ بْنِ عَبَّاسٍ- إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَكَلَّمَاهُ، فَأَمَّرَهُمَا عَلَى هَذِهِ الصَّدَقَاتِ، فَأَدَّيَا مَا يُؤَدِّي النَّاسُ وَأَصَابَا مِمَّا يُصِيبُ النَّاسُ، قَالَ: فَبَيْنَمَا هُمَا فِي ذَلِكَ جَاءَ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ فَوَقَفَ عَلَيْهِمَا، فَذَكَرَا لَهُ ذَلِكَ فَقَالَ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ (رضي الله عنه): لَا تَفْعَلَا، فَوَاللَّهِ مَا هُوَ بِفَاعِلٍ. فَانْتَحَاهُ رَبِيعَةُ بْنُ الْحَارِثِ فَقَالَ: وَاللَّهِ مَا تَصْنَعُ هَذَا إِلَّا نَفَاسَةً مِنْكَ عَلَيْنَا، فَوَاللَّهِ لَقَدْ نِلْتَ صِهْرَ رَسُولِ اللَّهِ (؟)فَمَا نَفِسْنَاهُ عَلَيْكَ. قَالَ عَلِيٌّ: أَرْسِلُوهُمَا. فَانْطَلَقَا، وَاضْطَجَعَ عَلِيٌّ (رضي الله عنه)، قَالَ: فَلَمَّا صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) الظُّهْرَ سَبَقْنَاهُ إِلَى الْحُجْرَةِ، فَقُمْنَا عِنْدَهَا حَتَّى جَاءَ، فَأَخَذَ بِآذَانِنَا، ثُمَّ قَالَ: ((أَخْرِجَا مَا تُصَرِّرَانِ)). ثُمَّ دَخَلَ وَدَخَلْنَا عَلَيْهِ، وَهُوَ يَوْمَئِذٍ عِنْدَ زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ. قَالَ: فَتَوَاكَلْنَا الْكَلَامَ، ثُمَّ تَكَلَّمَ أَحَدُنَا فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنْتَ أَبَرُّ النَّاسِ وَأَوْصَلُ النَّاسِ، وَقَدْ بَلَغْنَا النِّكَاحَ، فَجِئْنَا لِتُؤَمِّرَنَا عَلَى بَعْضِ هَذِهِ الصَّدَقَاتِ، فَنُؤَدِّيَ إِلَيْكَ كَمَا يُؤَدِّي النَّاسُ، وَنُصِيبَ كَمَا يُصِيبُونَ. قَالَ: فَسَكَتَ طَوِيلًا حَتَّى أَرَدْنَا أَنْ نُكَلِّمَهُ، قَالَ: وَجَعَلَتْ زَيْنَبُ تُلْمِعُ عَلَيْنَا مِنْ وَرَاءِ الْحِجَابِ: أَنْ لَا تُكَلِّمَاهُ،

قال: ثُمَّ قال: ((إنَّ الصَّدقةَ لا تنْبغِي لآلِ مُحَمَّدٍ، إنَّمَا هِيَ أَوْساخُ النَّاسِ، ادْعُوَا لي مَحْمِيَةَ -وكَانَ على الْخُمُسِ- ونَوْفَل بْنَ الْحارِثِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ)). قال: فجاءَاهُ، فقال لمَحْمِيةَ: ((أَنْكِحْ هَذَا الْغُلَامَ ابْنَتَك)) -للْفضْلِ بْنِ عَبَّاسٍ- فَأَنْكَحَهُ، وَقَالَ لنَوْفلِ بْنِ الْحارثِ: ((أَنْكِحْ هَذا الْغُلامَ ابْنَتَكَ)) -لي- فأَنْكحَني، وقَالَ لِمحْمِيةَ: ((أَصْدِقْ عَنْهُما مِنَ الْخُمُسِ كذَا وكذَا)). قَالَ الزُّهْرِيُّ: ولَمْ يُسَمِّهِ لي.

(عبدالمطلب) ی كوڕی (ربيعه)ی كوڕی (حارث) دەڵێ: (ربيعەی كوڕی حارث) و (العباس)ی كوڕی (عبدالمطلب) كۆبونەوە، وتيان بەخوا گەر ئێمەش ئەو دوو كوڕە بنێرين: -من و فەضلی كوڕی عباس- بۆ خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) قسەی لەگەڵ بكەن، بەڵكو بيانكات بە كارمەندی زەكات و خەڵكی چی دەكات ئەوانيش بيكەن و خەڵك چی دەست دەكەوێت ئەوانيش دەستيان بكەوێت، لەو كاتەدا ئەوان لەو گفتوگۆيەدا بوون علی كوڕی ابو طالب (ﷺ) هاتە لايان وەستا، ئەوانيش ئەم ڕاز و نيازەيان بۆ باسكرد، وتی: كاری وا مەكەن بەخوا شتی واناكات، (ربيعه)ی كوڕی حارث لەڕويدا وەستا و وتی: تۆ بۆيە وادەكەيت حەسودی بە ئێمە دەبەيت، سوێند بەخوا تۆ بويت بە زاوای پێغەمبەر (ﷺ) ئێمە حەسوديمان بەتۆ نەبرد. عەلی وتی: بيياننێرن، ئەوان ڕۆيشتن و عەليش ڕاكشا (ﷺ)، عبدالمطلب دەڵێ: كاتێ پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی نيوەڕۆی كرد پێشی كەوتين و لای حوجرەكەيدا وەستاين، هەتا هات، گوێی گرتين و فەرمووی: ((چی لە دڵتانداية دەری بڕن)). ئەو چوە ژورەوە و ئێمەش بەدوايدا، لەو ڕۆژەدا لای زەينەبی كچی (جحش) بوو، ئێمەش هەريەكەمان بەتەما بوو ئەوی تر قسە بكات، دواجار يەكێكمان هاتەگۆ و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تۆ چاكترين كەس و، خزم دۆستت ترين كەسی، ئێمەيش گەورەبوين و كاتی ژنهێنانمان هاتووە، هاتوين بمانكەيت بە كارمەندی هەندێ لەم خێر و زەكاتە، خەڵك چيت بۆ دەكات ئێمەش دەيكەين و، خەڵك چی دەست بكەوێت، ئێمەش دەستمان بكەوێت.. پێغەمبەر (ﷺ) ماوەيەكی زۆر بێ دەنگ بوو هەتا ويستمان قسەی لەگەڵ بكەينەوە، زەينەبيش لەپشتی پەردەكەوە ئاماژەی بۆ دەكردين: قسەی لەگەڵ مەكەن، لە دوايدا فەرموی: ((زەكات ناگونجێ بۆ بنەماڵەی محمد چونكە چڵكی [سامانی] خەڵكيە (محميه) و (نوفل)ی كوڕی (حارث)ی (كوڕی عبدالمطلب)م بۆ بانگ كەن كەلەو ڕۆژەدا

(محمية) کارمەندی پێنج یەکی دەستکەوتەکانی جەنگ بووە دەڵێ: هەردوکیان هاتن بۆ خزمەتی، بە (محمية)ی فەرمو: ((کچکەت مارە بکە لەم کورە)) واتە لە فضلی کوڕی عباس بە (نوفل ی کوڕی حارث)یشی فەرموو: ((کچەکەت مارە بکە لەم کوڕە)). واتە لەمن، لێی مارەکردم ئینجا بە (محمية)ی فەرموو: لەپێنج یەك ئەوەندە ئەوەندە مارەیی بدە لە بری هەردوکیان (زهری راوی) دەڵێ: ئەندازەکەی بۆ باس نەکردم.

## (١٣) دیاریی بۆ بنەماڵەی پێغەمبەر (ﷺ) حەڵاڵە

٥١٠- عن أَنسَ بْنَ مَالكٍ (رضي الله عنه) قَالَ: أَهْدَتْ بَرِيرَةُ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) لَحْمًا تُصُدِّقَ بِهِ عَلَيْهَا، فَقَالَ: ((هُوَ لَهَا صَدَقَةٌ وَلَنَا هَدِيَّةٌ)). [بخاري/ الزكاة/ ١٤٢٣،١٤٢٤]

(انس ی کوڕی مالك) دەڵێ: (بریرە) ئەو گۆشتەی کەبەخێر بۆی هاتبوو بەدیاری بردی بۆ پێغەمبەر ﷺ، ئەویش فەرمووی: ((ئەو گۆشتە بۆ ئەو خێرە، بەلام بۆ ئێمە دیاری‌یە)).

٥١١- عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ: بَعَثَ إِلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بِشَاةٍ مِنَ الصَّدَقَةِ، فَبَعَثْتُ إِلَى عَائِشَةَ (رضي الله عنها) مِنْهَا بِشَيْءٍ، فَلَمَّا جَاءَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِلَى عَائِشَةَ قَالَ: ((هَلْ عِنْدَكُمْ شَيْءٌ)). قَالَتْ: لَا، إِلَّا أَنَّ نُسَيْبَةَ بَعَثَتْ إِلَيْنَا مِنَ الشَّاةِ الَّتِي بَعَثْتُمْ بِهَا إِلَيْهَا. قَالَ: ((إِنَّهَا قَدْ بَلَغَتْ مَحِلَّهَا)). [بخاري/ الزكاة/ ١٤٢٣،١٤٢٤]

(أم عطية) (رضي الله عنها) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) مەڕێکی زەکاتی بۆ ناردم، منیش هەندێکیم لێنارد بۆ عائشە (رضي الله عنها). کە پێغەمبەر (ﷺ) سەردانی عائشەی کرد فەرمووی: ((ئەوە هیچتان لایە؟)) وتی: نەخێر، ئەوە نەبێ کە (نسیبە) بۆی ناردوین لەو مەڕەی کەتۆ بۆت ناردبوو. فەرمووی: ((ئەو مەڕە گەیشتۆتە شوێنی شیاوی خۆی)).

[واتە ئێمە وەکو دیاریەك وەرمان گرتووە]

## (١٤) پێغەمبەر (ﷺ) زەکاتی وەرنەگرتووە

٥١٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كَانَ إِذَا أُتِيَ بِطَعَامٍ سَأَلَ عَنْهُ، فَإِنْ قِيلَ: هَدِيَّةٌ، أَكَلَ مِنْهَا. وَإِنْ قِيلَ: صَدَقَةٌ، لَمْ يَأْكُلْ مِنْهَا. [بخاري/ الهبة/ ٢٤٣٧]

(ابو هريرە) (رضي الله عنه) دەڵێ: ئەگەر پێغەمبەر (ﷺ) خواردنێکی بۆ بهاتایە پرسیاری دەکرد، ئەگەر بوترایە دیاری‌یە، ئەوە لێی دەخوارد، ئەگەر بوترایە: خێرو زەکاتە لێی نەدەخوارد.

## (١٥) سەرفترە لەخورماو جۆ

٥١٣ـ عَنْ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) فَرَضَ زَكَاةَ الْفِطْرِ مِنْ رَمَضَانَ عَلَى النَّاسِ: صَاعًا مِنْ تَمْرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ، عَلَى كُلِّ حُرٍّ أَوْ عَبْدٍ، ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى مِنَ الْمُسْلِمِينَ. [بخاري/ صدقة الفطر/ ١٤٣٧]

(عبدالله ی کوڕی عمر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) زەکاتی سەرفترەی فەرزکرد لەڕەمەزاندا لەسەر خەڵکی، مەنێك خورما، یان مەنێك جۆ، لەسەر هەموو کەسێکی ئازاد یان بەندە، نێر بێت یان مێ لەموسڵمانان.

## (١٦) سەرفترە لەخۆراك و کەشك و مێوژ

٥١٤ـ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (ﷺ) قَالَ: كُنَّا نُخْرِجُ إِذْ كَانَ فِينَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) زَكَاةَ الْفِطْرِ عَنْ كُلِّ صَغِيرٍ وَكَبِيرٍ، حُرٍّ أَوْ مَمْلُوكٍ، صَاعًا مِنْ طَعَامٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ أَقِطٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ زَبِيبٍ، فَلَمْ نَزَلْ نُخْرِجُهُ حَتَّى قَدِمَ عَلَيْنَا مُعَاوِيَةُ بْنُ أَبِي سُفْيَانَ حَاجًّا أَوْ مُعْتَمِرًا، فَكَلَّمَ النَّاسَ عَلَى الْمِنْبَرِ، فَكَانَ فِيمَا كَلَّمَ بِهِ النَّاسَ أَنْ قَالَ: إِنِّي أَرَى أَنَّ مُدَّيْنِ مِنْ سَمْرَاءِ الشَّامِ تَعْدِلُ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ. فَأَخَذَ النَّاسُ بِذَلِكَ. قَالَ أَبُو سَعِيدٍ: فَأَمَّا أَنَا فَلَا أَزَالُ أُخْرِجُهُ كَمَا كُنْتُ أُخْرِجُهُ أَبَدًا مَا عِشْتُ. [بخاري/ صدقة الفطر/ ١٤٣٧]

(ابو سعيد الخدری) (ﷺ) دەڵێ: لەکاتێکدا پێغەمبەری خوا (ﷺ)، لەناوماندا بوو سەرفترەمان دەردەکرد بۆ هەموو کەسێکی بچوك و گەورە، ئازاد یان کۆیلە، مەنێك لەخۆراك، یان مەنێك لەکەشك، یان مەنێك لەجۆ، یان مەنێك لەخورما، یان مەنێك لەمێوژ. بەم شێوەیە دەرمان دەکرد هەتا (معاویەی کوڕی ابو سوفیان) هات بۆ ناومان بۆ حەج یان عەمرە، چووە سەر دوانگەو قسەی بۆ خەڵك کرد، یەکێك لەقسەکانی ئەوە بوو وتی: من پێم وایە دوو مشت گەنمی شام یەکسانە لەگەڵ مەنێك خورمادا، دوای ئەوە ئیتر خەڵك بەقسەی ئەویان کرد، (ابو سعید) دەڵێ: بەڵام من هەمیشە سەرفترە دەردەکەم وەك ئەوسا هەتا لەژیاندام.

## (١٧) دەرکردنی سەفیترە پێش نوێژی جەژن

٥١٥ـ عَنْ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) أَمَرَ بِزَكَاةِ الْفِطْرِ أَنْ تُؤَدَّى قَبْلَ خُرُوجِ النَّاسِ إِلَى الصَّلَاةِ. [بخاري/ صدقة الفطر/ ١٤٣٨]

(عبــدالله كــوڕی عمــر) (ﷺ) دەڵــێ: پێغەمبــەری خــوا (ﷺ) فــەرمانیدا بەبەخشینی زەكاتی سەرفترە پێش ئەوەی خەڵك دەربچن بۆ نوێژی جەژن.

## (١٨) هاندان بۆ خێركردن

٥١٦ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: ((مَا يَسُرُّنِي أَنَّ لِي أُحُدًا ذَهَبًا، تَأْتِي عَلَيَّ ثَالِثَةٌ وَعِنْدِي مِنْهُ دِينَارٌ، إِلَّا دِينَارٌ أَرْصُدُهُ لِدَيْنٍ عَلَيَّ)).

(ابوهريــره) (ﷺ) دەڵــێ: پێغەمبــەر (ﷺ) فەرمویــەتی: ((پێــم خــۆش نیــیە بەئەندازەی كێوی (احد) ئاڵتونم لابێت، سێ ڕۆژ بەسەرمدا بێت و دینارێكم لا مابێت، مەگەر ئەو دینارەی كەبۆ قەرزێكم دانابێ كەلەسەرمە)).

## (١٩) هاندان بۆ بەخشین

٥١٧ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) -يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ (ﷺ)- قَالَ: ((قَالَ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: يَا ابْنَ آدَمَ أَنْفِقْ أُنْفِقْ عَلَيْكَ. وَقَالَ: يَمِينُ اللَّهِ مَلْأَى -وَقَالَ ابْنُ نُمَيْرٍ: مَلْآنُ -سَحَّاءُ لَا يَغِيضُهَا شَيْءٌ، اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ)). [بخاري/ التفسير/ ٤٤٠٧]

(ابــو هريــره) (ﷺ) دەڵــێ: پێغەمبــەر (ﷺ) فەرمویــەتی: ((خــوای گــەورە دەفەرموێت: ئەی نەوەی ئادەم تۆ ببەخشە منیش پێت دەبەخشم)) هەروەها فەرمویەتی: ((دەستی ڕاستی [بەخشندەیی] خوای میهرەبان هەمیشە پڕە)).

(إبن نمير) دەڵێ: پڕەو بەخوڕەمیش لەشەوو ڕۆژدا دەبارێت و هیچ شتێك كەمی ناكاتەوە.

## (٢٠) ڕۆژێك دێت كەس خێرو زەكات وەرناگرێت

٥١٨ـ عن حَارِثَةَ بْنَ وَهْبٍ (ﷺ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: ((تَصَدَّقُوا، فَيُوشِكُ الرَّجُلُ يَمْشِي بِصَدَقَتِهِ، فَيَقُولُ الَّذِي أُعْطِيَهَا: لَوْ جِئْتَنَا بِهَا بِالْأَمْسِ قَبِلْتُهَا، فَأَمَّا الْآنَ فَلَا حَاجَةَ لِي بِهَا، فَلَا يَجِدُ مَنْ يَقْبَلُهَا)). [بخاري/ الزكاة/ ١٣٤٥]

(حارثــە ی كــوڕی وهــب) دەڵــێ: گوێــم لــە پێغەمبــەری خــوا بــوو (ﷺ) دەیفەرموو: ((خێر بكەن نزیكە كەسێك بگەڕێت تا خێرەكەی بدات بەكەسێك، كەچی ئەو كەسەی دەیەوێت پێی بدات دەڵــێ: ئەگــەر دوێنــێ بتهێنایــە وەرم دەگرت، بەڵام ئێستە پێویستم پێی نییە. ئیتر كەسی دەست ناكــەوێت لێــی وەربگرێت))

(کریـب) لەلایـەن (ام الفضـل بنـت حـارث)ەوە ڕەوانـە کـراوە بـۆلای (معاویـە) (ﷺ) لەشام، ئەویش دەڵێ: گەیشتمە شام و کارەکەیم ئەنجامدا.. ڕەمەزان هات و من لـە شـام بووم.. شـەوی جومعـە مـانگم بینـی پاشـان لـە کۆتـایی مـانگدا گەڕامەوە بۆ مەدینە، (عبدالله ی کوڕی عباس) باسی مانگی کردو لێی پرسیم: کەی مانگتان بینی؟ وتم: شەوی جومعە بینیمان، وتـی: تـۆ خـۆت بینیت؟ وتم: بەڵێ، خەڵکیش بینیان، هەمووشیان بەڕۆژووبوون، (معاویـە)ش بـەڕۆژو بـوو.. وتـی: بـەڵام ئێمە شـەوی شـەممە بینیمـان، بـەردەوامیش بـەڕۆژو دەبـین هـەتا سییەکە تەواو دەکەین، یان مانگ دەبینین، منیش وتم: باشە بینینـی معاویـەو ڕۆژو گرتنی بەس نییە؟ وتـی: نەخێر پێغەمبەر (ﷺ) ئاوا فەرمانی پێداوین.

## ( ٨ ) دومانگەکەی جەژن

٥٧٢ـ عن أَبِي بَكْرَةَ (ﷺ) عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَـال: ((شَـهْرَا عيـدٍ لـا يَنْقُصَانِ، رَمَضَانُ وَذُو الْحِجَّةِ)). [بخاري/ الصوم/ ١٨١٣]

(ابوبکـرة) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی: ((ڕەمـەزان و ذوالحجـة دوو مانگن کەم ناکەن)) [لەپاداشتدا ئەگەر ٢٩ڕۆژیش بن ].

## ( ٩ ) پارشێوکردن

٥٧٣ـ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((تَسَحَّرُوا فَإِنَّ فِي السَّحُورِ بَرَكَةً)). [بخاري/ الصوم/ ١٨٢٣]

(انـس) (ﷺ) پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی: (( پارشـێو بکـەن چونکـە لـە پارشێودا بەرەکەت هەیە)).

## ( ١٠ ) دواختسنی پارشێو

٥٧٤ـ عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ (ﷺ) قَالَ: تَسَحَّرْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) ثُمَّ قُمْنَا إِلى الصَّلَاةِ، قُلْتُ: كَمْ كَانَ قَدْرُ مَا بَيْنَهُمَا؟ قَالَ: خَمْسِينَ آيَةً. [بخاري/ الصوم/ ١٨٢١]

(زیـدی کـوڕی ثـابت) (ﷺ) دەڵـێ: پارشێومان کـرد لـە خزمـەت پێغەمبـەردا (ﷺ)، پاشان هەستاین بۆ نوێژ، منیش وتم: چەند نێوانیان بوو؟ وتـی: پـەنجا ئایەت. [واتە خوێندنەوەی ٥٠ ئایەتی مامناوەندی بەلەسەر خۆیی]

## (١١) دەستگرتنەوە لە خواردن

٥٧٥- عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((لَا يَغُرَّنَّكُمْ مِنْ سَحُورِكُمْ أَذَانُ بِلَالٍ، وَلَا بَيَاضُ الْأُفُقِ الْمُسْتَطِيلُ هَكَذَا، حَتَّى يَسْتَطِيرَ هَكَذَا)). وَحَكَاهُ حَمَّادٌ بِيَدَيْهِ، قَالَ: يَعْنِي مُعْتَرِضًا.

(سمـــرەی کـــوڕی جنـــدب) (رضي الله عنه) دەڵـــێ: پێغەمبـــەر (ﷺ) فەرموویـــەتی: ((بەبانگەکەی بلال دەست مەگرنەوە لە خواردن... هەروەها ئەو سپیاییەش کەبەرەو ئاسمان درێژ بۆتەوە هەتا بەکەناری ئاسۆدا سپیایی بڵاودەبێتەوە)) حماد بەهەردوو پەلی بەڕاست و چەپدا ئاماژەی پێکرد.

## (١٢) گوتەی پەروردگار

﴿حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ﴾

٥٧٦- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (رضي الله عنه) قَالَ: [لَمَّا] نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ: ﴿وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ﴾ [البقرة: ١٨٧] قَالَ: فَكَانَ الرَّجُلُ إِذَا أَرَادَ الصَّوْمَ رَبَطَ أَحَدُهُمْ فِي رِجْلَيْهِ الْخَيْطَ الْأَسْوَدَ وَالْخَيْطَ الْأَبْيَضَ، فَلَا يَزَالُ يَأْكُلُ وَيَشْرَبُ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُ رِئْيُهُمَا، فَأَنْزَلَ اللَّهُ بَعْدَ ذَلِكَ: ﴿مِنَ الْفَجْرِ﴾ فَعَلِمُوا أَنَّمَا يَعْنِي بِذَلِكَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ. [بخاري/ الصوم/ ١٨١٨]

(سـهلی کـوڕی سـعد) (رضي الله عنه) دەڵـــێ: کـاتێ ئـەم ئایەتـە دابـەزی کـە ئەمـە واتاکەیەتی: (بخۆن و بخۆنەوە هەتا تـاڵی سـپی لـەتاڵی ڕەش جیادەکەنـەوە) البقرە/١٨٧ پیاوی واهەبوو کە ئەیوسیت بەڕۆژو بێ پەتێکی ڕەش و پەتێکی سـپی دەبەسـت بـە قاچیـەوە، خـواردن و خواردنـەوەی دەخـوارد هـەتا بـۆی دەردەکـەوت (کامیـان ڕەشـە و کامیـان سـپییە)، پاشـان خـوای گـەورە ﴿لەبەرەبەیان﴾ی دابەزان، ئەو کاتە زانیان مەبەست شەو و ڕۆژە.

## (١٣) بانگی بیلال

٥٧٧- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضي الله عنهما) قَالَ: كَانَ لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) مُؤَذِّنَانِ: بِلَالٌ، وَابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ الْأَعْمَى، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((إِنَّ بِلَالًا يُؤَذِّنُ بِلَيْلٍ، فَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يُؤَذِّنَ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ)). قَالَ: وَلَمْ يَكُنْ بَيْنَهُمَا إِلَّا أَنْ يَنْزِلَ هَذَا وَيَرْقَى هَذَا. [بخاري/ الأذان/ ٥٩٢]

(عبـدالله ی کـوڕی عمـر) (رضي الله عنهما) دەڵـــێ: پێغەمبـــەر (ﷺ) دوو بـــانگوێژی هـەبوو...(بـلال وابـن ام مکتـوم)ی نابینـا، پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: (( بـلال

لەشەودا بانگ دەدا، بخۆن و بخۆنەوە هەتا ابن ام مكتوم بانگ دەدات)). عبدالله دەڵێ: نێوانیان هەر ئەوەندە بوو کە ئەمیان دابەزێ و ئەویان سەرکەوێت.

## (١٤) ڕۆژوی ئەو کەسەی لەشی گرانە

٥٧٨ـ عَنْ عائشَةَ وأمِّ سلمَةَ (رضي الله عنهما) زوْجَي النَّبيِّ (ﷺ) أنـهُمَا قالتَـا: إنْ كـانَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) لَيُصْبِحُ جُنُبًا -منْ جماعٍ غَيْر احْتلَامٍ- في رَمَضَانَ، ثُمَّ يَصُومُ. [بخاري/ الصوم/ ١٨٣٠]

(عائشه و ام سلمه) (رضي الله عنهما) دوهاوسەرەکەی پێغەمبەر (ﷺ) وتویانە: (جاری واهەبوو) پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆژی لێ دەبۆوە لەشی گران بوو-بەهۆی چونە لای هاوسەرەوە- لە ڕەمەزاندا کەچی بەردەوامیش دەبوو لەسەر ڕۆژوەکەی.

٥٧٩ـ عَنْ عَائشَةَ (رضي الله عنها): أنَّ رجُلًا جَاءَ إلَى النَّبيِّ (ﷺ) يَسْتَفْتيه وهيَ تسْمَعُ منْ وَرَاء الْبَاب، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّه تُدْركُني الصَّلَاةُ وَأنَا جُنُبٌ، أفَأصُومُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): ((وَأنَا تُدْركُني الصَّلَاةُ وَأنَا جُنُبٌ فَأصُومُ)). فقَالَ: لسْتَ مثْلَنَا يَا رَسُولَ اللَّه، قَدْ غَفَرَ اللَّهُ لَكَ مَا تقَدَّمَ منْ ذَنْبكَ وَمَا تَأخَّرَ. فَقَالَ: ((وَاللَّه إنِّي لَأرْجُو أنْ أكُونَ أخْشَاكُمْ للَّه، وَأعْلَمَكُمْ بمَا أتَّقي)).

(عائشه) (رضي الله عنها) دەڵێ: پیاوێك هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) پرسیاری لێ دەکرد ئەویش لەپشتی دەرگاکەوە گوێی لێ بوو، پرسی: ئەی پێغەمبەری خوا جاری واهەیە کاتی نوێژ دێت و من لەشم گرانە، ئایا بەڕۆژوبم؟ پێغەمبەریش (ﷺ) لەوەڵامیدا فەرمووی: ((منیش [جاری وا هەیە] کاتی نوێژ دێت و لەشم گرانەو کەچی بەڕۆژوش دەبم... [پیاوەکە] وتی: ئەی پێغەمبەری خوا: تۆ وەکو ئێمە نیت!! چونکە تۆ خوا لە گوناهانی سەرەتا و کۆتایت خۆش بووە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((سوێند بەخوا، من هیوام وایە لەهەموتان زیاتر لەخوا ترس بم و شارەزاتر بم کەچۆن خۆم بپارێزم لە سزای خوا)).

## (١٥) ڕۆژوەوان و لە بیرچوون

٥٨٠ـ عَنْ أبي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): ((مَنْ نَسيَ وهُوَ صَائمٌ، فَأكَلَ أوْ شَربَ، فَلْيُتمَّ صَوْمَهُ، فَإنَّمَا أطْعَمَهُ اللَّهُ وَسَقَاهُ)). [بخاري/ الصوم/ ١٨٣١]

(ابـو هریـره) (رضي الله عنه) دەڵـێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویـەتی: (( ئـەوەی لـەبیری نەبوو کە بەڕۆژوە و خواردن یان خواردنەوەی خوارد باڕۆژوەکەی تەواوبکات، چونکە ئەوە خوا خواردن و خواردنەوەی داوەتێ)).

## ( ١٦ ) ڕۆژوەوان و دەعوەت

٥٨١ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عن النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((إِذَا دُعِيَ أَحَدُكُمْ إِلَى طَعَامٍ، وَهُوَ صَائِمٌ، فَلْيَقُلْ: إِنِّي صَائِمٌ)).

(ابو هريره) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((ئەگەر کەسێکتان دەعوەت کرا بۆنان خواردن و بەڕۆژو بوو بابڵێ: من بەڕۆژوم)).

## ( ١٧ ) کەفارەتی سەرجێیی لەڕەمەزاندا

٥٨٢ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قال: جاءَ رجُلٌ إِلى النَّبِيِّ (ﷺ) فقَالَ: هَلَكْتُ يَا رَسُول اللَّه، قال: ((ومَا أهْلكك)). قَالَ: وَقَعْتُ على امْرَأَتِي فِي رَمَضَانَ، قَالَ: ((هَلْ تَجِدُ مَا تُعْتِقُ رَقَبَةً)). قَالَ: لَا، قَالَ: ((فَهَلْ تَسْتَطِيعُ أَنْ تَصُومَ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ)). قالَ: لَا، قَالَ: ((فَهلْ تجدُ مَا تُطْعِمُ ستِّينَ مِسْكِينًا)). قَالَ: لَا، قَالَ: ثُمَّ جَلسَ فَأُتِيَ النَّبِيُّ (ﷺ) بعرَقٍ فيه تَمْرٌ، فَقَالَ: ((تَصَدَّقْ بِهَذَا)). قَالَ: أَفْقَرَ مِنَّا؟ فمَا بَيْنَ لَابَتَيْهَا أَهْلُ بَيْتٍ أَحْوَجُ إليْه منَّا. فَضَحِكَ النَّبِيُّ (ﷺ) حَتَّى بَدَتْ أَنْيَابُهُ، ثُمَّ قَالَ: ((اذْهَبْ فأَطْعِمْهُ أَهْلَكَ)). [بخاري/ الصوم/ ١٨٣٤]

(ابو هريره) (ﷺ) دەڵێ: پیاوێك هات بۆلای پێغەمبەر وتی: تیاچووم ئەی پێغەمبەری خوا، ئەویش فەرمووی: ((چی تۆی تیا بردووە؟!)). کابرا وتی: لەڕەمەزاندا سەرجێیم لەگەڵ هاوسەرەکەمدا کردوە... ئەویش فەرمووی: ((ئایا دەتوانیت بەندەیەك ئازاد بکەیت؟)) کابرا وتی: نەخێر، فەرمووی: (( ئایا دەتوانیت دومانگ لەسەر یەك بەڕۆژوبیت؟)) کابرا وتی: نەخێر، فەرموی: ((ئەی دەتوانیت نانی شەست هەژار بدەیت؟)). کابرا وتی: نەخێر، ئینجا کابرا دانیشت، پێغەمبەر (ﷺ) زەمبیلەیەك خورمای بۆهات و فەرمووی: ((ئائەمە بکە بەخێر))، کابرا وتی: جا بۆ لەخۆمان هەژارتر هەیە؟ ئەم پەڕ و ئەوپەڕی شار لە ئێمە هەژارتری تیا نی‌یە کە پێویستی بەوە بێت!! ئەوسا پێغەمبەر (ﷺ) پێکەنی تا دانە پیرۆزەکانی دەرکەوت، پاشان فەرمووی: ((دەی بچۆ خێزانەکەتی پێ تێربکە)).

٥٨٣ـ عنْ عَائشَةَ (ﷺ) أَنَّهَا قَالَتْ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّه (ﷺ) فَقَالَ: احْتَرَقْتُ. قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): ((لِمَ)). قَالَ: وَطِئْتُ امْرَأَتِي فِي رَمَضَانَ نَهَارًا، قَالَ: ((تَصَدَّقْ تَصَدَّقْ)). قَالَ: مَا عِنْدِي شَيْءٌ، فَأَمَرَهُ أَنْ يَجْلِسَ. فَجَاءَهُ عَرَقَانِ فِيهِمَا طَعَامٌ، فَأَمَرَهُ [رَسُولُ اللَّه (ﷺ)] أَنْ يَتَصَدَّقَ بِهِ. [بخاري/ المحاربين/ ٦٤٣٦]

(دایکە عائشە) (ﷺ) دەڵێ: پیاوێك هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) وتی: سوتام!! پێغەمبەری خوایش (ﷺ) فەرمووی: ((بۆچی؟!)) کابرا وتی: لە ڕۆژی ڕەمەزاندا لەگەڵ هاوسەرەکەمدا تێکەڵ بووم.. ئەویش فەرمووی: ((خێربکە، خێربکە)).. کابرا وتی: جانیمە.. ئینجا فەرمانی پێدا کە دابنیشێت، دوزەمبیلە خۆراکی بۆهات، پێغەمبەر (ﷺ) پێی بەخشی و فەرمووی: ((بڕۆ بیکە بەخێر)).

## (١٨) ماچ کردن بۆ ڕۆژووەوان

٥٨٤ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يُقَبِّلُ وَهُوَ صَائِمٌ، وَيُبَاشِرُ وَهُوَ صَائِمٌ، وَلَكِنَّهُ أَمْلَكُكُمْ لِإِرْبِهِ. [بخاري/ الصوم/ ١٨٢٦]

(دایکە عائشە) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ماچی دەکرد، لەکاتێکدا بەڕۆژو بوو... پێستی بە پێستیان دەکەوت وبەڕۆژوو بوو بەلاَم لەهەمووتان ویستی بەهێزتر و خۆگرتر بوو.

## (١٩) کەخۆرئاوا بوو ڕۆژودەشکێنرێت

٥٨٥ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى (ﷺ) قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فِي سَفَرٍ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ، فَلَمَّا غَابَتِ الشَّمْسُ قَالَ: ((يَا فُلَانُ انْزِلْ فَاجْدَحْ لَنَا)). قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ عَلَيْكَ نَهَارًا. قَالَ: ((انْزِلْ فَاجْدَحْ لَنَا)). قَالَ: فَنَزَلَ فَجَدَحَ، فَأَتَاهُ بِهِ فَشَرِبَ النَّبِيُّ (ﷺ) ثُمَّ قَالَ بِيَدِهِ: ((إِذَا غَابَتِ الشَّمْسُ مِنْ هَا هُنَا، وَجَاءَ اللَّيْلُ مِنْ هَا هُنَا فَقَدْ أَفْطَرَ الصَّائِمُ)). [بخاري/ الصوم/ ١٨٣٩]

(عبدالله ی کوڕی ابو اوفی) دەڵێ: لەسەفەرێکدا لەخزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) بوین لە مانگی ڕەمەزاندا کاتی خۆرئاوابوون فەرمووی: ((فلاَن کەس دابەزە و خۆراکمان بۆ ئامادەبکە)) کابرا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هێشتا ڕۆژی ماوە، فەرمووی: ((دابەزە و خۆراکمان بۆ دروست بکە)) ئەویش هێنای و پێغەمبەر (ﷺ) لێی خواردەوە، پاشان بەدەست ئاماژەی کردو فەرمووی: ئەگەر خۆر لەوێوە ئاوابوو، شەو ئالەوێوە داهات ئەوە ئیتر ڕۆژوەوان ڕۆژو دەشکێنێ.

## (٢٠) ڕۆژو شکاندن

٥٨٦ـ عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((لَا يَزَالُ النَّاسُ بِخَيْرٍ مَا عَجَّلُوا الْفِطْرَ)). [بخاري/ الصوم/ ١٨٥٦]

(سهل ی کوڕی سعد) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((خەڵکی لە خێری بەردەوامدان هەتا پەلە بکەن لەڕۆژو شکاندا)) (واتە: دوای نەخەن لەکاتی خۆی).

٥٨٧ـ عَنْ أَبِي عَطِيَّةَ قَالَ: دَخَلْتُ أَنَا وَمَسْرُوقٌ عَلَى عَائِشَةَ (ﷺ)، فَقَالَ لَهَا مَسْرُوقٌ: رَجُلَانِ مِنْ أَصْحَابِ مُحَمَّدٍ (ﷺ) كلا اهُمَا لَا يَأْلُو عَنِ الْخَيْرِ، أَحَدُهُمَا يُعَجِّلُ الْمَغْرِبَ وَالْإِفْطَارَ، وَالْآخَرُ يُؤَخِّرُ الْمَغْرِبَ وَالْإِفْطَارَ؟ فَقَالَتْ: مَنْ يُعَجِّلُ الْمَغْرِب وَالْإِفْطَارَ؟ قَالَ: [قلنا] عَبْدُ اللَّهِ فَقَالَتْ: هَكَذَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَصْنَعُ.

(ابن عطية) دەڵێ: لەگەڵ (مسروق)دا سەردانی (دایکە عائشە) (ر.ض)یان کردوە. (مسروق) پێی وت: دوکەس هەیە لە هاوەڵانی محمد (ﷺ) کە هەردوکیان کەمتەرخەم نین لە چاکەکاریدا، یەکێکیان پەلەدەکات لە کاتی خۆرئاوابوندا و پەلەیەتی زوو بەربانگ بکاتەوە، ئەوی تریان، درەنگ نوێژەکەی دەکات و درەنگیش بەربانگ دەکاتەوە؟. (عائشە) وتی: کامیان بەپەلەیە بۆ کاتی خۆرئاوابون و بەربانگ کردنەوە، وتمان (عبدالله ی کوڕی مسعود) ئەویش وتی: پێغەمبەریش (ﷺ) هەروای دەکرد.

## (٢١) قەدەغەی دانەدەمی شەو ڕۆژ بۆ ڕۆژوگرتن

٥٨٨ـ عن أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَنِ الْوِصَالِ، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ: فَإِنَّكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ تُوَاصِلُ؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((وَأَيُّكُمْ مِثْلِي؟ إِنِّي أَبِيتُ يُطْعِمُنِي رَبِّي وَيَسْقِينِي)). فَلَمَّا أَبَوْا أَنْ يَنْتَهُوا عَنِ الْوِصَالِ وَاصَلَ بِهِمْ يَوْمًا ثُمَّ يَوْمًا، ثُمَّ رَأَوُا الْهِلَالَ، فَقَالَ: ((لَوْ تَأَخَّرَ الْهِلَالُ لَزِدْتُكُمْ)) كَالْمُنَكِّلِ لَهُمْ حِينَ أَبَوْا أَنْ يَنْتَهُوا. [بخاري/ الصوم/ ١٨٦٤]

(ابو هريرە) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) قەدەغەی دانەدەمی شەو و ڕۆژی کردوە لە ڕۆژوگرتندا، پیاوێك لە موسڵمانان وتی: خۆ تۆ ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) شەو ڕۆژ دەدەیتە دەم یەك.. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((جاکێتان وەکو منە؟ من شەوگار دەبەمە سەر و پەروەردگارم خواردن و خواردنەوەم پێ دەبەخشێ)). بەڵام کاتێ کە کۆڵیان نەدا مۆڵەتی دان کە ڕۆژ و شەوێك نەیشکێنن، ئینجا کە مانگی یەکشەوەیان بینی فەرمووی: ((ئەگەر دوا بکەوتایە

بۆ ئەو ئەندازەیەش بۆم زیاد دەکردن)) وەکو سزایەك بۆیان کاتێ کە کۆڵیان نەدەدا لە ڕۆژو شکاندن.

## (٢٢) ڕۆژوگرتن یان شکاندن لەسەفەردا

٥٨٩ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ) قَالَ: سَافَرَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) فِي رَمَضَانَ، فَصَامَ حَتَّى بَلَغَ عُسْفَانَ، ثُمَّ دَعَا بِإِنَاءٍ فِيهِ شَرَابٌ فَشَرِبَهُ نَهَارًا لِيَرَاهُ النَّاسُ، ثُمَّ أَفْطَر حَتَّى دَخَلَ مَكَّةَ. قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ (ﷺ): فَصَامَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) وَأَفْطَرَ، فَمَنْ شَاء صَامَ، وَمَنْ شَاءَ أَفْطَرَ. [بخاري/ الصوم/ ١٨٤٦]

(ابـن عبـاس) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) لەڕەمـەزاندا سـەفەری کـرد و بەڕۆژویش بوو هەتا گەیشتە (عەسفان) ئەوسا داوای جامۆڵەکەیەکی کرد کە خواردنەوەیـەکی تێـدا بـوو، بـە ئاشـکرا و لـە ڕۆژدا خواردیـەوە تـا خـەڵکی بیبینێـت، پاشـان هـەر ڕۆژوی نـەگرت هـەتا گەیشـتە مەککـە ئەوسـا پێغەمبـەر بەڕۆژو دەبوو [یان] دەیشکاند، [خـەڵکیش] ئـەوەی بیویستایە بەڕۆژو دەبوو، ئەوەی بیوسیتایە دەیشکاند...

٥٩٠ـ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّه (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) خَرَجَ عَامَ الْفَتْحِ إِلَى مَكَّةَ فِي رَمَضَانَ، فَصَامَ حَتَّى بَلَغَ كُرَاعَ الْغَمِيمِ فَصَامَ النَّاسُ، ثُمَّ دَعَا بِقَدَحٍ مِنْ مَاءٍ فَرَفَعَهُ حَتَّى نَظَرَ النَّاسُ إِلَيْهِ، ثُمَّ شَرِبَ، فَقِيلَ لَهُ بَعْدَ ذَلِكَ: إِنَّ بَعْضَ النَّاس قَدْ صَامَ، فَقَالَ: ((أُولَئِكَ الْعُصَاةُ، أُولَئِكَ الْعُصَاةُ)).

(جابری کوڕی عبـدالله) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) سـاڵی ڕزگـار کردنـی مەککە لـە ڕەمەزاندا کەوتـەڕێ، ڕۆژوەکـەی بـەردەوام بـوو، تـا گەیشـتە (کـراع الغمیـم) خـەڵکیش بـەڕۆژو بوون ئەوسا داوای پـەرداخێك ئـاوی کـرد و بـەرزی کردەوە هـەتا هـەموو خـەڵکی تەماشـایان کـرد ئینجا خواردیـەوە.. دوای ئـەوە عـەرزیان کـرد: هـەندێ کـەس هـەر بـەڕۆژون، ئـەویش فـەرموی: ئائەوانـە یاخیەکانن، ئائەوانە یاخیەکانن!!

## (٢٣) چاك نیە لە سەفەردا ڕۆژوگرتن

٥٩١ـ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّه (ﷺ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) فِي سَفَرٍ، فَرَأَى رَجُلًا قَد اجْتَمَعَ النَّاسُ عَلَيْهِ، وَقَدْ ظُلِّلَ عَلَيْهِ، فَقَالَ: ((مَا لَهُ))؟ قَالُوا: رَجُلٌ صَائِمٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((لَيْسَ الْبِرُّ أَنْ تَصُومُوا فِي السَّفَرِ)). [بخاري/ الصوم ١٨٤٤]

(جابری كوڕی عبدالله) (ﷺ) دەڵێ: جارێكیان پێغەمبەر (ﷺ) لەسەفەرێكدا بوو، پیاوێكی بینی خەڵكی لەسەری كۆبونەتەوە و سێبەریان لەسەر كردوە، پێغەمبەر (ﷺ) پرسی: ((ئەوە چیەتی؟)) وتیان: پیاوێكە بەڕۆژوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: ((ڕۆژو گرتن لە سەفەردا لەكارە چاكەكان نییە)).

## (٢٤) ڕەخنەگرتن لەوەی بەڕۆژو دەبێ یان دەیشكێنێ

٥٩٢ـ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (ﷺ) قَالَ: غَزَوْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) لِسِتَّ عَشْرَةَ مَضَتْ مِنْ رَمَضَانَ، فَمِنَّا مَنْ صَامَ وَمِنَّا مَنْ أَفْطَرَ، فَلَمْ يَعِبِ الصَّائِمُ على الْمُفْطِرِ وَلَا الْمُفْطِرُ عَلَى الصَّائِمِ.

(ابی سعید الخدری) (ﷺ) دەڵێ: لە خزمەتی پێغەمبەردا چوین بۆ غەزا ١٦ڕۆژ لەڕەمەزان تێپەڕیبو، هەمان بوو، بەڕۆژوبوو، هەشمان بوو شكاندبوی، جا نەڕۆژوەوانەكە ڕەخنەی گرت لەوەی شكاندویەتی، نەئەویش ڕەخنەی گرت لە ڕۆژوەوانەكە.

## (٢٥) پاداشتی ڕۆژونەگر زیاترە لە سەفەردا ئەگەر بە ئەركی سەرشانی هەستێ

٥٩٣ـ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ) قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) فِي السَّفَرِ، فَمِنَّا الصَّائِمُ وَمِنَّا الْمُفْطِرُ، قَالَ: فَنَزَلْنَا مَنْزِلًا فِي يَوْمٍ حَارٍّ، أَكْثَرُنَا ظِلًّا صَاحِبُ الْكِسَاءِ، وَمِنَّا مَنْ يَتَّقِي الشَّمْسَ بِيَدِهِ. قَالَ: فَسَقَطَ الصُّوَّامُ وَقَامَ الْمُفْطِرُونَ، فَضَرَبُوا الْأَبْنِيَةَ وَسَقَوُا الرِّكَابَ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((ذَهَبَ الْمُفْطِرُونَ الْيَوْمَ بِالْأَجْرِ)). [بخاري/ الجهاد/ ٢٧٣٣]

(انس) (ﷺ) دەڵێت: لە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) دا بووین لەسەفەرێكدا، هەمان بوو، بەڕۆژوبوو، هەشمان بوو شكاندبوی، لەڕۆژێكی گەرمادا بارمان خست ئەوەمان كە زۆر سێبەری هەبوو ئەوەمان بوو كە جلەكانی كردبوو بە سێبەر، هەمان بوو بەدەستی بەری خۆری دەگرت، ئیتر ئەوانەی بەڕۆژو بون بۆی دانیشتن، [هیچ كارێكیان پێ نەدەكرا] ئەوانەی بەڕۆژو نەبوون دەستیان كرد بە دەوار هەڵدان و ئاودانی وشترەكان، بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: ئەمڕۆ ئەوانەی بەڕۆژو نەبوون پاداشتەكەیان بۆ خۆیان دەستەبەركرد.

## ( ٢٦ ) ڕۆژو شکاندن بۆ بەرگەگرتنی بەرەنگاری دوژمن

٥٩٤. عن قَزَعَـةَ قـالَ: أتَيْـتُ أبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ (ﷺ) وَهُـوَ مكْثُـورٌ عليْه، فَلَمَّا تَفَرَّقَ النّاسُ عنْهُ قُلْتُ: إنِّي لَا أسْألُكَ عَمَّا يَسْألُكَ هؤُلَـاء عَنْهُ، سَألْتُهُ عَن الصَّوْم فِي السّفَرِ، فَقَالَ: سَافَرْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّه (ﷺ) إلى مَكّةَ وَنَحْنُ صيامٌ، قال: فَنزَلْنَا مَنْزِلًا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): ((إنّكُمْ قدْ دَنَوْتُمْ منْ عَدُوِّكُمْ، والْفطْرُ أقْوَى لكُمْ)). فَكَانَتْ رُخْصَةً، فَمِنَّا مَنْ صامَ ومِنَّا مَنْ أفطَر، ثُمَّ نَزَلْنَا مَنْزِلًا آخر، فقال: ((إنّكُمْ مُصَبِّحُو عدُوِّكُمْ، وَالْفِطْرُ أقْوَى لكُمْ، فأفطِرُوا)). وكانتْ عزْمَةً، فأفْطرْنا، ثُمَّ [قالَ]: لَقَدْ رَأيْتُنَا نَصُومُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) بعْدَ ذلك في السّفَر.

(قزعه) دەڵێ: چووم بۆلای (ابو سعيد الخدری) (ﷺ) بينيم خـەڵكێكی زۆر دەوری داوە، كاتێ خەڵكی بلاوەيان كرد پێموت: من لەو پرسيارانەت لێناكەم كەئەو خەڵكە دەيان پرسی، جا پرسيارم لێكـرد دەربـارەی ڕۆژو لەسـەفەردا، ئەويش وتی: لە خزمەت پێغەمبەری خوادا (ﷺ) لەسەفەرێكدا بوين بۆ مەككە ، هەمووشمان بەڕۆژوبوين كە گەيشتينە شوێنێك فەرمووی: ((بێگومـان ئێـوە لـە دوژمنەكەتان نزيك بونەتـەوە، ڕۆژو بشـكێنن گـوڕ و تينـە بۆتـان)) ئيـتر ئـەوە مۆڵەتێك بوو، جا هـەمانبوو بەڕۆژو بـوو، هـەمانبوو ڕۆژوەكـەی شكاند، پاشـان گواستمانەوە بۆ شوێنێكی تر، فەرموی: ((ئێـوە بـەيانی دەگەنـە سـەردوژمنتان، ڕۆژو شـكاندن گـور و تينـە بۆتـان، كەواتـە بيشـكێنن))، ئـەوە ئيـتر فـەرمان بـوو ئێمـەش ڕۆژومـان شـكاند، پـاش ئـەوە وا دەبـوو لـە سـەفەردا لـە خزمـەت پێغەمبەری خوادا (ﷺ) بەڕۆژوو دەبوين.

## ( ٢٧ ) سەرپشك بوون لە ڕۆژو گرتن يان نەگرتن لەكاتی سەفەردا

٥٩٥ـ عنْ حَمْزَةَ بْنِ عَمْرٍو الْأسْلَمِيِّ (ﷺ) أنّهُ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أجِدُ بِي قُـوَّةً عَلَى الصِّيَامِ فِي السَّفَرِ، فَهَلْ عَلَيَّ جُنَاحٌ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((هِيَ رُخْصَةٌ مِنَ اللَّهِ، فَمَنْ أخَذَ بِهَا فَحَسَنٌ، وَمَنْ أحَبَّ أنْ يَصُومَ فَلَا جُنَاحَ)).

(حمزەی كوڕی عمرو) (ﷺ) بـە پێغەمبـەری خـوای وتـووە: ئـەی پێغەمبـەری خوا من دەتوانم لەسەفەردا بەڕۆژو بم، ئايا هيچ گوناهم ناگات؟ پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمووی: ((ئەوە مۆڵەتێكە لەلايەن خوای گەورەوە، ئەوەی سودی لێوەربگرێت ئەوە چاكە ئەوەش حەزدەكات بەڕۆژو بێت ئەوە گوناهی ناگات)).

٥٩٦ـ عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ (ﷺ) قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فِي شَهْرِ رَمَضَانَ فِي حَرٍّ شَدِيدٍ، حَتَّى إِنْ كَانَ أَحَدُنَا لَيَضَعُ يَدَهُ عَلَى رَأْسِهِ مِنْ شِدَّةِ الْحَرِّ، وَمَا فِينَا صَائِمٌ إِلَّا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وَعَبْدُ اللَّهِ ابْنُ رَوَاحَةَ. [بخاري/ الصوم/ ١٨٤٣]

(ابو درداء) (ﷺ) دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەری خوادا لەمانگی ڕەمەزاندا کە زۆر گەرما بوو دەرچوین هەتا کەسانی وامان هەبوو کە دەستی دەنایە سەرسەری لەبەر تینی گەرما کەسمان بەڕۆژو نەبوین جگە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) و (عبدالله ی کوڕی ڕەواحە).

## (٢٨) گێڕانەوەی ڕەمەزان لە شەعباندا

٥٩٧ـ عَنْ أَبِي سَلَمَةَ قَالَ: سَمِعْتُ عَائِشَةَ (ﷺ) تَقُولُ: كَانَ يَكُونُ عَلَيَّ الصَّوْمُ مِنْ رَمَضَانَ، فَمَا أَسْتَطِيعُ أَنْ أَقْضِيَهُ إِلَّا فِي شَعْبَانَ، الشُّغْلُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، أَوْ: بِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ). [بخاري/ الصوم/ ١٨٤٩]

(ابو سلمە) بیستویەتی لە عائشە (ﷺ) دەیوت: جاری واهەبوو کەمن قەرزاری ڕۆژوی ڕەمەزان دەبووم نەم دەتوانی بیگێڕمەوە لە مانگی شەعباندا نەبێت، چونکە سەرگەرم دەبوم بۆ ئەوەی [دڵی] پێغەمبەری خوا (ﷺ) [لەخۆم ڕازی بکەم] .

## (٢٩) ڕۆژوگرتنەوە لەبری مردو

٥٩٨ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((مَنْ مَاتَ وَعَلَيْهِ صِيَامٌ صَامَ عَنْهُ وَلِيُّهُ)). [بخاري/ الصوم/ ١٨٥١]

(عائشە) (ﷺ) دەڵێ: کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: ((هەر کەس مردو قەرزاری ڕۆژو بوو با خزمە نزیکەکەی بۆی بگرێتەوە)).

٥٩٩ـ عن بُرَيْدَةَ (ﷺ) قَالَ: بَيْنَا أَنَا جَالِسٌ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) إِذْ أَتَتْهُ امْرَأَةٌ فَقَالَتْ: إِنِّي تَصَدَّقْتُ عَلَى أُمِّي بِجَارِيَةٍ، وَإِنَّهَا مَاتَتْ، قَالَ: فَقَالَ: ((وَجَبَ أَجْرُكِ، وَرَدَّهَا عَلَيْكِ الْمِيرَاثُ)). قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّهُ كَانَ عَلَيْهَا صَوْمُ شَهْرٍ، أَفَأَصُومُ عَنْهَا؟ قَالَ: ((صُومِي عَنْهَا)). قَالَتْ: إِنَّهَا لَمْ تَحُجَّ قَطُّ، أَفَأَحُجُّ عَنْهَا؟ قَالَ: ((حُجِّي عَنْهَا)).

(بریدە) (ﷺ) دەڵێ: لەکاتێکدا لە خزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) دانیشتبوم ئافرەتێك هات و وتی: من کەنیزەکێکم بەخشیوە بەدایکم، دایکیشم مرد... فەرموی: پاداشتەکەت دەستکەوت و بەیاسای میراتیش کە نێزەکەکەت بۆ

گەڕایەوە، ئینجا پرسی دایکم ڕۆژوی مانگێك قەرزارە،ئایا لە بری ئەو بەڕۆژو بم؟ فەرموی: بەڕۆژوبە بۆی، وتی: هەرگیز حەجیشی نەکردبو ئایا حەجی بۆ بکەم؟ فەرمووی: حەجیشی بۆ بکە.

## (٣٠) ئەوانەی ڕۆژوناگرن دەبێ فیدیە بدەن

٦٠٠ـ عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الْأَكْوَعِ (ﷺ) قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ: ﴿وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ﴾ [البقرة: ١٨٤] كَانَ مَنْ أَرَادَ أَنْ يُفْطِرَ وَيَفْتَدِيَ، حَتَّى نَزَلَتِ الْآيَةُ الَّتِي بَعْدَهَا فَنَسَخَتْهَا. [بخاري/ التفسير/ ٤٢٣٧٤]

(سلمەی کوڕی الاکوع) (ﷺ) دەڵێ: کاتێ کەئەم ئایەتە دابەزی ﴿ئەوانەی کەناتوانن بەڕۆژو بن باخۆراکی هەژارێك بدەن﴾ البقرة/١٨٤ ئەوسا هەرکەس بیویستایە دەیشکاندو فیدیەی دەدا، هەتا ئایەتی دواتر دابەزی کە حوکمی ئەوی سڕییەوە.

## (٣١) ڕۆژوگرتن و نەگرتن لە مانگەکاندا

٦٠١ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شَقِيقٍ (ﷺ) قَالَ: قُلْتُ لِعَائِشَةَ: أَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَصُومُ شَهْرًا كُلَّهُ؟ قَالَتْ: مَا عَلِمْتُهُ صَامَ شَهْرًا كُلَّهُ إِلَّا رَمَضَانَ، وَلَا أَفْطَرَهُ كُلَّهُ حَتَّى يَصُومَ مِنْهُ، حَتَّى مَضَى لِسَبِيلِهِ (ﷺ). [بخاري/ الصوم/ ١٨٦٨]

(عبداللە ی کوڕی شقیق) لە (عائشە)ی (ﷺ) پرسیوە: ئایا پێغەمبەر لە هیچ مانگێکدا بەتەواوەتی بەڕۆژو بووە؟ وتی: ئاگادار نیم هیچ مانگێك بەتەواوی بەڕۆژو بوبێت جگە لە ڕەمەزان، هەروەها هیچ مانگێکیش نەبووەکە تیایدا بەڕۆژوو نەبوبێت، هەندێکی هەر لێ گرتووە، هەتا کۆچی دوایی کرد.

## (٣٢) ڕۆژو لەڕێی خوادا

٦٠٢ـ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((مَا مِنْ عَبْدٍ يَصُومُ يَوْمًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ، إِلَّا بَاعَدَ اللَّهُ بِذَلِكَ الْيَوْمِ وَجْهَهُ عَنِ النَّارِ سَبْعِينَ خَرِيفًا)). [بخاري/ الجهاد/ ٢٦٨٥]

(ابو سعید الخدری) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((هەر بەندەیەك ڕۆژێك لەڕێی خوادا بەڕۆژو بێت خوای گەورە بەوهۆیە حەفتا پایز ڕوخساری لە ئاگری دۆزەخ بەدور دەگرێت)).

## ( ٣٣ ) گەورەیی ڕۆژی محرم

٦٠٣ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((أَفْضَلُ الصِّيَامِ بَعْدَ رَمَضَانَ شَهْرُ اللَّهِ الْمُحَرَّمُ، وَأَفْضَلُ الصَّلَاةِ بَعْدَ الْفَرِيضَةِ صَلَاةُ اللَّيْلِ)).

(ابو هریره) (ﷺ) دەڵێت پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (( گەورەترین ڕۆژو دوای ڕەمەزان ڕۆژووی مانگی (محرم)ە کەپێی دەوترێت (شهرالله المحرم) گەورەترین نوێژیش لەدوای نوێژەفەرزەکان شەونوێژە.

## ( ٣٤ ) ڕۆژوی عاشورا

٦٠٤ـ عن عَائِشَةَ (ﷺ): أَنَّ قُرَيْشًا كَانَتْ تَصُومُ عَاشُورَاءَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، ثُمَّ أَمَرَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) بِصِيَامِهِ حَتَّى فُرِضَ رَمَضَانُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((مَنْ شَاءَ فَلْيَصُمْهُ، وَمَنْ شَاءَ فَلْيُفْطِرْهُ)). [بخاري/ الصوم/ ١٧٩٤]

(دایکەعائیشە) (ﷺ) دەڵێ: قورەیش لەسەردەمی نەفامیدا لەعاشوابەڕۆژو دەبوو، پاشان پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی دا (کەئیمانداران) تێیدا بەڕۆژوبن تاڕەمەزان تێیدا فەرز کرا، ئەوسا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (( ئەوەی دەیەوێت باعاشورا بگرێت ئەوەش دەیەوێت با نەیگرێت)).

## ( ٣٥ ) کام ڕۆژ بەڕۆژوبین لەعاشوردا

٦٠٥ـ عَنِ الْحكم بْنِ الْأَعْرَجِ قَالَ: انْتَهَيْتُ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ) وَهُوَ مُتَوَسِّدٌ رِدَاءَهُ فِي زَمْزَمَ، فَقُلْتُ لَهُ: أَخْبِرْنِي عَنْ صَوْمِ عَاشُورَاءَ؟ فَقَالَ: إِذَا رَأَيْتَ هِلَالَ الْمُحَرَّمِ فَاعْدُدْ وَأَصْبِحْ يَوْمَ التَّاسِعِ صَائِمًا. قُلْتُ: هَكَذَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَصُومُهُ؟ قَالَ نَعَمْ.

(حکم بن الاعرج) دەڵێت چووم بۆ لای (ابن عباس) (ﷺ) کەعەباکەی کردبوو بەسەرین لای زەمزەدا پێم وت :هەواڵم بدەرێ دەربارەی ڕۆژی عاشورا، ئەویش وتی: هەرکات مانگی (محرم)ت دی بیژمێرە و ڕۆژی نۆهەم بەڕۆژوبە....منیش وتم: پێغەمبەر (ﷺ) ئەوڕۆژە بەڕۆژوو دەبوو؟ وتی:بەڵێ.

## ( ٣٦ ) گەورەیی ڕۆژوی عاشورا

٦٠٦ـ عَن ابْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) قَدِمَ الْمَدِينَةَ، فَوَجَدَ الْيَهُودَ صِيَامًا يَوْمَ عَاشُورَاءَ، فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((مَا هَذَا الْيَوْمُ الَّذِي تَصُومُونَهُ)). فَقَالُوا: هَذَا يَوْمٌ عَظِيمٌ أَنْجَى اللَّهُ فِيهِ مُوسَى وَقَوْمَهُ، وَغَرَّقَ فِرْعَوْنَ وَقَوْمَهُ، فَصَامَهُ مُوسَى شُكْرًا، فَنَحْنُ نَصُومُهُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((فَنَحْنُ

أَحَقُّ وَأَوْلَى بِمُوسَى)). مِنْكُمْ فَصَامَهُ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وَأَمَرَ بِصِيَامِهِ. [بخاري/ الصوم/ ١٩٠٠،١٩٠٢]

(ابن عباس) (ﷺ) دەڵێ کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) گەیشتە مەدینە بینی جولەکە بەڕۆژوون لەڕۆژی عاشورادا، پێی فەرموون : ((ئەم ڕۆژەچی یە واتێیدا بەڕۆژوودەبن؟)) وتیان :ئەمەڕۆژێکی گەورەو گرنگە، خوای گەورەموساوگەلەکەی تێدا ڕزگارکردووە، فیرعەون و داورودەستەکەی تێدا غەرق کرد، ئیتر موسا بۆسوپاس گوزاری تێیدا بەڕۆژوبووە، ئێمەش بەڕۆژو دەبین. پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (( ئێمە لەپێش ترین بۆموسا تائێوە)). ئیتر ئەوە بوو پێغەمبەر (ﷺ) تێیدا بەڕۆژو بوو وە فەرمانی دا کە[ئیماندارانیش] تێیدا بەڕۆژوبن.

٦٠٧- عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي يَزِيدَ: سَمِعَ ابْنَ عَبَّاسٍ (ﷺ) وَسُئِلَ عَنْ صِيَامِ يَوْمِ عَاشُورَاءَ، فَقَالَ: مَا عَلِمْتُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) صَامَ يَوْمًا يَطْلُبُ فَضْلَهُ عَلَى الْأَيَّامِ إِلَّا هَذَا الْيَوْمَ، وَلَا شَهْرًا إِلَّا هَذَا الشَّهْرَ. يَعْنِي رَمَضَانَ. [بخاري/ الصوم/ ١٩٠٠،١٩٠٢]

(عبدالله ی کوڕی یزید) دەڵێ: گوێی لە(ابن عباس) (ﷺ) بووە کاتێ پرسیاری لێکراوە دەربارەی ڕۆژوگرتن لەعاشوردا، وتویەتی: نەم زانیوەو نەم بیستوە کەپێغەمبەر (ﷺ) ڕۆژێك بەڕۆژو بوبێت و بەتەمای ئەوە بوبێت ئەو ڕۆژە لەڕۆژەکانی تر گەورەتربێ لەئەمڕۆ، یان مانگێگ جگە لەم مانگە [مەبەست ڕەمەزان بووە].

## ( ٣٧ ) ئەوەی لەعاشورادا شتی خوارد

٦٠٨- عَنِ الرُّبَيِّعِ بِنْتِ مُعَوِّذِ بْنِ عَفْرَاءَ (ﷺ) قَالَتْ: أَرْسَلَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) غَدَاةَ عَاشُورَاءَ إِلَى قُرَى الْأَنْصَارِ الَّتِي حَوْلَ الْمَدِينَةِ: ((مَنْ كَانَ أَصْبَحَ صَائِمًا فَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ، وَمَنْ كَانَ أَصْبَحَ مُفْطِرًا فَلْيُتِمَّ بَقِيَّةَ يَوْمِهِ)). فَكُنَّا بَعْدَ ذَلِكَ نَصُومُهُ وَنُصَوِّمُ صِبْيَانَنَا الصِّغَارَ مِنْهُمْ إِنْ شَاءَ اللَّهُ تعالى، وَنَذْهَبُ إِلَى الْمَسْجِدِ فَنَجْعَلُ لَهُمُ اللُّعْبَةَ مِنَ الْعِهْنِ، فَإِذَا بَكَى أَحَدُهُمْ عَلَى الطَّعَامِ أَعْطَيْنَاهَا إِيَّاهُ عِنْدَ الْإِفْطَارِ. [بخاري/ الصوم/ ١٨٥٩]

(ربیع ی کچی معوذی کوڕی عفراء) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) بەرەبەیانی ڕۆژی عاشورا خەڵکێکی ناردبۆدێهاتەکانی دەوری مەدینە (فەرموبوی کەبڵێن)

:((ئەوەی بەڕۆژوە باڕۆژوەکەی تەواوبکات، ئەوەی بەڕۆژونی‌یە باهیچ نەخوات، تائێوارە، ئیتر ئێمە دوای ئەوە ئەو ڕۆژەمان دەگرت منالە وردەکانیشمان بەڕۆژو دەکرد ئەوەیان کـەخوا بیویسـتایە. ئەوسا دەچویـن بـۆ مزگـەوت و [تـۆپ] و یاریمان لەخوری بۆ دروست دەکردن ئەگەر یەکێکیان بۆ خواردن بگریایە ئەوە تۆپەکەمان دەدایە تا کاتی بەربانگ.

## (٣٨) ڕۆژو لەشەعباندا

٦٠٩ـ عَنْ أَبِي سَلَمَةَ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ (ﷺ) عَنْ صِيَامِ رَسُولِ اللَّـهِ (ﷺ) فَقَالَتْ: كَانَ يَصُومُ حَتَّى نَقُولَ: قَدْ صَامَ، وَيُفْطِرُ حتَّـى نَقُولَ: قَدْ أَفْطَـرَ، وَلَـمْ أَرَهُ صَائِمًا مِنْ شَهْرٍ قَطُّ أَكْثَرَ مِنْ صِيَامِـهِ مِنْ شَعْبَانَ، كَـانَ يَصُـومُ شَعْبَانَ كُلَّـهُ، كَانَ يَصُومُ شَعْبَانَ إِلَّا قَلِيلًا. [بخاري/ الصوم/ ١٨٦٨]

(ابـی سـلمه) دەڵـێ: پرسـیارم کردلـە(عائیشـە) (ﷺ) دەربـارەی ڕۆژوی پێغەمبەر (ﷺ) ئەویش وتـی: [ساڵی وا هـەبوو] ئـەوەندە بـەڕۆژو دەبـوو هـەتا دەمـانوت ئـەم مانگـە نایشـکێنێ، [سـاڵی واش هـەبوو] بـەڕۆژوو نـەدەبوو،هـەتادەمانووت ئیـتر ڕۆژونـاگرێت. نەشم بینیـوە هیـچ مـانگێك زۆر بەڕۆژو بوبێت، [ساڵی واش هـەبوو] شـەعبانی هـەموو دەگرت مەگـەر کـەمێکی نەبێت.

## (٣٩) ڕۆژوی ناوەڕاستی شەعبان

٦١٠ـ عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْـنٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُـولَ اللَّـهِ (ﷺ) قَـالَ لَـهُ أَوْ لِـآخَرَ: ((أَصُمْتَ مِنْ سُرَرِ شَعْبَانَ)). قَالَ: لَا. قَالَ: ((فَإِذَا أَفْطَرْتَ فَصُمْ يَوْمَيْنِ)). [بخاري/ الصوم/ ١٨٨٢]

(عمرانـی کـوڕی حصـین) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) بـەوی فـەرموویان بەکەسێکی تـر: ئایا ناوەڕاستی شەعبان هیچ بەڕۆژوو بویت؟ ووتـی: نـەخێر فـەرموی: (( هـەرکات ڕۆژوی مـانگی [ڕەمـەزانت] تـەواو کـرد، دووڕۆژ بەڕۆژوبـە لەبری ئەوەی لە شەعبان نەتگرتووە)).

## (٤٠) بەڕۆژوبوونی شەش ڕۆژ لەشەوال

٦١١ـ عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الْأَنْصَارِيِّ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّـهِ (ﷺ) قَالَ: ((مَنْ صَـامَ رَمَضَانَ، ثُمَّ أَتْبَعَهُ سِتًّا مِنْ شَوَّالٍ، كَانَ كَصِيَامِ الدَّهْرِ)).

(ابـو ايـوب الانصـاری) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموويـەتی: ((ئـەوەی ڕەمەزان بەڕۆژوبێت و ،پاشان شەش ڕۆژی (شەوال)یش بەڕۆژو بێت بەدوایدا، ئەوە وەکو بەڕۆژو بونی هەموو ساڵەکە وەهایە)).

## (٤١) نەگرتنی (نۆمینەی حاجیان)

٦١٢ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) صَائِمًا فِي الْعَشْرِ قَطُّ.

(عائشه) (ﷺ) دەڵێ: هەرگیز نەمبینیوە پێغەمبەر (ﷺ) لەو دەڕۆژەدا [واتـە: دەڕۆژی یەکەمی مانگی ذی الحجّة] بەڕۆژو بوبێت.

## (٤٢) ڕۆژوی عارفە

٦١٣ـ عَنْ أَبِي قَتَادَةَ (ﷺ): رَجُلٌ أَتَى النَّبِيَّ (ﷺ) فَقَالَ: كَيْفَ تَصُومُ؟ فَغَضِبَ رَسُولُ اللَّـه (ﷺ) مِنْ قوله، فَلَمَّا رَأَى عُمَرُ (ﷺ) غَضَبَهُ، قَالَ: رضينا بِاللَّـه رَبًّا وَبِالْإِسْلَامِ دِينًا وَبِمُحَمَّدٍ نَبِيًّا، نَعُوذُ بِاللَّه مِنْ غَضَبِ اللَّه وَغَضَبِ رَسُوله. فَجَعَلَ عُمَرُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ يُرَدِّدُ هَذَا الْكَلَامَ حَتَّى سَكَنَ غَضَبُهُ، فَقَالَ عُمَرُ: يَا رَسُولَ اللَّه، كَيْفَ بِمَنْ يَصُومُ الدَّهْرَ كُلَّهُ؟ قَالَ: ((لَا صَامَ وَلَا أَفْطَرَ)) أَوْ قَالَ: ((لَمْ يَصُمْ وَلَمْ يُفْطِرْ)). قَالَ: كَيْفَ مَنْ يَصُومُ يَوْمَيْنِ وَيُفْطِرُ يَوْمًا؟ قَالَ: ((وَيُطِيقُ ذَلِكَ أَحَدٌ)). قَالَ: كَيْفَ مَنْ يَصُومُ يَوْمًا وَيُفْطِرُ يَوْمًا؟ قَالَ: ((ذَاكَ صَوْمُ دَاوُدَ عَلَيْهِ السَّلَام)). قَالَ: كَيْفَ مَنْ يَصُومُ يَوْمًا وَيُفْطِرُ يَوْمَيْنِ؟ قَالَ: ((وَدِدْتُ أَنِّي طُوِّقْتُ ذَلِكَ)). ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّه(ﷺ): ((ثَلَاثٌ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ، وَرَمَضَانُ إِلَى رَمَضَانَ، فَهَذَا صِيَامُ الدَّهْرِ كُلِّه. صِيَامُ يَوْمِ عَرَفَةَ: أَحْتَسِبُ عَلَى اللَّه أَنْ يُكَفِّرَ السَّنَةَ الَّتِي قَبْلَهُ وَالسَّنَةَ الَّتِي بَعْدَهُ، وَصِيَامُ يَوْمِ عَاشُورَاءَ: أَحْتَسِبُ عَلَى اللَّهِ أَنْ يُكَفِّرَ السَّنَةَ الَّتِي قَبْلَهُ)).

(ابو قتاده) (ﷺ) دەڵێ: پیاوێك هات بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) لێی پرسی؟ ئەوە چۆن بەڕۆژو دەبیت؟! پێغەمبـەر (ﷺ) لەقسـەکەی پەسـت بوو، کە(عمـر)ئـەوەی بینی وتی: ئێمە ڕازین کەخوا پەروەردگارمانە و ئیسلام ئاینمانە و محمدیـش پێغەمبەرمانـە، پـەنادەگرین بەخوا لـەناڕەزایی و توڕەیـی خواو پێغەمبەرەکـەی، جا (عمر)چەند جارێك ئەوەی دووبارە کردەوە هەتا پێغەمبەر ڕقەکەی نیشتەوە، ئینجا عمر ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا کەسێك هـەموو کـات بـەڕۆژو بێت پێت چۆنـە.؟ ئـەویش فـەرمووی: ئـەوە نـەڕۆژوی بـۆ حسابە، نەشکاندوشـێتی، عمـر ووتـی: ئەی ئەوەی دوو ڕۆژ بگرێت و ڕۆژێك نەگرێت؟ جاکەس دەتوانێت ئەوە

بکات؟ عمر وتـی: ئـەوەی رۆژە نـاڕۆژێك بەڕۆژودەبێت؟ فـەرمووی ئـەوە رۆژوی (داود)ە سەلامی خوای لەسەر بێت، عمر وتـی: ئـەی ئـەوە چۆنـە ڕۆژێك بەڕۆژو بێت و دوو ڕۆژ بەڕۆژو نەبێت؟ فەرمووی: ئاواتەخوازم ئەو توانایەم پیٚ بدرایە. پاشان پێغەمبەر (ﷺ) فـەرمووی: سـیٚ ڕۆژ لەهـەموو مـانگێکدا ڕەمـەزانیش بـۆ ڕەمـەزان ئـەوەڕۆژوی هـەموو سـاڵەکەیە. ڕۆژوی ڕۆژی عەرەفـەش ئومێـدم وایـە بەخوا کەببێت بەکەفارەتی ساڵی ڕابردوو ساڵی داهاتووش. ڕۆژوی عاشوراش ئومێدم وایە بەخوا کەببێت بە کەفارەتی ساڵی ڕابردوو.[١]

## (٤٣) نەگرتنی ڕۆژوی عارفە بۆ حاجیان

٦١٤ـ عَنْ أُمِّ الْفَضْلِ بِنْتِ الْحارِثِ (ﷺ): أَنَّ نَاسًا تَمَارَوْا عِنْدَهَا يَوْمَ عَرَفَةَ فِي صِيَامِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: هُوَ صَائِمٌ، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: لَيْسَ بِصَائِمٍ، فَأَرْسَلْتُ إِلَيْهِ بِقَدَحِ لبنٍ وهُوَ وَاقِفٌ عَلَى بَعِيرِهِ بِعَرَفَةَ، فَشَرِبَهُ. [بخاري/ الحج/ ١٥٧٨]

(ام الفضـل بنـت الحـارث) (ﷺ) دەڵـێ: خـەڵکێك لـەلای ئـەو گفتوگۆیـان بـوو دەربارەی بەڕۆژوبوونی پێغەمبەر (ﷺ): لـەڕۆژی عارفـەدا، هـەندێکیان وتیـان بەڕۆژووە، هەندێکی تریان وتیان نەخێر بەڕۆژو نی‌یە، ئەوسا پەرداخێك شیری بۆ پێغەمبەر (ﷺ) نارد لەکاتێکدا بەسەر ووشترەکەیەوە بوو لەعارفەدا، ئـەویش خواردیەوە.

## (٤٤) ڕۆژوو نەگرتن لە جەژنەکاندا

٦١٥ـ عَنْ أَبِي عُبَيْدٍ مَوْلَى ابْنِ أَزْهَرَ أَنَّـهُ قَالَ: شَهِدْتُ الْعِيـدَ مَعَ عُمَـرَ بْـنِ الْخَطَّابِ (ﷺ) فَجَاءَ فَصَلَّى، ثُمَّ انْصَرَفَ، فَخَطَبَ النَّـاسَ فَقَالَ: إِنَّ هَذَيْـنِ يَوْمَـانِ نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَنْ صِيامِـهِما: يَـوْمُ فِطْرِكُـمْ مِـنْ صِيَـامِكُمْ، وَالْـآخَرُ يَـوْمٌ تَأْكُلُونَ فِيهِ مِنْ نُسُكِكُمْ. [بخاري/ الصوم/ ١٨٨٩]

(ابوعبید)کارگوزاری (ابن ازهار) دەڵیٚ: جەژنمان کرد لەگـەڵ (عمـری کـوڕی خطاب) (ﷺ) هات و نوێژی کردوو ڕۆیشت و وتاری بۆ خەڵك داو وتی: ئەم دوو ڕۆژە پێغەمبـەر (ﷺ): ڕێگـری کـردووە ڕۆژوی تێـدا بگـیرێت، ئـەو ڕۆژەی ڕۆژو

[١] ئەم فەرموودەیە پێچەوانەی فەرموودەی پێشووی (عائشة) نیە چونکە نەبینینی ئەو بەڵگە نیـە لەسـەر ئـەوە پێغەمبـەر بەڕۆژوو نـەبووبێت لـە عارفەدا، ئـەکریٚ ئـەو ڕۆژە لـەماڵی ئـەودا نەبوبێت.

دەشكێنن دوای مانگی ڕەمەزان [واتە جەژنی ڕەمەزان] هەروەها ئەوڕۆژەی كەقوربانی حەجی تێدا دەخۆن (ڕۆژەكانی جەژنی قوربان).

## (٤٥) ڕۆژانی (ايام التشريق)

٦١٦ـ عَنْ نُبَيْشَةَ الْهُذَلِيِّ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((أَيَّامُ التَّشْرِيقِ أَيَّامُ أَكْلٍ وَشُرْبٍ -وفي رواية- وَذِكْرٍ لِلَّهِ)).

(نبيشه الهذلي) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ): فەرموویەتی: (( سێ ڕۆژەی دوای جەژنی قوربان ڕۆژانی خواردن و خواردنەوەن)) لەڕیوایەتێكی تردا هاتووە ((یادكردنی خوای گەورەشن)).

## (٤٦) ڕۆژی دووشەممووان

٦١٧ـ عَنْ أَبِي قَتَادَةَ الْأَنْصَارِيِّ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) سُئِلَ عَنْ صَوْمِ الِاثْنَيْنِ، فَقَالَ: ((فِيهِ وُلِدْتُ، وَفِيهِ أُنْزِلَ عَلَيَّ)).

(ابوقتادە) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ): كاتێك دەربارەی ڕۆژوی دووشەموان لێیان پرسیوە ، فەرموویەتی: ((من لەڕۆژەدا لەدایك بووم، لەو ڕۆژەشدا قورئان دابەزێنراوەتە سەرم)). [واتە: بیگرن باشە]

## (٤٧) بەڕۆژبوونی ڕۆژانی هەینی بەتەنها پەسەندنیيە

٦١٨ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((لَا يَصُومُ أَحَدُكُمْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ إِلَّا أَنْ يَصُومَ قَبْلَهُ أَوْ يَصُومَ بَعْدَهُ)). [بخاري/ الصوم/ ١٨٨٤]

(ابوهريرە) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ): فەرموویەتی: (( باكەستان ڕۆژانی هەینی بەڕۆژونەبێت مەگەر ڕۆژێك لەپێشەوە یانلەدواوە [لەگەڵیدا] بەڕۆژوبێت.

٦١٩ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((لَا تَخْتَصُّوا لَيْلَةَ الْجُمُعَةِ بِقِيَامٍ مِنْ بَيْنِ اللَّيَالِي، وَلَا تَخُصُّوا يَوْمَ الْجُمُعَةِ بِصِيَامٍ مِنْ بَيْنِ الْأَيَّامِ، إِلَّا أَنْ يَكُونَ فِي صَوْمٍ يَصُومُهُ أَحَدُكُمْ)).

(ابوهريرە) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ): فەرموویەتی: (( شەوی هەینی تایبەت مەكەن بەشەو نوێژو ڕۆژی هەینی لەناو ڕۆژەكانی تر تایبەت مەكەن بەڕۆژووەوە، مەگەر ئەو ڕۆژە بەرعادەتی ڕۆژوگرتنی یەكێكتان بكەوێت.

## (٤٨) ڕۆژوی سێ ڕۆژ لەهەرمانگێكدا

٦٢٠ـ عن مُعاذةُ الْعدويّةُ أنَّها قالتْ: سألْتُ عائشةَ زوْجَ النَّبيِّ (ﷺ): أكانَ رسُولُ اللَّه (ﷺ) يصُومُ مِنْ كُلِّ شهْرٍ ثلاثةَ أيّامٍ؟ قالتْ: نعمْ. فقُلْتُ لها: مِنْ أيِّ أيّامِ الشّهْرِ كانَ يصُومُ؟ قالتْ: لمْ يكُنْ يُبالي مِنْ أيِّ أيّامِ الشّهْرِ يصُومُ.

(خاتوو معاذة العدوية)دەڵێ: پرسیومە لەعائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (ﷺ): کەئایا پێغەمبەری خوا لەهەر مانگیکدا سێ ڕۆژ بەڕۆژودەبوو؟ وتی: بەڵێ، وتم: لەچ ڕۆژانێکی مانگدا بەڕۆژوو دەبوو؟ وتی: گوێی نەدەدایە لەکام ڕۆژ لەڕۆژەکانی مانگ بەڕۆژووببێت.

## (٤٩) ڕۆژوی بەردەوام پەسەند نیيە

٦٢١ـ عن عبْدَ اللَّه بْن عمْرو بْن الْعاص (رضي الله عنه) قالَ: بلغَ النَّبيَّ (ﷺ) أنّي أصُومُ أسْرُدُ، وأُصلّي اللّيْل، فإمّا أرْسلَ إليّ وإمّا لقيتُهُ، فقال: ((ألمْ أُخْبرْ أنّكَ تصُومُ ولا تُفْطرُ وتُصلّي اللّيْل؟ فلا تفْعلْ، فإنَّ لعيْنكَ حظًّا، ولنفْسكَ حظًّا، ولأهْلكَ حظًّا، فصُمْ وأفْطرْ، وصلّ ونمْ وصُمْ منْ كُلّ عشْرةِ أيّامٍ يوْمًا، ولكَ أجْرُ تسْعةٍ)). قالَ: إنّي أجدُني أقْوى منْ ذلكَ يا نبيَّ اللَّه، قالَ: ((فصُمْ صيامَ داوُدَ عليْه السّلام)). قالَ: وكيْفَ كانَ داوُدُ يصُومُ يا نبيَّ اللَّه؟ قالَ: ((كانَ يصُومُ يوْمًا ويُفْطرُ يوْمًا، ولا يفرُّ إذا لاقى)). قالَ: منْ لي بهذه يا نبيَّ اللَّه؟ قالَ عطاءٌ: فلا أدْري كيْفَ ذكرَ صيامَ الْأبد، فقالَ النَّبيُّ (ﷺ): ((لا صامَ منْ صامَ الْأبد، لا صامَ منْ صامَ الْأبد لا صامَ منْ صامَ الْأبدَ)). [بخاري/ الصوم ١٨٧٦]

(عبدالله ی کوڕی عمرو کوڕی عاص) (رضي الله عنه) دەڵێ: هەواڵ گەیشتەوە پێغەمبەر (ﷺ): کەمن بەردەوام بەڕۆژوم وبەشەویش نوێژدەکەم، جا نازانم ناردی بەشوێنمدا یان خۆم بەخزمەتی گەیشتم. فەرمووی: (( بیستومە کەتۆ بەردەوام بەڕۆژو دەبیت و ڕۆژو ناشکێنیت، بەردەوامیش شەونوێژ دەکەیت؟ وامەکە.. چونکە چاوت مافی هەیە خۆیشت مافت هەیە ، خێزانت مافی هەیە، تۆ بەڕۆژوببەو مەشبە، شەونوێژ بکەو بشخەوە، لەدەڕۆژدا ڕۆژێك بەڕۆژو ببە. پاداشتی نۆ ڕۆژەکەی تری هەیە (عبدالله) وتی: من لەوە زیاتر دەتوانم ئەی پێغەمبەر (ﷺ): فەرمووی: (( کەواتە ڕۆژو بگرە وەك بەڕۆژو بوونی (داود) سەلامی خوای لێبێت. وتم : (داود) چۆن بەڕۆژو دەبوو ئەی پێغەمبەر (ﷺ): فەرمووی: (( ڕۆژێك بەڕۆژو دەبو ڕۆژێك دەیشکاند. کاتێکیش بەرەنگاری

دوژمنیش بووایەتەوە ڕای نەدەکرد)) وتم چاکیٚ ئەوەی بۆ دەلویٚ ئەی پێغەمبەر (ﷺ)؟ عطاء دەڵــیٚ: ئیـتر نـازانم چـۆن باســی ڕۆژوی بـەردەوام هاتـە پێشـەوە، پێغەمبەر (ﷺ): فەرمووی: (( ئەوە ڕۆژوی نەگرتووە کەبەردەوام بەڕۆژو دەبێت، ئـەوە ڕۆژوی نـەگرتووە کـە بـەردەوام بـەڕۆژو دەبێـت [واتـە: خـێری ناگـاتو نادروستە]

## (٥٠) چاکترین ڕۆژو ڕۆژوی (داود)ە، ڕۆژ ناڕۆژێك

٦٢٢ـ عَنْ عَبْدِ اللَّه بْنِ عَمْرو (ﷺ) قَالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللّـهِ (ﷺ): ((إِنَّ أَحَـبَّ الصِّيَامِ إِلَى اللَّهِ صِيَامُ دَاوُدَ، وَأَحَبَّ الصَّلَاةِ إِلَى اللَّهِ صَلَاةُ دَاوُدَ عَلَيْهِ السَّلَام: كَانَ يَنَامُ نِصْفَ اللَّيْلِ، وَيَقُومُ ثُلُثَهُ، وَيَنَامُ سُدُسَهُ. وَكَان يَصُومُ يَوْمًا وَيُفْطِرُ يَوْمًا)). [بخاري/ التجهد/ ١٠٧٩]

(عبــدالله ی کــوڕی عمــرو) (ﷺ) دەڵــیٚ: پێغەمبــەر (ﷺ) فەرموویــەتی: ((پەســـەندترین ڕۆژو لای خـــوای گـــەورە ڕۆژوی (داود)ە، پەســـەندترین شەونوێژیش لای خـوای گـەورە هـەر شـەونوێژی داودە. نیـوەی کـاتی شـەو دەخەوت سێیەکەی تری شەونوێژی دەکرد، شەش یەکی دەخەوتەوە، هـەروەها ڕۆژێك بەڕۆژودەبوو، ڕۆژێکیش بەڕووژونەدەبوو)).

## (٥١) ئەوەی ڕۆژوی سونەت بگرێت پاشان بیشکێنێت

٦٢٣ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ النَّبِـيُّ (ﷺ) ذَاتَ يَـوْمٍ فَقَالَ: ((هَلْ عِنْدَكُمْ شَيْءٌ)). فَقُلْنَا: لَـا. قَالَ: ((فَإِنِّي إِذَنْ صَائِمٌ)). ثُمَّ أَتَانَا يَوْمًا آخَرَ، فَقُلْنَـا: يَا رَسُولَ اللَّهِ أُهْـدِيَ لَنَـا حَيْـسٌ، فَقَـالَ: ((أَرِينِيـهِ فَلَقَـدْ أَصْبَحْـتُ صَائِمًا)). فَأَكَلَ.

(عائشە) (ﷺ) دەڵیٚ: پێغەمبەر (ﷺ): ڕۆژێك هـات بۆلام فـەرمووی: ((هیچتـان لەلاهەیە؟)) وتمان نەخێر: فەرمووی: ((کەواتە بەڕۆژو دەبم))، ڕۆژێکـی تـر هـات بۆ لامان. وتمان: ئەی پێغەمبـەر (ﷺ): خورمـاو ڕۆن و کەشـکمان بـەدیاری بـۆ هـاتووە، فـەرمووی: ((پیشـانم بـدە، هەرچـەندە ئـەم بەیانی‌یـە نیـازی ڕۆژوم هەبوو)) ئیتر دەستی کرد بەخواردنی.

# (١٢) مانەوە لەمزگەوتدا (اعتكاف)

## (١) ئەوەی دەیەوێت لەمزگەوت بمێنێتەوە کەی دەست بەکاربێت

٦٢٤ـ عَنْ عَائِشَةَ (﵂) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِذَا أَرَادَ أَنْ يَعْتَكِفَ صَلَّى الْفَجْرَ ثُمَّ دَخَلَ مُعْتَكَفَهُ، وَإِنَّهُ أَمَرَ بِخِبَائِهِ فَضُرِبَ، أَرَادَ الاعْتِكَافَ فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ، فَأَمَرَتْ زَيْنَبُ بِخِبَائِهَا فَضُرِبَ، وَأَمَرَ غَيْرُهَا مِنْ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ (ﷺ) بِخِبَائِهِ فَضُرِبَ، فَلَمَّا صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) الْفَجْرَ، نَظَرَ فَإِذَا الْأَخْبِيَةُ، فَقَالَ: ((آلْبِرَّ تُرِدْنَ)). فَأَمَرَ بِخِبَائِهِ فَقُوِّضَ، وَتَرَكَ الاعْتِكَافَ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ، حَتَّى اعْتَكَفَ فِي الْعَشْرِ الْأَوَّلِ مِنْ شَوَّالٍ. [بخاري/ الاعتكاف/ ١٩٢٨]

(عائشە) (﵂) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) : کاتێ دەیویست لەمزگەوتدا بمێنێتەوە، نوێژی بەیانی دەکردو ئەوسا دەچووە ئەو شوێنەی کە تێیدا دەمایەوە، جارێکیان فەرمانی دا چادرێکی بۆ هەڵدرا، دەیویست دەڕۆژی کۆتایی ڕەمەزان بمێنێتەوە، زەینەبیش فەرمانی داچادری بۆ هەڵدرا، کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی بەیانی کرد، سەیری کرد چەندەها چادر هەیە فەرمووی: (( دەیانەوێت خێرو چاکەیان دەست بکەوێت))؟ ئینجا فەرمانی دا چادرەکەی خۆی لابرێ، وازی لە اعتکاف هێنا لەو ڕەمەزانەداو، دەی یەکەمی شەوال اعتکافی کرد.

## (٢) مانەوە لەدەشەوی یەکەم و دەشەوی ناوەڕاست دا.

٦٢٥. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (ﷺ) قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) اعْتَكَفَ الْعَشْرَ الْأَوَّلَ مِنْ رَمَضَانَ، ثُمَّ اعْتَكَفَ الْعَشْرَ الْأَوْسَطَ فِي قُبَّةٍ تُرْكِيَّةٍ عَلَى سُدَّتِهَا حَصِيرٌ. قَالَ: فَأَخَذَ الْحَصِيرَ بِيَدِهِ فَنَحَّاهَا فِي نَاحِيَةِ الْقُبَّةِ، ثُمَّ أَطْلَعَ رَأْسَهُ فَكَلَّمَ النَّاسَ فَدَنَوْا مِنْهُ، فَقَالَ: ((إِنِّي اعْتَكَفْتُ الْعَشْرَ الْأَوَّلَ، أَلْتَمِسُ هَذِهِ اللَّيْلَةَ، ثُمَّ اعْتَكَفْتُ الْعَشْرَ الْأَوْسَطَ، ثُمَّ أُتِيتُ فَقِيلَ لِي: إِنَّهَا فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ، فَمَنْ أَحَبَّ مِنْكُمْ أَنْ يَعْتَكِفَ، فَلْيَعْتَكِفْ)). فَاعْتَكَفَ النَّاسُ مَعَهُ، قَالَ: ((وَإِنِّي أُرْبِئْتُهَا لَيْلَةَ وِتْرٍ، وَإِنِّي أَسْجُدُ صَبِيحَتَهَا فِي طِينٍ وَمَاءٍ)). فَأَصْبَحَ مِنْ لَيْلَةِ إِحْدَى وَعِشْرِينَ، وَقَدْ قَامَ إِلَى الصُّبْحِ، فَمَطَرَتِ السَّمَاءُ، فَوَكَفَ الْمَسْجِدُ، فَأَبْصَرْتُ الطِّينَ وَالْمَاءَ، فَخَرَجَ حِينَ فَرَغَ مِنْ صَلَاةِ الصُّبْحِ، وَجَبِينُهُ وَرَوْثَةُ أَنْفِهِ فِيهِمَا الطِّينُ وَالْمَاءُ، وَإِذَا هِيَ لَيْلَةُ إِحْدَى وَعِشْرِينَ مِنَ الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ. [بخاري/ صلاة التراويح/ ١٩١٤]

(ابوسعید الخدري) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ): لەدەشەوی سەرەتای ڕەمەزاندا (اعتکاف)ی کرد، پاشان لەدەشەوی ناوەڕاستا (اعتکعاف)ی کرد لەچادرێکی گومەزی تورکیدا، چەتری بەردەرگاکەی حەسیرێك بوو، حەسیرەکەی بەدەستی پیرۆزی لابردو خستیە سوچێکی چادرەکەوە، ئینجا سەری دەرهێناو قسەی بۆ خەڵکی کرد، ئەوانیش لێی نزیك بوونەوەو فەرمووی: ((من دە شەوی یەکەم اعتکافم کرد و بەتەمای ئەو شەوە بووم [شەوی قەر]، پاشان دەشەوی ناوەڕاست مامەوە دوای ئەوە هاتن بۆ لام و پێم وترا: ئەو شەوە لەدە شەوی کۆتاییدایە، هەرکەس لە ئێوە پێی خۆشە بمێنێتەوە بابمێنێتەوە) خەڵك لەخزمەتیدا مانەوە. ئینجا فەرمووی (من وام دیوە لەخەوندا کەشەوێکی تاك بێت، لەو خەونەمدا وام دی کە بەیانیەکەی لەقوڕاودا سوجدەم دەبرد،)) جا بەیانی بیست و یەك هەستا بۆ نوێژی بەیانی باران باری بوو. مزگەوت دڵۆپەی کردبوو، قوڕاوەکەی دی کاتێ لێبۆوە ناوچەوان و سەری لووتی قوڕاویان پێوە بوو. ئەوشەوە شەوی بیست و یەك بوو لەدەی کۆتایی.

## ( ٣ ) مانەوە لەمزگەوتدا لەدەشەوی کۆتایی ڕەمەزاندا

٦٢٦ــ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كَانَ يَعْتَكِفُ الْعَشْرَ الْأَوَاخِرَ مِنْ رَمَضَانَ حَتَّى تَوَفَّاهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ، ثُمَّ اعْتَكَفَ أَزْوَاجُهُ مِنْ بَعْدِهِ. [بخاري/ الاعتكاف/ ١٩٢٢]

(عائشە) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ): دەشەوی کۆتای ڕەمەزان لەمزگەوتدا دەمایەوە هەتا خوای گەورە بردیەوە بۆ لای خۆی، پاشان هاوسەرەکانی دوای خۆی ئەوکارەیان کرد.

## ( ٤ ) خۆماندووکردن لەدەشەوی کۆتای ڕەمەزاندا

٦٢٧ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِذَا دَخَلَ الْعَشْرُ أَحْيَا اللَّيْلَ وَأَيْقَظَ أَهْلَهُ، وَجَدَّ، وَشَدَّ الْمِئْزَرَ. [بخاري/ صلاة التراويح/ ١٩٢٠]

(عائشە) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ): کاتێ گەیشتە دەشەوی کۆتایی [ڕەمەزان] شەوگاری (بەخوا پەرستی) دەبردەسەرو، خێزانەکانی هەڵ دەسان و خۆی ماندودەکردو پشتوێنی لێ قایم دەکرد.

## ( ٥ ) گەڕان بەدوای شەوی قەدرا

٦٢٨ـ عن ابْنَ عُمَرَ (ﷺ) قال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((الْتَمِسُوهَا فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ -يَعْنِي لَيْلَةَ الْقَدْرِ- فَإِنْ ضَعُفَ أَحَدُكُمْ أَوْ عَجَزَ فَلَا يُغْلَبَنَّ عَلَى السَّبْعِ الْبَوَاقِي)). [بخاري/ صلاة التراويح/ ١٩١١]

(ابن عمر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ): فەرمویەتی: (( بگەڕێن بەشوێنی دە شەوی کۆتایدا–واتە شەوی قەدر– ئەگەر کەسێکتان بێ هێز بوو یان نەیتوانی با حەوتەکەی کۆتای لەدەست خۆی نەدات.

*/شەوی قەدر شەوی بیست و یەکە ... سەیری فەرموودەی ژمارە ٦٣٢ بکە.

## ( ٦ ) شەوی قەدر شەوی بیست و یەکە

قَد تقدم حديث ابي سعيد الخدري (ﷺ) في ذلك [رقم: ٦٣٢].

پێشتر ئەم فەرموودەیە باس کرا لەژمارە (٦٣٢)دا.

## ( ٧ ) شەوی قەدر شەوی بیست و سێیە.

٦٢٩ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أُنَيْسٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((أُرِيتُ لَيْلَةَ الْقَدْرِ ثُمَّ أُنْسِيتُهَا، وَأَرَانِي صُبْحَهَا أَسْجُدُ فِي مَاءٍ وَطِينٍ)). قَالَ: فَمُطِرْنَا لَيْلَةَ ثَلَاثٍ وَعِشْرِينَ، فَصَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فَانْصَرَفَ وَإِنَّ أَثَرَ الْمَاءِ وَالطِّينِ عَلَى جَبْهَتِهِ وَأَنْفِهِ. قَالَ: وَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أُنَيْسٍ يَقُولُ: ثَلَاثٍ وَعِشْرِينَ.

(عبدالله ی کوڕی انیس) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((شەوی قەدرم نیشان درا و پاشان بیرم برایەوە، لەخەونم دابینم سوجدەم دەبرد لە قوڕاودا)). دەڵێ: شەوی بیست و سێ بارانمان بۆ باری، پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی بۆ کردین و ئەمجا ڕۆیی، شوێنەواری قوڕاوەکە لەسەر ناوچەوان و لووتی دیار بوو... ڕاوی دەڵێ: (عبدالله کوڕی انیس) دەیوت: شەوی بیست و سێبوو.

## ( ٨ ) لە نۆ و حەوت و پێنجدا هەوڵی بۆ بدە.

٦٣٠ـ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (ﷺ) قَالَ: اعْتَكَفَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) الْعَشْرَ الْأَوْسَطَ مِنْ رَمَضَانَ، يَلْتَمِسُ لَيْلَةَ الْقَدْرِ قَبْلَ أَنْ تُبَانَ لَهُ، فَلَمَّا انْقَضَيْنَ أَمَرَ بِالْبِنَاءِ فَقُوِّضَ، ثُمَّ أُبِينَتْ لَهُ أَنَّهَا فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ، فَأَمَرَ بِالْبِنَاءِ فَأُعِيدَ، ثُمَّ خَرَجَ

عَلَى النَّاسِ فَقَالَ: ((يَا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّهَا كَانَتْ أُبِينَتْ لِي لَيْلَةُ الْقَدْرِ، وَإِنِّي خَرَجْتُ لِأُخْبِرَكُمْ بِهَا، فَجَاءَ رَجُلَانِ يَحْتَقَّانِ مَعَهُمَا الشَّيْطَانُ، فَنُسِّيتُهَا، فَالْتَمِسُوهَا فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ، الْتَمِسُوهَا فِي التَّاسِعَةِ وَالسَّابِعَةِ وَالْخَامِسَةِ)). قَالَ: قُلْتُ: يَا أَبَا سَعِيدٍ إِنَّكُمْ أَعْلَمُ بِالْعَدَدِ مِنَّا. قَالَ: أَجَلْ نَحْنُ أَحَقُّ بِذَلِكَ مِنْكُمْ. قَالَ: قُلْتُ: مَا التَّاسِعَةُ وَالسَّابِعَةُ وَالْخَامِسَةُ؟ قَالَ: إِذَا مَضَتْ وَاحِدَةٌ وَعِشْرُونَ فَالَّتِي تَلِيهَا ثِنْتَيْنِ وَعِشْرِينَ، وَهِيَ التَّاسِعَةُ. فَإِذَا مَضَتْ ثَلَاثٌ وَعِشْرُونَ فَالَّتِي تَلِيهَا السَّابِعَةُ، فَإِذَا مَضَى خَمْسٌ وَعِشْرُونَ فَالَّتِي تَلِيهَا الْخَامِسَةُ. [بخاري/ صلاة التراويح/ ١٩١٢]

(ابو سعيد الخدري) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) لە دە شەوی ناوەڕاستی ڕەمەزاندا لە مزگەوت مایەوە بۆ ئەوەی ڕێی لەشەوی قەدر بکەوێت، کاتێ کەدەشەوەکە تەواو بوو ئەو شوێنەی کە دروستی کردبوو هەڵی وەشان، پاشان بۆی دەرکەوت کە لەدەشەوی کۆتاییدایە، فەرمانیدا کە شوێنەکە دروست بکرێتەوە، ئینجا چوە ناو خەڵکی و فەرموی: ((خەڵکینە من شەوی قەدرم بۆ دەردەکەوت و دەرچووم کە پێتان بڵێم، دوپیاوهاتن کێشەیان هەبوو هەریەکەیان خۆی بە خاوەنی حەق دەزانی و شەیتانیشیان لەگەڵدابوو، ئیتر لەبیرم برایەوە، جاله دەشەوی کۆتایی ڕەمەزاندا بۆی بگەڕێن هەوڵی بۆ بدەن لە نۆهەم و حەوت و پێنجەمدا، منیش وتم :ئەی (ابو سعيد) ئێوە لەژمارە شارەزا ترن لە ئێمە، وتی: بەڵێ ئێمە زیاتر خاوەن حەقین لەوەدا.. وتم: نۆهەم و حەوتەم و پێنجەم چییە؟ وتی: کاتێ بیست و یەك تێپەڕی بەشوێنیدا کاتێ بیست و دوو دێت ئەوە نۆهەمە، کاتێ بیست و سێ تێپەڕی، ئەوەی بە شوێنیدا دێت ئەوە حەوتەمە، ئەگەر بیست و پێنج تێپەڕی ئەوەی بە شوێنیدا دێت پێنجەمە.

## ( ٩ ) شەوی قەدر بیست و حەوتە

٦٣١ـ عن زِرَّ بْنَ حُبَيْشٍ (ﷺ) قَالَ: سَأَلْتُ أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ (ﷺ) فَقُلْتُ: إِنَّ أَخَاكَ ابْنَ مَسْعُودٍ يَقُولُ: مَنْ يَقُمِ الْحَوْلَ يُصِبْ لَيْلَةَ الْقَدْرِ، فَقَالَ: رَحِمَهُ اللَّهُ، أَرَادَ أَنْ لَا يَتَّكِلَ النَّاسُ، أَمَا إِنَّهُ قَدْ عَلِمَ أَنَّهَا فِي رَمَضَانَ، وَأَنَّهَا فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ، وَأَنَّهَا لَيْلَةُ سَبْعٍ وَعِشْرِينَ، ثُمَّ حَلَفَ -لَا يَسْتَثْنِي- أَنَّهَا لَيْلَةُ سَبْعٍ وَعِشْرِينَ. فَقُلْتُ: بِأَيِّ

شَيْءٍ تَقُولُ ذَلِكَ يَا أَبَا الْمُنْذِرِ؟ قَالَ: بِالْعَلَامَةِ -أَوْ بِالْآيَةِ- الَّتِي أَخْبَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أَنَّهَا تَطْلُعُ يَوْمَئِذٍ لَا شُعَاعَ لَهَا.

(زر بن حبيش) (ﷺ) دەڵێ: پرسیارم کرد لە (أُبي کوڕی سعد) (ﷺ) و وتم (مسعود)ی برات دەڵێت: ئەوەی بەدرێژای ساڵ شەو و ڕۆژ شەو نوێژ بکات بەشەوی قەدر دەگات، دیارە ڕەحمەتی خوای لێ بێ ویستویەتی خەڵکی پاڵ نەدەنەوە، چونکە ئەو چاك دەزانێت کەلەڕەمەزاندایە، وە لە دە شەوی کۆتایشدایە و شەوی بیست و حەوتیشە، پاشان سوێندی خوارد بەبێ دودڵی کە شەوی بیست و حەوتە، منیش ووتم: بەچ شتێك [بەڵگەیەك] ئەوە دەڵێیت ئەی [ابو منذر]؟ ووتی بەو نیشانەو بەڵگەیەی کە پێغەمبەر (ﷺ) باسی فەرمووە، کە ئەویش ئەوەیە کاتێ خۆر هەڵدێت تیشکی نییە.

# بەشی حـــــەج

## (١) حەج یەکجار فەرزە لەتەمەندا

٦٣٢ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: خَطَبَنَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالَ: ((أَيُّهَا النَّاسُ، قَدْ فَرَضَ اللَّهُ عَلَيْكُمُ الْحَجَّ، فَحُجُّوا)). فَقَالَ رَجُلٌ: أَكُلَّ عَامٍ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَسَكَتَ، حَتَّى قَالَهَا ثَلَاثًا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((لَوْ قُلْتُ نَعَمْ لَوَجَبَتْ، وَلَمَا اسْتَطَعْتُمْ)). ثُمَّ قَالَ: ((ذَرُونِي مَا تَرَكْتُكُمْ، فَإِنَّمَا هَلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ بِكَثْرَةِ سُؤَالِهِمْ، وَاخْتِلَافِهِمْ عَلَى أَنْبِيَائِهِمْ، فَإِذَا أَمَرْتُكُمْ بِشَيْءٍ فَأْتُوا مِنْهُ مَا اسْتَطَعْتُمْ، وَإِذَا نَهَيْتُكُمْ عَنْ شَيْءٍ فَدَعُوهُ)). [بخاري/ الاعتصام بالكتاب و السنة]

(ابو هريره) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتاری بۆ داین و فەرمووی: ((خەڵکینە، خوای گەورە حەجی لەسەر فەرزکردوون، حەج بکەن))، کابرایەك وتی: هەموو ساڵێك ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)؟ پێغەمبەر (ﷺ) بێدەنگ بوو، هەتا کابرا سێ جار دووبارەی کردەوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((ئەگەر بموتایە بەڵێ، فەرز دەبوو لەسەرتان و، نەشتان دەتوانی ئەنجامی بدەن)). پاشان فەرمووی: ((وازم لێبێنێت ئەوەندە لەشت مەکۆڵنەوە، چونکە ئەوانەی پێش ئێوە تیاچوون بەهۆی پرسیار زۆرکردن و لە فەرمان دەرچوونی پێغەمبەرانیانەوە، ئەگەر فەرمانی شتێکم پێکردن چەندەتان توانی ئەنجامی بدەن، ئەگەر ڕێگری شتێکم لێکردن دەستبەرداری بن و وازی لێبهێنن)).

## (٢) پاداشتی حەج و عەمرە

٦٣٣ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ ((الْعُمْرَةُ إِلَى الْعُمْرَةِ كَفَّارَةٌ لِمَا بَيْنَهُمَا، وَالْحَجُّ الْمَبْرُورُ لَيْسَ لَهُ جَزَاءٌ إِلَّا الْجَنَّةُ)). [بخاري/ العمرة/ ١٦٨٣]

(ابو هريره) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((لە عەمرەیەکەوە بۆ عەمرەیەکی تر کەفارەتی گوناهی نێوانیانە، حەجی وەرگیراویش پاداشتی تەنها بەهەشتە))

٦٣٤ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((مَنْ أَتَى هَذَا الْبَيْتَ، فَلَمْ يَرْفُثْ وَلَمْ يَفْسُقْ، رَجَعَ كَمَا وَلَدَتْهُ أُمُّهُ)). [بخاري/ الإحصارو جزاء الصيد/ ١٧٢٣]

(ابو هريره) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((ئـەوەی بێـت بـۆ ئـەم ماڵـە [واتە کەعبە] ڕەفتار و گوفتاری نابەجێ نەکات، گوناه و تـاوان ئەنجام نـەدات، دەگەڕێتەوە ئەو دۆخەی وەکو تازە لە دایك بوبێت...))

## (٣) گەورە حەج

٦٣٥ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: بَعَثَنِي أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ (ﷺ) -فِي الْحَجَّةِ الَّتِي أَمَّرَهُ عَلَيْهَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) قَبْلَ حَجَّةِ الْوَدَاعِ- فِي رَهْطٍ يُؤَذِّنُونَ فِي النَّاسِ يَوْمَ النَّحْرِ: لَا يَحُجُّ بَعْدَ الْعَامِ مُشْرِكٌ، وَلَا يَطُوفُ بِالْبَيْتِ عُرْيَانٌ. قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: فَكَانَ حُمَيْدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ يَقُولُ: يَوْمُ النَّحْرِ يَوْمُ الْحَجِّ الْأَكْبَرِ، مِنْ أَجْلِ حَدِيثِ أَبِي هُرَيْرَةَ. [بخاري/ الصلاة في الثياب/ ٣٦٢]

(ابو هريره) (ﷺ) دەڵێ: (ابو بكر الصديق) (ﷺ) ناردمی لـەو حەجـەدا کە پێغەمبەر (ﷺ) کردبوی بە ئەمیری پێش حەجی ماڵئاوایی لەگەڵ دەستەیەکدا تا بانگەواز بکەین لـەناو خـەڵکیدا لـەڕۆژی جەژنی قوربانـدا، کە ئەمساڵ بـەدواوە هیچ موشرکێك نابێ حەج بکات، هیچ کەس بەڕوتی نابێ تەوافی کەعبـە بکات. (ابن مشهاب) دەڵێ: (حمیدی کوڕی عبدالرحمن) دەیوت ڕۆژی جەژنی قوربان ڕۆژی گەورە حەجە. لەبەر ئەم ڕیوایەتەی (ابو هريره).

## (٤) گەورەیی ڕۆژی عەرەفە

٦٣٦ـ عن عَائِشَةُ (ﷺ): إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ((مَا مِنْ يَوْمٍ أَكْثَرَ مِنْ أَنْ يُعْتِقَ اللَّهُ فِيهِ عَبْدًا مِنَ النَّارِ مِنْ يَوْمِ عَرَفَةَ، وَإِنَّهُ لَيَدْنُو، ثُمَّ يُبَاهِي بِهِمُ الْمَلَائِكَةَ فَيَقُولُ: مَا أَرَادَ هَؤُلَاءِ)).

(عائشه) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: هیچ ڕۆژێك نیـە ئەوەنـدەی ڕۆژی عەرەفەخوای گـەورە بـەندەی تیـادا ئـازاد بکـات لـە ئـاگری دۆزەخ، لـەو ڕۆژەدا خوای گەورە نزیك دەبێتەوە و شانازی دەکات بەوانەوە لای فریشتەکان و دەفەرموێت: ئەوانە چییان دەوێت [بێجگە لە ڕەزامەندی من] !!.

### (٥) دوعای سواربونی (هۆکاری سەفەر)

٦٣٧ـ عن عَلِيٍّ الْأَزْدِيَّ: أَنَّ ابْنَ عُمَرَ (ﷺ) عَلَّمَهُمْ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) كَانَ إِذَا اسْتَوَى عَلَى بَعِيرِهِ خَارِجًا إِلَى سَفَرٍ كَبَّرَ ثَلَاثًا، ثُمَّ قَالَ: ((سُبْحَانَ الَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَذَا وَمَا كُنَّا لَهُ مُقْرِنِينَ. وَإِنَّا إِلَى رَبِّنَا لَمُنْقَلِبُونَ. اللَّهُمَّ إِنَّا نَسْأَلُكَ فِي سَفَرِنَا هَذَا الْبِرَّ وَالتَّقْوَى، وَمِنَ الْعَمَلِ مَا تَرْضَى. اللَّهُمَّ هَوِّنْ عَلَيْنَا سَفَرَنَا هَذَا، وَاطْوِ عَنَّا

(ابو هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((لەکاتێکدا دوو ژن کە هەریەکەیان کوڕێکی خۆیی لەگەڵ دەبێت گورگێك هات و کوڕی یەکێکیانی برد. ئەمەیان [کە کوڕەکەی براوە] بەوی تریانی وت: کوڕەکەی تۆی بردوە، ئەویش وتی: نەخێر کوڕەکەی تۆی بردوە، ئەویش وتی: نەخێر کوڕەکەی تۆی بردوە، ئینجا هەردووکیان کێشەکەیان بردە لای داود ئەویش منداڵەکەی دابە ژنە گەورەکەیان، ئینجا هەردووکیان چوون بۆ خزمەت (سليمان)ی کوڕی (داود) (ﷺ) و بەسەرهاتی خۆیانیان بۆ گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: ((چەقۆیەکم بۆبێنن تا [ئەم منداڵەی کە ماوە] بیکەم بە دوو کەرتەوە لە نێوانتانا. ژنە بچکۆلەکە وتی: نەء، خوا ڕەحمت پێ بکا، ئەوە کوڕی ئەوە. ئیتر بڕیاری دا کە منداڵەکە بۆ ژنە بچوکەکە بێت)). دەڵێ: (ابو هريره) وتی: بەخوا ئەو ڕۆژە نەبێت نەمبیستووە کە بەچەقۆ [بە زمانی عەرەبی] بووترێت (سكين) ئێمە هەردەمان ووت: (مُدية).

## ( ٨ ) دادوەر ناکۆکی لا دەبات

١٠٠٩ـ عن أَبي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قال: قال رَسُولُ الله (ﷺ): ((اشْتَرَى رَجُلٌ مِنْ رَجُلٍ عَقَارًا لَهُ، فَوَجَدَ الرَّجُلُ الَّذِي اشْتَرَى الْعَقَارَ فِي عَقَارِهِ جَرَّةً فِيهَا ذَهَبٌ، فَقَال لَهُ الَّذِي اشْتَرَى الْعَقَارَ: خُذْ ذَهَبَكَ مِنِّي، إِنَّمَا اشْتَرَيْتُ مِنْكَ الْأَرْضَ وَلَمْ أَبْتَعْ مِنْكَ الذَّهَبَ، فَقَالَ الَّذِي شَرَى الْأَرْضَ: إِنَّمَا بِعْتُكَ الْأَرْضَ وَما فِيهَا قَالَ: فتحَاكَمَا إِلَى رَجُلٍ، فَقَالَ الَّذِي تَحَاكَمَا إِلَيْهِ: أَلَكُمَا وَلَدٌ؟ فَقَالَ أَحدُهُمَا: لِي غُلَامٌ، وقَالَ الآخَرُ: لِي جَارِيَةٌ، قَالَ: أَنْكِحُوا الْغُلَامَ الْجَارِيَةَ، وَأَنْفِقُوا عَلَى أَنْفُسِكُمَا مِنْهُ وَتَصَدَّقَا)).

لە(ابو هريرة)وە(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((پیاوێك زەویەکی لە پیاوێکی تر کڕی، لەزەویەکەدا کوپەیەك ئاڵتونی دۆزیەوە، ئەو پیاوەی زەویەکەی کڕی بوو بە فرۆشیارەکەی وت: وەرە ئاڵتوونەکەت بەرەوە چونکە من تەنها زەویەکەم لێکڕیوی نەك ئاڵتوون فرۆشیارەکەیش وتی: من زەویەکە و ئەوەی کە تێیدایە پێم فرۆشتووی، ئینجا دێن بۆلای پیاوێك تا چارەیان بکات ئەویش پێیان دەڵێ: منداڵتان هەیە؟ یەکێکیان دەڵێت من کوڕێکم هەیە ئەوی تریشیان دەڵێت: منیش کچێکم هەیە. ئەویش دەڵێ: دە کچەکە بدەن بە کوڕەکە و لەو ماڵە خەرج کەن بۆ هەردوولاتان و خێریشی لێبکەن)).

١٠١٠ـ عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ (رضي الله عنه): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: ((أَلَا أُخْبِرُكُمْ بِخَيْرِ الشُّهَدَاءِ؟ الَّذِي يَأْتِي بِشَهَادَتِهِ قَبْلَ أَنْ يُسْأَلَهَا)).

لە(زید)ی کوڕی (خالد)ی (جهنی)یەوە: کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((ئایا پێتان بڵێم چاکترین شایەت کێیە؟ چاکترین شایەت ئەو کەسەیە کە شایەتیەکەی دەدات پێش ئەوەی داوای لێبکرێت)).

# (٣١) بەشی هەڵگرتنەوەی شتی ونبوو

## (١) حوكمی هەڵگرتنەوەی ونبوو

١٠١١. عن زَيْدَ بْنَ خَالِدٍ الْجُهَنِيَّ (ﷺ) صَاحِبَ رَسُولِ (ﷺ) قَالَ: سُئِلَ رسُولُ (ﷺ) عَنِ اللُّقَطَةِ: الذَّهَبِ أَوِ الْوَرِقِ؟ فَقَالَ: ((اعْرِفْ وِكَاءَهَا وَعِفَاصَهَا، ثُمَّ عَرِّفْهَا سَنَةً، فَإِنْ لَمْ تَعْرِفْ فَاسْتَنْفِقْهَا، وَلْتَكُنْ وَدِيعَةً عِنْدَكَ، فَإِنْ جَاءَ طَالِبُهَا يَوْمًا مِنَ الدَّهْرِ فَأَدِّهَا إِلَيْهِ)). وَسَأَلَهُ عَنْ ضَالَّةِ الْإِبِلِ؟ فَقَالَ: ((مَا لَكَ وَلَهَا؟ دَعْهَا، فَإِنَّ مَعَهَا حِذَاءَهَا وَسِقَاءَهَا، تَرِدُ الْمَاءَ وَتَأْكُلُ الشَّجَرَ حَتَّى يَجِدَهَا رَبُّهَا)). وَسَأَلَهُ عَنِ الشَّاةِ؟ فَقَالَ: ((خُذْهَا، فَإِنَّمَا هِيَ لَكَ أَوْ لِأَخِيكَ أَوْ لِلذِّئْبِ)).

(زيد)ی كوڕی (خالد الجهنی)، هاوەڵی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەڵێ: پرسیار لە پێغەمبەر (ﷺ) كرا سەبارەت بە هەڵگرتنەوەی شتی ون بوو: زێڕ یا زیو [مەبەست پارەیە]؟ ئەویش فەرمووی: ((سەیركە بزانە دەمی توورەكەكەی بەچی بەستراوە و تورەكەكەیش چی‌یە و چۆنە؟ پاشان تا ساڵێ جاڕی بۆ بدە، ئەگەر نەناسراو خاوەنی نەبوو خەرجی كە و ئەوە سپاردە بێت لای خۆت، جا ئەگەر خاوەنەكەی ڕۆژێ لە ڕۆژان هاتەوە بۆی بیدەرەوە)) ئینجا پرسیاری لێكرد سەبارەت بە حوشتری ون بوو؟ ئەویش فەرمووی: ((تۆ چیتە بەسەریەوە؟ وازی لێبێنە، پێلاوی خۆی و جەوەندە ئاوی خۆیی پێیە خۆی دێتە سەر ئاو و درەخت دەخوا تا خاوەنەكەی دەیدۆزێتەوە)). ئینجا پرسیاری لێكرد دەربارەی مەڕ ومالاتی ون بوو؟ فەرمووی: ((بیگرە لای خۆت، چونكە یا بۆ تۆ دەبێت یا بۆ براكەت یا بۆ گورگ)).

## (٢) دەربارەی هەڵگرتنەوەی شتی ونبووی حاجی {لەحەجدا}

١٠١٢ـ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عُثْمَانَ التَّيْمِيِّ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) نَهَى عَنْ لُقَطَةِ الْحَاجِّ.

لە(عبدالرحمن)ی كوڕی (عثمان)ی (التيمی)یەوە دەگێڕنەوە كە پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگری كردووە لەوەی كە شتی ون بووی حاجی [لەحەجدا] هەڵبگیرێتەوە.

## ( ٣ ) کەسێ ونبوویەك هەڵگرێتەوە ئەوە سەر لێشێواوە

١٠١٣ـ عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ (ﷺ) عَنْ رَسُول (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: ((مَنْ آوَى ضَالَّةً فَهُوَ ضَالٌّ، مَا لَمْ يُعَرِّفْهَا)).

لە(زید)ی کوڕی (خالد)ی (جهنی)یەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((هەر کەسێك شتێکی وون بوو هەڵگرێتەوە بۆ خۆی و جاڕی بۆ نەدات، ئەوە سەر لێشێواوە)).

## ( ٤ ) ڕێگرکردن لە دۆشینی مەڕو ماڵاتی خەڵکی بەبێ ڕەزامەندی خۆیان

١٠١٤ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ (ﷺ) قَالَ: ((لَا يَحْلُبَنَّ أَحَدٌ مَاشِيَةَ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذْنِه، أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَنْ تُؤْتَى مَشْرُبَتُهُ فَتُكْسَرَ خِزَانَتُهُ، فَيُنْتَقَلَ طَعَامُهُ، إِنَّمَا تَخْزُنُ لَهُمْ ضُرُوعُ مَوَاشِيهِمْ أَطْعِمَتَهُمْ، فَلَا يَحْلُبَنَّ أَحَدٌ مَاشِيَةَ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذْنِهِ)).

(ابن عمر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((با هیچ کەس مەڕ وماڵاتی هیچ کەس بەبێ ڕەزامەندی خۆی نەدۆشێت، ئایا کەسێك لە ئێوە پێی خۆشە بچنە ژووری گەنجینەکەی و گەنجینەکەی بشکێنرێت و خۆراکەکەی ببرێت، دە ئەوانیش گوانی مەڕو ماڵاتەکەیان، گەنجینەیە یانی خۆراکەکەیان بۆ هەڵدەگرێت، کەوابوو با هیچ کەس بێ ڕەزامەندی خاوەنەکەی مەڕ و ماڵاتی هیچ کەس نەدۆشێت)).

# (٣٢) بەشی میوانداریی

## ( ١ ) حوکمی کەسێك میوان ڕاگیر نەکات

١٠١٥ـ عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّكَ تَبْعَثُنَا، فَنَنْزِلُ بِقَوْمٍ فَلَا يَقْرُونَنَا، فَمَا تَرَى؟ فَقَالَ لَنَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ): ((إِنْ نَزَلْتُمْ بِقَوْمٍ فَأَمَرُوا لَكُمْ بِمَا يَنْبَغِي لِلضَّيْفِ فَاقْبَلُوا، فَإِنْ لَمْ يَفْعَلُوا فَخُذُوا مِنْهُمْ حَقَّ الضَّيْفِ الَّذِي يَنْبَغِي لَهُمْ)).

(عقبە)ی کوڕی (عامر) دەڵێ: وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا تۆ {بەملاولاماندا} دەنێریت، دێین بەسەر تیرەو هۆزی ئەو تۆدا کەچی میوانداریمان ناکەن، جا بەلاتەوە چۆنە؟ پێغەمبەریش (ﷺ) پێی فەرمووین: ((ئەگەر دابەزین لەسەر تیرە و هۆزێك و میوانداریان کردن وەکو پێویست ئەوە ئێوەیش بچن بە دەمیانەوە، ئەگەر میوانداریشیان نەکردن و خوڵکیان نەکردن ئەوە ئەمەندەی کە پێویستە مافی میوانداری خۆتانیان لێوەرگرن {ئەگەر بەزۆریش بێت})).

## ( ٢ ) فەرمان بە میوانداریی

١٠١٦ـ عَنْ أَبِي شُرَيْحٍ الْخُزَاعِيِّ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): ((الضِّيَافَةُ ثَلَاثَةُ أَيَّامٍ، وَجَائِزَتُهُ يَوْمٌ وَلَيْلَةٌ، وَلَا يَحِلُّ لِرَجُلٍ مُسْلِمٍ أَنْ يُقِيمَ عِنْدَ أَخِيهِ حَتَّى يُؤْثِمَهُ)). قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَكَيْفَ يُؤْثِمُهُ؟ قَالَ: ((يُقِيمُ عِنْدَهُ وَلَا شَيْءَ لَهُ يَقْرِيهِ بِهِ)).

لە(ابو شریح)ی (خزاعی)یەوە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((میوانداری سێ ڕۆژە، شەوو ڕۆژی یەکەم بایەخی زیاتری پێبدرێ، ڕەوانییە بۆ هیچ موسڵمانێك ئەمەندە لای برا موسڵمانەکەی بمێنێتەوە تاوەکو گوناهباری بکات. وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، چۆن گوناهباری دەکات؟ فەرمووی: ((لای بمێنێتەوە و هیچی وایش نەبێت میوانداری پێ بکات)).

## ( ٣ ) دەربارەی دەست گرۆیی بەماڵی زیادە

١٠١٧ـ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (ﷺ) قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ فِي سَفَرٍ مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) إِذْ جَاءَ رَجُلٌ عَلَى رَاحِلَةٍ لَهُ، قَالَ: فَجَعَلَ يَصْرِفُ بَصَرَهُ يَمِينًا وَشِمَالًا، فَقَالَ

رَسُولُ (ﷺ): ((مَنْ كانَ مَعَهُ فَضْلُ ظَهْرٍ فَلْيَعُدْ بِهِ عَلَى مَنْ لَا ظَهْرَ لَهُ، وَمَنْ كَانَ لَهُ فَضْلٌ مِنْ زَادٍ فَلْيَعُدْ بِهِ عَلَى مَنْ لَا زَادَ لَهُ)). قَالَ: فَذَكَرَ مِنْ أَصْنَافِ الْمَالِ مَا ذَكَرَ، حَتَّى رَأَيْنَا أَنَّهُ لَا حَقَّ لِأَحَدٍ مِنَّا فِي فَضْلٍ.

(ابو سعيد)ی (الخدري)(ﷺ) دەڵێ: لەكاتێكدا ئێمە لەسەفەرێكدا لە خزمەت پێغەمبەری خوادا بووین. ئەمەندەمان زانی پیاوێك بەسواری وولاغێكەوە هات، دەڵێ: كابرا هەر چاوە چاوی بوو بەلای ڕاست و چەپی خۆیدا ئەیڕوانی، لەو كاتەدا پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: ((هەر كەس وڵاخێكی سواری زیادەی هەیە با بیدات بە كەسێك كە پێی نیە، و هەر كەسێكیش توێشووی زیادەی پێیە با بیدات بە كەسێك پێی نی‌یە)) دەڵێ: لە هەموو چەشنەماڵێكی ئەوتۆی باس كرد كە ، تاوەكوو هاتینە سەر ئەو قەناعەتەی كە هیچ كام لە ئێمە مافی هەبوونی هیچ زیادەیەكی لە خۆی نەبێت)).

## ( ٤ ) فەرمان كردن بە گرد كردنەوەی توێشووەكان لەكاتی تەنگانەدا

١٠١٨ـ عن إِيَاسُ بْنُ سَلَمَةَ، عَنْ أَبِيهِ (ﷺ) قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فِي غَزْوَةٍ، فَأَصَابَنَا جَهْدٌ، حَتَّى هَمَمْنَا أَنْ نَنْحَرَ بَعْضَ ظَهْرِنَا، فَأَمَرَ نَبِيُّ (ﷺ) فَجَمَعْنَا مَزَاوِدَنَا، فَبَسَطْنَا لَهُ نِطَعًا. فَاجْتَمَعَ زَادُ الْقَوْمِ عَلَى النِّطَعِ، قَالَ: فَتَطَاوَلْتُ لِأَحْزِرَهُ كَمْ هُوَ؟ فَحَزَرْتُهُ كَرَبْضَةِ الْعَنْزِ، وَنَحْنُ أَرْبَعَ عَشْرَةَ مِائَةً، قَالَ: فَأَكَلْنَا حَتَّى شَبِعْنَا جَمِيعًا، ثُمَّ حَشَوْنَا جُرُبَنَا، فَقَالَ نَبِيُّ اللهِ (ﷺ): ((فَهَلْ مِنْ وَضُوءٍ)). قَالَ: فَجَاءَ رَجُلٌ بِإِدَاوَةٍ [لَهُ] فِيهَا نُطْفَةٌ، فَأَفْرَغَهَا فِي قَدَحٍ، فَتَوَضَّأْنَا كُلُّنَا نُدَغْفِقُهُ، دَغْفَقَةً أَرْبَعَ عَشْرَةَ مِائَةً، قَالَ: ثُمَّ جَاءَ بَعْدَ ذَلِكَ ثَمَانِيَةٌ، فَقَالُوا: هَلْ مِنْ طَهُورٍ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): ((فَرِغَ الْوَضُوءُ)).

لە(ایاس)ی كوڕی (سلمه)ەوە (ﷺ) ئەویش لە باوكیەوە، دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) دەرچووین بۆ جەنگێك، تووشی برسێتی و فەلاكەتێك هاتین، تاوەكو خەریك بوو هەندێ لە وولاخی سواریەكانمان سەر بڕین، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمانی دەركرد، ئێمەیش هەگبەی توێشووەكانمان كۆكردەوە و كەوڵێكمان {لە پێستی خۆشەكراو} بۆڕاخست توێشووی خەڵكەكە لەسەر كەوڵەكە كۆكرایەوە دەڵێ: منیش خۆم درێژ كرد تا بزانم مەزەندەی بكەم چەندێك دەبێت؟ سەیرەكەم بەئەندازەی بزنێكە كە مۆڵگی خواردبێت. ئێمەیش هەزار و چوار صەد كەس بووین دەڵێ: كەچی هەر هەموویشمان تێرمان خوارد

و توێشە بەرەکانیشمان لێپڕکرد، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((ئەی ئاوی دەست نوێژ هەیە)) دەڵێ: پیاوێك لەولاوە بە جەوەندەیەکەوە هات کەمێك ئاوی تیا بوو ئەویش کردیە ناو دۆلکەیەکەوە، ئێمەیش دەستنوێژمان گرت هەر هەموو بە خوڕ لێمان دادەکرد کە ژمارەکەمان هەزار و چوارسەد کەس بوو، دەڵێ: پاش ئەوە هەشت کەس هاتن، ووتیان: ئاوی دەست نوێژماوە؟ پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: ((ئاوی دەست نوێژ تەواو بوو)).

# (٣٣) بەشى جيهاد

## ( ١ ) لەبارەى فەرموودەى خواوە (( واگومان مەبەن ئەوانەى لەڕێگەى خوادا كوژراون مردوون ))

١٠١٩. عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: سَأَلْنَا عَبْدَ اللَّهِ (ﷺ) عَنْ هذه الْآيَةِ: ﴿ولا تحْسبنَ الَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتًا بَلْ أَحْيَاءٌ عِنْدَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ﴾ [آل‌عمران:١٦٩]. قَالَ: أَمَا إِنَّا قَدْ سَأَلْنَا عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: ((أَرْوَاحُهُمْ فِي جَوْفِ طَيْرٍ خُضْرٍ، لَهَا قَنَادِيلُ مُعَلَّقَةٌ بِالْعَرْشِ، تَسْرَحُ مِنَ الْجَنَّةِ حَيْثُ شَاءَتْ، ثُمَّ تَأْوِي إِلَى تِلْكَ الْقَنَادِيلِ، فَاطَّلَعَ إِلَيْهِمْ رَبُّهُم اطِّلَاعَةً فَقَالَ: هَلْ تَشْتَهُونَ شَيْئًا؟ قَالُوا: أَيَّ شَيْءٍ نَشْتَهِي، وَنَحْنُ نَسْرَحُ مِنَ الْجَنَّةِ حَيْثُ شِئْنَا؟ فَفَعَلَ ذَلِكَ بِهِمْ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ. فَلَمَّا رَأَوْا أَنَّهُمْ لَنْ يُتْرَكُوا مِنْ أَنْ يُسْأَلُوا، قَالُوا: يَا رَبِّ، نُرِيدُ أَنْ تَرُدَّ أَرْوَاحَنَا فِي أَجْسَادِنَا، حَتَّى نُقْتَلَ فِي سَبِيلِكَ مَرَّةً أُخْرَى. فَلَمَّا رَأَى أَنْ لَيْسَ لَهُمْ حَاجَةٌ تُرِكُوا)).

(مسروق) دەڵێ: پرسیارمان لە (عبدالله)ی كوڕی (مسعود)كرد دەربارەی ئەم ئایەتە كە ئەمە ماناكەیەتی ﴿گومان وامەبەن ئەوانەی كە لەڕێگەی خوادا كوژراون مردوون بەڵكو زیندوون و لای پەروەردگاریان ڕۆزی دەدرێن﴾ ئەویش وتی: ئێمەش پرسیارمان لەپێغەمبەر (ﷺ) كرد ئەویش فەرمووی: ((گیانیان وا لەناو سكی باڵندەیەكی سەوزدا، خاوەنی چەند چرایەكی هەڵواسراو بە عەرشەوە. لەبەهەشتا چەندە بیانەوێ‌و بۆ هەركوێ بیانەوێ دەگەڕێن پاشان دێنەوە بۆلای ئەو چرایانە، پەروەردگاریان تەماشایەكیان دەكات و دەفەرموێت: ((ئایا حەز لە هیچ دەكەن)) دەڵێن: حەز بەچی بكەین لە كاتێكدا ئێمە بەئارەزووی خۆمان بۆ كوێ بمانەوێ لەبەهەشتا دەگەڕێین؟ تا سێ جار ئەمەیان پێ دەفەرموێت، كاتێ دەبینن وازیان لێناهێنرێت تا داوای شتێك نەكەن، دەڵێن: پەروەردگار، داوات لێدەكەین كەجارێكی دیكە گیانمان بگەڕێنەوە بۆ لاشەمان تا جارێكیتر لە پێناوی تۆدا بكوژرێین كاتێ دەبینێ هیچ داوایەكیان نییە وازیان لێدەهێنرێت))

## (٢) دەرگاکانی بەهەشت لەژێر سێبەری شمشێرەکاندان

١٠٢٠ـ عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ قَيْسٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي وَهُوَ بِحَضْرَةِ الْعَدُوِّ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ (ﷺ): ((إِنَّ أَبْوَابَ الْجَنَّةِ تَحْتَ ظِلَالِ السُّيُوفِ)). فَقَامَ رَجُلٌ رَثُّ الْهَيْئَةِ، فَقَالَ: يَا أَبَا مُوسَى آنْتَ سَمِعْتَ رَسُولَ الله (ﷺ) يَقُولُ هَذَا؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: فَرجَعَ إِلَى أَصْحَابِهِ فقال: أَقْرَأُ عَلَيْكُمُ السَّلَامَ، ثُمَّ كَسرَ جَفْنَ سَيْفِه فأَلْقَاهُ، ثُمّ مشى بِسيْفِهِ إِلى الْعدُوِّ فضرب بِهِ حَتَّى قُتِل.

له (ابو بكر)ی کوڕی (عبدالله)ی کوڕی (قیس) ئەویش لە باوکیەوە دەڵێ: گوێم لە باوکم بوو لـە کـاتێکدا ئامـادەی جـەنگ بـوو ڕووبـە دوژمـن دەیـوت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((لەڕاستیدا دەرگاکانی بەهەشت لە ژێـر سـێبەری شمشێرەکاندان)) پیاوێکی شڕۆڵ وتی: ئەی (ابو موسی) تۆ خۆت گوێت لە پێغەمبەر (ﷺ) بووە کە وابفەرمووێت؟ وتی: بەڵێ، دەڵێ: ئیتر گەڕایەوە بۆ لای هاوەڵەکانی وتـی: سـەلامتان لێدەکـەم [خـوا حـافیزی کـرد] و پاشـان کێلانـی شمشـێرەکەی شـکاند و فـڕێی داو بـەرەو دوژمـن ڕۆیشـت هـەر بـەردەوام بـە شمشێرەکەی لە دوژمنی ئەدا هەتا کوژرا.

## (٣) هاندان بۆ جیهاد

١٠٢١ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): ((تَضَمَّنَ اللَّهُ لِمَنْ خَرَجَ فِي سَبِيلِهِ، لَا يُخْرِجُهُ إِلَّا جِهَادًا فِي سَبِيلِي وَإِيمَانًا بِي وَتَصْدِيقًا بِرُسُلِي، فَهُوَ عَلَيَّ ضَامِنٌ أَنْ أُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ، أَوْ أَرْجِعَهُ إِلَى مَسْكَنِهِ الَّذِي خَرَجَ مِنْهُ، نَائِلًا مَا نَالَ مِنْ أَجْرٍ أَوْ غَنِيمَةٍ. وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، مَا مِنْ كَلْمٍ يُكْلَمُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ إِلَّا جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَهَيْئَتِهِ حِينَ كُلِمَ، لَوْنُهُ لَوْنُ دَمٍ وَرِيحُهُ مِسْكٌ، وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، لَوْلَا أَنْ يَشُقَّ عَلَى الْمُسْلِمِينَ مَا قَعَدْتُ خِلَافَ سَرِيَّةٍ تَغْزُو فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَبَدًا، وَلَكِنْ لَا أَجِدُ سَعَةً فَأَحْمِلَهُمْ، وَلَا يَجِدُونَ سَعَةً، وَيَشُقُّ عَلَيْهِمْ أَنْ يَتَخَلَّفُوا عَنِّي. وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، لَوَدِدْتُ أَنِّي أَغْزُو فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَأُقْتَلُ، ثُمَّ أَغْزُو فَأُقْتَلُ، ثُمَّ أَغْزُو فَأُقْتَلُ)).

(ابو هريره)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((خوای گەورە دەستە بـەری ئـەو کەسـەی کـردوە کـە لـە پێنـاوی ئـەودا دەربچێـت و فەرموویـەتی: ((هەرکەس دەرچوونەکەی تەنها لەڕێگەی مندا و باوەڕ بەمن و بەڕاست زانینی پێغەمبەرەکانمدا بێت ئەوە من زامنـی ئـەوەی بۆ دەکـەم بیخەمە بەهەشت، یان

بیگێڕمەوە بۆ ئەوماڵەی لێی دەرچووە لەگەڵ ئەوەی بەدەستی هێناوە لەپاداشت و دەستکەوتی جەنگ سوێند بەو کەسەی گیانمی بەدەستە هیچ برینێك نی‌یە کەلەڕێگەی خوادا کرابێت مەگەر کاتێك [خاوەنەکەی] لە ڕۆژی قیامەت دێت و زیندوو دەبێتەوە وەکو خۆی چۆن بریندار بووە لەو کاتەدا بریندار بووە ڕەنگی برینەکەی ڕەنگی خوێنە وبۆنەکەیشی بۆنی میسکە. سوێند بەو کەسەی گیانی محمدی بەدەستە. ئەگەر لەبەر ئەوە نەبێ ببێتە زەحمەت لەسەر موسڵمانان لەپاش هیچ لەشکرێکەوە کە دەرچێت و بجەنگێت لە ڕێگەی خوادا هەرگیز دانەئەنیشتم و نەئەمامەوە، بەڵام من ئەمەندەم لەدەستدا نی‌یە بتوانم هەڵیان گرم و ئەوانیش ئەمەندەیان لە دەستدا نی‌یە. لایشیان ناڕەحەتە لەمن دوا بکەون، سوێند بەوەی گیانی محەمەدی بەدەستە من حەزدەکەم لە ڕێگەی خوادا بجەنگم و بکوژرێم، هەمدیسان بجەنگم و بکوژرێم دیسان بجەنگم و بکوژرێمەوە)).

## ( ٤ ) بەرزکردنەوەی پلەوپایەی بەندەبە جیهاد

١٠٢٢ـ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: ((يَا أَبَا سَعِيدٍ، مَنْ رَضِيَ بِاللَّهِ رَبًّا، وَبِالْإِسْلَامِ دِينًا، وَبِمُحَمَّدٍ نَبِيًّا، وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ)). فَعَجِبَ لَهَا أَبُو سَعِيدٍ فَقَالَ: أَعِدْهَا عَلَيَّ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَفَعَلَ، ثُمَّ قَالَ: ((وَأُخْرَى يُرْفَعُ بِهَا الْعَبْدُ مِائَةَ دَرَجَةٍ فِي الْجَنَّةِ، مَا بَيْنَ كُلِّ دَرَجَتَيْنِ كَمَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ)). قَالَ: وَمَا هِيَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: ((الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ)).

(أبو سعيد)ی (الخدري)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((ئەی (أبو سعيد) هەر کەس ڕازی بێت بەوەی خوا پەروەردگاری بێت و محمدیش پێغەمبەری بێت، بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێت (أبو سعيد)یش سەری سوڕما وتی: بۆم دووبارە بکەرەوە ئەی پێغەمبەری خوا، ئەویش بۆی دووبارە کردەوە، پاشان فەرمووی: ((شتێکی دیکەیش کەبەندە تیایدا صەد پلە لە بەهەشتا پێی بەرز و بلند دەبێتەوە، هەر نێوان دوو پلەش بە ئەندازەی نێوان ئاسمان و زەوی‌یە)) وتی: ئەوە چی‌یە ئەی پێغەمبەری خوا؟. فەرمووی: ((جیهاد کردنە لە ڕێگەی خوادا، جیهاد کردنە لە ڕێگەی خوادا)).

## ( ٥ ) موجاهيد چاكترينى خەڵكىيە

١٠٢٣ـ عنْ أبي سعيدٍ الْخُدْريّ (ﷺ): انّ رجُلًا اتى النّبــيّ (ﷺ) فقــال: ايّ النّاس أفْضلُ؟ فقال: ((رجُلٌ يُجاهدُ في سبيل اللّه بماله ونفْسه)). قال: ثُمّ منْ؟ قال: ((مُؤْمنٌ في شعْبٍ من الشّعاب يعْبُدُ اللّه ربّهُ، ويدعُ النّاس منْ شرّه)).

(ابو سعيد)ى (الخدرى)(ﷺ) دەڵىّ: پياوێك هاتە خزمەتى پێغەمبەر (ﷺ) وتى: چاكترين كەس كىّيە؟ ئەويش فەرمووى: ((پياوێكە جيهاد بكات لەرێى خوادا بەماڵ و گيانى خۆى)) وتى: پاشان كىّيە؟ فەرمووى: ((بڕواداريكيش لە شيوێك لەشيوەكان [خۆى مەڵاس بدات] و پەروەردگارى بپەرستێت و خەڵكى لەزيانى بە دوورگرێت)).

## ( ٦ ) كەسێ بمرێت و نەجەنگێت [لەرێگەى خوادا] و بەخەياڵيشيا نەيەت

١٠٢٤ـ عنْ أبي هُريْرة (ﷺ)) قال: قال رسُولُ (ﷺ): ((منْ مات ولمْ يغْزُ، ولمْ يُحدِّثْ به نفْسهُ، مات على شُعْبةٍ منْ نفاقٍ)). قال عبْدُ اللّه بْنُ الْمُبارك: فنُرى أنّ ذلك كانَ علَى عهْد رسُول (ﷺ).

(أبو هريرة)(ﷺ) دەڵىّ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموويەتى: ((هەركەس بمرێت و جەنگى لەرێگەى خوادا نەكردبێت و بەدڵيشيدا نەهاتبێت كە بيكات، ئەوە لەسەر بەشێك لە دوڕوويى مردووە)) عبدالله)ى كوڕى (المبارك) دەڵىّ: ئێمە وامان گومان دەبرد كە ئەوە لەسەردەمى پێغەمبەرى خوادا بووبێت.

## ( ٧ ) خێرى جيهاد لەدەريادا

١٠٢٥ـ عَنْ أنس بْن مَالكٍ (ﷺ): أنّ رَسُول (ﷺ) كان يدْخُلُ على أُمّ حرام بنْت ملْحَانَ فَتُطْعمُهُ، وكَانتْ أُمُّ حرامٍ تَحْت عُبَادة بْن الصّامت (ﷺ). فدخَل عليْـها رَسُولُ (ﷺ) يَوْمًا فَأَطْعَمَتْهُ، ثُمّ جلسَتْ تفْلي رأْسهُ، فنام رسُولُ (ﷺ). ثُمّ اسْتيْقظ وَهُوَ يَضْحَكُ، قَالَتْ: فَقُلْتُ: ما يُضْحكُكَ يا رَسُول اللّه؟ قال: ((ناسٌ منْ أمّتي عُرِضُوا عَلَيّ غُزاةً فِي سَبِيلِ اللّه، يرْكبُون ثبج هذا البحْر مُلُوكا على الأسرّة، أوْ: مثْلَ الْمُلُوكِ عَلَى الْأَسرَّة)). يَشُكُّ أَيّهُما قَال. قالتْ: فَقُلْتُ: يا رسُولَ اللّـه ادْعُ اللّهَ أَنْ يَجْعَلَني منْهُمْ. فَدعا لَها، ثُمَّ وَضَعَ رَأْسهُ، فنَام. ثُمّ اسْتيْقظ وهُو يَضْحكُ، قَالَتْ: فَقُلْتُ: مَا يُضْحكُك يا رسُول اللّه؟ قال: ((ناسٌ منْ أُمّتي عُرضُوا علَيّ غُزاةً فِي سَبِيلِ اللّه)). كما قَال في الْأولى. قالتْ: فقُلتُ: يا رسُول اللّه ادْعُ اللّه أنْ

يجْعَلَني مِنْهُمْ. قَالَ: ((أَنْتِ مِنَ الْأَوَّلِينَ)). فَرَكِبتْ أُمُّ حَرَام بِنْتُ مِلْحَانَ الْبحْرَ في زَمَنِ مُعَاوِيَةَ، فَصُرِعَتْ عَنْ دَابَّتِها حِينَ خَرَجتْ مِنَ الْبَحْر فهلكتْ.

لـە(انس)ی کـوڕی (مـالك)ەوە (ﷺ) دەگێڕنـەوە: کـە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) ئەچوو بۆ سـەردانی (أم حـرام)ی کچـی (ملحـان) و ئـەویش خۆراکـی پـێدەدا (أم حرام) خێزانی (عبادە)ی کوڕی (الصـامت) بـوو. ڕۆژێـك پێغەمبـەر (ﷺ) چـوو بۆلای ئـەویش خۆراکـی پێداو پاشان دانیشت سـەری دەدۆزی. پێغەمبـەریش (ﷺ) خـەوی لێکـەوت پاشان بە پێکەنینـەوە خەبـەری بوویـەوە، (أم حـرام)یـش دەڵێ: بەچی پێدەکەنی ئەی پێغەمبەری خوا؟ ئەویش فەرمووی: ((کەسانێکم لە ئوممەتەکەم پێنیشاندرا کە ئەجەنگان لە ڕێگەی خوادا. سواری ناوەڕاستی ئـەم دەریا بووبوون پادشا بوون لەسەر تەخت، یا خوود وەك پادشا وابوون لەسـەر تەخت)) دووجار کامیانی فەرموو: دەڵـێ: وتم: ئـەی پێغەمبـەری خـوا بپـاڕێرەوە کە بمکات بە یـەکێ لەوانە. ئـەویش بـۆی دەپاڕێتـەوە. پاشان سـەردەنێتەوە و خـەوی لێدەکەوێتەوە، پاشتر دووبارە بە پێکەنینـەوە خەبـەری دەبێتـەوە، دەڵـێ: وتم: بـەچی پێدەکـەنی ئـەی پێغەمبـەری خـوا؟ فـەرمووی: ((کەسـانێکم لـە ئوممەتەکـەم پێنیشـان درا لـە ڕێگـەی خـوادا دەجـەنگان)) وەك لـەجاری پێشـودا فەرمووی. دەڵێ: منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا داوا لە خوا بکە کەبمکات بە یـەکێ لەوانـە. فـەرمووی: ((تـۆ لـە پێشـوەکانیت)) (أم حـرام) ئەمێنێتـەوە تـا لەسەردەمی (معاویە)دا سواری کەشتی دەبێت بەناو دەریـادا، کاتێ لەدەریاکە دەرچوو لەسەر وڵاخەکەی دەکەوێتە خوارەوە و تیا دەچێت.

## ( ٨ ) خێری سەنگەرگیری لە ڕێگەی خوادا

١٠٢٦ـ عَنْ سَلْمان (ﷺ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُول (ﷺ) يَقُولُ: ((رِبَاطُ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ خَيْرٌ مِنْ صِيَامِ شَهْرٍ وقِيَامِه. وَإِنْ مَاتَ جَرَى عليْهِ عَمَلُهُ الَّذِي كَانَ يَعْمَلُهُ، وَأُجْرِيَ عليْه رِزْقُهُ، وأَمِنَ الْفَتَّانَ)).

(سـلمان)(ﷺ) دەڵـێ: لـە پێغەمبـەرم (ﷺ) بیسـت کـە دەیفـەرموو: ((سەنگەرگیری شەوو ڕۆژێك [لەڕێگەی خوادا] چاکترە لە ڕۆژووی [سونەتی] مـانگێك و شـەونوێژی [شـەوەکانی] ئەگـەر لـەو ماوەیەشـدا بمرێت کـردەوە چاکـەکانی دونیـای هـەر بـە بـەردەوامی بـۆ دەمێنێتـەوە ورزق و ڕۆزیەکـەی بەردەوام دەبێت و لەسزای گۆڕیش دڵنیا دەبێت.

## ( ٩ ) سەر لەبەیانی یا سەر لە ئێوارە دەرچوونێك لەڕێگەی خوادا

١٠٢٧ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): ((لَغَدْوَةٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَوْ رَوْحَةٌ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا)).

(أنس)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((سوێند بە خوا سەر لەبەیانی دەرچونێك لە ڕێگەی خوادا یا سەر لە ئێوارە دەرچونێك چاکترە لە دونیا و هەرچی وا لە دنیادا)).

## ( ١٠ ) لەبارەی فەرموودەی خوا ﴿أجعلتم سقاية الحاج..﴾

١٠٢٨ـ عن النُّعْمَانُ بْنُ بَشِيرٍ (ﷺ) قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ مِنْبَرِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَقَالَ رَجُلٌ: مَا أُبَالِي أَنْ لَا أَعْمَلَ عَمَلًا بَعْدَ الْإِسْلَامِ إِلَّا أَنْ أُسْقِيَ الْحَاجَّ، وَقَالَ آخَرُ: مَا أُبَالِي أَنْ لَا أَعْمَلَ عَمَلًا بَعْدَ الْإِسْلَامِ إِلَّا أَنْ أَعْمُرَ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ، وَقَالَ آخَرُ: الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَفْضَلُ مِمَّا قُلْتُمْ، فَزَجَرَهُمْ عُمَرُ (ﷺ) وَقَالَ: لَا تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ عِنْدَ مِنْبَرِ رَسُولِ (ﷺ) وَهُوَ يَوْمُ الْجُمُعَةِ، وَلَكِنْ إِذَا صَلَّيْتُ الْجُمُعَةَ دَخَلْتُ فَاسْتَفْتَيْتُهُ فِيمَا اخْتَلَفْتُمْ فِيهِ. فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ الْحَاجِّ وَعِمَارَةَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ كَمَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ..﴾ الْآيَةَ إِلَى آخِرِهَا.

(نعمان)ی کوڕی (بشیر)(ﷺ) دەڵێ: من لای دوانگەکەی پێغەمبەری خوا بووم (ﷺ) پیاوێك وتی: گوێم لێنییە ئەگەر پاش ئیسلامەتی هیچ کردەوەیەکی چاکەم هەبێت جگە لە ئاودان بە حاجیان. پیاوێکی دیکەیش وتی: گوێم لێنییە ئەگەر هیچ کردەوەیەکی چاکەم هەبێت پاش ئیسلامەتی جگە لە ئاوەدان کردنەوەی مزگەوتی (حەرام) پیاوێکی دیکە وتی: خەبات کردن لە ڕێگەی خوادا باشترە لەوەی کەوتتان، (عمر)یش (ﷺ) لێیان تووڕە بوو وتی: لای دوانگەی پێغەمبەری خوا دەنگتان بەرزمەکەنەوە. ئەو ڕۆژە ڕۆژی (جومعە) بوو کە نوێژی (جومعە)م کرد دەچمە خزمەتی و پرسیاری لێدەکەم دەربارەی ئەوەی کە جیاواز بوون تیایدا. ئیتر خوای باڵا دەست ئەم ئایەتەی نارد کە ئەمە ماناکەیەتی: ((ئایا ئاودان بە حاجیان و ئاوەدان کردنەوەی ماڵی خوا (المسجد الحرام)تان وەك کەسێك داناوە کە باوەڕی بەخوا و ڕۆژی دوایی هەبێت و..))

## ( ١١ ) هاندان لەسەرداوا کردنی شەهیدیی

١٠٢٩ـ عن سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: ((مَنْ سَأَلَ اللَّهَ الشَّهَادَةَ بِصِدْقٍ بَلَّغَهُ اللَّهُ مَنَازِلَ الشُّهَدَاءِ، وَإِنْ مَاتَ عَلَى فِرَاشِهِ)).

لـە (سـهل)ی کـوڕی (حنیـف)ەوە (ﷺ) دەگێڕنــەوە، کــە پێغەمبــەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((هـەر کـەس بەڕاسـتی داوای شـەهید بـوون لـەخوا بکـات، خـوا دەیگەیێنێتە پلەی شەهیدان بالەسەر جێگەکەی خۆیشی بمرێت)).

## ( ١٢ ) خێری شەهید بوون

١٠٣٠ـ عن أَنسَ بْنَ مَالِكٍ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ((مَا مِنْ أَحَدٍ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ، يُحِبُّ أَنْ يَرْجِعَ إِلَى الدُّنْيَا وَأَنَّ لَهُ مَا عَلَى الْأَرْضِ مِنْ شَيْءٍ، غَيْرُ الشَّهِيدِ، فَإِنَّهُ يَتَمَنَّى أَنْ يَرْجِعَ فَيُقْتَلَ عَشْرَ مَرَّاتٍ، لِمَا يَرَى مِنَ الْكَرَامَةِ)).﴿ بخاری / الجهاد/ ٢٦٦٢﴾

(انس)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((هیچ کەس نی‌یە بچێتە بەهەشت و حەزکات بگەڕێتەوە بۆ دونیا با هەرچی لەسەر زەویشدا هەیە هی ئەوبێت جگە لە شەهید کە حەز دەکات بگەڕێتەوە و دەجار بمرێت، لەبەر ئەو ڕێز و شکۆیەی دەستی دەکەوێت و بەچاوی خۆی دەیبینێت)).

## ( ١٣ ) نیەت لە کردەوەکاندا

١٠٣١ـ عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ (ﷺ): ((إِنَّمَا الْأَعْمَالُ بِالنِّيَّةِ، وَإِنَّمَا لِامْرِئٍ مَا نَوَى، فَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ فَهِجْرَتُهُ إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ، وَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ لِدُنْيَا يُصِيبُهَا، أَوِ امْرَأَةٍ يَتَزَوَّجُهَا، فَهِجْرَتُهُ إِلَى مَا هَاجَرَ إِلَيْهِ))﴿ بخاری / بدءالوحی/ ١﴾.

(عمـر)ی کـوڕی (الخطـاب)(ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـــەتی: ((کاروکردەوەکان هەر بەپێی نیەتن و هەر کەس بەپێی نیەتی خۆی. هەر کەس کۆچەکەی بۆلای خوا و پێغەمبەری خوا بێت. ئەوە کۆچەکەی بـۆلای خـوا و پێغەمبـەری خوایـە، هەرکەسـیش کۆچەکـەی بـۆ {مـاڵێکی} دونیـا بێـت کـە بەدەستی بهێنێت، یا ژنێك بێت کە مارەی بکات. ئەوا کۆچەکەی بۆلای ئەوەیە کە کۆچی بۆ کردووە)).

## ( ١٤ ) ڕەزامەندی خوا لە شەهیدان

١٠٣٢ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: جَاءَ نَاسٌ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) [فَقَالُوا]: أَنِ ابْعَثْ مَعَنَا رِجَالًا يُعَلِّمُونَا الْقُرْآنَ وَالسُّنَّةَ. فَبَعَثَ إِلَيْهِمْ سَبْعِينَ رَجُلًا مِنَ الْأَنْصَارِ يُقَالُ لَهُمُ الْقُرَّاءُ، فِيهِمْ خَالِي حَرَامٌ، يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ وَيَتَدَارَسُونَ بِاللَّيْلِ يَتَعَلَّمُونَ. وَكَانُوا بِالنَّهَارِ يَجِيئُونَ بِالْمَاءِ فَيَضَعُونَهُ فِي الْمَسْجِدِ، وَيَحْتَطِبُونَ فَيَبِيعُونَهُ

وَيَشْتَرُونَ بِهِ الطَّعَامَ لِأَهْلِ الصُّفَّةِ وَلِلْفُقَرَاءِ، فَبَعَثَهُمُ النَّبِيُّ (ﷺ) إِلَيْهِمْ فعرضوا لَهُمْ. فَقَتَلُوهُمْ قَبْلَ أَنْ يَبْلُغُوا الْمَكَانَ، فقالوا: اللَّهُمَّ بَلِّغْ عَنَّا نَبِيَّنَا أَنَّا قَدْ لقيناك فَرَضِينَا عنك وَرَضِيتَ عَنَّا. [قال]: وَأَتَى رَجُلٌ حَرَامًا خال أنس مِنْ خَلْفِهِ فطعنه بِرُمْحٍ حَتَّى أَنْفَذَهُ، فقال حَرَامٌ: فُزْتُ وَرَبِّ الْكَعْبَةِ، فقال رسول (ﷺ) لأصحابه: ((إِنَّ إِخْوَانَكُمْ قَدْ قُتِلُوا، وَإِنَّهُمْ قالوا: اللَّهُمَّ بَلِّغْ عَنَّا نبيَّنا أَنَّا قَدْ لقيناك فرضينا عَنْكَ وَرَضِيتَ عَنَّا)).﴿بخاری / الجهادم٢٦٤٧﴾

(انس)ی كوڕی (مالك) (ﷺ) دەڵێ: چەند كەسێك هاتنە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) وتیان: چەند پیاوێكمان لەگەڵ بنێرە تا قورئان و سوننەتمان فێر بكەن. پێغەمبەریش (ﷺ) حەفتا كەس لە یاریدەدەران (الانصار)ی بۆ ناردن كەپێیان دەوترا (قورئان خوێنەكان) (حرام)ی خاڵمیانی تێدا بوو. قورئانیان دەخوێند و بەشەو دەوریان دەكردەوە و فێری دەبوون، بە ڕۆژیش ئاویان بۆ مزگەوت دەهێنا و دایان دەنا، داریان دەكرد و دەیان فرۆشت و خواردنیان پێدەكڕی بۆ ئەهلی (صُفە) پێغەمبەریش (ﷺ) ناردنی و ئەوانیش ڕێگەیان پێگرتن و هەموویان كوشتن پێش ئەوەی بگەنە ئەو شوێنە، وتیان: خوایە بە پێغەمبەرەكەمان ڕاگەێنە كە ئێمە بە خزمەت تۆ شاد بووین و لێمان ڕازی بوویت ئێمەیش لە تۆ ڕازی بووین. [دەڵێت]: پیاوێك دێت بۆ (حرام) خاڵی (انس) لە پشتەوە لێیدەدا تاوەكو دیوەدەری دەكات. ئینجا (حرام)دەڵێ: سوێند بە پەروەردگاری (كەعبە) بەختەوەر بووم. پێغەمبەریش (ﷺ) بە هاوەڵانی ڕادەگەێنێت و دەفەرموێت ((براكانتان كوژرانو و تیان: خوایە بە پێغەمبەرەكەمان ڕاگەیەنە كە ئێمە بە خزمەت تۆ شاد بووین و لێمان ڕازی بوویت و ئێمەیش لەتۆ ڕازی بووین)).

## (١٥) شەهیدان پێنجن

١٠٣٣ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ (ﷺ) قَالَ: ((بَيْنَمَا رَجُلٌ يَمْشِي بِطَرِيقٍ وَجَدَ غُصْنَ شَوْكٍ عَلَى الطَّرِيقِ فَأَخَّرَهُ، فَشَكَرَ اللَّهُ لَهُ، فَغَفَرَ لَهُ)). وقال: ((الشُّهَدَاءُ خَمْسَةٌ: الْمَطْعُونُ، وَالْمَبْطُونُ، وَالْغَرِقُ، وَصَاحِبُ الْهَدْمِ، وَالشَّهِيدُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ [عَزَّ وَجَلَّ])).﴿بخاری/الجماعة و الامامة/٦٢٤﴾

(ابو هریرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (لەكاتێكدا پیاوێك بە ڕێگەیەكدا دەڕۆیشت و چڵە دڕكێك دەبینێ و لای دەدات، ئینجا

سوپاسیخوادەكات و ، خوایش لێی قوبوڵ دەكات و لێی خۆش دەبێت))و فەرمووی: ((شەهیدەكان پێنجن، ئەوانەی بە دەردەكولێرە و نەخۆشینە درمەكان دەمرن، ئەوانەی بەدەردی سك دەمرن، ئەوەی دەخنكێت، ئەوەی شتی بەسەردا دەروخێنرێت و، ئەوەیش شەهید دەبێت لە ڕێگەی خوادا)).

## (١٦) تاعون شەهادەتە بۆ هەموو موسڵمانێك

١٠٣٤ـ عَنْ حَفْصَةَ بِنْتِ سِيرِينَ قَالَتْ: قَالَ لِي أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ: بِمَ مَاتَ يَحْيَى بْنُ أَبِي عَمْرَةَ (ﷺ)؟ قَالَتْ: قُلْتُ: بِالطَّاعُونِ. [قَالَتْ]: فَقَالَ: قَالَ رَسُولُ (ﷺ): ((الطَّاعُونُ شَهَادَةٌ لِكُلِّ مُسْلِمٍ)). ﴿بخاری/الجهاد/٢٦٧٥﴾

(حفصة)ی كچی (سیرین) دەڵێ: (انس) ی كوڕی (مالك) پێی وتم: (یحیی)ی كوڕی (أبو عمره) بەچی مرد؟ دەڵێ: منیش وتم: بە (تاعون) مرد. ئەویش وتی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((تاعون شەهیدیيە بۆ هەموو موسڵمانێك)).

## (١٧) خوا لە هەموو گوناهێكی شەهید خۆش دەبێت جگە لە قەرز

١٠٣٥ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ (ﷺ) قَالَ: ((يُغْفَرُ لِلشَّهِيدِ كُلُّ ذَنْبٍ إِلَّا الدَّيْنَ)).

(عبدالله)ی كوڕی (عمرو)ی كوڕی (العاص) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((خوا لە هەموو گوناهێكی شەهید دەبورێت جگە لە قەرزاری)).

١٠٣٦ـ عَنْ أَبِي قَتَادَةَ (ﷺ) عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ): أَنَّهُ قَامَ فِيهِمْ فَذَكَرَ لَهُمْ أَنَّ الْجِهَادَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالْإِيمَانَ بِاللَّهِ أَفْضَلُ الْأَعْمَالِ، فَقَامَ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، [أَرَأَيْتَ] إِنْ قُتِلْتُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، تُكَفَّرُ عَنِّي خَطَايَايَ؟ فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): ((نَعَمْ، إِنْ قُتِلْتَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَأَنْتَ صَابِرٌ مُحْتَسِبٌ، مُقْبِلٌ غَيْرُ مُدْبِرٍ)). ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): ((كَيْفَ قُلْتَ)). قَالَ: أَرَأَيْتَ إِنْ قُتِلْتُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَتُكَفَّرُ عَنِّي خَطَايَايَ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): ((نَعَمْ، وَأَنْتَ صَابِرٌ مُحْتَسِبٌ، مُقْبِلٌ غَيْرُ مُدْبِرٍ إِلَّا الدَّيْنَ، فَإِنَّ جِبْرِيلَ عَلَيْهِ السَّلَام قَالَ لِي ذَلِكَ)).

(أبو قتادة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەناوماندا هەستا و باسی ئەوەی بۆ كردین كە جیهاد لەڕێگەی خوادا و باوەڕی [تەواو] بەخوا چاكترین كردەوەن، پیاوێك هەستا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا [پێم بڵێ] ئایا ئەگەر لەڕێگەی خوادا كوژرام تاوانەكانم دەسڕێتەوە؟ پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: ((بەڵێ. ئەگەر بكوژرێیت لە ڕێگەی خوادا وبە ئارام بیت و چاوەڕێی پاداشتی

خـوا بیـت و ڕووبکەیتـە دوژمنـو پشـتی تێنەکـەیت)) پاشـان پێغەمبــەر (ﷺ) فەرمووی: ((چۆنت وت)) وتی: پێم بڵێ ئایا ئەگەر لە ڕێگەی خوادا بکوژرێم تاوانەکانم دەسڕێتەوە؟ پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: ((بەڵێ. ئەگەر بە ئارام و دڵسۆز بیت و بە تەمای پاداشت بیت و ڕووبکەیتە دوژمن و پشتی تێنەکەیت جگە لە قەرزاری، چونکە (جبریل) سەلامی خوای لەسەر بێت ئەوەی پێ وتم)).

## ( ١٨ ) هەرکەس لە پێناویماڵەکەیدا بکوژرێت شەهیدە

١٠٣٧ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ: أَرَأَيْتَ إِنْ جَاءَ رَجُلٌ يُرِيدُ أَخْذَ مَالِي؟ قَالَ: ((فَلَا تُعْطِهِ مَالَكَ)). قَالَ: أَرَأَيْتَ إِنْ قَاتَلَنِي؟ قَالَ: ((قَاتِلْهُ)). قَالَ: أَرَأَيْتَ إِنْ قَتَلَنِي؟ قَالَ: ((فَأَنْتَ شَهِيدٌ)). قَالَ: أَرَأَيْتَ إِنْ قَتَلْتُهُ؟ قَالَ: ((هُوَ فِي النَّارِ)).

(أبو هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) وتـی: ئـەی پێغەمبەری خوا پێم بڵێ ئەگەر پیاوێك هات و ویستی ماڵەکەمم لێ زەوت بکات؟ فەرمووی: ((ماڵەکەتی مەدەرێ)) وتی: پێم بڵێ ئەی ئەگەر ویستی شەڕم لەگەڵ بکات؟ فەرمووی: ((تۆیـش شـەڕی لەگـەڵ بکـە)) وتـی: پێـم بڵـێ ئـەی ئەگـەر کوشتمی؟ فەرمووی: ((ئەوە تۆ شەهیدی)) وتی: پێم بڵێ ئەی ئەگەر من ئەوم کوشت؟ فەرمووی: ((ئەو لە ئاگردایە)).

## ( ١٩ ) لەبارەی فەرمووەی خوا ﴿رجال صدقوا ما عاهدوا الله عليه﴾

١٠٣٨ـ عَنْ ثَابِتٍ قَالَ: قَالَ أَنَسٌ (ﷺ): عَمِّيَ الَّذِي سُمِّيتُ بِهِ، لَمْ يَشْهَدْ مَعَ رَسُولِ (ﷺ) بَدْرًا، قَالَ: فَشَقَّ عَلَيْهِ، قَالَ: أَوَّلُ مَشْهَدٍ شَهِدَهُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) غُيِّبْتُ عَنْهُ، وَإِنْ أَرَانِيَ اللَّهُ مَشْهَدًا فِيمَا بَعْدُ مَعَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، لَيَرَانِي اللَّهُ [تعالى] مَا أَصْنَعُ. قَالَ: فَهَابَ أَنْ يَقُولَ غَيْرَهَا، قَالَ: فَشَهِدَ مَعَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) يَوْمَ أُحُدٍ، قَالَ: فَاسْتَقْبَلَ سَعْدُ بْنُ مُعَاذٍ، فَقَالَ لَهُ أَنَسٌ: يَا أَبَا عَمْرٍو أَيْنَ؟ فَقَالَ: وَاهًا لِرِيحِ الْجَنَّةِ أَجِدُهُ دُونَ أُحُدٍ. قَالَ: فَقَاتَلَهُمْ حَتَّى قُتِلَ، قَالَ: فَوُجِدَ فِي جَسَدِهِ بِضْعٌ وَثَمَانُونَ مِنْ بَيْنِ ضَرْبَةٍ وَطَعْنَةٍ وَرَمْيَةٍ، قَالَ: فَقَالَتْ أُخْتُهُ عَمَّتِي الرُّبَيِّعُ بِنْتُ النَّضْرِ: فَمَا عَرَفْتُ أَخِي إِلَّا بِبَنَانِهِ. وَنَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ: ﴿رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ فَمِنْهُمْ مَنْ قَضَى نَحْبَهُ وَمِنْهُمْ مَنْ يَنْتَظِرُ وَمَا بَدَّلُوا تَبْدِيلًا﴾ [الاحزاب: ٢٣] قَالَ: فَكَانُوا يُرَوْنَ أَنَّهَا نَزَلَتْ فِيهِ وَفِي أَصْحَابِهِ.﴿بخاری/الجهاد/٢٦٥١﴾

(ثـابت)(ﷺ) دەڵـێ: (أنس) وتـی: ئەو مامەیـەم کەمن بـە ناویـەوە نـاونراوم ئامادەی جەنگی بەدر نەبوو لە خزمەت پێغەمبەری خوادا (ﷺ) دەڵـێ: ئـەویش ئەمەی لا زۆر زەحمەت بوو. وتی: یەکەم جـەنگێك پێغەمبـەر (ﷺ) ئامادەی بـوو منـی لێبێبـەش بووم و ئامادەی نـەبووم ئەگـەر لەمـەولا خـوای گـەورە دیمـەنی جەنگێکی دیکەی نیشان دام لە خزمـەت پێغەمبـەردا (ﷺ) ئـەوە خـوا دەزانێـت چـی دەکـەم، دەڵـێ: ترسا کە شـتێکی تـر بڵێ. لە خزمـەت پێغەمبـەردا (ﷺ) لە جـەنگی (أحد)دا ئامـادە بـوو. لـەو ڕۆژەدا (سعد)ی کـوڕی (معـاذ) بـەرەو ڕووی دێـت و (انس) پێـی دەڵێـت: ئـەی (ابـا عمـر) بـەرەو کـوێ؟ ئـەویش دەڵـێ: ئـاه تامـەزرۆی بۆنــی بەهەشـتم لـە ڕووی کێـوی (أحـد) دا هەسـتی پێدەکـەم، ئیـتر لەگەڵیان جەنگا تا کوژرا لە لەشیدا هەشتا و ئەمەندە برینی تێدابوو لـە لێدانی ڕم و شـیر و تـیر. خوشـکەکەی کـە(ربیـع)ی کچـی (النضـر)دەڵـێ: براکــەمم نەناسیەوە بەسـەر پەنجـەکانیدا نـەبێت. ئـەم ئایەتـە هاتـە خـوارەوە کـە ئەمـە ماناکەیەتی: ﴿لە نێو بڕواداراندا پیاوانێك هـەن لەسـەر بەڵێنی خۆیـان مردوون بە ئاکامی خۆیـان گەیشتن و هەشیانە چاوەڕوان دەکـات و بـەڵێنی خۆیانیـان نـەگۆڕیووە﴾ دەڵـێ: خـەڵکی وای بـۆ دەچـوون کـە ئـەم ئایەتـە لەشـانی ئـەوو هاوەڵەکانیاندا هاتبێتە خوارەوە.

## ( ٢٠ ) ئەوەی بجەنگێ بۆ بڵند کردنەوەی فەرموودەی خوا

١٠٣٩ـ عن أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ (ﷺ): أَنَّ رَجُلًا أَعْرَابِيًّا أَتَى النَّبِيَّ (ﷺ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، الرَّجُلُ يُقَاتِلُ لِلْمَغْنَمِ، وَالرَّجُلُ يُقَاتِلُ لِيُذْكَرَ، وَالرَّجُلُ يُقَاتِلُ لِيُرَى مَكَانُهُ، فَمَنْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((مَنْ قَاتَلَ لِتَكُونَ كَلِمَةُ اللَّهِ أَعْلَى فَهُوَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ)). ﴿بخاری/الجهاد/٢٦٥٥﴾

(أبو موسی)ی (الاشعري) دەڵێ: پیاوێکی دەشتەکی هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) وتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا، پیـاو هەیـە دەجـەنگێت بـۆ دەسـتکەوت، پیاویش هەیە دەجەنگێت بۆ نـاوو شـۆرەت و پیـاویش هەیـە دەجـەنگێت بـۆ ئەوەی شوێن و پلەوپایەی لە نێو خەڵکیدا بناسرێ و ببینرێت، لەوانە کامیان لەڕێگەی خوادایە؟ ئەویش فەرمووی: ((هەر کـەس بجـەنگێت بـۆ ئـەوەی وشـەی خوا بەرز و بڵند بێت ئەوە لەڕێگەی خوادایە)).

## ( ٢١ )كەسێ بۆ رووپامایی و ناووشۆرەت بجەنگێ

١٠٤٠ـ عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ قَالَ: تَفَرَّقَ النَّاسُ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ)، فقال لهُ نَاتِلُ أَهْلِ الشَّامِ: أَيُّهَا الشَّيْخُ، حَدِّثْنَا حَدِيثًا سَمِعْتَهُ مِنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ). قَالَ: نَعَمْ، سَمِعْتُ رَسُولَ (ﷺ) يَقُولُ: ((إِنَّ أَوَّلَ النَّاسِ يُقْضَى يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَيْهِ رَجُلٌ اسْتُشْهِدَ، فَأُتِيَ بِهِ فَعَرَّفَهُ نِعَمَهُ فَعَرَفَهَا، قَالَ: فَمَا عَمِلْتَ فِيهَا؟ قَالَ: قَاتَلْتُ فِيكَ حَتَّى اسْتُشْهِدْتُ، قَالَ: كَذَبْتَ، وَلَكِنَّكَ قَاتَلْتَ لِأَنْ يُقَالَ جَرِيءٌ فَقَدْ قِيلَ، ثُمَّ أُمِرَ بِهِ فَسُحِبَ عَلَى وَجْهِهِ حَتَّى أُلْقِيَ فِي النَّارِ. وَرَجُلٌ تَعَلَّمَ الْعِلْمَ وَعَلَّمَهُ، وَقَرَأَ الْقُرْآنَ، فَأُتِيَ بِهِ فَعَرَّفَهُ نِعَمَهُ فَعَرَفَهَا، قَالَ: فَمَا عَمِلْتَ فِيهَا؟ قَالَ تَعَلَّمْتُ الْعِلْمَ وَعَلَّمْتُهُ، وَقَرَأْتُ فِيكَ الْقُرْآنَ، قَالَ: كَذَبْتَ، وَلَكِنَّكَ تَعَلَّمْتَ الْعِلْمَ لِيُقَالَ عَالِمٌ، وَقَرَأْتَ الْقُرْآنَ لِيُقَالَ هُوَ قَارِئٌ، فَقَدْ قِيلَ، ثُمَّ أُمِرَ بِهِ فَسُحِبَ عَلَى وَجْهِهِ حَتَّى أُلْقِيَ فِي النَّارِ. وَرَجُلٌ وَسَّعَ اللَّهُ عَلَيْهِ، وَأَعْطَاهُ مِنْ أَصْنَافِ الْمَالِ كُلِّهِ، فَأُتِيَ بِهِ فَعَرَّفَهُ نِعَمَهُ فَعَرَفَهَا، قَالَ: فَمَا عَمِلْتَ فِيهَا قَالَ مَا تَرَكْتُ مِنْ سَبِيلٍ تُحِبُّ أَنْ يُنْفَقَ فِيهَا. إِلَّا أَنْفَقْتُ فِيهَا لَكَ. قَالَ: كَذَبْتَ، وَلَكِنَّكَ فَعَلْتَ لِيُقَالَ: هُوَ جَوَادٌ، فَقَدْ قِيلَ، ثُمَّ أُمِرَ بِهِ فَسُحِبَ عَلَى وَجْهِهِ ثُمَّ أُلْقِيَ فِي النَّارِ)).

(سليمان)ی كوڕی (يسار) دەڵێ: خەڵكی دەوری (أبو هريرة)یان چۆڵ كرد، (ناتل) ناوێكی خەڵكی (شام) پێی وت: ئەی مامەی پیرەمێرد: شتێكمان بۆ باس بكە كەلە پێغەمبەرت بیستبێت. ئەویش وتی بەڵێ لە پێغەمبەرم بیستووە كە دەیفەرموو: ((یەكەمین كەسێ دادگایی دەكرێت لە ڕۆژی دواییدا پیاوێكە شەهید بووە، دەهێنرێت و خوای گەورەش ناز و نیعمەتەكانی خۆی پێ دەناسێنێ و ئەویش دانی پێدا دەنێ، دەفەرمووێت: دەی باشە چیت تێداكردووە؟ ئەویش دەڵێ: جەنگم كردووە لە پێناو تۆدا تاوەكو شەهید بووم. دەفەرمووێت: درۆ دەكەیت، بەڵكو تۆ بۆ ئەوە جەنگت كردووە پێت بڵێن ئازایە ئەوەیشت پێ وترا. ئینجا فەرمانی پێ دەدرێ دەمەوڕوو كێش دەكرێ وفڕێ دەدرێتە ناو ئاگرەوە، هەروەها پیاوێكیش فێری جۆرە زانستێك بووە و خەڵكیشی فێركردووە و قورئانی خوێندووە، ئەویش دەهێنرێت و باسی ناز و نیعمەتی خۆیی بۆ دەكات و پێی دەناسێنێ ئەویش دانی پێدا دەنێت، دەفەرموێت: دەی باشە چیت تێداكردووە؟ ئەویش دەڵێ: فێری زانست بووم و خەڵكیشم فێركردووە و لەبەر خاتری تۆیش قورئانم خوێندوە، دەفەرموێت:

درۆت کرد بەڵکو بۆ ئەوە فێری بویت تا پێت بڵێن زانایە، قورئانیشت خوێندوە تا پێت بڵێن قورئان خوێنە ئەوەیشت [لەدونیادا] پـێ وتـراوە. پاشـان فـەرمان دەدات کێش دەکرێت دەمەو ڕوو فڕێ دەدرێتە ناو ئاگرەوە. پیاوێکیش خـوا دەرووی خێری لێکردۆتەوە و لەهەموو جۆرە ماڵێکی پێبەخشیوە، دەهێنرێت و ناز و نیعمەتی خۆی پـێ دەناسـێنێ و ئـەویش دانـی پێدادەنـێ دەفـەرموێت: ((باشە چیت کردووە؟ ئەویش دەڵێ: هیچ ڕێگەیەکم نەهێشتۆتەوە کە تۆ پێت خۆش بێت ماڵی تێدا بەخت بکرێت و نەم گرتبێتەبەر لە پێناوی تۆدا، ئەویش دەفەرموێت: درۆ دەکەیت. بەڵکو تۆ بۆیە وات کردووە تا پێت بڵێن: کەسێکی بەخشندەو نان بدەیە، ئەوەیشت پێ وتراوە. پاشان فەرمان دەکرێت دەمەو ڕوو کێش دەکرێت و فڕێ دەدرێتە ناوی ئاگرەوە.

## ( ٢٢ ) زۆریی پاداشت لەسەر کوژران لە ڕێی خوادا

١٠٤١ـ عَنِ الْبرَاءِ (ﷺ) قَالَ: جاءَ رَجُلٌ منْ بَنِي النَّبِيت -قَبِيلٍ منَ الْأَنْصارِ- فقالَ: أَشْهدُ أَنْ لَا إِلهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّكَ عَبْدُهُ ورَسُولُهُ. ثُمَّ تَقدَّمَ فَقَاتلَ حَتَّى قُتِلَ، فقالَ النَّبيُّ (ﷺ): ((عَمِلَ هَذَا يَسيرًا، وَأُجِر كَثِيرًا)).

(البراء) (ﷺ) دەڵێ: پیاوێك لە (بنی النبیت) کە بەرەیـەکن لـە یاریدەدەران. هات و وتی: شایەتی دەدەم کە هیچ کـەس شایەنی پەرستن نیـیە جگـە لـەخوا نەبێت و تۆیش {ئەی محمد} بەندە و پێغەمبەری خوایت. پاشـان پێش کەوت و جـەنگا تـا کـوژرا، پێغەمبـەریش (ﷺ) فـەرمووی: ((ئەمـە کـەم ئیشـی کـرد و پاداشتی زۆر درایەوە)).

## ( ٢٣ ) کەسێك بجەنگێت و بپێکرێت یان دەستکەوتی ببێت

١٠٤٢ـ عنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (ﷺ) قال: قالَ رَسُولُ الله (ﷺ): ((مَا منْ غَازِيَةٍ أَوْ سَرِيَّةٍ تَغْزُو، فتغْنَمُ وتسْلَمُ، إِلَّا كَانُوا قدْ تَعَجَّلُوا ثُلُثَيْ أُجُورِهِمْ. ومَا منْ غَازِيَةٍ أَوْ سَرِيَّةٍ تُخْفِقُ وَتُصابُ إِلَّا تَمَ أُجُورُهُمْ)).

(عبـدالله)ی کـوڕی (عمـرو) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: ((هـەر کۆمەڵـە جـەنگاوەرێگك یـان لەشـکرێك بجـەنگن و سـەربکەون و دەستکەوتیان ببـێ ئەوە دوو سێیەکی پاداشـتی خۆیـان دەسـتکەوتووە، هـەر کۆمەڵـە جـەنگاوەرێگك یان لەشـکرێك نییە بجەنگن و تێـك بشـکێن و بپێکرێـن مەگەر هەر ئەوانە هەموو پاداشتی خۆیان بە تەواوەتی بەدەست دێنن)).

## (٢٤) پاداشتی کەسێك تفاق بۆ جەنگاوەرێك دابین بکات

١٠٤٣ـ عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ (ﷺ) عَنْ رَسُول الله (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: ((مَنْ جَهَّزَ غَازِيًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَقَدْ غَزَا، وَمَنْ خَلَفَهُ فِي أَهْلِهِ بِخَيْرٍ فَقَدْ غَزَا)).﴿بخاری/الجهاد/١٠٩٢﴾

((زید)ی کوڕی (خالد الجهنی) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((هەر کەس تفاقی جەنگاوەرێك ساز بکات و بیخاتە سەر ڕێ ئەویش هەر غەزای کردوە، هەر کەسیش بە جوانی خزمەتی ماڵ و منداڵی جەنگاوەرێك بکات ئەویش هەر غەزای کردوە، هەر کەسیش بە جوانی خزمەتی ماڵ و منداڵی جەنگاوەرێك بکات ئەویش هەر غەزای کردوە)).

## (٢٥) کەسێك خۆی ساز بکات و نەخۆش کەوێت با تفاقەکەی بداتە کەسێك جەنگی پێوە بکات

١٠٤٤ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ): أَنَّ فَتًى مِنْ أَسْلَمَ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي أُرِيدُ الْغَزْوَ، وَلَيْسَ مَعِي مَا أَتَجَهَّزُ [به]. قَالَ: ((ائْتِ فُلَانًا، فَإِنَّهُ قَدْ كَانَ تَجَهَّزَ فَمَرِضَ)). فَأَتَاهُ فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) يُقْرِئُكَ السَّلَامَ وَيَقُولُ: أَعْطِنِي الَّذِي تَجَهَّزْتَ بِهِ. قَالَ: يَا فُلَانَةُ أَعْطِيهِ الَّذِي تَجَهَّزْتُ بِهِ، وَلَا تَحْبِسِي عَنْهُ شَيْئًا، فَوَاللَّهِ لَا تَحْبِسِي مِنْهُ شَيْئًا فَيُبَارَكَ لَكِ فِيهِ.

(انس) کوڕی (مالك) (ﷺ) دەڵێ: گەنجێك لە هۆزی (أسلم) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من نیازی جەنگم هەیە کەرەسە و تفاقی وایشم نییە کە پێی بجەنگم. فەرمووی: ((بڕۆ بۆ لای فلان کەس [کەرەسەکانی ئەو بێنە] چونکە ئەو خۆی ساز کردو نەخۆش کەوت)) ئەویش هات بۆ لای‌و پێی وت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەلامت لێدەکات و دەفەرمووێت: ئەو کەرەسەو تفاقەی خۆتت پێ‌ساز کردبوو بمدەرێ. ئەویش بە خێزانەکەی وت: ئەو تفاقەی کە خستبووم بڕۆ بیدەرێ و هیچی لێ‌گل مەدەرەوە بەخوا هیچی لێ گلنادەیتەوە بۆ ئەوەی خوا بەرەکەتی تێبخات بۆت.

## (٢٦) ڕێزگرتن لە خێزانی جەنگاوەرانی ڕێی خوا

١٠٤٥ـ عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بُرَيْدَةَ عَنْ أَبِيهِ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): ((حُرْمَةُ نِسَاءِ الْمُجَاهِدِينَ عَلَى الْقَاعِدِينَ كَحُرْمَةِ أُمَّهَاتِهِمْ، وَمَا مِنْ رَجُلٍ مِن

الْقَاعِدِينَ يَخْلُفُ رَجُلًا مِنَ الْمُجَاهِدِينَ فِي أَهْلِهِ فَيَخُونُهُ فِيهِمْ، إِلَّا وُقِفَ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَيَأْخُذُ مِنْ عَمَلِهِ مَا شَاءَ، فَمَا ظَنُّكُمْ)).

له(سلیمان)ی كوڕی (بریده)وه ئەویش له باوكیەوه دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((ڕێز و حورمەت گرتن لە خێزانی جەنگاوەران لەسەر لێكەوتەكان [ئەوانەی لە غەزا دواكەوتون بەهۆی بەهانەیەكەوە] وەك ڕێز و حورمەتی دایكیان وەهایە،هەر پیاوێك لەلێكەوتەكان لەپاش هەر پیاوێك لە موجاهیدەكان بەجێ بمێنێ لەناو ماڵ و منداڵیدا وە خیانەتیان لێبكات لە ڕۆژی قیامەتدا بۆی دەوەستێنرێت و چەندی بوێ لە چاكەكانی دەیبات بۆ خۆی ئیتر گومانتان چۆنه)).

## ( ٢٧ ) لەبارەی فەرموودەی (( تاقمێك لە ئوممەتەكەم تا قیامەت لەسەر حەق دەبن ))

١٠٤٦ـ عَنْ ثَوْبَانَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): ((لَا تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي ظَاهِرِينَ عَلَى الْحَقِّ، لَا يَضُرُّهُمْ مَنْ خَذَلَهُمْ، حَتَّى يَأْتِيَ أَمْرُ اللَّهِ وَهُمْ كَذَلِكَ)).﴿بخاری/المناقب/٣٤٤١، ٣٤٤٢﴾

(ثوبان)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((بەردەوام تاقمێك له ئوممەتەكەم لەسەر حەق دەمێنن و نابەزن و كەسێك بیەوێت سەرشۆڕیان بكات ناتوانێت زیانیان لێبدات تاوەكو فەرمانی خوا بە مردنیان دێت و ئەوان هەروا دەبن)).

١٠٤٧ـ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ شِمَاسَةَ الْمَهْرِيُّ قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ مَسْلَمَةَ بْنِ مُخَلَّدٍ، وَعِنْدَهُ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَمْرِو ابْنِ الْعَاصِ، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: لَا تَقُومُ السَّاعَةُ إِلَّا عَلَى شِرَارِ الْخَلْقِ، هُمْ شَرٌّ مِنْ أَهْلِ الْجَاهِلِيَّةِ، لَا يَدْعُونَ اللَّهَ بِشَيْءٍ إِلَّا رَدَّهُ عَلَيْهِمْ. فَبَيْنَمَا هُمْ عَلَى ذَلِكَ أَقْبَلَ عُقْبَةُ بْنُ عَامِرٍ (ﷺ)، فَقَالَ لَهُ مَسْلَمَةُ: يَا عُقْبَةُ اسْمَعْ مَا يَقُولُ عَبْدُ اللَّهِ، فَقَالَ عُقْبَةُ: هُوَ أَعْلَمُ، وَأَمَّا أَنَا فَسَمِعْتُ رَسُولَ (ﷺ) يَقُولُ: ((لَا تَزَالُ عِصَابَةٌ مِنْ أُمَّتِي يُقَاتِلُونَ عَلَى أَمْرِ اللَّهِ، قَاهِرِينَ لِعَدُوِّهِمْ. لَا يَضُرُّهُمْ مَنْ خَالَفَهُمْ، حَتَّى تَأْتِيَهُمُ السَّاعَةُ وَهُمْ عَلَى ذَلِكَ)). فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: أَجَلْ. ((ثُمَّ يَبْعَثُ اللَّهُ رِيحًا كَرِيحِ الْمِسْكِ، مَسُّهَا مَسُّ الْحَرِيرِ. فَلَا تَتْرُكُ نَفْسًا فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةٍ مِنَ الْإِيمَانِ إِلَّا قَبَضَتْهُ، ثُمَّ يَبْقَى شِرَارُ النَّاسِ، عَلَيْهِمْ تَقُومُ السَّاعَةُ)).

(عبدالرحمن)ى كوڕى (شماسەالمهرى) دەڵێ: لاى (مسلمە)ى كوڕى (مخلد) بووم، (عبدالله)ى كوڕى (عمر)يشى لادانيشتبوو، (عبدالله)وتى: قيامەت هەڵناسێت مەگەر لەسەر خراپانى خەڵكى، كەلە خەڵكى سەردەمى نەفامى خراپترن. هەر نزا و پارانەوەيەكيش بكەن خوا لێيان وەرناگرێت و دەيداتەوە بەسەرياندا. لە كاتێكدا ئەوان لەم قسە و باسانەدا دەبن (عقبە)ى كوڕى (عامر)يش بەرەولايان دێت (مسلمە)دەڵێ: ئەى (عقبە) گوێبگرە، لەوەى كە (عبدالله) دەيڵێت. (عقبە)يش دەڵێ: ئەو لە من زاناترە، بەڵام من لە پێغەمبەرم (ﷺ) بيستووە كە ديفەرموو: ((بەردەوام تاقمێك لە ئوممەتەكەم لەسەر فەرمانى خوا دەجەنگن دوژمنيان دەبەزێنن و نەيارانيان ناتوانێت زيانيان لێبدەن تاوەكو قيامەت دێت و ئەوان هەر لەسەر ئەو بارە دەبن)). (عبدالله) دەڵێ: بەڵێ وايە. ((پاشان خوا بۆنێكى وەك بۆنى ميسك دەنێرێت بەركەوتنى لەسەر لەش وەك بەركەوتنى ئاوريشم وەهايە هيچ بەندەيەك ناهێڵێتەوە كەلە دڵيدا بە ئەندازەى كێشى دانەوێڵەيەك باوەڕ هەبێت ئەوا گيانى دەكێشێت، پاشان خراپانى خەڵكى دەمێنێتەوە قيامەت لەسەر ئەوان هەڵدەسێت)).

١٠٤٨- عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): ((لَا يَزَالُ أَهْلُ الْغَرْبِ ظَاهِرِينَ عَلَى الْحَقِّ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ)).

(سعد)ى كوڕى (ابى وقاص) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەرى خوا (ﷺ) فەرموويەتى: ((بەردەوام خاوەن دۆڵچە گەورەكان {مەبەست پێى خەڵكى عەرەبستانە يا شامە} بەردەوام دەبن لەسەر حەق و پشتيوانى لێدەكەن تا قيامەت هەڵدەسێت)).

## (٢٨) دووكەس يەكێكيان ئەوى تريان دەكوژێت

١٠٤٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): ((يَضْحَكُ اللَّهُ لِرَجُلَيْنِ، يَقْتُلُ أَحَدُهُمَا الْآخَرَ، كِلَاهُمَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ)). قَالُوا: كَيْفَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: ((يُقْتَلُ هَذَا فَيَلِجُ الْجَنَّةَ، ثُمَّ يَتُوبُ اللَّهُ عَلَى الْآخَرِ، فَيَهْدِيهِ إِلَى الْإِسْلَامِ، ثُمَّ يُجَاهِدُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَيُسْتَشْهَدُ)) ﴿بخارى. الجهاد/٢٦٧١﴾.

(ابو هريره) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموويەتى: ((خوا پێكەنينى بۆ دوو پياو دێت [مەبەست لە پێكەنين نواندنى ڕەزامەنديە] يەكێكيان ئەوى تريان دەكوژێت و كەچى هەردووكيان دەچنە بەهەشت)) وتيان: چۆن ئەى

پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ((ئەمەیان دەکوژرێت و دەچێتە بەهەشت، پاشان خوا تۆبە لەوەی تریشیان وەردەگرێت و ڕێنمایی دەکات بەرەو ئیسلامەتی و پاشان جیهاد دەکات لە ڕێگەی خواداو شەهید دەبێت)).

١٠٥٠ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): ((لَا يَجْتَمِعَانِ فِي النَّارِ اجْتِمَاعًا يَضُرُّ أَحَدُهُمَا الْآخَرَ)). قِيلَ: مَنْ هُمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: ((مُؤْمِنٌ قَتَلَ كَافِرًا ثُمَّ سَدَّدَ)).

(ابو هريرە)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((کۆنابنەوە لە ئاگردا بە جۆرە کۆبوونەوەیەك کەیەکێکیان زیان بەوی تریان بگەیەنێت)) وتیان: ئەوانە کێن ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ((باوەڕدارێك بێباوەڕێك بیکوژێت و پاشان بێباوەڕەکە بچێتەوە بەخۆیدا باش ببێت [باوەڕ بێنێت].

## ( ٢٩ ) خێری کەسێك حوشترێ لەڕێگەی خوادا ببەخشێت

١٠٥١ـ عنْ أَبِ يِ مَسْعُودٍ الْأَنْصَارِيِّ (ﷺ) قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ بِنَاقَةٍ مَخْطُومَةٍ فَقَالَ: هَذِهِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، فَقَالَ رَسُولُ (ﷺ): ((لَكَ بِهَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ سَبْعُ مِائَةِ نَاقَةٍ، كُلُّهَا مَخْطُومَةٌ)).

(ابو مسعود)ی (الانصاری) دەڵێ: پیاوێك حوشترێکی لغاوکراوی هێنا و وتی: ئەمە لە ڕێگەی خوادا پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: ((لە ڕۆژی قیامەتدا (٧٠٠)حوشتری دەدرێتێ هەر هەمووی لغاو کراون)).

١٠٥٢ـ عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الْأَنْصَارِيِّ (ﷺ) قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالَ: إِنِّي أُبْدِعَ بِي فَاحْمِلْنِي، فَقَالَ: ((مَا عِنْدِي)). فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَنَا أَدُلُّهُ عَلَى مَنْ يَحْمِلُهُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((مَنْ دَلَّ عَلَى خَيْرٍ فَلَهُ مِثْلُ أَجْرِ فَاعِلِهِ)).

(ابو مسعود)ی (الانصاری) دەڵێ: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) وتی: من وڵاغەکەم پەکی کەوتووە یا (تیاچووە) و وڵاغێکی سواریم پێ بدە و هەڵم گرە، ئەویش فەرمووی: ((لام نیە)) پیاوێك لەوێدا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من ڕێبەری دەکەم بۆ لای کەسێك کە هەڵی بگرێت. پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: ((هەر کەس ڕێبەری خەڵکی بکات ئەوە بە ئەندازەی پاداشتی چاکە کارەکە خێری هەیە))

## ( ٣٠ ) لەبارەی فەرموودەی خوا ﴿وأعدوا لهم ماستطعتم من قوة﴾

١٠٥٣ـ عن عُقْبَةَ بْن عَامِرٍ (ﷺ) قالَ: سَمعْتُ رَسُولَ اللّه (ﷺ) وَهُوَ عَلَى الْمنْبَرِ يَقُولُ: (( ﴿وَأعدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ منْ قُوَّة﴾ [الأنفال: ٦٠] ألَا إنَّ الْقُوَّةَ الرَّمْيُ، ألَا إنَّ الْقُوَّةَ الرَّمْيُ، ألَا إنَّ الْقُوَّةَ الرَّمْيُ)) [قالها ثلاثاً].

(عقبە)ی کوڕی (عامر)(ﷺ) دەڵێ: لەکاتێکدا پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر مینبەر بوو گوێم لێبوو دەیفەرموو: ((﴿چەند دەتوانن هێزیان بۆ ئامادە بکەن﴾ بزانن هێز بریتیەلە تیر ئەندازی، بزانن هێز بریتییە لە تیر ئەندازی، بزانن هێز بریتییە لە تیر ئەندازی)) سێ جار دووبارەی کردەوە.

١٠٥٤ـ عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (ﷺ) قَالَ: سَمعْتُ رَسُولَ اللّه (ﷺ) يَقُولُ: ((سَتُفْتَحُ عَلَيْكُمْ أرَضُونَ وَيَكْفِيكُمُ اللّهُ، فَلَا يَعْجِزُ أحَدُكُمْ أنْ يَلْهُوَ بِأسْهُمه)).

(عقبە)ی کوڕی (عامر) دەڵـێ: گوێم لە پێغەمبەر (ﷺ) بوو کە دەیفەرموو: ((لەمەولا چەند ولاتێك بە ڕوتاندا دەکرێتەوە، تەنها خواشتان بەس دەبێ بۆ لەکۆڵ خستنی زیانی نەیاران، کەوابوو با لەوکاتەدا هیچ کام لە ئێوە سستی و تەمەڵی نەکات لەوەی کە بەتیرەکانی خۆیەوە خۆی خەریك بکات [واتە مەشقی لەسەر بکات])).

١٠٥٥ـ عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَن بْن شمَاسَةَ: أنَّ فُقَيْمًا اللَّخْمِيَّ قَال لعُقْبَةَ بْن عَامرٍ (ﷺ): تَخْتَلفُ بَيْنَ هَذَيْنِ الْغَرَضَيْنِ، وَأنْتَ كَبِيرٌ يَشُقُّ عَلَيْكَ؟ قَالَ عُقْبَةُ: لَوْلَا كَلَامٌ سَمعْتُهُ منْ رَسُول اللّه (ﷺ) لَمْ أعَانِيه. قَالَ الْحَارِثُ: فَقُلْتُ لابْنِ شمَاسَةَ: وَمَا ذَاكَ؟ قَالَ: إنَّهُ قَالَ: ((مَنْ عَلمَ الرَّمْيَ ثُمَّ تَرَكَهُ فَلَيْسَ منَّا. أوْ: قَدْ عَصَى)).

لە(عبدالرحمن)ی کوڕی (شماس)ەوە: کە (فقیمی اللخمی)بە (عقبە)ی کوڕی (عامر)ی وت: بۆچ هات و چۆتە لە نێوان ئەم دوو نیشانەدا ئەمبەر و ئەوبەر دەکەیت ئەمە زەحمەتە بۆت؟ (عقبە)یش وتی: ئەگەر فەرمایشتێك نەبوایە کە لە پێغەمبەر (ﷺ)م بیستوە ئاوا خۆمم زەحمەت نەئەدا، (الحارث)دەڵێ: بە (ابن شماس)ەم وت: ئەو فەرمایشتە چیە؟ وتی: ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((هەر کەس فێری تیر ئەندازی بێت و پاشان وازی لێبێنێت ئەوە لە ئێمە نییە، یا سەرپێچی کردووە)).

## (٣١) خێرو بێر بەناوچاوى ئەسپەوەيە هەتا ڕۆژى قيامەت

١٠٥٦ـ عَنْ جَرِير بْنِ عَبْدِ اللَّه (ﷺ) قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) يَلْوِي نَاصِيَةَ فَرَسٍ بِإِصْبَعِهِ وَهُوَ يَقُولُ: ((الْخَيْلُ مَعْقُودٌ بِنَوَاصِيهَا الْخَيْرُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ: الْأَجْرُ وَالْغَنِيمَةُ)).﴿بخارى/الجهاد/٢٦٩٧﴾

(جرير)ى كوڕى (عبدالله) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەرى خوام (ﷺ) بينى دەستى بەنێو چاوانى ئەسپێكدا دەهێنا و دەيفەرموو: ((ئەسپ خێر و بێر بەناوچاوانيەوەيە هەتا ڕۆژى قيامەت. هەم پاداشت و هەم دەستكەوت)).

١٠٥٧ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ((الْبَرَكَةُ فِي نَوَاصِي الْخَيْلِ)).﴿بخارى/الجهاد/٢٦٩٧

(انس)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموويەتى: ((فەڕ و بەرەكەت لەناوچاوانى ئەسپ دايە)).

## (٣٢) حەز نەكردن بە ئەسپى دەست و قاچ بازگ

١٠٥٨ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) يَكْرَهُ الشِّكَالَ مِنَ الْخَيْلِ. وفي رواية: وَالشِّكَالُ أَنْ يَكُونَ الْفَرَسُ فِي رِجْلِهِ الْيُمْنَى بَيَاضٌ وَفِي يَدِهِ الْيُسْرَى، أَوْ فِي يَدِهِ الْيُمْنَى وَرِجْلِهِ الْيُسْرَى.

(ابو هريره) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەرى خوا (ﷺ) حەزى بە ئەسپى (الشكال) نەكردووە، لە ڕيوايەتێكدا (الشكال) بريتىيە لە ئەسپێك دەستى چەپ و قاچى ڕاستى سپى بێت ياخود دەستى ڕاست و قاچى چەپى سپى بێت.

## (٣٣) پێش بڕكێ كردن لە نێوان ئەسپ دا

١٠٥٩ـ عن ابْنِ عُمَرَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) سَابَقَ بِالْخَيْلِ الَّتِي قَدْ أُضْمِرَتْ مِنَ الْحَفْيَاءِ، وَكَانَ أَمَدُهَا ثَنِيَّةَ الْوَدَاعِ، وَسَابَقَ بَيْنَ الْخَيْلِ الَّتِي لَمْ تُضْمَرْ مِنَ الثَّنِيَّةِ إِلَى مَسْجِدِ بَنِي زُرَيْقٍ، وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ فِيمَنْ سَابَقَ بِهَا﴿بخارى/المساجد/٤١٠﴾.

(ابن عمر)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) پێشبڕكێى دەكرد بەو ئەسپانەى كە دابەستە كرابوون لە شوێنێك كە ناوى (حفياء) بوو، كۆتاييەكەى لە (ثنية الوداع) بوو، هەروەها پێشبڕكێى دەكرد لە نێوان ئەو ئەسپانەى كە دابەستە

نەكرابوون لە (ثنیـة)وە بۆ مزگەوتی بەنی زورەیق، (ابن عمر)یش یەكێك بوو لەوانەی لە پێشبڕكێكەدا بوون.

## (٣٤) كەسانێك بروبەهانە یان هەبێت و لەجەنگ دوابكەون

١٠٦٠ـ عَنْ أَبِي إِسْحَق: أَنَّهُ سَمِعَ الْبَرَاءَ (ﭬ) يَقُولُ فِي هَذِهِ الْآيَةِ ﴿لا يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ... وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ فأمر رسولُ الله (ﷺ) زَيْدًا فجاء بِكَتِفٍ يكْتُبُها، فشكا إِلَيْهِ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ ضَرَارَتَهُ، فنزلتْ: ﴿لا يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ﴾ [النساء: ٩٥]﴿بخاری/الجهاد/٢٦٧٦﴾

لە (ابو اسحاق)وە كەدەڵێ: گوێی لە (البراء)بوو دەربارەی ئەم ئایەتە دەیووت: ﴿لا یستوی القاعدون..﴾ ئینجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی بە زەید كرد دەفە شانێكی هێنا تا بینووسێت. لەو كاتەدا كوڕی (ابن أم مكتوم) سكاڵای نابینایانی خۆی لاكرد ئینجا ئەم ئایەتە دابەزی كە ئەمە ماناكەیەتی: ﴿ئەو كەسانەی كە لێكەوتوون لە بڕواداران جگە لە زیان لێكەوتووان نەبێت وەك یەك نین لەگەڵ ئەو كەسانەی جیهاد دەكەن لە ڕێگەی خوادا)).

## (٣٥) كەسێك نەخۆشی گلیبداتەوە لە غەزا

١٠٦١ـ عَنْ جابر (ﭬ) قَال: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) فِي غَزَاةٍ، فقالَ: ((إِنَّ بِالْمَدِينَةِ لَرِجَالًا، مَا سِرْتُمْ مسيرا ولا قطعْتُمْ واديًا إِلَّا كَانُوا مَعَكُمْ، حَبَسَهُمُ الْمَرَضُ)).

(جابر)(ﭬ) دەڵێ: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا بووین (ﷺ) لە جەنگێكدا فەرمووی: ((لەڕاستیدا لە مەدینەدا پیاوانێك هەن ئێوە هەر قۆناغێك ڕۆیشتبن هەر شیوو دۆڵێكیشتان بڕیبێ ئەوانە لەگەڵتان دەبوون. بەڵام نەخۆشی گلی داونەتەوە))

# (٣٤) بەشی بەسەرهاتی جەنگەکان

## (١) بۆ سەرکردەکانی سوپا و هێزەکان و ئامۆژگاری کردنیان بەوەی کە پێویستە

١٠٦٢ـ عن بُرَيْدَةَ (ﷺ) قال: كانَ رسُولُ اللَّه (ﷺ) إذَا أمّر أميرًا على جَيْشٍ أوْ سريَّةٍ اوْصاهُ في خاصَّتِه بتقْوى اللَّه (ﷻ)، ومَنْ معَهُ منَ الْمُسْلمينَ خيْرًا. ثُمَّ قال: ((اغْزُوا باسْم اللَّه، في سبيل اللَّه، قاتلوا منْ كفرَ باللَّه. اغْزُوا ولا تغُلُّوا، ولا تغْدرُوا، ولا تمْثُلُوا، ولا تقْتُلُوا وليدًا، وإذَا لقيت عدُوّك منَ الْمُشْرِكينَ فادْعُهُمْ إلى ثلاث خصالٍ -أوْ: خلالٍ- فأيّتُهُنَّ ما أجابُوك فاقْبلْ منْهُمْ، وكُفَّ عنْهُمْ. ثُمَّ ادْعُهُمْ إلى الْإسْلام، فإنْ أجابُوك فاقْبَلْ منْهُمْ، وكُفَّ عنْهُمْ، ثُمَّ ادْعُهُمْ إلى التَّحوُّل منْ دارهمْ إلى دار الْمُهاجرينَ، وأخْبرْهُمْ أنَّهُمْ إنْ فعلُوا ذلك فلهُمْ ما للْمُهاجرينَ وعليْهمْ ما على الْمُهاجرين، فإنْ أبوْا أنْ يتحوَّلُوا منْها: فأخْبرْهُمْ أنَّهُمْ يكُونُونَ كأعْراب الْمُسْلمين، يَجْري عليْهمْ حُكْمُ اللَّه الَّذي يَجْري على الْمُؤْمنين، ولا يكُونُ لهُمْ في الْغنيمة والْفيْء شيْءٌ إلَّا أنْ يُجاهدُوا مع الْمُسْلمينَ. فإنْ هُمْ أبوْا فَسلْهُمُ الْجزْية. فإنْ هُمْ أجابُوك فاقْبلْ منْهُمْ وكُفَّ عنْهُمْ. فإنْ هُمْ أبوْا فاسْتعنْ باللَّه، وقاتلْهُمْ. وإذا حاصرْتَ أهْل حصْنٍ، فأرادُوك أنْ تجْعل لهُمْ ذمّة اللَّه وذمَّة نبيّه (ﷺ)، فلا تَجْعلْ لهُمْ ذمّة اللَّه ولا ذمَّةَ نبيّه (ﷺ)، ولكن اجْعلْ لهُمْ ذمَّتك وذمَّة أصْحابك، فإنَّكُمْ أنْ تُخْفرُوا ذممَكُمْ وذمم أصْحابكُمْ أهْونُ منْ أنْ تُخْفرُوا ذمَّةَ اللَّه وذمَّةَ رسُوله (ﷺ). وإذا حاصرْتَ أهْلَ حصْنٍ، فأرادُوك أنْ تُنْزلهُمْ على حُكْم اللَّه، فلا تُنْزلْهُمْ على حُكْم اللَّه، ولكنْ أنْزلْهُمْ على حُكْمك، فإنَّكَ لا تدْري أتُصيبُ حُكْم اللَّه فيهمْ أمْ لا)). قال عبْدُ الرَّحْمَن، يعني ابن مهدي: هذا أوْ نحْوهُ.

(بُريدة) (ﷺ) دەڵێ: هەر کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەرکردەیەکی دابنایە لەسەر سوپایەك، یان هێزێکەوە، ئامۆژگاری تایبەتی دەکرد کە لە خوا(ﷻ) بترسێ و، چاك بێت لەگەڵ ئەو موسوڵمانانەش کە لەگەڵیدان، پاشان دەیفەرموو: ((بەناوی خواوە و لە پێناوی خوادا بجەنگن، بجەنگن لەگەڵ کەسێکدا کە باوەڕی بە خوانیە، بجەنگن و خیانەت لە دەستکەوتی شەڕ مەکەن تا دابەش نەکرێت، غەدر مەکەن، لاشەی کوژراوان مەشێوێنن، منداڵ مەکوژن، ئەگەر ڕووبەڕووی دوژمنە بێ باوەڕەکان بوونەوە بانگهێشتیان بکە بۆ سێ شت

-یان سێ سیفەت- لە هەرکامێکیاندا هاتن بە دەمتەوەلێیان وەربگرە و وازیان لێبهێنە، پاشان بانگهێشتیان بکە بۆ سەر ئاینی ئیسلام، ئەگەر وەلامیان بە بەلێ بوو لێیان وەربگرەو، وازیان لێ بهێنە، پاشان بانگهێشتیان بکە کە لە شوێنی خۆیانەوە بگوێزنەوە بۆ شوێنی کۆچکەران[1]، ئاگاداریان بکە کە ئەگەر ئەوەیان ئەنجام دا ئەوا هەر مافێ بۆ کۆچکەران هەیە بۆ ئەوانیش هەیە. وە هەرئەرکێ دەکەوێتە سەر شانیکۆچکەران دەکەوێتە سەر شانی ئەوانیش، جا ئەگەر ئەوەیان ڕەت کردەوە و شوێنی خۆیانیان بەجێنەهێشت، ئاگاداریان بکە کە ئەوانیش وەك عەرەبە موسوڵمانە دەشتەکیەکان وان، ئەو حوکمەی خوایان لە سەر پیادە دەکرێ کە لەسەر باوەڕداران پیادە دەکرێ بەلام لە دەستکەوتی جەنگ و دەستکەوتەکانی تریش (الغنيمة و الفيء) هیچیان نادرێتێ، مەگەر ئەوەی شان بەشانی موسڵمانان جیهاد بکەن ئەگەر ئەمەشیان ڕەت کردەوە ئەوا داوایان لێ بکە سەرانە بدەن، ئەگەر ڕازی بوون لێیان وەربگرە و وازیان لێبهێنە، ئەگەر ڕازی نەبوون داوای یارمەتی و پشتگیری خوا بکە و، لەگەڵیاندا بجەنگە و، ئەگەر گەمارۆی جێگیربوانی قەلایەکت دا، داوایان لێکردی پەیمانی خوا و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) لەگەڵیاندا مۆرکەی ئەوا لەگەڵیاندا مۆرمەکە، بەڵکو خۆت و هاوەڵەکانت پەیمانی پارێزراوی خۆتانیان بدەنێ، چونکە ئەگەر ئێوە پەیمانی خۆتان و هاوەڵەکانتان بشکێنن، ئەوا ئاسانترە لەوە کە پەیمانی خوا و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بشکێنن، خۆ ئەگەر جێگیربووانی قەلایەکت گەمارۆدا، داوایان لێکردی کە حوکمی خوایان بەسەردا جێبەجێبکەیت، ئەوەیان لەگەڵدا مەکە، بەڵکو حوکمی خۆتیان بەسەردا جێبەجێ بکە، چونکە تۆ نازانی، کە ئایا وەك پێویست ئەتوانی بڕیار و حوکمی ڕاستی خوایان لەسەر جێبەجێ بکەیت یان نا)).

## (٢) فەرماندان بە نوێنەران بۆ ئاسانکاریی

١٠٦٣ـ عن ابي موسى (رضي الله عنه): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) بَعثَهُ وَمُعاذًا إلَى اليَمن فقال: ((يَسِّرا وَلَا تُعَسِّرا، وَبَشِّرا وَلَا تُنفِّرا. وتطاوعا ولا تختلفا)). [البخاري الجهاد ٢٨٧٣]

[1] واتە بۆ وڵاتی ئیسلام

(أبو موسى) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەو و (معاذ)ی نارد بۆ یەمەن و فەرمووی: ((ئاسانکاریی بکەن و شت قورس مەکەن، موژدە دەربن و خەڵکی دوور مەخەنەوە، گوێڕایەڵی یەکتربن و لەنێوخۆتاندا ناکۆك مەبن)).

## (٣) ناردنی نوێنەران و پاداشتی کەسێ کە دەهێڵرێتەوە

١٠٦٤ـ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (ﷺ): أَنّ رسُولَ اللّه (ﷺ) بَعَثَ إلى بنِي لحْيان: ((ليَخْرُجْ منْ كُلِّ رَجُلَيْن رَجُلٌ)). ثُمَّ قال للْقاعد: ((أَيُّكُمْ خلفَ الْخَارِجَ فِي أَهْلِه وَماله بِخَيْرٍ كَانَ لَهُ مِثْلُ نِصْفِ أَجْرِ الْخَارِجِ)).

(ابو سعيد الخُدري) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) کردیە سەر (بني لحيان) کە: ((با هەر لە دوو کەستان، پیاوێك بڕوات)). پاشان بەو یەکەیانی فەرموو کە دەمێنێتەوە: ((هەر کەس لە ئێوە چاودێری ماڵ و منداڵی یەکێك لە ڕۆیشتوان بکات بەچاکە ئەوا بە ئەندازەی نیوەی پاداشتی ئەوی هەیە)).

## (٤) سنووری تەمەنی نێوان بچووك و گەورە لە چوون بۆ جەنگ

١٠٦٥ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ) قالَ: عَرَضَنِي رَسُولُ اللَّه (ﷺ) يَوْمَ أُحُدٍ فِي الْقِتَالِ، وَأَنَا ابْنُ أَرْبَعَ عَشْرَةَ سَنَةً فَلَمْ يُجِزْنِي. وَعَرَضَنِي يَوْمَ الْخَنْدَقِ وَأَنَا ابْنُ خَمْسَ عَشْرَةَ سَنَةً فَأَجَازَنِي. قال نَافِعٌ: فَقَدِمْتُ عَلَى عُمَرَ بْنِ عَبْدِ الْعَزِيزِ (ﷺ) وَهُوَ يَوْمَئِذٍ خَلِيفَةٌ، فحَدَّثْتُهُ هَذَا الْحَدِيثَ، فَقَالَ: إِنَّ هَذَا لَحَدٌّ بَيْنَ الصَّغِيرِ وَالْكَبِيرِ، فَكَتَبَ إلى عُمَّالِه أَنْ يَفْرِضُوا لِمَنْ كَانَ ابْنَ خَمْسَ عَشْرَةَ سَنَةً، وَمَنْ كَانَ دُونَ ذَلِكَ فَاجْعَلُوهُ فِي الْعِيَالِ. [البخاري/ الشهادات/٢٥٢١]

(إبن عمر) (ﷺ) دەڵێ: لە ڕۆژی جەنگی (أحد)دا چواردە ساڵ بووم پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە چاوی پێم کەوت مۆڵەتی نەدام، لە ڕۆژی (خندق) دا کە چاوی پێم کەوت تەمەنم پانزە ساڵ بوو، مۆڵەتیدام بجەنگم، (نافع) دەڵێ: هاتمە لای (عمر)ی کوڕی (عبدالعزيز) (ﷺ) کە ئەو کاتە جێنشین بوو، ئەم فەرموودەیەم بۆ گێڕایەوە، وتی: ئەوە سنوری نێوان بچووك و گەورەیە. نووسراوی نارد بۆ کاربەدەستانی کە مووچە ببڕنەوە بۆ ئەو کەسەی تەمەنی پانزە ساڵە، هەرکەسیش لەوە خوارتربێت بیخەنە ڕیزی ئەو خێزانانەوە کە یارمەتی دەدرێن.

## (٥) ڕێگریی لە هەڵگرتنی قورئان بۆ خاکی دوژمن

١٠٦٦ـ عن ابن عُمَر (رضي الله عنه) عَنْ رَسُول اللَّه (ﷺ): أنَّهُ كَانَ يَنْهَى أنْ يُسافر بِالْقُرْآن إلَى أرْض الْعَدُوِّ، مَخَافَةَ أنْ ينالهُ الْعَدُوُّ. [البخاري الجهاد/ ٢٨٢٨]

(إبن عمر) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگری دەکرد لە هەڵگرتنی قورئان لە کاتی سەفەرکردندا بۆ خاکی دوژمن. لەترسی ئەوەی نەبادا دوژمن دەست درێژی بکاتە سەر.

## (٦) ڕێکردن بەناو لەوەڕگا و ڕووتەمەنی دا

١٠٦٧ـ عَنْ أبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَال رَسُولُ اللَّه (ﷺ): ((إذَا سَافرْتُمْ فِي الْخِصْبِ فَأعْطُوا الْإبِل حَظَّهَا مِنَ الْأرْض، وإذَا سَافرْتُمْ فِي السَّنَة فَأسْرعُوا عليْهَا السَّيْرَ، وَإِذَا عَرَّسْتُمْ بِاللَّيْل فَاجْتَنِبُوا الطَّرِيقَ، فَإِنَّهَا مَأْوَى الْهَوَامِّ بِاللَّيْل)).

(أبو هريرة) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((ئەگەر بە ڕێبواری چوون بەناو لەوەڕگادا مافی حوشترەکان بدەن با بەشی خۆیان لەو زەویەدا بلەوەڕێن و، ئەگەر بە ڕێبواری چوون بەناو ڕووتەمەنیدا بەپەلە بەسەریدا بڕۆن، ئەگەر بەشەو کاروانتان خست (بۆ حەوانەوە) لەسەرە ڕێگە دوور بکەونەوە، چونکە سەرە ڕێگە بە شەودا شوێنگەی مێرووی زیان بەخشە)).

## (٧) سەفەرکردن بەشێکە لە سزا و ئازار

١٠٦٨. عَنْ أبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه): أنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) قَالَ: ((السَّفَرُ قِطْعَةٌ مِنَ الْعَذَاب، يَمْنَعُ أحَدَكُمْ نَوْمَهُ وَطَعَامَهُ وَشَرَابَهُ، فَإِذَا قَضَى أحَدُكُمْ نَهْمَتَهُ مِنْ وَجْهِهِ فَلْيُعَجِّلْ إلَى أهْلِهِ)). [البخاري/ العمرة/ ١٧١٠]

(أبو هريرة) (رضي الله عنه) دەڵێ: کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ((سەفەر بەشێکە لە سزا و ئازار، چونکە خەو وخواردن و خواردنەوە لەو کەسە قەدەغە دەکات، ئەگەر یەکێکتان لەسەفەرەکەیدا ئیشەکەی تەواو بوو، با پەلە بکات لە گەڕانەوە بۆ ناوماڵ و خێزانی)).

## (٨) بەشەو گەڕانەوە بۆ ناو ماڵ و منداڵ باش نییە

١٠٦٩ـ عَنْ جَابِر بن عبد الله (رضي الله عنه) قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّه (ﷺ) أنْ يَطْرُقَ الرَّجُلُ أهْلَهُ لَيْلًا، يَتَخَوَّنُهُمْ أوْ يَطْلُبُ عَثَرَاتِهِمْ.

(جابر) کوڕی (عبدالله) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگری کردوە کە بەشەو پیاو بگەڕێتەوە ناو ماڵ و خێزانی، بەنیازی خانە گومانی، یا بەدوای هەڵە و تاوانیاندا بگەڕێ.

١٠٧٠- عنْ أنس ابْن مالكٍ (ﷺ): أنَّ رَسُول اللَه (ﷺ) كان لَا يطْرُقُ أهْلَهُ ليْلا، وكان يأْتيهمْ غُدْوة أوْ عشيّة. [البخاري العمرة ١٧٠٦]

(أنس)ی کوڕی (مالك) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەشەودا نەدەگەڕایەوە ناو ماڵ و خێزانی، بەڵکو لە کاتی بەیانیاندا یان دەمەو ئێوارە دەگەڕایەوە.

## (٩) نزا و پارانەوە لە پێش دەستپێکردنی جەنگ

١٠٧١- عن ابْن عَوْنٍ قال: كتبْتُ إلى نافعٍ أسْألُهُ عن الدُّعاء قبْل الْقتال؟ قال: فكتب إليّ: إنّما كانَ ذَلك في أوّل الإسْلام، قدْ أغار رسُولُ اللّه (ﷺ) علَى بَني الْمُصْطلق وهُمْ غارُّون، وأنْعامُهُمْ تُسْقى علَى الْماء، فقتلَ مُقاتلتهُمْ وسبَى سبْيهُمْ، وأصابَ يوْمَئذٍ -قال يَحْيى: أحْسبُهُ قال -جُوَيْرية- أوْ قال الْبتّة- ابْنة الْحارث. وَحدَّثني هَذا الْحديث عبْدُ اللّه بْنُ عُمرَ (ﷺ)، وكانَ في ذَلك الْجيْش. [البخاري/ العتق ٢٤٠٣]

(ابن عون) (ﷺ) دەڵێ: نامەم نارد بۆ (نافع) و پرسیاری پارانەوەی پێش جەنگم لێکرد؟ وتی: بۆی نووسیمەوە: ئەمە لەسەرەتای بڵاو بونەوەی ئیسلامەوە بوو، کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەرەو (بني المصطلح) ڕۆیشت، لەکاتێکا بێ ئاگا بوون، مەڕوماڵاتیان لە ئاو خواردنەوەدا بوون، جەنگا لەگەڵ جەنگاوەرانیاندا و ژن و منداڵی بەدیل گرتن، (یحیی) دەڵێ: (ابن عون) وتی: هەر لەو ڕۆژەدا وا گومان دەبەم کە (جویریة) یان بە دڵنیاییەوە کچەکەی (حارث)ی بە دیل گرت. ئەم فەرمووودەیە (عبدالله)ی کوڕی (عمر) (ﷺ) بۆی گێڕامەوە کە لەناو سوپاکەدا بوو.

## (١٠) نامەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ پادشاکان کەبانگهێشتی دەکردن بۆ خوا پەرستی

١٠٧٢- عنْ أنسٍ (ﷺ): أنَّ نَبيَّ اللَّه (ﷺ) كَتَبَ إلَى كِسْرَى وَإلَى قيْصَرَ وَإلَى النَّجَاشيِّ، وَإلَى كُلِّ جَبَّار، يدْعُوهُمْ إلَى اللَّه، تَعالَى وَلَيْس بالنَّجَاشيِّ الَّذي صَلَّى عَلَيْه النَّبيُّ (ﷺ). [البخاري/ الجنائز/ ١١٨٨]

(أنــس) (ﷺ) دەڵــێ: پێغەمبــەری خــوا (ﷺ) نامــەی نووســی بــۆ لای (کیسرا) و (قیصر) و (نجاشی) و بۆ هەموو خاوەن دەسەڵاتێکی نا موسڵمانی بە زەبر، بانگهێشتی دەکردن باوەڕ بهێنن بە خوای گەورە، ئەم (نجاشی)یە ئەو (نجاشی)یە نییە کە موسڵمان بوو و، پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی جەنازەی غائبی لەسەر کرد.

## (١١) نامەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ هەرقل و بانگ کردنی بۆ موسڵمان بوون

١٠٧٣ـ عَن ابْنِ عَبَّاسٍ: أنَّ أبَا سُفْيَانَ (ﷺ) أخْبرهُ منْ فيه إلَى فيه قَالَ: انْطلقْتُ في الْمُدَّةِ الَّتي كَانَتْ بَيْنِي وبَيْنَ رسُولِ اللَّه (ﷺ)، قال: فَبيْنا أنا بالشَّأم إذْ جيءَ بكتَابٍ منْ رَسُولِ اللَّه (ﷺ) إلَى هرقْل، يَعْنِي عظيم الرُّوم، قَال: وكَانَ دَحْيَةُ الْكلْبيُّ جاءَ به. فَدَفَعهُ إلى عظيم بُصْرَى، فدفعهُ عظيمُ بُصْرَى إلَى هرَقْل، فقَال هرَقْلُ: هَلْ هَاهُنَا أحَدٌ منْ قوْم هَذَا الرّجُل الَّذي يَزْعُمُ أنَّهُ نبيٌّ؟ قالُوا: نعمْ، قَالَ: فدُعيتُ في نفرٍ منْ قُرَيْشٍ، فدَخلْنَا على هرَقْل، فأجْلَسنا بيْنَ يديْه، فقَال: أيُّكمْ أقْرَبُ نسَبًا منْ هذا الرَّجُل الَّذي يزْعُمُ أنَّهُ نَبيٌّ؟ فَقَالَ أبُو سُفْيَانَ: فقُلْتُ أنَا، فَأَجْلسُوني بَيْنَ يديْه، وَأجْلسُوا أصْحابِي خلْفي، ثُمَّ دَعَا بتَرْجُمَانه فقالَ [لهُ]: قُلْ لهُمْ: إنِّي سائلٌ هَذا عن الرَّجُل الَّذي يزْعُمُ أنَّهُ نَبيٌّ، فإنْ كذَبني فكذِّبُوهُ، قَال: فقَالَ أبُو سُفْيَان: وَايْمُ اللَّه لوْلا مخَافَةُ أنْ يُؤْثَرَ عليَّ الْكذبُ لكذبْتُ، ثُمَّ قَال لتَرْجُمَانه: سَلْهُ كَيْفَ حَسَبُهُ فِيكُمْ؟ قَالَ: قُلْتُ: هُوَ فينا ذُو حسبٍ، قَال: فهَلْ كَان منْ آبَائه ملكٌ؟ قُلْتُ: لَا، قَال فَهَلْ كُنْتُمْ تتهمُونَهُ بالْكذب قَبْل أنْ يَقُول ما قَال؟ قُلْتُ: لَا، قَال: ومَنْ يتَّبعُهُ، أشْرافُ النَّاس أمْ ضُعفَاؤُهُمْ؟ قَال: قُلْتُ: بَل ضُعَفَاؤُهُمْ، قَال: أيَزِيدُون أمْ يَنْقُصُونَ؟ قالَ: قُلْتُ: لا، بَلْ يَزِيدُونَ، قَال: هلْ يرْتَدُّ أحَدٌ منْهُمْ عنْ دينه بعْد أنْ يدْخُل فيه سَخْطةً لهُ؟ قَال: قُلْتُ: لَا، قَال: فَهَلْ قَاتَلْتُمُوهُ؟ قُلْتُ: نعمْ، قَالَ: فكَيْفَ كان قتالُكمْ إيَّاهُ؟ قَالَ: قُلْتُ: تكونُ الْحرْبُ بيْننا وَبَيْنَهُ سجالًا: يُصيبُ منَّا ونُصيبُ منْهُ. قَال: فَهَلْ يَغْدِرُ؟ قُلْتُ: لا، ونحْنُ منْهُ في مُدَّةٍ لا نَدْري مَا هُوَ صَانعٌ فِيهَا، قَال: فواللَّه ما أمْكنني منْ كلمةٍ أُدْخل فيها شَيْئًا غَيْرَ هَذه، قَال: فَهَلْ قَالَ هَذَا الْقَوْل أحَدٌ قَبْلَهُ؟ قَالَ: قُلْتُ: لَا. قَال لتَرْجُمانه: قُل لَهُ: إنِّي سَأَلْتُك عنْ حَسَبِه، فَزَعمْتَ أنَّهُ فِيكُمْ ذُو حسَبٍ، وكذَلك الرُّسُلُ تُبْعَثُ في أحْسَاب قَوْمهَا. وَسَأَلْتُك هلْ كَانَ في آبَائه ملكٌ، فَزَعَمْتَ: أنْ لَا، فَقُلْتُ: لَوْ كَانَ منْ

آبائه ملك، قُلْتُ رَجُلٌ يَطْلُبُ مُلْكَ آبائه. وَسَأَلْتُك عَنْ أَتْباعه أَضُعَفاؤُهُمْ أَمْ أشْرافُهُمْ؟ فَقُلْتَ: بَلْ ضُعَفَاؤُهُمْ، وهُمْ أتْباعُ الرُّسُل. وَسأَلْتُك: هَلْ كُنْتُمْ تَتَّهِمُونَهُ بالْكَذِب قَبْلَ أَنْ يَقُولَ ما قالَ؟ فزعَمْتَ: أَنْ لَا، فَقَدْ عرفْتُ أَنَّهُ لَمْ يَكُنْ لِيدَعَ الْكَذِب على النَّاسِ، ثُمَّ يَذْهَب فَيكْذِبَ عَلَى اللَّهِ. وَسأَلْتُك: هَلْ يَرْتَدُّ أحدٌ منْهُمْ عَنْ دينه -بَعْدَ أَنْ يَدْخُلَهُ- سَخْطَةً لَهُ؟ فَزعمْتَ: أنْ لَا، وَكذَلِك الْإِيمَانُ إذا خالط بشاشَة الْقُلُوبِ. وسألْتُكَ هَلْ يزِيدُون أوْ يَنْقُصُونَ؟ فزعَمْتَ أنَّهُمْ يَزِيدُون، وكَذلك الْإِيمانُ حَتَّى يَتِمَّ. وَسَألْتُك هَلْ قَاتَلْتُمُوهُ؟ فَزعَمْتَ: أَنَّكُمْ قَدْ قَاتَلْتُمُوهُ، فتكُونُ الْحرْبُ بيْنكُمْ وبيْنَهُ سجالًا: يَنالُ منْكُمْ وَتنَالُونَ منْهُ، وكذلك الرُّسُلُ تُبْتَلى، ثُمَّ تَكُونُ لهُمُ الْعاقبةُ. وسألْتُك: هَلْ يغْدرُ؟ فزعمْت أنَّهُ لا يغْدرُ، وكذلك الرُّسُلُ لا تغْدرُ. وَسأَلْتُكَ: هَلْ قَال هَذَا الْقوْلَ أحدٌ قبْلَهُ؟ فزعَمْت: أنْ لا، فَقُلْتُ: لَوْ قال هَذا الْقوْل أحدٌ قبْلهُ، قُلْتُ: رَجُلٌ ائْتَمَّ بِقوْلٍ قِيلَ قبْلَهُ. [قَال]: ثُمَّ قَال: بِمَ يأْمُرُكُمْ؟ قُلْتُ: يأْمُرُنا بالصَّلاة والزَّكاة والصِّلَة والْعفاف. قالَ: إنْ يكُنْ ما تقُولُ فيه حقًّا فإنَّهُ نبِيٌّ، وقدْ كُنْتُ أعْلمُ أنَّهُ خارجٌ، ولمْ أكُنْ أظُنُّهُ منْكُمْ، ولوْ أنِّي أعْلمُ أنِّي أخْلُصُ إِلَيْه لَأحْبَبْتُ لِقَاءهُ، ولوْ كُنْتُ عِنْدهُ لَغَسَلْتُ عنْ قدميْه، وليبْلُغنَّ مُلْكُهُ ما تحْت قدميَّ. قال: ثُمَّ دعا بكتَاب رَسُول اللَّه (ﷺ) فقرأَهُ، فإذا فيه: ((بِسْم اللَّه الرَّحْمن الرَّحِيم، منْ مُحَمَّدٍ رَسُول اللَّه إلى هرقْل عظِيمِ الرُّوم، سلامٌ على من اتَّبع الْهُدى. أمَّا بعْدُ: فإنِّي أدْعُوك بِدِعَايَةِ الْإِسْلامِ، أَسْلِمْ تَسْلَمْ، وأسْلمْ يُؤْتك اللَّهُ أجْرك مرَّتيْن، وإنْ تولَّيْت فَإنَّ عليْكَ إِثْمَ الْأريسيِّين، و: ﴿يا أهْلَ الْكتاب تعالوْا إلى كلمةٍ سواءٍ بيْننا وبيْنكُمْ أنْ لَا نَعْبُدَ إِلَّا اللَّهَ ولَا نُشْرِك بِهِ شيْئًا ولا يتَّخذ بعْضُنا بعْضًا أرْبابا منْ دُونِ اللَّه فَإنْ تولَّوْا فقُولُوا اشْهَدُوا بأنَّا مُسْلمُونَ﴾ [آل‌عمران: ٦٤]. فلمَّا فرغ منْ قراءة الْكتاب، ارْتفعت الْأصْواتُ عنْدهُ وكثُر اللَّغْطُ، وأمر بِنا فأُخْرجْنا. قالَ: فقُلْتُ لأصْحابي حين خرجْنا: لَقدْ أمِرَ أمْرُ ابْن أبِي كبْشَة، إنَّهُ ليخافُهُ ملكُ بني الْأصْفَر. قال: فما زلْتُ مُوقنًا بِأمْر رسُول اللَّه (ﷺ) أنَّهُ سيظْهرُ حتَّى أدْخل اللَّهُ عليَّ الْإِسْلام.

(إبن عباس) دەڵێ: لەدەمی (أبو سفیان) دەماو دەم بیستم، وتی: لەماوەی پەیمانی (حودەیبیە) ی نێوان من و پێغەمبەری خوا (ﷺ) چووم بۆ سەفەر، لەکاتێکدا کە لەشام بووم نامەیەك لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) هێنرا بۆ (هرقل)، واتە گەورەی ڕۆم، کە (دحیة الکلبي) هێنابووی، دایە دەست گەورەی

(بُصْرى)، گەورەی (بُصْرى)یش دایە دەستی (هرقل)، (هرقل) وتی: ئایا لێرە کەسێ هەیە لە کەسوکاری ئەو پیاوەی وادادەنێ کەپێغەمبەرە؟ وتیان بەڵێ. (ابو سفیان دەڵێ: لەناو چەند قورەیشیەکدا بانگکرام و چووینە لای (هرقل) لەبەردەمیدا داینیشاندین و وتی: کامتان بە خزمایەتی نزیکترە لەو پیاوەی وا گومان دەبا کە پێغەمبەرە؟ (ابو سفیان) وتی: وتم: من و پاشان لەبەردەمیدا دایان نیشاندم و هاوەڵەکانیشم لە دواوە. ئینجا تەرجومانەکەی داواکرد و پێی وت: پێیان بڵێ من پرسیار لەمە دەکەم لەبارەی ئەو پیاوەوە کە وادادەنێ پێغەمبەرە، ئەگەر درۆی لەگەڵ کردم بە درۆی بخەنەوە، (إبن عباس) دەڵێ: ابوسفیان وتی: سوێند بە خوا ئەگەر ترسی ئەوەم نەبوایە کە بە درۆم دەخەنەوە درۆم دەکرد، پاشان بە تەرجومانەکەی وت: لێی بپرسە کە بنەماڵەکەی چۆنە لەناوتاندا؟ وتم: ئەو لە نێوانماندا وەجاغ زادەیە (هرقل) وتی: ئایا لە باووباپیرانیدا پادشا هەبووە؟ وتم: نەخێر، وتی: ئایا تۆمەتبارتان کردووە بە درۆ پێش ئەوەی ئەمە بڵێت؟ وتم: نەخێر. وتی: کێ شوێنی دەکەوێ، پیاوماقوڵ و بنەماڵەدار یان لاواز و بێدەسەڵاتەکان؟ وتم: خەڵکانی لاواز و بێدەسەڵاتەکان. وتی: ئایا زۆردەبن یان کەم دەکەن؟ وتم: نەخێر بەڵکو زۆر دەبن. وتی: ئایا کەسیان ڕقی لەو دینەدەبێتەوە و پاشگەز دەبێتەوە لە دوای چوونە ناوی؟ وتم: نەخێر. وتی ئایا جەنگتان لەگەڵدا کرد؟ وتم: بەڵێ. وتی ئەو شەڕەتان لەگەڵیدا چۆن شەڕێ بوو؟ وتم: شەڕ لە نێوانماندا هەر جارە جۆرێ بوو، جارێ ئەو سەردەکەوت و جارێ ئێمە. وتی: ئایا غەدر دەکا؟ (واتە پەیمانی دەشکاند) وتم: نەخێر، ئێستە ئێمە و ئەو پەیمانێکمان لە نێواندایە نازانین ئەو خەریکی چیە تیایدا. ابو سفیان وتی: سوێند بە خوا نەمتوانی تەنها یەك وشەی (زامدارکەر) بخەمە سەر قسەکانم لە (بەرانبەریدا) جگە لەم قسەیەی کە کردم لە دەرحەقی. وتی: ئایا کەسێکی تر لە پێش نەمەوە ئەم قسەیەی کردوە. واتە لافی پێغەمبەری لێداوە؟ وتم: نەخێر بە تەرجومانەکەی وت: پێی بڵێ من پرسیارم لێکردی دەربارەی وەجاغ زادەییەکەی. وتت کە ئەو لە نێوانتاندا وەجاغ زادەیە. هەر وەهایە پێغەمبەران لە وەجاغ زادە و بنەماڵەی قەومەکەی خۆیاندا نێردراون. پرسیارم لێکردی ئایا کەسێ لە باوباپیرانیدا پادشابووە، وتت: هەرگیز نەخێر دەڵێم: ئەگەر کەسێ لەباوباپیرانی

پادشابوایە، دەمووت پیاوێکە داوای سامان و دەسەڵاتی باپیرانی دەکات پرسیارم لێکردی دەربارەی شوێنکەوتوانی، کە ئایا لاواز و بێدەسەڵاتەکانن، یان پیاوماقوڵ و بنەماڵەکانن؟ وتت: بەڵکو لاواز و بێدەسەڵاتەکانن. هەر ئەوانەیش شوێنکەوتەی پێغەمبەرانن.. پرسیارم لێکردی، ئایا لە پێش لاف لێدانی پێغەمبەرایەتیدا ئێوە تاوانبارتان دەکرد بە درۆکردن؟ وات دانا: کە هەرگیز نەخێر ، من لەوەوە زانیم کە ناگونجێ کەسێك درۆ لەگەڵ خەڵکیدا نەکات و بچێت درۆ بەدەم خواوە بکات. پرسیارم لێکردی: ئایا کەس لە ئاینەکەی پاشگەز دەبوویەوە -لەپاش ئەوەی کە دەچووە ناوی- بەهۆی ڕقلێبونیەوە؟ وتت: هەرگیز نەخێر ئەویش سروشتی باوەڕە، کاتێ تێکەڵاو بە سۆزەکانی دڵ بوو، پرسیارم لێکردی ئایا شوێنکەوتوانی زۆر دەبن یان کەم دەکەن؟ وات دانا زۆر دەبن، ئەوە سروشتی باوەڕە: تا دەگاتە ئەنجامی تەواوی خۆی و جێگیر دەبێ. پرسیارم لێکردی: ئایا جەنگتان کردووە لەگەڵیدا، وتت: کە ئێوە جەنگتان لەگەڵدا کردوە. شەڕ لە نێوانتاندا هەر جارە جۆرێك بووە، زیانی لێداون و زیانتان لێ داوە ، پێغەمبەران هەر وابوون کە تاقی دەکرێنەوە، بەلام دەرئەنجام سەرکەوتن هەر بۆ ئەوانە ، وە پرسیارم لێکردی: ئایا غەدر دەکات؟ وات دانا کەغەدر ناکات، ئەوە ڕەوشتی پێغەمبەرانە کە غەدر ناکەن، پرسیارم لێکردی: ئایا کەس لە پێش ئەمەوە ئەم قسەیەی کردووە، واتە دەربارەی پێغەمبەرایەتی؟ وتت: هەرگیز نەخێر، وتم: ئەگەر کەسێ لە پێش ئەمەوە ئەم قسەیەی کردبێ، دەمووت : پیاوێکە وتەیەك دووبارە دەکاتەوە کە پێش خۆی وترابێ. ئینجا (هرقل) وتی: فەرمانتان بە چی پێ‌دەدا؟ وتم: فەرمانمان پێ‌دەکات نوێژبکەین و زەکات بدەین و سیلەی ڕەحم بەجێ بهێنین و داوێن پاك بین. وتی: ئەگەر ڕاست بێ ئەو سیفەتانەی تێدابێ کە دەیانڵێیت ئەوا بە ڕاستی پێغەمبەرە. من ئەوەم دەزانی کە پێغەمبەرێکی وا پەیدا دەبێت، بەلام گومانم وانەبوو کە لە ئێوەیە ئەگەر بمزانیایە کە دەتوانم بگەمە لای، حەزم دەکرد بە خزمەتی بگەم، ئەگەر لەلایدا بوومایە قاچەکانیم دەشۆرد.. بەدڵنیایی سنووری دەسەلاتی دەگاتە ئەم شوێنەی کە لە ژێر پێی مندایە.. پاشان داوای نامەکەی پێغەمبەری خوای (ﷺ) کرد و خوێندیەوە، ئەمەی تێدابوو: ((بسم الله الرحمن الرحيم. لە (محمد) پێغەمبەری خواوە (ﷺ) بۆ (هرقل)ی گەورەی ڕۆم،

سلاو لەو کەسەبێت کە شوێن ڕێگەی ڕاستی دەکەوێ، پاشان: من بانگهێشتت دەکەم بۆ سەر ئاینی ئیسلام، موسوڵمان ببە سەلامەت دەبی (لەهەردوو دنیا)، موسڵمان ببە خوای گەورە دوو قات پاداشتت دەداتەوە. ئەگەر ئەوەت ڕەت کردەوە ئەوە تاوانی ڕەعیەتەکەتت دەکەوێتە سەر، ئەم ئایەتەی خوێندەوە کەلە نامەکەدا هەبوو: ﴿يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْا إِلَى كَلِمَةٍ سَوَاءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَنْ لَا نَعْبُدَ إِلَّا اللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ..﴾ ئەمە ماناکەیەتی: ﴿ئەی ئەوانەی کتێبتان بۆ ڕەوانە کراوە. وەرن بەدەم بانگەواز و بەرنامەیەکەوە کە هاوبەش و هاوسەنگە لە نێوان ئێمەش و ئێوەشدا (ئەویش ئەمەیە): جگە لە (الله) کەسی تر نەپەرستین، هیچ جۆرە هاوەڵێکی بۆ بڕیارنەدەین، هیچ لایەکمان لاکەی ترمان (بەپیرۆز و فەرمان ڕەوا دانەنێین) و لە جیاتی ئەو زاتە کەسی‌تر نەپەرستین (خۆ ئەگەر لەم بانگەوازەدا) سەرپێچیان کرد و گوێیان پێ‌نەدا، ئەوە پێیان بڵێ: کە ئێوە بەشایەت بن ئێمە موسوڵمانین و ملکەچی فەرمانی پەروەردگارین)). کاتێ لێبویەوە لە خوێندنەوەی نامەکە، غەڵبە غەڵب و (دەنگە دەنگ) بەرزبوویەوە لە دەوروبەری کە نەدەزانرا چی دەوترێ، (هرقل) فەرمانی‌دا و ئێمە براینە دەرەوە. وتی: کاتێ چووینە دەرەوە بە هاوەڵەکانم وت: بە ڕاستی پلەوپایەی کوڕی (أبي كبشة)[1] گەورە بوو. ئەوەتا پادشای (بني الأصفر)[2] لێی دەترسێ.. لەوکاتەوە ئیتر من لەوە دڵنیابووم کە ئاینی پێغەمبەر (ﷺ) ئاشکرا دەبێ، هەتا خوا ئیسلامی خستە دڵی خۆشمەوە.

## (١٢) پارانەوەی پێغەمبەر (ﷺ) و ئارامگرتنی لەسەر ئازاری دوو ڕووەکان

١٠٧٤ـ عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ (رضي الله عنه): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) رَكِبَ حِمَارًا عَلَيْهِ إِكَافٌ، تَحْتَهُ قَطِيفَةٌ فَدَكِيَّةٌ، وَأَرْدَفَ وَرَاءَهُ أُسَامَةَ، وَهُوَ يَعُودُ سَعْدَ بْنَ عُبَادَةَ فِي بَنِي الْحَارِثِ بْنِ الْخَزْرَجِ، وَذَاكَ قَبْلَ وَقْعَةِ بَدْرٍ، حَتَّى مَرَّ بِمَجْلِسٍ فِيهِ أَخْلَاطٌ مِنَ

[1] (أبي كبشة) یەکێکە لە باپیرە ناودارەکانی پێغەمبەر (ﷺ)، یان مەبەست بە باوکی شیریەتی. تا لە پلەوپایەی کەم بکەنەوە

[2] (بني الأصفر) مەبەست ڕۆمەکانە

الْمُسْلمين والْمُشْركين عبدَة الْأوْثان والْيهُود، فيهمْ عَبْدُ اللَّه بْنُ أُبَيّ وفي الْمَجْلس عَبْدُ اللَّه بْنُ رواحة، فلمّا غشيَت المجْلس عَجَاجَةُ الدّابَّة خَمَّرَ عَبْدُ اللّه بْنُ أُبَيّ أنْفهُ بردائه، ثُمّ قالَ: لا تُغبّرُوا علَيْنا. فسلّم عليْهم النَّبيُّ (ﷺ)، ثُمّ وَقَفَ فنَزلَ، فدعاهُمْ إلى اللّه وقرأ عليْهمُ الْقُرْآن، فقال عبْدُ اللَّه بْنُ أُبيّ: أيُّها الْمرْءُ، لا أحْسَنَ منْ هذا، إنْ كان ما تقُولُ حقًا فلا تُؤْذنا في مجالسنا، وارْجعْ إلى رحْلك، فمَنْ جاءك منّا فاقْصُصْ عليْه. فقال عبْدُ اللّه بْنُ رواحة (ﷺ): اغْشَنا في مَجالسنا، فإنّا نُحبُّ ذلك. قال: فاسْتبَّ الْمُسْلمُون والْمُشْركُون والْيهُودُ حتَّى همُّوا أنْ يَتواثبُوا، فلمْ يزل النّبيُّ (ﷺ) يُخفّضُهُمْ، ثُمّ ركب دابّتهُ حتَّى دَخلَ علَى سَعْد بْن عُبادة، فقال: ((أيْ سعْدُ ألمْ تسْمعْ إلى ما قال أبُو حُبابٍ -يُريدُ عَبْدَ اللّه بْنَ أُبيّ- قال: كَذا وكذا)). قالَ: اعْفُ عنْهُ يا رَسُول اللّه واصْفحْ، فوَاللّه لقدْ أعْطاكَ اللّهُ الّذي أعْطاك، ولَقد اصْطلح أهْلُ هذه الْبُحيْرة أنْ يُتوّجُوهُ فيُعصّبُوهُ بالْعصابة، فلمّا ردّ اللّهُ ذلك بالْحقّ الّذي أعْطاكهُ شرقَ بذلك، فذلكَ فعَل به مَا رأيْتَ. فعفَا عنْهُ النّبيُّ (ﷺ).[البخاري التفسير/ ٤٢٩٠]

(أسامة)ی کوڕی (زيد) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) سواری گوێدرێژێك بوو بوو، کورتانێکی پێوەبوو. لە ژێر خۆیشیدا قەیفەیەکی (فدك)[٣]ی ڕاخستبوو، (أسامة)ی لە پشتیەوە سوار کردبوو سەردانی (سعد) کوڕی (عبادە)ی دەکرد کە نەخۆش بوو، لەناو (بنی الحارث)ی سەر بە (خزرج). ئەوەش لە پێش ڕووداوی بەدردا بوو، دای بەلای کۆڕێکدا کە هەمە جۆرە بوو لە موسڵمانان و بت پەرستان و جولەکە، (عبدالله) کوڕی (أبي) لەناویاندا بوو، (عبدالله) کوڕی (ڕەواحە)ش لە کۆڕەکەدا بوو، هەر کە تەپ و تۆزی گوێدرێژەکە کەوتە سەر مەجلیسەکە، (عبدالله)ی کوڕی (أبي) بە پۆشاکەکەی لوتی خۆی داپۆشی، پاشان وتی: تۆز مەکە بەسەرماندا، پێغەمبەر (ﷺ) سڵاوی لێکردن. پاشان وەستا و دابەزی، بانگهێشتی کردن بۆ پەرستنی خوای گەورە و، قورئانی خوێند بەسەریاندا، ئینجا (عبدالله) کوڕی (أبي) وتی: ئەی کابرا، قسەی لەمە باشترت نیە، ئەگەر ئەوەش ڕاستە کە دەیڵێیت، ئازاری مەجلیسەکەمان مەدە و بگەڕێرەوە بۆ ماڵی خۆت، هەر کەس لە ئێمە هاتەلات ئەوا لەوێ قسەی بۆ بکە.

[٣] فدك: شارۆچکەیەکە دوو قۆناغ لە مەدینەوە دوورە.

(عبدالله) کوڕی (رواحه) (ﷺ)وتی: بەڵکو سەرمان لێبدە لە کوڕەکانماندا، ئێمە ئەوەمان پێخۆشە، پاشان موسڵمانەکان و بت پەرستەکان و جولەکە لەیەك توڕە بوون و بە مەبەستی شەڕکردن هەستانە سەر پێ بۆیەکتر، پێغەمبەر (ﷺ)بەردەوام دایدەمرکاندنەوە، پاشان سواری وڵاغەکەی بوویەوە تا چووە لای (سعد)کوڕی (عُبادة)، فەرمووی: ((ئەی (سعد) ئایا نەتبیست کە (أبو حباب) – مەبەستی (عبدالله) کوڕی (أبي)– ئاوا و ئاوای وت؟)). (سعد) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لێی خۆش ببە و چاوپۆشی لێبکە، سوێند بە خوا ئەو پلەوپایەی خوا بە تۆی بەخشی لە کاتێکدا بوو کە خەڵکی ئەم شارە بڕیاریان دابوو کە تاجی لەسەرکەن و بیکەنە گەورەی خۆیان، کاتێ خوای گەورە ئەوەی لێسەندەوە بەو ڕاستیەی کە بە تۆی داوە زۆر ناڕەحەت و تەنگەتاو بوو، ئەوە بوو وای لێکرد کە ئەو هەڵوێستەی هەبێ کە بینیت، ئیتر پێغەمبەر (ﷺ) لێی خۆش بوو.

## ( ١٣ ) ڕێگریی لە غەدر و ناپاکی

١٠٧٥ـ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): ((لِكُلِّ غَادِرٍ لِوَاءٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يُرْفَعُ لَهُ بِقَدْرِ غَدْرِهِ، أَلَا وَلَا غَادِرَ أَعْظَمُ غَدْرًا مِنْ أَمِيرِ عَامَّةٍ)).

(أبو سعيد) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (( هەموو ستەمکارێك لە ڕۆژی قیامەتدا ئاڵایەکی هەیە، بەڕادەی غەدرەکەی بۆی بەرزدەکرێتەوە، ئاگاداربن کە هیچ ستەمکارێ نیە ستەمەکەی گەورەتربێ لە ستەمی (فەرمانڕەوایەکی) گشتی)) (واتە ستەمی فەرمانڕەوایان گەورە و گرانترە و زۆرتر حسابی بۆ ئەکرێ لە خەڵکی تر).

## ( ١٤ ) وەفاکردن بە پەیمان

١٠٧٦ـ عنْ حُذَيْفَةُ بْنُ الْيَمَانِ (ﷺ) قَالَ: مَا مَنَعَنِي أَنْ أَشْهَدَ بَدْرًا إِلَّا أَنِّي خَرَجْتُ أَنَا وَأَبِي حُسَيْلٌ، قَالَ: فَأَخَذَنَا كُفَّارُ قُرَيْشٍ، قَالُوا: إِنَّكُمْ تُرِيدُونَ مُحَمَّدًا، فَقُلْنَا: مَا نُرِيدُهُ، مَا نُرِيدُ إِلَّا الْمَدِينَةَ، فَأَخَذُوا مِنَّا عَهْدَ اللَّهِ وَمِيثَاقَهُ لَنَنْصَرِفَنَّ إِلَى الْمَدِينَةِ وَلَا نُقَاتِلُ مَعَهُ، فَأَتَيْنَا رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) فَأَخْبَرْنَاهُ الْخَبَرَ، فَقَالَ: ((انْصَرِفَا، نَفِي لَهُمْ بِعَهْدِهِمْ وَنَسْتَعِينُ اللَّهَ عَلَيْهِمْ)).

(حذيفة) ی کوڕی (اليمان) (ﷺ) دەڵێ: هیچ شتێکی تر نەبوو کەمن دابڕێ لە بەشداریکردن لە جەنگی (بدر) ئەوە نەبێ کە من و (حُسيل)ی باوکم

دەرچووین، کافرەکانی قورەیش ئێمەیان گرت، وتیان: ئێوە دەتانەوێ بچن بۆلای محمد، وتمان: نەخێر نامانەوێ بچین بۆ لای، دەمانەوێ بچین بۆ مەدینە، ئەوانیش پەیمان و بەڵێنی خوایان لێوەرگرتین کە بچین بەرەو (مدینە) و شان بەشانی ئەو نەجەنگین، هاتینە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و هەواڵەکەمان پێدا، ئەویش فەرمووی: ((بڕۆن، ئێمە وەفادەکەین بە و پەیمانەی پێمان داون داوای یارمەتی لە خوای گەورە دەکەین کە سەرمان بخات بەسەریان دا)).

## (١٥) خۆزگە نەخواستن بە ڕووبەڕوو بونەوەی دوژمن و، خۆڕاگری لەکاتی ڕووبەڕووبوونەوەدا

١٠٧٧ـ عَنْ أَبِي النَّضْرِ، عَنْ كِتَابِ رَجُلٍ مِنْ أَسْلَمَ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (ﷺ) يُقَالُ لَهُ: عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي أَوْفَى، فَكَتَبَ إِلَى عُمَرَ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ حِينَ سَارَ إِلَى الْحَرُورِيَّةِ يُخْبِرُهُ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) كَانَ فِي بَعْضِ أَيَّامِهِ الَّتِي لَقِيَ فِيهَا الْعَدُوَّ يَنْتَظِرُ، حَتَّى إِذَا مَالَتِ الشَّمْسُ، قَامَ فِيهِمْ فَقَالَ: ((يَا أَيُّهَا النَّاسُ لَا تَتَمَنَّوْا لِقَاءَ الْعَدُوِّ وَاسْأَلُوا اللَّهَ الْعَافِيَةَ، فَإِذَا لَقِيتُمُوهُمْ فَاصْبِرُوا، وَاعْلَمُوا أَنَّ الْجَنَّةَ تَحْتَ ظِلَالِ السُّيُوفِ)). ثُمَّ قَامَ النَّبِيُّ (ﷺ) وَقَالَ: ((اللَّهُمَّ مُنْزِلَ الْكِتَابِ، وَمُجْرِيَ السَّحَابِ، وَهَازِمَ الْأَحْزَابِ اهْزِمْهُمْ وَانْصُرْنَا عَلَيْهِمْ)). [البخاري: الجهاد/ ٢٨٦١]

(ابو النضر) دەڵێ: لەنامەی پیاوێکەوە لە تیرەی (اسلم) و لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) کە پێی دەوترا: (عبدالله) کوڕی (اوفی) کە نووسیبوی بۆ (عمر) کوڕی (عبیدالله) کاتێ ڕۆشتبوو بەرەو (الحرورية)[1] ئاگاداری دەکات: کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەیەکێ لە جەنگەکانیدا کە ڕووبەڕووی دوژمن بوویەوە، چاوەڕوانی کرد، هەتا خۆر بەرەو ئاوابوون چوو، ئینجا هەستاو فەرمووی: ((ئەی خەڵکینە خۆزگە مەخوازن بۆ ڕووبەڕووبونەوەی دوژمن، لەخوا بخوازن سەلامەت و پارێزراوبن، ئەگەر ڕووبەڕووشیان بوونەوە ئارامبگرن. ئەوەش بزانن کە بەهەشت لە ژێر سێبەری شمشێرەکاندایە)). دووبارە پێغەمبەر (ﷺ) هەستاو فەرمووی: ((ئەی خوایە، دابەزێنەری قورئان و هێنەری هەورەکان، ئەی ڕوخێنەری حیزب و تاقمە بێباوەڕەکان. تێکیان بشکێنە و سەرمان بخە بەسەریاندا)).

---

(٢) الحرورية: ناوچەیەکە (خەواریج)ی تێدابوو؟

## (١٦) دۆعا کردن لە دوژمن

فيه حديث عبدالله بن أبي أوفى (ﷺ)، وقد تقدم في الباب قبله.
فەرمودەی پێشووی لەسەرە (عبدالله) کوڕی (أبو أوفى) (ﷺ) دەیگێڕێتەوە.

١٠٧٨ـ عَنْ أنَسٍ (ﷺ): أنَّ رسُولَ اللَّه (ﷺ) كانَ يقُولُ يوْمَ أُحُدٍ: ((اللَّهُمَّ إنَّكَ إنْ تَشَأْ لَا تُعْبَدْ فِي الْأَرْضِ)).

(انس) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە رۆژی (أُحد)دا دەیفەرموو: ((ئەی خوایە، ئەگەر هۆکارەکانی سەرکەوتن بڕەخسێنی بۆ دوژمن ئەوا تۆ لەم سەرزەویەدا ناپەرسترێیت)).

## (١٧) جەنگ فڕوفێڵە

١٠٧٩ـ جَابِرِ بن عبدالله (ﷺ) قال: رَسُولُ اللَّه (ﷺ): ((الْحَرْبُ خُدْعَةٌ)).

(جابر(کوڕی (عبدالله) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((جەنگ فڕو فێڵە)) [واتە: لەجەنگدا دەکرێ بەمەبەستی زیان گەیاندن بە دوژمن فێڵ بکەیت. فێڵ (خدع) لە قورئاندا بە مانای ئەوەدێت کەکارێك دەرخەیت کە سەر لەدوژمن تێك بدەیت].

## (١٨) بەشدار نەکردنی بت پەرستان لە جەنگدا

١٠٨٠ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) -زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ)- أنَّها قالتْ: خَرج رسُولُ اللَّه (ﷺ) قبلَ بَدْرٍ، فلمَّا كانَ بِحرَّةِ الْوَبَرةِ أدْركَهُ رَجُلٌ، قدْ كانَ يُذْكَرُ منْهُ جُرْأةٌ ونَجْدةٌ، فَفَرِحَ أصْحَابُ رَسُولِ اللَّه (ﷺ) حِينَ رَأوْهُ. فلمَّا أدْركَهُ قال لرَسُول اللَّه (ﷺ): جِئْتُ لِأَتَّبِعَكَ وأُصِيبَ مَعَكَ، قَالَ لَهُ رسُولُ اللَّه (ﷺ): ((تُؤْمِنُ باللَّه ورَسُوله)). قَالَ: لَا، قَالَ: ((فَارْجِعْ، فَلنْ أسْتَعِينَ بِمُشْرِكٍ)). قالتْ: ثُمَّ مضى، حتَّى إذا كُنَّا بِالشَّجَرَةِ أدْرَكَهُ الرَّجُلُ، فقَالَ لَهُ كَمَا قَالَ أوَّلَ مَرَّةٍ. فقَالَ لهُ النَّبِيُّ (ﷺ) كما قَالَ أوَّلَ مَرَّةٍ، قَالَ: ((فَارْجِعْ، فَلَنْ أسْتَعِينَ بِمُشْرِكٍ)). قَالَ: ثُمَّ رجَع فأدْركَهُ بالْبَيْدَاءِ، فَقَالَ لَهُ كَمَا قَالَ أوَّلَ مَرَّةٍ: ((تُؤْمِنُ باللَّه وَرَسُولِه)). قَالَ: نَعَمْ، فَقَالَ [لهُ] رسُولُ اللَّه (ﷺ): ((فَانْطلِقْ)).

(عائشە)ی خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕووەو (بدر) ڕۆیشت، کاتێ گەیشتە (حرة الوبرة)[٢] پیاوێك گەیشت پێی، وا باسی

---

[٢] حرة الوبرة: شوێنێکە لە دەرەوەی مەدینە.

ئەو پیاوە دەکرا کە بە غیرەتە و بە هانای هەرکەسێکەوە دێ کە هانای پێ ببات، هەرکە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بینیان دڵخۆش بوون، کاتێ گەیشتە لایان ، بەپێغەمبەری خوا (ﷺ)ی وت هاتووم لەگەڵتدا بم و بجەنگێم و شتێکم دەستکەوێ. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((باوەڕت بە خوا و بەپێغەمبەرەکەی هەیە؟)) وتی: نەخێر. فەرمووی: ((بگەڕێرەوە. من بت پەرست بەشدار ناکەم بۆ یارمەتی)) عائیشە وتی: دوای ئەوە ڕۆیشت، کاتێ ئێمە لە (الشجرة)[٣] بووین پیاوەکە گەیشتەوە بە پێغەمبەر (ﷺ) و هەمان قسەی یەکەمجاری لێدووبارە کردەوە، پێغەمبەریش (ﷺ) هەمان فەرموودەی جاری یەکەمی پێوتەوە، پاشان فەرمووی: ((بگەڕێرەوە من داوای یارمەتی لە بێباوەڕ ناکەم)) عائشە وتی: پاشان گەڕایەوە و دواتر لە (البیداء)[٤] گەیشتەوە بە پێغەمبەر (ﷺ) و پێغەمبەریش (ﷺ) هەمان فەرموودەی یەکەمین جاری لێ دووبارە کردەوە: ((باوەڕت بە خوا و بەپێغەمبەرەکەی هەیە؟)) وتی: بەڵێ. پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموو: ((دە بکەوەڕێ)).

## ( ١٩ ) دەرچوونی ئافرەتان لەگەڵ جەنگاوەراندا

١٠٨١ـ عَنْ أنس (رضي الله عنه): أنَّ أمَّ سُلَيْم (رضي الله عنها) اتَّخَذَتْ يَوْمَ حُنَيْن خنْجرا، فكان مَعها، فرآها أبُو طَلْحَةَ، فقال: يا رسُول اللّه هذه أُمُّ سُلَيْم مَعها خنْجرٌ، فقال لها رسُولُ اللّه (ﷺ): ((ما هذا الْخنْجرُ)). قالت: اتَّخَذْتُهُ إنْ دنا منِّي أحدٌ من الْمُشْرِكينَ بَقَرْتُ به بطْنَهُ، فجعل رسُولُ اللّه (ﷺ) يضْحكُ، قالتْ: يا رسُول اللّه اقْتُلْ مَنْ بَعْدَنَا منَ الطُّلَقاء انْهزَمُوا بك، فقال رسُولُ اللّه (ﷺ): ((يا أمَّ سُلَيْم، إنَّ اللّهَ [(عز وجل)] قدْ كفى وأحْسَن)).

(انس) (رضي الله عنه) دەڵێ: (أمّ سلیم) (رضي الله عنها) لە ڕۆژی (حنین)دا خەنجەرێکی بەدەستەوە گرتبوو کە لەگەڵ خۆی هەڵی گرتبوو، (أبو طلحة) چاوی پێکەوت، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوە (أم سلیم)ە خەنجەرێکی پێیە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە (أم سلیم)ی وت: ((ئەو خەنجەرە چییە؟)) وتی: هەڵم گرتووە تا ئەگەر یەکێ لە بێباوەڕان لێم نزیک بوویەوە سکی هەڵبدڕم پێی.

---

[٣] الشجرة. شوێنێکە لە دەردوەی مەدینە.

[٤] البیداء: بیابان.

وایكرد كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێبكەنێ. (أم سليم) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو ئازاد كراوانەی (مەككە)ش بكوژە كەلە شەڕەكە هەڵهاتن و بوونە مایەی شكست هێنانت. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((ئەی (أم سليم)، خوای گەورە پێویستی نەخستینە ئەوان و چاكەیشی لەگەڵ كردوون)).

١٠٨٢ـ عَنْ أَنس بْنِ مالكٍ (رضي الله عنه) قَالَ: لَمَّا كانَ يَوْمُ أُحُدٍ انْهَزَم ناسٌ منَ النّاس عَن النَّبيِّ (ﷺ)، وأَبُو طلْحَةَ بيْن يَدي النَّبيِّ (ﷺ) مُجوِّبٌ عَلَيْه بحجَفَةٍ، قال: وكَان أَبُو طلْحَة رجُلًا راميًا شَديد النَّزْعِ، وكسر يوْمئذٍ قوْسَيْنِ أَوْ ثلاثًا، قال: فكَان الرَّجُلُ يمُرُّ معَهُ الْجعْبَةُ من النَّبْلِ، فيقُولُ: ((انْثُرْها لأَبي طلْحة)). قال: ويُشْرفُ نبيُّ اللَّه (ﷺ) يَنْظُرُ إِلى الْقَوْم، فيَقُولُ أَبُو طلْحَة: يا نبيَّ الله بأَبِي أَنْت وأُمِّي لا تُشْرفْ، لَا يُصبْكَ سَهْمٌ منْ سهام الْقَوْم، نحْري دُون نحْرِكَ. قَال: ولقدْ رأَيْتُ عَائشَةَ بِنْتَ أَبي بكْرٍ وأُمَّ سُلَيْمٍ -(رضي الله عنهما)- وإِنَّهُما لَمُشَمِّرتان أَرى خَدم سُوقهما، تنْقُلَان الْقرَبَ على مُتُونهما، ثُمَّ تُفْرغانه في أفْواههمْ، ثُمَّ ترْجِعان فتمْلَآنها، ثُمَّ تَجيئانِ تُفْرغَانه في أفْواه الْقوْم، ولقدْ وقع السَّيْفُ منْ يديْ أبي طلْحة إِمَّا مرَّتيْن وإِمَّا ثَلاثًا، منَ النُّعاس. [بخاري فضائل الصحابة ٣٦٠٠]

(انس) كوڕی (مالك) (رضي الله عنه) دەڵێ: كاتێ كەلە ڕۆژی (أحد) دا كەسانێ لە جەنگاوەران لە شەڕ هەڵهاتن و پێغەمبەریان بەجێهێشت، (ابو طلحة)یش لەبەردەمی پێغەمبەردا بوو (ﷺ) بە پارچەیەك پێست بەری گرتبوو لە پێغەمبەر و شێوە قەڵغانێكی بۆ دروست كردبوو، (انس)وتی: (ابو طلحة) پیاوێكی دەست ڕاست و تیر بەهێز بوو. لەو ڕۆژەدا دوو یاسێ كەوانی شكاند. هەر كە پیاوێ تێدەپەری بەلایدا و تیرخانی پێبووایە، پێغەمبەر دەیفەرموو: ((تیرەكانت دانێ بۆ (ابو طلحة))). پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە گۆشەیەكەوە دەیڕوانیە خەڵكەكە، (ابو طلحة) دەیووت: ئەی پێغەمبەری خوا، باوك و دایكم بە فیدات بن، دەرمەكەوە، نەبادا تیرێ لە تیرەكانی ئەو بێباوەڕانە بەرت بكەوێ، گیانم بە فیدای گیانت بێ. (انس)وتی: بینیم بەچاوی خۆم وا عائیشەی كچی ابو بكر و (ام سليم) خۆیان هەڵكردوە بە جۆرێ كە خەڵخاڵی پێیانم دەبینی، كوندە ئاو لەسەر پشتیان بوو دەیانگواستەوە، پاشان كوندەكەیان خاڵی دەكردەوە لەدەمی جەنگاوەراندا. پاشان دەگەڕانەوە پڕیان دەكردەوە، دیسان

دەهاتنەوە خاڵیان دەكردەوە لەدەمی جەنگاوەراندا، دوو جار سێ جار شمشێر لەدەستی (ابو طلحة) كەوتە خوارەوە لەتاو ئەوە كە خەو زۆری بۆ هێنابوو.

١٠٨٣ـ عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ الْأَنْصَارِيَّةِ (ﷺ) قالت: غَزَوْتُ مع رسُول اللّه (ﷺ) سبْعَ غَزَوَاتٍ، أَخْلُفُهُمْ فِي رِحَالِهِمْ، فَأَصْنَعُ لَهُمُ الطَّعامَ، وأُداوي الْجَرْحى، وأَقُومُ على الْمَرْضى. [البخاري — ٣٦٠٠ —مناقب ابي طلحة (ﷺ)]

(أم عطية الأنصارية) (ﷺ) دەڵێ: لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) حەوت جار چووم بۆ غەزا لە شوێنی هەڵدانیان و سەربازگەی دواوە دەمامەوە خواردنم بۆ دروست دەكردن، زامدارەكانم تیمار دەكرد، چاودێری نەخۆشەكانم دەكرد.

## ( ٢٠ ) ڕێگریی كردن لە كوشتنی ژنان و منداڵان لە جەنگدا

١٠٨٤ـ عَنِ ابْنِ عُمرَ (ﷺ) قالَ: وُجِدت امْرَأَةٌ مقْتُولةً في بعْض تلْك الْمغَازي. فَنَهَى رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَنْ قتْل النِّسَاءِ والصِّبْيان. [البخاري/ الجهاد/ ٢٨٥٢]

(عبدالله) كوڕی (عمر) (ﷺ) دەڵێ: لە غەزایەك لە غەزاكاندا ئافرەتێكی كوژراو بینرا، ئینجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگریی كرد لە كوشتنی ژنان و منداڵان.

## ( ٢١ ) بڕینی دارخورماكانی دوژمن و سوتاندنیان

١٠٨٥ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ): أَنَّ رسُولَ اللّه (ﷺ) قطعَ نخْل بني النَّضير وحرّق. ولها يَقُولُ حَسَّانُ (ﷺ):

وَهَانَ عَلَى سَراة بني لُؤَيّ       حريقٌ بالْبُويْرة مُسْتَطِيرُ

وَفي ذَلكَ نزَلَتْ: ﴿مَا قطعْتُمْ منْ لينةٍ أَوْ تركْتُمُوهَا قائمَةً عَلَى أُصُولهَا﴾ الْآية. [البخاري/ المغازي/ ٢٩٨٤]

(عبدالله) كوڕی (ابن عمر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دارخورماكانی (بنو النضیر) بڕی و سوتاندنیشی، لەم بارەیەوە حسان (شاعیری ئیسلام) (ﷺ) دەڵێ:

وهان على سراة بني لؤي       حريق بالبويرة[1] مستطيرُ

بەڵای گەورەكانی (بني لؤی) وە ئاسان بوو ئاگرێ لە (بويرة) بكەوێتەوە تەشەنەبكات. هەر لەم بارەیەوە ئەم ئایەتەی سەرەوە هاتە خوارەوە

[1] البويرة: ناوی شوێنێكە لە گەڕەك وبانی بنو النضیر

کە ئەمە ماناکەیەتی: ﴿هەر درەختێکی تەڕتان بڕیبێت یان وازتان لێهێنابێت و لەسەر بنجی خۆی مابێت (لەخەیبەردا) بە فەرمانی خوابووە و ویستی ئەوی لەسەرە، تا تاوانباران و لەسنوور دەرچووەکانی سەرشۆڕ و خەجاڵەت بکات﴾.

## ( ٢٢ ) بردنی خواردن لە خاکی دوژمندا

١٠٨٦ـ عَنْ عبْد اللَّه بْن مُغفّل (رضي الله عنه) قال: أصبْتُ جرابًا منْ شحْم يوْم خيْبر، قال: فالْتزمْتُهُ، فقُلْتُ: لا أُعطي الْيوْم احدًا منْ هذا شيْئًا، قال: فالْتفتُّ فإذا رسُولُ اللَّه (ﷺ) مُتبسِّمًا. [بخاري، الخمس ٢٩٨٤]

(عبدالله) کوڕی (مُغفَّل) (رضي الله عنه) دەڵێ: ڕۆژی (خەیبەر) هیزەیەك بەزم دۆزیەوە؛ هەڵمگرت و وتم: ئەمڕۆ لەمە هیچ بەشی کەس نادەم. وتی: کەلام کردەوە پێغەمبەری خوام (ﷺ) بەزەردەخەنەوە بینی.

## ( ٢٣ ) حەڵاڵکردنی دەستکەوتەکانی جەنگ تایبەتە بەم ئوممەتەوە

١٠٨٧ـ عنْ أبي هُريْرة (رضي الله عنه) قال: قال رسُولُ اللّه (ﷺ): ((غزا نبيٌّ من الْأنْبياء، فقال لقوْمه: لا يتْبعْني رجُلٌ قدْ ملك بُضْع امْرأةٍ، وهُو يُريدُ أنْ يبْني بها ولمّا يبْن ولا آخرُ قدْ بنى بُنْيانًا ولمّا يرْفعْ سُقُفها. ولا آخرُ قد اشْترى غنمًا أوْ خلفات وهُو مُنْتظرٌ ولادها. قال: فغزا فأدْنى للقرْية حين صلاة الْعصْر أوْ قريبًا منْ ذلك، فقال للشّمْس: أنْت مأْمُورةٌ وأنا مأْمُورٌ، اللّهُمّ احْبسْها عليّ شيْئًا. فحُبستْ عليْه حتّى فتح اللّهُ عليْه، قال: فجمعُوا ما غنمُوا، فأقْبلت النّارُ لتأْكُلهُ فأبتْ أنْ تطْعمهُ، فقال: فيكُمْ غُلُولٌ، فلْيُبايعْني منْ كُلّ قبيلةٍ رجُلٌ، فبايعُوهُ فلصقتْ يدُ رجُل بيده، فقال: فيكُمُ الْغُلُولُ، فلْتُبايعْني قبيلتُك، فبايعتْهُ، قال: فلصقتْ بيد رجُليْن أوْ ثلاثةٍ، فقال: فيكُمُ الْغُلُولُ، أنْتُمْ غللْتُمْ، قال: فأخْرجُوا لهُ مثْل رأْس بقرةٍ منْ ذهبٍ، قال: فوضعُوهُ في الْمال، وهُو بالصّعيد، فأقْبلت النّارُ فأكلتْهُ، فلمْ تحلّ الْغنائمُ لأحدٍ منْ قبْلنا، ذلك بأنّ اللّهَ تبارك وتعالى رأى ضعْفنا وعجْزنا، فطيّبها لنا)). [البخاري/ الخمس ٢٩٥٦]

(ابو هریرة) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((پێغەمبەرێ لە پێغەمبەران غەزایەکی کرد و، بە ئوممەتەکەیی وت: با پیاوێ شوێنم نەکەوێ کە ئافرەتێکی مارەکردبێ و، ویستبێتی بیگوێزێتەوە و هێشتا نەیگواستبێتەوە، هەروەها کەسێکی تریش کە خانوویەکی کردبێتەوە وهێشتا سەری نەگرتبێ. یەکێکی تریش کە مەڕ یا حوشتری ئاوسی کڕی بێ و

چاوەڕێی بۆ بەچكەی هەبێ، فەرمووی: غەزاكەی كرد و كات نوێژی عەسر یان دەوروبەری عەسر نزیكی گوندەكە بوبویەوە، بە خۆری فەرموو: تۆ فەرمانبەرداری و منیش فەرمانبەردارم، خوایە ماوەیەك ئەم خۆرە ڕاگرە بۆم. خۆرەكەی بۆ ڕاگیرا تاخوا سەری خست، فەرمووی: دەستكەوتە جەنگیەكەیانیان كۆكردەوە، ئاگر هات بۆ ئەوەی بیسوتێنێ كەچی نەیسوتاند، پێغەمبەرەكە فەرمووی: گزیكارتان تێدایە، با لە هەر هۆزێك كەسێ بێ پەیمانم بداتێ، پەیمانیان دایە، دەستی پیاوێك لكا بە دەستیەوە، فەرمووی: گزی كارتان تێدایە، با هۆزەكەت هەمووی پەیمانم بداتێ، ئینجا هۆزەكە پەیمانی دایە: دەستی لكابە دەستی دووسێ پیاوی هۆزەكەوە، فەرمووی: گزییەكە لە ئێوەدایە، ئێوە گزیتان كردوە، فەرمووی: بەقەبارەی سەرە مانگایەك ئاڵتونیان بۆ دەرهێنا و خستیانە ناو ئەو دەستكەوتەوە كەلە دەشتەكە دانرابوو. ئاگرەكە هات و سوتاندی، دەستكەوتەكانی شەڕ بۆ كەس حەڵاڵ نەكراوە لەپێش ئێمەوە، بەڵام چونكە خوای گەورە لاوازی و بێدەستەڵاتی ئێمەی بینیوە، بۆیە حەڵاڵی كردوە بۆ ئێمە)).

## (٢٤) دەستكەوتەكانی جەنگ

١٠٨٨ـ عَنْ مِصْعَب بنْ سَعْدٍ، عَن ابِيهِ قَال: نَزَلَتْ فِيَّ ارْبَع ايات: أصَبْتُ سَيْفاً فاتَى بِهِ النَبيَّ (ﷺ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ الله نَفِّلنيه ، فاقال (ضَعْهُ) مِنْ حيْثُ اخَذْتَهُ))]ثُمَّ قامَ فَقَالَ: نَفِّلْنِيهِ يَا رَسُولَ اله ، فقالَ: ((ضَعْهُ)) .فقامَ فقالَ: يَا رَسُولَ الله نَفِلنِيهِ، اأجْعَل كمَن لا غنَاءَ لَهُ؟ فقَال [لَهُ] النَبيَّ(ﷺ): ((ضَعْهُ مِنْ حَيْثُ اخَذْتَهُ)). قالَ: فَنَزَلَت هَذِه الايَةُ﴿يَسْأَلونَكَ عَنِ الْأنْفَالِ قُلِ الْأنْفَالُ لِلَّهِ وَالرَّسُولِ﴾[(الأنفال: ١)].

(مُصعَب) كوری (سَعد) لەباوكیەوە دەڵێ: چوار ئایەت لەبارەمەوە دابەزیون، شمشێرێكم دۆزیەوە، هێنام بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) عەرزم كرد: ئەی پێغەمبەری خوا بیكەرە زیادەبەشم لە دەستكەوتی جەنگ، پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو: ((لەكوێ هەڵت گرتوە هەر لەوێ دایبنێرەوە)). پاشان هەستام عەرزم كرد: ئەی پێغەمبەری خوا بیكەرە زیادەبەشم لە دەستكەوتی جەنگ. فەمووی: ((داینێ)) دیسانەوە هەستام وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بیكەرە (زیادەبەشم) لە دەستكەوتی جەنگی. ئایا هەروەك كەسێ سەیرم دەكرێ‌كە هیچ

سودێکی نەبووە لە جەنگەکەدا؟ پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو: ((لە کوێ هەڵت گرتووە هەر لەوێ دایبنێرەوە)). (مُصعب) دەڵێ: ئەم ئایەتەی سەرەوە هاتە خوارەوە: کە ئەمە ماناکەیەتی: ﴿ئەی محمد (ﷺ) پرسیارت لێدەکەن دەربارەی ئەو دەستکەوتانەی بەبێ شەڕ دەست ئەکەون، تۆ بڵێ هەموو دەستکەوتەکان هی خوا و پێغەمبەرن)). (الانفال: ١)

## ( ٢٥ ) هێزەکان دەستکەوتی جەنگیان پێ دەدرێ

١٠٨٩ـ عَن ابْن عُمَـر (رضي الله عنهما) قـال: بَعـثَ رَسُـولُ اللـه (ﷺ) سـريّةً إلـى نجْـدٍ، فخرَجْتُ فيها، فأصَبْنا إبلًا وغنمًا، فبلغتْ سُهْمَانُنا اثْنـيْ عَشـرَ بَعـيرًا، ونفّلَنـا رَسُولُ اللّه (ﷺ) بَعيرًا بعيرًا. [البخاري/ الخمس/ ٢٩٦٥]

(إبن عمر) (رضي الله عنهما) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) هێزێکی نارد بۆ (نەجد)، منیش لە گەڵیاندا ڕۆیشتم، حوشتر و مەڕێکی زۆر بووە دەستکەوتمان، بە جۆرێ کە پشکی هەریەکەمان دوانزە حوشتر بوو، لەسەرووی ئەوەشەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) یەکی حوشترێکی تری پێداین.

## ( ٢٦ ) دەستکەوتەکانی جەنگ دەکرێن بە پێنج پشك

١٠٩٠ـ عَنْ ابْن عُمر (رضي الله عنهما): أنّ رَسُولَ اللّه (ﷺ) قدْ كانَ يُنَفّلُ بعْض منْ يبْعثُ منَ السَّرَايَا لأنْفُسهِمْ خاصّةً، سوَى قسْم عَامّة الْجَيْش، وَالْخُمْسُ فـي ذلكَ واجبٌ كلّه. [البخاري/ الخمس ٢٩٦٦]

(إبن عمر) (رضي الله عنهما) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستکەوتی جەنگی دەدا بە هەندێ لەو هێزانە کە دەیناردن بۆ جەنگ ئەمە تایبەت بەو هێزانە بوو، جگە لەو بەشەی کەلە کۆی گشتی دەستکەوتی جەنگی سوپاکە بەریان دەکەوت، واجبە پێنج یەك لە هەموو ئەو دەستکەوتە دەربکرێت لە پێش دابەشکردنی ئەو بەخششە تایبەتەی پێغەمبەر (ﷺ) لەم پێنج یەکەنەبووە.

## ( ٢٧ ) چەك وشمەکی کوژراو دەدرێ بە بکوژەکە

١٠٩١ـ عَنْ أبي قَتَادَةَ (رضي الله عنه) قالَ: خَرَجْنا مَعَ رَسُول اللّه (ﷺ) عَامَ حُنيْن، فلَمّا الْتقيْنَا كانَتْ للْمُسْلمينَ جوْلَةٌ، قَالَ: فرَأيْتُ رَجُلًا من الْمُشْركين قدْ عَلا رجُلًا مـن الْمُسْلمينَ، فَاسْتَدرْتُ إلَيْه حَتّى أتيْتُهُ منْ وَرائه فَضرَبْتُهُ عَلَى حَبْل عاتقه، واقْبل عَلَيّ، فَضَمّني ضَمّةً وجَدْتُ منْهَا ريحَ الْمَوْت، ثُمّ أدْركَهُ الْموْتُ فأرْسَلَني، فَلحقْتُ عُمَرَ بْنَ الْخطّاب (رضي الله عنه)، فقَالَ: مَا للنّـاس؟ فقلْـتُ: أمْرُ اللّـه (ﷻ)، ثُـمّ إنّ النّـاس

رَجَعُوا، وجَلَس رَسُولُ اللَّه (ﷺ) فقَال: ((مَنْ قتَلَ قتيلًا لهُ عَلَيْه بيِّنَةٌ فلهُ سَلَبُهُ)). قال: فَقُمْتُ فَقُلْتُ: منْ يَشْهَدُ لِي؟ ثُمّ جَلسْتُ، ثُمّ قالَ مثْلَ ذَلكَ، فقَالَ: فقُمْتُ فقُلْتُ: منْ يَشْهَدُ لي؟ ثُمَّ جلسْتُ، ثُمّ قالَ ذَلك الثَّالثَةَ، فقُمْتُ، فقَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): ((ما لك يَا أبَا قتَادَةَ)). فقصَصْتُ عليْه الْقصَّةَ، فقَال رجُلٌ منَ الْقوْم: صدق يَا رسُول اللَّه، سلبُ ذَلك الْقتيل عنْدي، فأَرْضه منْ حقِّه. وقَال أَبُو بكْرٍ الصِّدِّيقُ (ﷺ): لَا هَا اللَّه إذًا، لَا يعْمِدُ إلى أَسَدٍ منْ أُسُدِ اللَّه، يُقَاتلُ عنِ اللَّه وعَنْ رسُوله (ﷺ)، فيُعْطيكَ سَلَبَهُ. فقَال رَسُولُ اللَّه (ﷺ): ((صَدَقَ، فأَعْطه إيَّاهُ)). فأَعْطَاني، قال: فبِعْتُ الدِّرْع فابْتَعْتُ به مَخْرَفًا في بنِي سَلِمةَ، فإنَّهُ لأَوَّلُ مَالٍ تأَثَّلْتُهُ في الْإسْلَام. [بخاري/ الخمس، ٢٩٧٣]

(ابو قتادة) (ﷺ) دەڵێ: ساڵی (حنین) لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) چووین بۆ جەنگ، کاتێ ڕووبەڕووی (دوژمنان) بووینەوە موسڵمانان توشی شڵەژانێ بوون، بینیم، وا پیاوێك لە بێباوەڕان زاڵ بووە بەسەر موسڵمانێکدا، منیش سوڕامەوە بەلایدا تا چوومە پشتیەوە و شمشێرێکم دالە ڕەگی لاملی، ڕووی تێکردم و گوشیمی بە خۆیەوە، بۆنی مردنم لێ بەدی کرد، دوایی بەریدام و مرد، گەیشتمەوە بە (عمر)ی کوڕی (خطاب) و (ﷺ) وتی: ئەم خەڵکە بۆوای لێهات؟ وتم: فەرمانی خوای گەورەیە، پاشان خەڵکی گەڕانەوە، پێغەمبەری خوایش (ﷺ) دانیشت و فەرمووی: ((هەرکەسێ کوژراوێکی کوشتبێ و بەڵگەیەکی هەبێ لەسەری ئەوا چەك و شمەکەکەی بۆ ئەو کەسەیە)) (ابو قتادة) دەڵێ: هەستام وتم: کێ شایەتیم بۆ دەدا؟ پاشان دانیشتم، دیسان پێغەمبەر (ﷺ) فەرموودەکەی دووبارە کردەوە. منیش هەستام و وتم: کێ شایەتیم بۆدەدا؟ دیسان دانیشتمەوە، بۆ جاری سێیەم پێغەمبەر (ﷺ) فەرموودەکەی دووبارە کردەوە. هەستامەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((ئەوە چیتە (ابو قتادة)؟ داستانەکەم بۆ گێڕایەوە، یەکێ لەناو خەڵکەکەدا وتی: ڕاست دەکات ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) چەك و شمەکی ئەو کوژراوە لای منە، ڕازی بکە با بۆ من بێت. (ابو بکر الصدیق) (ﷺ) وتی: هەرگیز نابێ ئەوە ببێ، پێغەمبەر ئەوە ناکات کە شێرێ لە شێرانی خوا بجەنگێ لە پێناو خواو پێغەمبەرەکەیدا و ئێستە چەك و شمەکەکەی بدات بە تۆ. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((ڕاست دەکات بیدەرەوە)). ئەویش پێی دامەوە، (ابو قتادة) دەڵێ:

زرێکەم فرۆشت و بە پارەکەی باغێکم لە (بنی سلمة) کڕی. ئەوەیش یەکەم سامانێ بوو کە لە ئیسلامدا دەستم بکەوێ و کردبێتم بە موڵکی خۆم.

**( ٢٨ ) چەك و شمەكی کوژراو بە ئیجتهاد دەدرێ بە یەکێ لە بکوژان**

١٠٩٢ـ عَنْ عبْدِ الرّحْمن بْن عَوْف (ﷺ) أنَهُ قال: بيْنا انا واقفٌ في الصَفّ يوْم بدْر، نظرْتُ عنْ يميني [وشمالي] فإذا انا بيْن غُلاميْن من الأنْصار حديثة أسْنانُهما، تمنَيْتُ لوْ كُنْتُ بيْن اضْلع منْهما، فغمزني أحدُهُما فقال: يا عمِّ، هل تعْرفُ أبا جهْل؟ قال: قُلْتُ: نعمْ، وما حاجتُك إليْه يا ابْن اخي؟ قال: أُخْبِرْتُ انَهُ يسُبُّ رسُول اللّه (ﷺ)، والّذي نفْسي بيده لئنْ رأيْتُهُ لا يُفارقُ سوادي سوادهُ حتّى يمُوت الْأعْجلُ منّا. قال: فتعجّبْتُ لذلك، فغمزني الْآخرُ، فقال مثْلها، قال: فلمْ أنْشبْ أنْ نظرْتُ إلى أبي جهْل يزُولُ في النّاس، فقُلْتُ: ألا تريان؟ هذا صاحبُكُما الّذي تسْألان عنْهُ، قال: فابْتدراهُ فضرباهُ بسيْفيْهما حتّى قتلاهُ، ثُمّ انْصرفا إلى رسُول اللّه (ﷺ) فأخْبراهُ، فقال: ((أيُّكُما قتلهُ)). فقال كُلُّ واحد منْهُما: انا قتلْتُ، فقال: ((هلْ مسحْتُما سيْفيْكُما)). قالا: لا، فنظر في السّيْفيْن، فقال: ((كلاكُما قتلهُ)). وقضى بسلبه لمُعاذ بْن عمْرو بْن الْجمُوح، والرّجُلان: مُعاذُ بْنُ عمْرو بْن الْجمُوح، ومُعاذُ بْنُ عفْراء. [البخاري الخمس ٢٩٧٢]

(عبدالرحمن) کوڕی (عوف) (ﷺ) دەڵێ: لە کاتێکدا کە من لە ڕۆژی بەدردا لەناو ڕیزی (جەنگاوەران)دا وەستابووم، بەلای ڕاست و چەپی خۆمدا سەیرم کرد خۆم بینیەوە لە نێوان دوو مێرد منداڵی ئەنصاری مەدینەیی‌تازە لاودا وەستاوم، ئاواتم خواست کە لە نێوان دووانی لەوانە بەهێزتردا بومایە، یەکێکیان چاوی لێداگرتم و وتی: مامە ئایا تۆ (ابو جهل) دەناسی؟ وتم: بەڵێ کوڕی برام کارت چی‌یە پێی؟ وتی: هەواڵم پێگەیشتوە کە جنێو بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەدات سوێند بەوکەسەی گیانی منی بەدەستە، ئەگەر بیبینم لاشەم لەلاشەی ناترازێ تا ئەو کەسەمان کە زووتر ئەجەلی هاتووە بمرێ. (عبد الرحمن) دەڵێ: لەو هەڵوێستە سەرم سوڕما ئەوی تریشیان چاوی لێداگرتم و هەمان قسەی هاوەڵەکەی دووبارە کردەوە. زۆری نەخایاند تا سەیرم کرد وا (أبوجهل) لە نێو خەڵکەکەدا دێت و دەچێ و وتم: ئایا نایبینن؟ ئەوە ئەو کەسەیە کە هەواڵتان پرسی، (عبدالرحمن) دەڵێ: هەڵیانکوتایە سەری و (دەست پێشخەریان کرد) بە شمشێرەکانیان کەوتنە لێدانی تاکوشتیان، پاشان

گەڕانەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) و هەواڵەکەیان پێگەیاند، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((کامتان کوشتی؟)) هەریەکەیان وتی: من کوشتم، ئینجا فەرمووی: ((ئایا شمشێرەکانتان سڕیوە؟)) وتیان: نەخێر، سەیری هەردوو شمشێرەکەی کرد، فەرمووی: ((بەڵێ، هەردووکتان کوشتوتانە)). فەرمانی دا چەك و شمەکەکەی ابو جهل بدرێ بە (معاذ) کوڕی (الجموح). دوو پیاوەکەش (معاذ) کوڕی (عمرو)ی کوڕی (الجموح) و (معاذ) کوڕی (عفراء) بوون.

## (٢٩) بێبەش کردنی جەنگاوەر لە چەك و شمەکی کوژراوی دەستی خۆی بە ئیجتهادی سەرکردە

١٠٩٣ـ عنْ عوْف بْن مالكٍ (ﷺ) قال: قتل رجُلٌ منْ حمْير رجُلًا من الْعدُوِّ، فأراد سلبهُ، فمنعهُ خالدُ ابْنُ الْوليد (ﷺ)، وكان واليًا عليْهمْ، فأتى رسُول اللّه (ﷺ) عوْفُ بْنُ مالكٍ فأخْبرهُ، فقال لخالدٍ: ((ما منعك أنْ تُعْطيهُ سلبهُ)). قال: اسْتكْثرْتُهُ يا رسُول اللّه، قال: ((ادْفعْهُ إليْه)). فمرّ خالدٌ بعوْفٍ فجرّ بردائه، ثُمّ قال: هلْ أنْجزْتُ لك ما ذكرْتُ لك منْ رسُول اللّه (ﷺ)؟ فسمعهُ رسُولُ اللّه (ﷺ) فاسْتُغْضب فقال: ((لا تُعْطه يا خالدُ، لا تُعْطه يا خالدُ، هلْ أنْتُمْ تاركُون لي أُمرائي؟ إنّما مثلُكُمْ ومثلُهُمْ كمثل رجُلٍ اسْتُرْعي إبلًا أوْ غنمًا، فرعاها، ثُمّ تحيّن سقْيها فأوْردها حوْضًا فشرعتْ فيه، فشربتْ صفْوهُ وتركتْ كدْرهُ، فصفْوُهُ لكُمْ وكدْرُهُ عليْهمْ)).

(عوف) کوڕی (مالك) (ﷺ) دەڵێ: کەسێك لە هۆزی (حیمیر) پیاوێکی لە دوژمن کوشت، ویستی چەك و شمەکەکەی ببات، (خالد)ی کوڕی (ولید) (ﷺ) کە سەرپەرشتیان بوو نەیدایە، (عوف)ی کوڕی (مالك) هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا و (ﷺ) هەواڵەکەی پێدا، پێغەمبەر (ﷺ) بە (خالد)ی فەرموو: ((چی وای لێکردی ئەو چەك و شمەکەی نەدەیتێ؟))، (خالد) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە زۆرم زانی، فەرمووی: ((بیدەرێ))، (خالد) دای بەلای (عوف)دا و (عوف) عەباکەی ڕاکێشا، پاشان وتی: ئایا بەڵێنەکەی خۆمم بردەسەر کەوتم لای پێغەمبەر (ﷺ) سکاڵات لە دەست دەکەم؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) گوێی لێ بوو، ڕقی هەڵساو فەرمووی: ((ئەی خالید مەیدەرێ، ئەی خالید مەیدەرێ، ئایا بۆ وازناهێنن لە سەردەستەی هێزەکانم؟ نموونەی ئێوە و ئەوان وەك پیاوێ وایە، کراوە بە شوانی بڕکەیەك حوشتر و مەڕ، ئەویش

دەیانلەوەڕێنیٚ تا کاتی ئاودانیان، ئینجا دەیانباتە سەر گۆماوێك ئاوە ڕوون و پاکەکە دەخۆنەوە و لیٚلاوەکەی جیٚ دیٚلن، ڕوون و پاکەکەی بۆ ئێوەیە و لیٚلەکەیشی بۆ سەرکردەکانە)).

**(٣٠) هەموو چەك و شمەکی کوژراو دەدریٚ بەو جەنگاوەرەی کوشتویەتی**

١٠٩٤ـ عنْ سَلمةَ بْنُ الْأكْوَع (ﷺ) قال: غزَوْنا معَ رسُول اللّه (ﷺ) هَوازِن، فبَيْنا نحْنُ نتضحَّى مَع رَسُول اللّه (ﷺ)، إذْ جَاءَ رَجُلٌ علَى جمَلٍ أحْمَر فأناخهُ، ثُمَّ انْتزعَ طَلَقًا منْ حقَبِهِ فقيَّد بِهِ الْجمَلَ، ثُمَّ تقدَّمَ يتغدَّى مع الْقوْم، وجعَل ينْظُرُ، وفينا ضَعْفةٌ ورقَّةٌ في الظَّهْرِ وبَعْضُنا مُشاةٌ، إذْ خَرج يَشْتَدُّ، فأتى جملهُ فأطْلَق قَيْدَهُ، ثُمَّ أنَاخهُ وقَعدَ علَيْه فأثارَهُ فاشْتَدَّ بِه الْجَمَلُ، فاتَّبَعهُ رَجُلٌ على نَاقةٍ ورْقاء، قَالَ سَلَمَةُ: وخَرجْتُ أشْتَدُّ، فكُنْتُ عنْدَ وِرك النَّاقة، ثُمَّ تقدَّمْتُ حتَّى كُنْتُ عنْد وَرك الْجَمَل، ثُمَّ تَقدَّمْتُ حتَّى أخذْتُ بِخطام الْجمل فأنخْتُهُ، فلمَّا وَضعَ رُكْبتَهُ في الْأرْض اخْترَطْتُ سَيْفِي فضَرَبْتُ رَأْسَ الرَجُل فندر، ثُمّ جئْتُ بِالْجمل أقُودُهُ، عليْه رحْلُهُ وسِلاحُهُ، فاسْتقْبَلَني رَسُولُ اللّه (ﷺ) والنَّاسُ مَعَهُ، فقال: ((مَنْ قتَل الرَّجُلَ)). قالُوا: ابْنُ الْأكْوَع، قالَ: ((لَهُ سَلَبُهُ أجْمَعُ)). [البخاري/ الجهاد/ ٢٨٨٦]

(سَلَمة) کوڕی (الأكوع) (ﷺ) دەڵیٚ: لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) جەنگی هەوازینمان کرد، کاتیٚ ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) نانی چێشتنگاومان دەخوارد، پیاوێك[1] بەسەر حوشترێکی سورەوە هات و چۆکی بە حوشترەکەی دادا، پاشان سیرمەیەکی چەرمی لە پشتی خۆی دەرهێنا و حوشترەکەی پیٚبەستەوە، ئینجا هاتە پێشەوە و دەستی کرد بە نان خواردن لەگەڵ مەجلیسەکەدا، کەوتە تەماشاکردن، ئێمەش جۆرە لاوازی و شەکەتیەکمان پێوە دیاربوو لەسواری وڵاغ و لەبەپیٚ ڕۆیشتنی هەندێکیشمان، کابرا بە ڕاکردن ڕۆیشت و حوشترەکەی کردەوە، پاشان یەخی حوشترەکەی داو سواری بوو، بە توندی کەوتە لێخوڕینی و حوشترەکەش کەوتە غاردان، یەکیٚ لە پیاوەکان لەسەر پشتی حوشترێکی بۆری میٚ دوای کەوت، (سلمة) دەڵیٚ: ئینجا منیش بە ڕاکردن شوێنی کەوتم، گەیشتمە کەفەڵی حوشترە بۆرە مێیەکە، پاشان گەیشتمە کەفەڵی حوشتری (کابراکە)، لێی چوومە پێش و لغاوی

---

[1] لە بخاری‌دا مەبەست بە پیاو، جەنگاوەرێکە بەبیٚ پەیمانی پاراستن بێتە وڵاتی ئیسلام.

حوشترەکەم گرت و پەخم دا، کاتێ ئەژنۆی خستە سەر زەوی، شمشێرەکەمم لە کێلان دەرهێنا و دام لەسەری پیاوەکە و سەری قرتا و کەوتە خوارێ، پاشان حوشترەکەم بە شوێنم دا ڕاکێشا، هەموو کەل و پەلی سەفەر و چەکەکەی لەسەر بوو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێشوازی لێکردم خەڵکانێکیش لە خزمەتیدا بوون، فەرمووی: ((کێ ئەو پیاوەی کوشت))، وتیان: (إبن الآكوع)، فەرمووی: ((هەموو چەك و شمەکەکەی بۆ ئەوە)).

## (٣١) زیادە بەخشیی لە دەستکەوتی جەنگدا و دیل بەدیل کردن

١٠٩٥ـ عنْ إِياسُ بْنُ سَلمةَ، عنْ أَبيه (ﷺ) قال. غَزَوْنَا فزَارَةَ وَعلیْنَا أَبُو بكْرٍ (ﷺ)، أمَّرَهُ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) عَلَيْنَا، فلمّا كان بيْننا وبيْن الْماء ساعةٌ أمرنا أَبُو بكْرٍ فَعرّسْنَا، ثُمَّ شَنَّ الْغَارَة فوَرَدَ الْمَاءَ، فقتلَ منْ قتل عليْه وسبى. وَأَنْظُرُ إِلَى عُنُقٍ منَ النَّاسِ فيهمُ الذَّرارِيُّ، فَخَشيتُ أَنْ يَسْبِقُوني إِلى الْجبَل، فرمَيْتُ بِسَهْمٍ بيْنَهُمْ وبَيْنَ الْجَبلِ، فَلَمَّا رَأَوُا السّهْم وقفُوا، فجِئْتُ بِهِمْ أَسُوقُهُمْ وَفِيهِمُ امْرَأَةٌ منْ بَني فزارَةَ عَليْهَا قَشْعٌ منْ أدم -قال: الْقَشْعُ: النِّطعُ- معها ابْنَةٌ لَها منْ أَحْسَنِ الْعرَبِ، فسُقْتُهُمْ حتَّى أَتيْتُ بِهِمْ أَبَا بَكْرٍ (ﷺ)، فنفَّلني أَبُو بكْرٍ ابْنَتَها، فقدمْنا الْمدِينَةَ وما كَشَفْتُ لَها ثَوْبًا. فلقِيني رسُولُ اللَّه (ﷺ) في السُّوق، فقال: ((يا سَلَمَةُ هَبْ لي الْمرْأَة)). فقُلْتُ: يا رسُول اللَّه، [واللَّه] لَقَدْ أَعْجبتْني وما كشَفْتُ لَهَا ثَوْبًا. ثُمَّ لقيَني رَسُولُ اللَه (ﷺ) من الْغد في السُّوق فَقال لي: ((يا سلمَةُ، هبْ ليَ الْمَرْأَةَ للَه أَبُوك)). فَقُلْتُ: هيَ لَك يا رسُول اللَه، فوَاللَّه ما كشَفْتُ لها ثوْبًا، فبَعَثَ بها رسُولُ اللَّه (ﷺ) إلى أَهْل مكَّة، ففدى بها نَاسًا من الْمُسلمين، كانُوا أُسرُوا بمكَّةَ.

(إياس) کوری (سلمة) لە باوکیەوە (ﷺ) دەڵێ: جەنگی (فزارة) مان کرد بە فەرماندەیی (ابو بكر) (ﷺ) کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کردبوویە فەرماندەمان، کاتژمێرێکمان مابوو بگەینە ئاو، (ابوبکر) فەرمانی پێدایین دابەزین بۆ حەوانەوە، پاشان ابوبکر شاڵاوی برد و گەیشتە سەرئاوەکە، ئەوەی کوشتی کوشتی و هی تریش بە دیل گیران، سەیری کۆمەڵێ خەڵکم دەکرد کە ژمارەیەك ژن و منداڵیان تێدابوو، ترسی ئەوەم بوو ئەوان پێشم بکەون لە گەیشتن بە کەژەکە، تیرێکم خست بۆ نێوان ئەوان و کەژەکە، کاتێ تیرەکەیان بینی وەستان و هاتم و پێشی خۆمم دان. ژنێکیان تێدابوو لە (بني فزارة)، پۆشاکێکی چەرمی

